# شەیتان دەگێڕێتەوە


| | |
|---|---|
| نووسەران: | د. ئەحمەد خالید مستەفا |
| وەرگێڕان: | فەیسەڵ هەمەوەندی |
| نەخشەسازیی بەرگ و ناوەڕۆک: | علی عبدالقادر ڕەزانی |
| لە بڵاوکراوەکانی: | ناوەندی فێربوون |
| نۆرەی چاپ: | یەکەم - 2024 |
| تیراژ: | 1000 دانە |
| قەبارە: | 14سم × 21 سم |
| نرخ: | 8.000 دینار |

**لە بەڕێوبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (287)ی ساڵی (2024)ی پێ دراوە.**

ناوەندی فێربوون بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

**بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: عیماد رە شید**

**بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: ڕەنج عیماد**

**لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی فێربوون**

ناونیشان: هەولێر- بازاڕی کتێبفرۆشان - بەرامبەر دەرگای قەڵا

07504048285 - 0662231315

د. ئەحمەد خالید مستەفا

و: فەیسەل هەمەوەندی

# شەیتان دەگێڕێتەوە

ڕۆمان

بنیادەمەکان بەوای هەناسەی گەرمییانەوە بەرگەی یەکتریان نەدەگرت..
فرۆکەیەکی تەنگەبەر چون قوتووی ماسی سەردین شان بەشان یەکەوە دانیشتووین..
پێمان بەر یەک دەکەوت، هەناسەمان تێکەڵ بەیەک دەبوو، بۆن و بەرامەی خۆ نەشۆریمان، پەسێوی دەکردین..
عارەقەی نێو چەوانمان جۆگەلەی بەستبوو، پێدەچوو گرفتێک لە سارد کەرەوەکەدا هەبێت و لەکار کەوتبێت، وەلێ گرفت کەوتبووە پاک و خاوێنی سەرنشینانیش..
گەشتێکی ئاسمانی هەرزان بەها دەیبردم، منیش شێخی سەلەفی (بلقاس)یم، بۆ دیدارێک لە ڕۆمانیا بەڕێکەوتووم. لەکارکەوتنی ساردکەرەوەکە وەڕسی نەکردبووم، بەڵکو ئەو کچەی بەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، شانم بەر شانی دەکەوت، لاقەکانی نیمچە ڕووت بە بێزارییەوە دەیلەراندەوە و جاروباریش تۆفێکی بۆ دەکرد.
خەڵکەکە کە دیقەتی ڕیشمیان دەدا، چون هەڵگری ڕق و ترسیان بێت، ڕق بۆ شێوازی ڕوخساری ئیسلامییەکەم بێت، ترسەکەشیان لەوەدابوو خۆم بە ڕوویاندا بتەقێنمەوە، کەچی قەشەکانیان کە لێخۆشبوونیان پێ دەبەخشن، هەر وەک ڕیشەکەی منیان هەیە، ڕەنگە هی ئەوان درێژتریش بێت.
خانەخوێ ئاسمانییەکە بەبزەخەنەیەکەوە برێک بۆ ڕێز داچەمیەوە، هەموومان بزەمان بەڕوخسارمانەوە داهانی، تەنانەت ئەگەر فرۆکەکەش بسووتایە گوێمان لێ نەبوو، بە زمانی یۆنانی شتێکی بەو کچەی پۆشتەیی ژیانی لەخۆی داماڵی بوو، کە بەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، پێیگوت، چون ئەوەی بۆ لەکارکەوتنی ساردکەرەوەکە داوای بکات، ئەوە مەزەندەی خۆم بوو.

هەوڵمدا بەسەر کورسیە وشکەکەوە حەسانەوەیەک بەخۆم بدەم، تا دەمێک چاوم بچێتە خەو، گەیشتن بە براشۆف جارێ زۆری بە بەرەوە ماوە.

خۆ خەواڵوو کردن ئاسان نەبوو، دەی هات و لەتەک خۆیشیدا ئەو خەونە جەنجاڵەی هێنا ، کە بە هەموو وردەکارییەکانیەوە و بە دڵگوشین تیا ژیام.

منت دەبینی لە ژوورێکی بچووک وێستاوم، بەرامبەر ئەو قەرەوێڵەیەی بە توندی دەلەرییەوە، خەڵکانێکیش بە دیارمەوە هاوکاری جەنگیان دەکردم، کە بۆ خۆم هەڵمبژارد و هەر خۆشم دەرئەنجامەکانی لە ئەستۆی خۆم دەگرم، تەماشای کچێکم دەکرد بەسەر قەرەوێلەکەوە فڕێ درابوو، دەموچاوی هیچی بە مێینە نەدەچوو، بەڵکو لە نیچەرێک دەچوو، چاوەکانی تەواو سپی بوون، نینۆکەکانی درێژ بە شێوەیەکی تۆقێنەر دیقەتی دەدام، چون ئەوەی بەریەرەکانیم بکات، دەنگێکی خنکاوی تووڕەی لێ بەرز دەبووەوە، لەهاواری کەمتیارێک دەچوو.

من قورئانم بەسەریا دەخوێند و ئەویش بە گاڵتەجارییەوە دەمی واڵا کردبوو، بەسەر قەرەوێڵەکەوە ئەو کۆتەی دەست و پێیمان بە زنجیر کردبوو، خۆی رادەپسکاند..

ئەو خوێنەی بەسەر دیوارەکەو بوو، ئەو برینانەش کە بەسەر ڕوخسارم و هەموو ئەوانەش کە لەوێ کەوتبوون، پێت دەڵێت ئەو چ شەیتانێکی نەفرەت کراوی تێدا ڕۆ چووە، بەو چاوەی پێی دەڕوانێت، لەسەرخۆ سەری بۆ لای من وەردەگێڕێ، ئەوجا..

بەوای ترسەوە بە ئاگا هاتمەوە، چاو لەچاوانی سەرنشینان دەبڕم، گوێم لەقسەیەک بوو، لەوی لەسیلەمدا دانیشتبوو چون ئەوەی بەزمانی ڕۆمانی

جوێن بێت، بە چاوێکی بێزارانەوە لێم ڕوانی، بیرم لەو هەڵوێستە نامۆیە کردەوە، کە منی لە وڵاتی میسری خۆشەویستم دەرهانی بۆ وڵاتی نامۆیان.
لەمزگەوت دەردەچووم، کاتێ یەک لە قوتابییە زیرەکەکانم ئەوانەی قورئانم فێر دەکردن، نامەیەکی پێدام، مۆرێکی زۆری بە زمانی ئەورووپی ڕۆژهەڵاتی بەسەرەوەبوو.
نامەکەم هەڵپچڕی، نامەکەی ناویم دەرهێنا، بە دەستنووسێکی جوان و بەڕەوشتێکی بەڕێزانەوە بانگهێشتم دەکەن، من شێخ خالید موسا ئەلراقی، چارەسەری بە قورئان ئامادەی کۆنفراسی نێودەوڵەتی بم، کە لە (براشۆف)ی ڕۆمانیادا ساز دەکرێت، هیچ بەهانەیەکیان بۆ نەهێشتمەوە، پلیتی فڕۆکە و شوێنی نیشتەجێبوونی ئوتێلیشیان بۆ ناردبووم، نەک هەر ئەوە، تەنانەت پارەیەکی زۆریشیان لە دۆلار بۆ ناردبووم، تا پێویستییەکانی سەفەرەکەی پێ بکرێم، ئەوەشیان پێ ڕاگەیاندم کە فیزاکەشیان بۆ ئامادە کردووم، ئەوەی لەسەر من ماوە، تەنها ڕوو کردنە ڕووەو باڵیۆزی ڕۆمانیا و تەنها پاسپۆرتەکەم لەگەڵ خۆم ببم.
بانگهێشتکردنەکە لە لایەن مەکۆی باڵای زانستە میتافیزکییەکان و هونەری ڕوحیانەتدا بوو، لەڕاستیدا پێشتر شتی وام نەبیستووە، ناشزانم چۆن پێیان زانیوم، هەڵبەتە بەوای ئەو بەرنامەیەی لە تەلەفیزۆنەوە تیا دەرکەوتم، کە من ئەزموونی خۆمم لە دەرپەڕاندنی جنۆکە لە بلقاس باسم لێوە کردووە، بەڵام چی وای لێکردوون لە ڕۆمانیا گرنگی بە ئێمە بدەن؟!
بەدەر لەوەی ڕقم لە سەفەر دەبووەوە، بەتایبەت بۆ وڵاتی کافران، هەستم کرد هەلێکە بۆ بڵاوکردنەوەی شتێک لە ئاینی ئیسلام، هەلێکی پڕ لە دڵەڕاوکێیە.

* * *

فرۆکەخانەی براشۆف بەو هەموو مینا بەندە بەرزانەی چاو بڕی ناکات، بیانیانگەلێکی نامۆ، قژەسەریان زەردباو، پیاوان و ژنانیان قوول ڕووت، دەهاتن و دەچوون، منیش بەم ڕیشە درێژەمەوە بەنێویاندا تێدەپەڕیم، هەر کە دەگەیشتمە بەرامبەر ژنان چاوەکانم دەنووچقاند.

نەفرەت لە خەواریجەکان، ئەوانەی ڕیشیان بەرداوەتەوەو بێگوناهەکان دەکوژن و بەناوی ئیسلامەوە دەیانتەقێننەوە. سۆسەی دەم وچاوەکانم دەکرد، ئەمە خوایە چاوم بە کەسێک بکەوێت کە لێرە چاوەڕوانمە، زۆرێک لە لافیتەکانم بینی، کە ناوی کەسەکانی بەسەرەوە بوو، ناوی من لەنێویاندا نەبوو، تا لافیتەیەکم بەرچاو کەوت، درووشمی مەحفەلەکەی بانگهێشتیان کردبووم، بەسەرەوە بوو.

پیاوێکی قژ تەنک هەڵیگرتبوو، لاواز چون لیسی دارهەنار، بە ڕوخساری دیاربوو، ژیان ماندووی کردووە، ددانەکانی بەوای جگەرەکێشانەوە زەرد هەڵگەڕاون، بەدوو چاوی شینەوە لێی ڕوانیم، بەدەر لەماندووبوونەکەی چاوەکانی بریقەی گەنجایەتییان پێوە دیاربوو، بزەخەنەیەکی بەپەای بۆ کردم، بە زمانێکی ئینگلیزی بۆنی زاراوەی ڕووسی پێوە دیاربوو، گوتی:

- بەڕێز شێخی پیرۆز سڵاو.

بە ئینگلیزییەکی درووست وەڵامم دایەوە:

- سڵاو لە ئێوەش، ناوی بەڕێزتان چییە؟

دەستی درێژ کرد و جانتاکەی لەدەستم وەرگرت و گوتی:

- ئیڤان، ئیڤان سوکۆلۆف .

دووی کەوتم، بەدەم ڕۆیشتنەوە تەماشای دەورو بەری خۆمم دەکرد و بەخۆشم دەگوت: بەلقاس تۆ های لەکوێ، کوا گەلەکەت بەو گەرم و گوڕییەوە؟ خەڵکی لێرە سەرما ڕوحیانی بردووە!
کابرای ڕووسی بەرەو ئۆتۆمبێلێکی مامناوەندی بردم و بەڕێکەوتین، دیاربوو پیاوێکی زۆر کەمدوو بوو، کەوتمە پرسیار کردن:
- شوێنی کۆنفرانسەکە لەکوێیە؟
بەدەم تێڕوانینی ڕێگاکەوە، گوتی:
- ئوتێلەکە لە دراگۆسە، شارۆچکەیەکە بەسەر چیای فاراگاسەوە، نیو کاتژمێر لێرەوە دوورە.
سەرم بۆ ڕاوەشاند وەک ئەوەی لێی حاڵی بووبم، تەنانەت ناوی وڵات و شارەکانیشیان ئەفسانەییە، شتێکم بیر کەوتەوە:
- ئێوە قەڵای دراکۆلاتان هەیە، ڕاستە؟
بۆ چەند چرکەیەک چاوی لێ کز کرد، لە ئاوێنەکەوە تەماشای کردم، ئەوجا تەماشای ڕێگاکەی کردو گوتی:
- بەڵێ، بەڵام دوورە لە شارۆچکەیەکی دراوسێی هەمان پارێزگای ترانسلڤانیایە کە ئێمەی تێداین.
بەدەم دیقەتدانمەوە بۆ ڕۆمانیا ئاهێکم هەڵکێشا، لە سەردەمی ناوەند خوو ڕەوشتێک هەبوو هەموو شتێکی دەلووشی، بە زمانێکی تۆزێک توند گوتی:
- جگەرە دەکێشیت؟
بەچاوێکی سووکەوە تەماشام کرد، چون ئەوەی جوێنی وێدابم، گوتم:
- نا، هەرگیز.

وامزانی خۆی ئامادە دەکات، داوام لێ بکات ڕێی وێدەم جگەرەکەی خۆی بکێشێت، وەلێ نەیکێشا، بەدرێژایی ڕێگاکە نقەی لێوە نەهات.

ڕێگاکە بەرە بەرە لە بیناو قەرەباڵغی بۆ زەوی سەوزایی بەریلاو و چیای پڕ دارستان دەگۆڕا، ئێدی بیناکان تەواو ون بوون، تەنها دەشتایی و شیو دەرکەوتن، ئەو خەڵکە لەم دنیایە خاوەن بەهەشتن. ئۆتۆمبێلەکە لای دا و ڕێگایەکی لاوەکی بەنێو گردۆڵکەی سەوزایی پێچاو پێچی بەرەو ژوور دەبووەوە، تا لەبەردەم ئوتێلێک وەستا، دیاربوو ئەو ئوتێلە شوێنی حەوانەوەمە.

ئەوە ئوتێل نییە، زیاتر لە خانوو دەکات، سێ نهۆمە لە دار درووستکراوە، سەری بانەکەی سێگۆشەی سوورە، هەر وەک سەربانی ئەوروپییەکان، سەوزاییەکی زۆریش دەوری داوە، چیاش لەهەموو شتێکی دابڕیوە.

بەو دارانەی گەڵاکانیان بەردەبوونەوە، بەڕاستی دیمەنێکی دڵڕفێنی هەبوو، ناوی خانووەکەم بە بان دیوارەکەیەوە بە پیتی ورد بینی، PURGATORIUM، زۆر گوێم بەناوەکە نەدا.

پیاوەکە دابەزی و دەرگاکەی بۆ کردمەوە و ئەوجا جانتاکەشی داگرتم و لە پێشمەوە بەرەو ناو خانووەکە ڕۆیشت، دوا بەدوای ڕۆیشتم، هەر کە چوومە ژوورەوە هەموو دەنگەکان بێدەنگیان نواند.

خەڵکانێک لە هەموو توێژەکان، پیاوان و ژنان، بەسەرسامییەوە لێیان دەڕوانیم، برێکیان دانیشتوون و برێکی تریان بەپێوە دەتگوت لەچاوەڕوانی کەسێکدان، بە نیشانەکانی ڕوخساریان پێ نەدەچوو چاوەڕوانی من بن، بەسڵاوی ئیسلامانانەوە سڵاوم لێ کردن، بەرەو پرسگەکە بەڕێکەوتم و تەماشای دار و دیواری نشینگەکەم دەکرد، پێدەچوو زۆر کۆن بێت، هەر

بەوای جیرە جیری ڕۆیشتن بەسەر زەویە دارییەکەی بۆت دەردەکەوت زۆر کۆن بێت.

*　　　*　　　*

لەپشت مێزی پرسگەکەوە ژنێکی زۆر قەڵەو وەستابوو، پێدەچوو لە شەستەکان بێت، ئەوەندە سووراو سپیاوی بەدەم و چاویا ساوی بوو، بەشی عەشرەتێک ژنانی دەکرد، سەریشی بە شێوازی لادێی بەستبوو، بە زمانی ئینگلیزیی شێوەزاری نۆردیە گوتی:

- ئەی گەنجی قۆز لە کاتی خۆت هاتیت، تا گەڕانەوەت جەوازەکەت لای ئێمە دەمێنێتەوە.

بە ڕووخۆشییەوە بزەم بۆ کرد و گەشتنامەکەم پێدا، ناومی لە سجلەکە لەخانەی دوانزە نووسی، کەواتە بە خۆشمەوە دوانزە ئاکانجین، لام لێ کردنەوە و بەچاوی خۆم ژماردمن، زۆربەیان لە پیاوانن و توێژی جیاوازن، تیایاندایە لە زانا دەچێت، سێ ئافرەتیش لە دوانزە کەسەکەن، ئافرەتێکی پەردەپۆش چاوی لەزەوی هەڵنەدەبڕی، ئافرەتێکی هیندی، بەو خاڵە سوورەی ناوچەوانییەوە دیاربوو مەزەنەکەم ڕاستە، ئەوی سێیەمیان تەمەن بچووکە و پێدەچێت ئاسیایی بێت، دیقەتدانی هەموویان بۆ من بە ورپاییەوەبوو، دیقەتدانی منیش بۆ ئەوان هەر وابوو.

سەرم بۆ کارمەندی نووسینگەکە وەک خۆشحاڵییەک بادا، ئەوجا ئاوڕم دایەوەو بەرەو کەڤاڵێکی گەورەی بەدارەوە کراو ڕۆیشتم، ئەو تابلۆیە تاکە شت بوو، لەهەموو دیکۆری ئوتێلەکە جیاواز بوو.

تابلۆیەک لە سەردەمی ڕێنیسانس، یا کۆتایی سەردەمی ناوەند، پیاوێکی کورتە باڵای قەڵەو بەسەر مێزێکەوە وێستاوەو شتێکی بەدەستەوەیە و بەرزی کردووەتەوە، سێ ئافرەتی لادێ نشینیش لەخوار مێزەکەوە وێستاون و ئافرەتێکی زۆر دەوڵەمەندیش لەپێشیانەوە دانیشتووە، بە کراسە بەهادارەکەیەوە دیاربوو..

- چۆنن یا شێخ؟

زمانی عارەبی بە شێوەزارێک نەمدەزانی چییە، ولێ بۆ من خۆشحاڵی بوو، ئاوڕم دایەوە، پیاوێکی گەنم ڕەنگ، ڕوخسارێکی کراوە، بزەخەنەیەکی بۆ کردم و گوتی:

- (توێبە)ی برات لەگەڵتدایە، لە یەمەنەوە.

بەو دەنگە دڵخۆش بووم، چون ئەوەی لە بەهەشتەوە دەنگەکە هاتبێت، ئاخر لەنێو دۆزەخی نامۆیاندا بووم، وەک کەسێکی توێنی لەنیو بیابان ئاوم بۆ هەڵقوڵابێت، گوتم:

- توێبەی برا لەوەتی پێم ناوەتە ئەم خاکە تەنها تۆ دڵت خۆش کردم، ناوت جوانە، مانای چییە؟

بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

- یاشێخ یانی (تەیب یانی باش).

بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتم:

- تۆش پێدەچێت پیاو باش بیت.

پێیگوتم:

- یاشێخ تۆ لەو ئەکتەرە ئەمریکییە دەچیت، جۆن ترافۆڵتا، جیاوازی نێوانتان تەنها تۆ ریشێکی درێژت هەیە.

بەقسەکەی کە لە نوکتە دەچوو خەنیمەوە، بەو برایەم دڵنیابووم کە هاوڵێکم دەبێت، لەپڕ گوێمان لە دەنگی پێ بوو، بە قادرمەکە دەهاتە خوارەوە، هەر هەموومان دیقەتمان دا، بۆ خۆم بەسەرسوڕماوییەوە چاوەکانم ئەبڵەق بوون، تەنانەت زۆربەیان بەسەرسوڕماوییەوە لەوەی بە قادرمەکە دەهاتە خوارەوە لێیان ڕوانی.

پیاوێکی سەر ڕووتاوە، زۆر قەڵەو، کورتە باڵا، جل و بەرگێکی گران بەهای لەبەردا، ڕوخسارێکی لووس، چون ئەوەی کۆسە بێت، تەنها برۆکانی موویەکی تەنکیان هەبوو، بە دوو چاوی شینەوە لێی ڕوانین، بزەخەنەیەکی مار ئاسای بۆ کردین و گوتی:

- ئێمە لە هەموو وڵاتان ئێوەمان هێناوە بۆ ڕۆمانیا تا لەم کۆبوونەوەی ساڵانەدا بەشدار بن، دڵم پێتان زۆر خۆشە.

بەدەم دابەزینی بە قادرمەکان درێژەی بەقسەکەی دا و گوتی:

- ئێمە بوارێکتان وێدەدەین ئەزموونی خۆتانمان بۆ بگێڕنەوە، لەتەکتانا قسەو باس ئەگۆڕینەوە، تا جیهان تێبگات ئێوە لەسەر هەقن.

دەنگی بەلامەوە چون فیشکەی مار وابوو، چاوانی خەڵکەکە لەنێوان سەرسام بوون و دڵەڕاوکێ متەقیان لەخۆیان بڕیبوو. دیسانەوە گوتی:

- یەکەمین کۆنفرانسی یەکێتی نێودەوڵەتی بۆ کۆکردنەوەی زانستە سروشتییەکان و میتافیزیکی و زانستە ڕوحییەکان لە یەک بۆتەدا.

شێوەی چەتر پەنجەکانی لەیەک ئاڵاند و گوتی:

- دوای شام کردن چاومان بەیەک دەکەوێتەوە، جەستەتان پڕ لەهێز بکەن، پێویستیاتن پێ دەبێت.

داچەمیەوەو گوتی:

- ناوم (شارلۆتان)ە، من خانەخوێی ئێوەم، کە ئێوەم بۆ ئێرە بانگهێشت کردووە، باوەڕیشم پێتانە، وەک چۆن کەس باوەڕی نەدەکرد.

ئەوجا جووڵەیەکی شانۆگەرییانەی بۆ کرد و ڕۆیشت، دڵمانی بە شێوەو ڕوخسار و شێوازی قسەکردنەکەی سەرسام کرد، دووی کەوتین، ئەویش بەرەو نووسینگەی پێشوازی بەڕێکەوت، لەتەک کارمەندی نووسینگەکە سەرقاڵی وتو وێژ بوو.

میوانەکان بۆ چێشتخانەکە لەنهۆمی دووەم سەرکەوتن، منیش دوویان کەوتم، ئافرەتە قەڵەوەکەی پرسگەکە پێشمان کەوت و خۆی بەناندێنەکەدا کرد، هەرچی پیاوە ڕووسیەکەی کە بۆ ئێرەی هێنام، مێزەکانی ڕێک دەخست، وا دیاربوو لەم میوانخانەیە بێجگە لەوان کەسی تر کاری تێا ناکات.

پیاوە ڕووسییەکە گشت مێزەکانی دایە دەم یەک و چون ئەوەی مێزێکی گەورەی لێ پێک بهێنێت، چووم هاوکاری بکەم، توێبەش کەوتە هاوشانم، پیاوە ڕووسییەکە بە سەرسامییەوە دیقەتی داین، دواتر جێی بۆ هەمووان کردەوەو بەجێی هێشتین، ئەوجا پیاوە سەر ڕووتاوەکە هات و گوتی:

- پێویست ناکات لەنان خواردنەکە دوودڵ بن، تیاتانە جوولەکەیە وەک میکائیل و تیاشتانە موسوڵمانن وەک شێخ خالید و مامۆستا توێبە، ئەم خواردنانە گۆشتی بەرازی تیا نییە، گۆشتی دەریایشی تیا نییە.

دیقەتی ئەو جوولەکەم دا، پیاوێکی لاواز و ڕیشێکی تەنک و چاو درەوشاوە، بەتیلەی چاو لێی ڕوانیم، ئەوجا خۆی بە مێزەکەوە خەریک کرد، تەماشای توێبەم کرد، ئەویش بەهەمان بیرکردنەوەی من تەماشای کردم، ئاخر ئێمە حەزمان بە جوولەکە نەبوو، ناحەزیمان لەتەک جوولەکان تا هەزار ساڵی تریش هێور نابێتەوە.

دوای نان خواردنەکە، هەر ئافرەتە قەڵەوەکە چای بۆ هێناین، بەوای خەڵکەکەوە زانیم ناوی (لیزا)یە.

چەند خولەکێک و خانەخوێ کەچەڵەکە شارلۆتان بە کیسەیەکی ڕەشەوە هات، شتێکی پێچراوی تیا دەرهێنا و گوتی:

- ئەمە دیاری مەکۆیە، بازنگی وزەی راستەقینەیە، لە هیچ شوێنێک نایدۆزنەوە، نووکە لە نەوەدەکانین، هەموو بازرگانەکان دەستکردە چینییەکەی دەفرۆشن، لەدەستی بکەن، هەرچی وزەی نەگەتیڤتان تیا بێت، دەری دەپەڕێنێت، هاوکێشەی درووست لە خەرمانەی وزەتان وێدەدات، کە لە دەورووبەرتان دەدرێت.

لیزا کارمەندی پێشوازیکار دەستی بەدابەشکردنی کیسەکان کرد، چاوانی خەڵکم بینی چەند سۆزداربوون، بیرمە برایەکی موسوڵمان لەمزگەوت شتێکی وەک ئەمەی لە مەچەکدا بوو، باسی وزەی دەکرد، کاتی لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاوام لێ حەرام کرد، گوتی ئەو شتەی لەژێر قۆڵی کراسەکەی شاردووەتەوە، گوایە سوودێکی گەورەی هەیە، بازنگەکەم لە کیسەکە دەرهێنا، کانزایەکی ڕەق بوو، لەدەستی ڕاستمم کرد، ئەوجا تەماشام کرد،

دەنگێکی کانزایی دەرکرد، دواتر لە قۆڵی کراسەکەم شاردمەوە، یەکێک لە پیاوەکان جەستەیەکی کەڵەگەتی هەبوو گوتی:

- پێدەچێت ئەمە ڕاستەقینە بێت، زیاتر لە یەکێکم بینی ساختە بوو، توورم دانە ناو تەنەکەی خۆڵ.

شارلۆتان بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

- دکتۆر هاتشیسۆن ئێوە کارەبا و وزەتان فێر کردین.

پیاوە کەڵەگەتەکە شەرمەزاری پێوە دەرکەوت، ما لەبازنگەکەی بڕوانێت، تەماشام کرد، وەلێ گرنگیم وێنەدا، لەتەک گروپەکە بۆ نهۆمی سێیەم بەرەو هۆڵی کۆنفرانسەکە بە ڕێکەوتین..

ژوورێکی گەورەبوو، مێزێکی هێلکەیی لەناوەندی ژوورەکە، سیانزە کورسی بە چوار دەوری مێزەکەدا، شارلۆتان لەلای سەرەوە دانیشت، هەموومان بێ دەستنیشانکردنی کورسییەکان دانیشتین، توێبە لەسەر کورسییەکەی تەنیشتم دانیشت، شارلۆتان چاوەڕوان بوو تا هەموومان دانیشتین، گوتی:

- بە چاودێرییەکی زۆر ئێوەمان هەڵبژارد، هەر یەکێک لە ئێوە چیرۆکێکی هەیە، نهێنی زانستێک ئاشکرا دەکات، کە مرۆڤەکان بەدەست چارەسەرکردنیەوە گیرۆدە ببوون، یا نهێنییەکی ڕوحیانەت کە مرۆڤ پێویستی پێبووە، هەندێکیشتان نهێنییەکی پێیە وابەستەیە بە پیلانێک دژ بەرەگەزی مرۆڤایەتیمان، تا هەر هەمووان سوود مەند بن، هەموو ڕۆژێک قسەکەرێکمان دەبێت، یانی هەر یەک لە ئێوە ڕۆژێکی بۆ هەیە، ئەوەی دۆزیویەتەوە یا زانیویەتی بۆمانی بخاتە ڕوو، چۆنیشی دەوێ بە ئارەزووی

خۆی بیگێڕێتەوە، ئەوەی لێرە دەگوترێت، وەک ئەوە نییە لەدەرەوە باس دەکرێت.

لیزا.. یەکی پەرداخێک چای لەبەردەماندا دانا و هۆڵەکەی بەجێهێشت، شارلۆتان تەماشای لای کورسییەکی کردو گوتی:

- ڕۆژی یەکەم لەتۆ باشترم نەدۆزیوەتەوە (لازار) قسەمان بۆ بکات، تۆ جیهانت ئەمدیو و ئەودیو کردووە.

تەماشای پیاوەکەم کرد، هەوڵمدەدا بیرم بێتەوە ئەو ڕوخسارەم لەکوێ بینیوە، گەنجێکی قژ خاو، چاوێلکەی چوارگۆشەی لەچاوا، جل و بەرگێکی سادە، بزەخەنەیەکی بێ گزی، شارلۆتان گوتی:

- بەڕێزان بۆب لازارتان پێ دەناسێنم.

بۆب لازار وەک ڕێزێک داچەمیەوە، گوێی لە هەناسەی سەرسوڕهێنەری هەندێک لەوانەی دەیناسین بوو، پێی سەرسوڕمان نەبوو، هەر بەڕاستی بەر لەچەند مانگێک جیهانی ئەمدیو و ئەودیو کردبوو.

**1**

# بەسەرهاتی دەڤەری 51

**( بۆب لازار.. دەیگێڕێتەوە)**

**" کاتێک دەبی بە سەرۆکی دەزگایەک لەو پرسیارانەی لە خۆتی دەپرسیت: هەر بەڕاستی چی لە دەڤەری 51 دەگوزەرێت؟ بڕوام وایە تەنها سەرۆکم کە ناوی ئەو دەڤەرە ئاشکرا دەکەم"**

دوایین پایزی دەیەی هەشتاکان بەهەر هەموو ئەوەی تێیدا بوو، گەڵای دارەکان کە با وەراندبوونی، تا دوا دیمەنی ئەو سەردەمە لە شەیدایی و هونەر بخاتە ڕوو، ئەوەی لە هەشتاکان دەستی لە پاڵتۆ پێستە کورتە ڕەشەکەی نابوو، تا شتێکی شەیدا و شەیداترمان بۆ دەربخات، گرتەیەک لەنێو گێڕانەوەی هەواڵەکانی کاتژمێر پێنج دەرکەوت، گرتەی پیاوێک ڕوخساری بەتەواوی دیار نەبوو، دنیای ئەمدیو و ئەودیو کردبوو.

ستافێکی سەیر لە هەواڵەکان بابەتێکی سەیر بڵاو دەکەنەوە، پیاوێک تا نەناسرێتەوە لە شوێنێکی تاریکدا دانیشتووە، چون ئەوەی لەناو ئۆتۆمبیلێک دابێت، لە پەنجەرکەوە شەوی ئاسمان دەردەکەوێت، دیمەنی گەڵا ڕژاوەکان بەدەم (با)وە لەپەنجەرەکەوە دەبینرا، پیاوەکە لەکامێراکەی ڕووانی، بێژەرەکە بە شێوەزاری بەرنامەیەکی پیشەگەر دەبێژێت" دەڤەری 51 وەک ئەوەی ئێمە بە حەوزی تاوانکارەکانی ناوزەد دەکەین، شوێنێکی نهێنییە بەسەر هەسارەی زەوییەوە، ڕێک باکووری نیڤادایە، لەوێ تاقیکردنەوە بۆ جۆرە چەکێکی زۆر خەتەرناک دەکرێت، خەڵکی دانیشتووانی نزیک بەو

دەڤەرە ئیدیعای ئەوە دەکەن، بەچاوی خۆیان شتگەلێکیان بەئاسمانەوە بینیوە دەفڕێت، ئەمڕۆش زانایەکی فیزیکیمان لەتەکدایە، دەڵێت بەخۆی لەو حەوزی تاوانکارانە کاری کردووە، بۆیە داوای لێکردووین ناسنامەکەی ئاشکرا نەکەین.

- بەڕێز.. چۆن بزانین وەک خۆت دەڵێی زانیاریەکت لایە، لەو شوێنە چی دەگوزەرێت؟

- باوەڕ ناکەم ڕێگایەک هەبێت تا بزانیت، چونکە ڕێگایەک بۆ سەلماندنی ئەوە نییە، بە بێ ئەوەی ناسنامەکەم دەرهێنم و خۆم بنێمە نێو کێشەو ململانێ، بۆخۆم کەمم بەسەر نەهاتووە.

- بەتەواوی پێمان بڵێ، چی لەوێ دەکرێت؟

- زۆر باشە، لەوێ زۆر.. لەڕاستیدا 9 تەنی فڕیو لەسەرچاوەیەکی دوور لە گۆی زەوی، کار لەسەر تاقیکردنەوەی دەکرێت.

- دەڵێیت 9 تەنی فڕیو؟ زۆر باشە، ئەو تاقیکردنەوانە چۆن دەکرێن؟

- مەبەستت چییە؟

- یانی تاقیکردنەوەی سەرکەوتوون؟

- هەندێکیان بێخەوشە و وەک چۆن بۆی داڕێژراوە وا کار دەکات، ئەو دوای پارچە پارچە لەیەک جیا کراونەتەوە، بۆ خۆم لێپرساوی یەکێکیان بووم.

- چۆن ئەو دەڤەرە فڕیوانەمان دەست کەوت؟ چۆن بە دەستی حکومەت گەیشت؟

- هیچ زانیارییەکم لەو بارەوە نییە، ئەو زانیارییانە بە کەس نادرێت، تەنها زانیاری پێویست بە کارەکەی خۆمیان وێداوم.

- تۆ بڵێی حکومەت بۆ خۆی دروستیانی کردووە، بیانووی دەرەوەی گۆی زەوی بۆ داهێناوە؟

- مەحاڵە، ئەو تەکنەلۆژیایەی ئەو شتانە کاری پێ دەکەن، لەسەر زەوی هەر نییە، ئەوەش ئەو هۆکارەیە کە من لێرە لەپێناویدام، ئاخر ئەوە تاوانکارییە، نەک هەر بەرامبەر گەلی ئەمریکا، بەڵکو دژ بە کۆمەڵگای زانستیش تاوانە.

- ئەگەر حکومەت پێت بزانێت زانیاریمان پێ دەدەیت، چیت بەسەر دێت؟

- هەر شتێک ڕەنگە ڕوو بدات، نازانم، هیچ بیرۆکەیەکم نییە.

- تۆ باسی ئەوەت کرد تووشی کێشە هاتووی؟

- بەڵێ، ئاگاداریان کردمەوە کە بە سیخوڕی کردن تاوانبار کراوم، هەڕەشەی کوشتنیان لێکردووم، نازانم دواتر چیم بەسەر دێت.

- سوپاس کە لەتەکمانا بوویت، زانیاری باشت پێبوو، بەڕێز سوپاس بۆ تۆ، بینەرانی ئازیز ، ناوبڕێک و دێینەوە لاتان، نووکە دەگەڕێینەوە لای بیگ بنگ لە سی. بی. سی، پەیامنێرمان لە چینەوە دەڵێت کە...

گرتە ڤیدیۆکە بەسەر ئەو پیاوەی لە تاریکییەکە دانیشتبوو هەر ئیشی دەکرد، دوا بە دوای گوێ نەدانی بە پرسیارەکە دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی کردەوە، تا بڕوات، بەدەم ڕێوە دەیگوت" با جیهان سەرقاڵی گەمەی خۆیان بن، نەفرەتیش با بۆ ئەو کەسانە بێت، کە ئەو گەمژانە وریا دەکاتەوە" وێنەی

بێژەرەکە گەڕایەوە، ژنە بێژەرەکەی تەنیشتی لەبزەخەنەی خۆی نەدەکەوت، باسیان لە بابەتێکی تر دەکرد، چون ئەوەی هەموو هەواڵێکی گەمژانە لای ئەوان گرنگ بێت.

ئا کۆد گەلێک هەن ئەگەر دەستت وێدان، تەقینەوە درووست دەبێت، ئەودەم نەک هەر ئەمریکا ژێر و بان دەکات، هەموو جیهان سەرو بن دەکات. شاشەی تەلەفیزیۆنی هەموو ماڵان گرتەی ئەو پیاوەی کە لەتاریکی دانیشتبوو، بە هەموو زمانەکان بوو بەهەواڵ و بڵاوکرایەوە، دەبینیت بێژەری رووسی بە زمانێکی سارد باسی لەو حەوزە تاوانکارییە دەکرد، کە ئەمریکا خەریکی چییە، لەتەک ئەوەش نیشانەی ئەو شوێنەی دەئاخنییە نێو هەواڵەکە، کە کە ساختەیان لە بۆ چوونە سەر مانگ بێت، دەبینیت بیژەری ژاپۆن بەشێوازێکی تر گوزارشتی لێ دەکات و دەڵێت.. ئەو ناوچەیە تاقیکردنەوەی چەکی ئەتۆمی تیادەکرێت، بەو بۆنەشەوە نموونەیەکی هیرۆشیمای بیر خستنەوە.

هەزاران خەڵک وەک کوللە لە نزیک ئەو شوێنەی (51) کۆ بوونەوە، کەوتنە گەڕان بەدووی ئەو پیاوەی لە تاریکییەکەدا دانیشتبوو، ئەو پیاوە ناوی بۆب، بۆب لازار بوو.

*　　　*　　　*

بۆب لازار دەڵێت:

تۆ هەنووکە ئەو کەسە نیت کە خولگەی گەردوون بیت، تۆ شتێکی لە نێو شتگەلێکی زۆر، ڕەنگە بلیۆنان کەسی تری ئەم گەردوونە بن، ئەمە

بیرۆکەیەکی ترسناکە، لووت بەرزی مرۆڤ دەڕووشێنێت، کە وا دەزانێت ئەم گەردوونە تەنها بۆ ئەو درووستکراوە.

ناوم ڕۆبێرت لازارە، ئەو ناوەی وەختەبوو بیرم بچێتەوە، تەنانەت دایکیشم بە بۆب بانگی دەکرم، وەلێ کە تووڕە بوایە، بە ڕۆبێرت ناوزەدی دەکردم، ئەو بەوای ئەو تەقینەوانەوە تووڕە دەبوو، کە لەباخچەی ماڵەوە تاقیم دەکردنەوە، گەمە کردن بەیاری ئاگرین ڕەنگە مناڵ بکوژێت، وەلێ من هەر وازم لێ نەدەهێنا، ئاخر ئەو برە بچووکە ئەو وزە گەورەیەی دادەهێنا، بەلامەوە شتێکی گرنگ بوو. بۆ خۆم توووند و تیژ نیم، وەلێ لەو منداڵانەم کە هەڵسوکەوتی نامۆیان دەکرد، ئەوانەی چاوێلکەی گەورەیان لەچاو دەکرد و بەو ئاوایە ئەوانی تر گاڵتەیان پێ دەکرد، ئەوانەش جەستەیان پڕ بوو، لێیان دەدان. لەو منداڵانە بووم کە ئەگەرەکو کێشات پێیدا و چاوێلکەکەیشت شکاند، وەک گەمژەیەک بەدوویدا دەگەڕاو لەچاوی دەنایەوەو گریانەکەشی لەخۆیدا قەتیس دەکرد، تا ئەوەی لە کەسایەتی ماویەتییەوە خۆی نەدۆڕێنێت، دواتر بێ لۆمە کردن دەڕۆات.

گەورەبووم، وەک هەموو ئەوانەی لەخۆم دەچوون، نمرەی زۆر بەرزم بەدەست دەهێنا، لەتاقیگەیەکی توێژینەوە کارم دەکرد، هی وەک من جەستەی لاوازیان لە ماوەی خوێندندا دەشاردەوە، لەگەورەترین کارگەی توێژینەوەی ئەتۆمی لە (لۆس ئالامۆسی) ئەمریکا کارم دەکرد، هەموو ئەوانەی لەوێ بوون وەک خۆم وا بوون، خاوەن بەهرە بوون، کە لەشکستی هەموو شتێک هەڵدەهاتن، بەسەرکەوتنیان لەو شتەی هیچی لێت نەدەویست، کە بەهێز بیت یا زمانزان بیت، تەنانەت زمانیشت هەر نەبوایە کێشە نەبوو، تەنها و تەنها خۆت و مێشکت، تەنانەت لەنێو ئەوانیشدا من جیاواز بووم، کە من خاوەن ئۆتۆمبێلە

سەیر و سەمەرەکە بووم، تەنانەت لە لۆس ئالامۆس لەبەرگی پێشەوەی ڕۆژنامە فەرمییەکە دایانگرتم و تێیدا نووسیبویان" یەکێک لە زانایانی لۆس ئالامۆس مەکینەیەکی موشەک هاوێژی خستووەتە سەر ئۆتۆمبێلە هۆنداکەی، کە تیژڕەوییەکەی دەگەیشتە 400 کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا" وێنەکەشیان داگرتبووم، کاتێ سواری ئۆتۆمبێلەکە بووم، زەردەخەنەیەکم بۆ گرتەکەش کرد، نەمزانی ئەو ڕۆژنامەیە دوای چەند خولەکێک لە بڵاوبوونەوەی سەرتاپای ژیانم دەگۆرێت.

تەواوی تیمی لۆس ئامۆس ئەو ڕۆژە لەسەر پێ وەستابوون، چونکە زانای بیرمەند ( ئێد تیلەر) زانای گەورەی بۆمبی هایدرۆجینی هاتبوو وتارێک پێشکەش بکات، ئەو ڕۆژە هەمان ڕۆژی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکە بوو، تێلەر بە دووچاوی کە لەچاوانی ئینیشتاین دەچوون، لێی ڕوانیم، ڕۆژنامەکەی بەدەستەوە گرت و لەپشتی چاوێلکەکەیەوە گوتی:

- تۆ ئەم شتەت دروستکردووە؟

بەدەم ڕێکخستنی چاوێلکەکەی چاوم پێمگوت، بەڵێ، ئەو بەنیازی ڕۆیشتن بوو، داوای لێکردم بە زووترین کات ژیاننامەی خۆمی بۆ بنێرم.

دوا بەدوای ئەو چاوپێکەوتنە، ژیانم بلەز بەرێوە دەچوو، چون ئەوەی دەستم بەدوگەی بەرەو پێشەوەچوونی تۆمارکەری ڤیدیۆکەوە نابێت، لە کارەکەی لۆس ئالامۆس وازیان لێ هێنام، بۆ کارێکی تر لەسەر مەکینە و لەشوێنێکی دوور، هەر زۆر زوو داواکرام، چاوپێکەوتنەکەم لە کۆمپانیای تایبەت بوو، ئەو کۆمپانیایە کار لەسەر بەرهەم هێنانی زۆرترین چەکی ئەمریکی هەستیار و تۆقێنەر دەکات.

مەزەندەی تاقیکردنەوەی زۆر گرانم کرد، وەلێ پرسیارەکان بێ بایەخ بوون، ئەوەی ڕاستی بێت، چاوانی ئەو کەسەی پرسیارەکانی لێ دەکردم، لەناخما بەدووی شتێکدا دەگەڕا، پێدەچوو نەیاندۆزیبێتەوە، بەڵام واژۆ لەسەر لێهاتوویەکەم کرا. شوێنی کارکردنەکەم زۆر دوور و نهێنی بوو، نەیاندەویست بەوردی پێمی بڵێن، ڕۆژانێکی قورس بەچەندین تەن بەسەر کاغزدا بەسەر برد، وابزانم سەد کاغزم بەڕێخست و واژۆم لەسەر سەدی تر کرد، بەوای زۆری کاغزەکانەوە بێ ئەوەی هەندێکی بخوێنمەوە واژۆم دەکردن.

دواجار کارتێکی موگناتیسکراویان پێدام، زۆرێک لەدرووشمی دەوڵەتی لەسەر بوو، کارتی ڕێگەپێدان بۆ ناوچەیەکی زۆر نهێنی لەهەموو جیهاندا، ناوچەی51.

زەنگێک لەدوورڕا دێت، وەک زەنگی ئاگادار کردنەوەی ڕوحە لەغافڵبوونی، زەنگێک چوون ئەوەی لەخەونمدا لێدرابێت، لێ هزرم ڕەتی کردەوە، زەنگێک تادەهات دەنگەکەی بەرزتر دەبووەوە، پشتگوێ خستنی مەحاڵبوو، خەوم زڕا، بە ترسەوە بەخەبەر هاتمەوە، بەتیلەی چاوە ماندووەکانم لە میلەکانی کاتژمێرەکەم ڕوانی، چواری بەریەیانبوو، زەنگەکە بەردەوام بوو، ناڕەحەتی کردم، لەتەک ئەوەش برێ دەنگی ناڕەزایی لە هاوسەرەکەمەوە کە بەتەنیشتمەوە نووستبوو بەرزەوە بوو، بە لارە لار ڕاستەوەبووم، بە تووڕەییەوە دەست بە هێدسێتی زەنگۆڵەکەوە بگرم، لایەنی دووەم ئیستفزازی کردم، چەند وتەیەکی مووی جەستەم قیتەوەبوون، تەماشای هاوسەرەکەم کرد، ئەودەم بە ئاگا هاتبووەوە، چاوەکانی پرسیار ئاسا تێبڕیم، زمانم لەگۆ کەوت، ویستم پێی بڵێم ئەوە زەنگی پەیوەندی کارەکەمە، بۆیە دەبێ هەر ئێستا بڕۆم، چاوم لە پاڵتۆکەم گرِدا، هاوسەرەکەشم کۆمەڵێک پرسیاری تووڕ دایە سەرم، هیچ وەلامێکم بۆی نەبوو، ئاخر چی پێ بڵێم، بڵێم بەم بەری

بەیانە حکومەتی ئەمریکی پەیوەندیان پێوە کردووم، تا ئاگادارم بکەنەوە دوای دوو کاتژمێر فڕۆکەیەک دەمبات بۆ شوێنێکی نادیار؟ بۆم نەبوو لەتەک هیچ خەڵقەندەیەک باس لەکارەکەم لەناوچەی 51 بکەم، پرسیارەکان شێوازی مێینەیان لەخۆ گرت، بەو ئاوایەی دەیبینی جوانترین جل و بەرگ لەبەر دەکەم.

ژنەکەمم خۆش نەدەویست، ڕەنگە لە حەزمم نەگردبێت، وەڵامی هەموو پرسیارێکیم بە گەمژەیی دەدایەوە، بۆیە زۆر گومانی لێدەکردم، خۆ ئەگەر ڕێیان وێدابام باسم لەتەکیا کردبا، ئەوە ئارامتری دەکرد، چۆن بۆ ڕەزامەندی وەڵامی شتێکی بۆ بدەمەوە، کە خودی خۆم ناتوانم وەڵامی خۆم بدەمەوە؟ ئاخر کار لەحەوزی تاوانکارییەکان ئەوە هەڵدەگرێت کەسێک لە دەزگای سەربازییەوە بەرەبەیانێکی زوو پێت ڕابگەێنێت، کە دەبێت دەست بەجێ لە فڕۆکەخانەی مەکارین بم، کاتی بۆ نەهێشتمەوە پرسیارێکیشی لێبکەم، هەر زوو پەیوەندییەکەی بڕی.

لە فڕۆکەخانە دەیان گەشتیار ڕیزیان بەستووە، وەلێ ئەو ڕیزەم بوارد، کاتێک ناوی خۆمم پێگوتن، بەرەو هۆڵێکی سەربازی تایبەت بردمیان، لەوێوە فڕۆکەی تایبەت بەکۆمپانیای AG&G ئامادە کرابوو.

فڕۆکەیەکی تایبەت نیشانەی سووری مستێکی بەسەرەوەبوو، دەستبەجێ هەڵیفڕاندم، بڕێکی تر زەلامان لەتەکا بوو، هەر هەموویان یەک شێوە جل و بەرگیان پۆشیبوو، بێدەنگ دانیشتبووین، چون ئەوەی لەگەشتێکی ئاساییدا بین، دیاربوو هەر من دوودڵی ناویان بووم، زوو زوو لەپەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەم دەکرد، بەپێی قسەکانیان بێت ئێمە بۆ شوێنێکی دوور دەڕۆیشتین،

شوێنەکەش نەناسراوبوو، لەپەنجەرەکەوە هیچ شتێک دیار نەبوو، تەنها بیابان و پێچاو پێچی چیاکانمان لێوە دیاربوو.

ئەوەی لەمەڕ ناوچەی 51 دەمزانی، شوێنێکی تاقیکردنەوەیە، لەویلایەتی نیڤادا، بەقەد پانتایی وڵاتی سویسرا دەبێت، شوێنەکە شوێنێکی فرە گەورەیە، پڕە لەشوێنی تاقیکردنەوە، جێی تیایە بۆ تاقیکردنەوەی ئەتۆمی، جێیەکی تر بۆ چەکی کیمیایی، جێیەکی تر بۆ مەشقی فڕۆکەی سەربازیی نهێنی، کاتێک فڕۆکەکە نیشتەوە هیچ بینایەکم نەبینی.

کە لە فڕۆکەکە دابەزین، ڕێڕەوی دەستکرد بۆ نیشتنەوەی فڕۆکە لەنێو چیاکان دروستکرابوو، بینایەکی بچووک، هەر وەک دوو ژووری بەدەم یەکەوە، لەوێ هەر هەموومانیان پشکنی، ماوەی پشکنینەکە لەماوەی هەڵفڕینی فڕۆکەکە زیاتر بوو، بەدەر لەوەی گوێ بەهیچ نادەم، وەلێ چاوەکانم سۆسەی هەموو شتێکیانم پێ دەکردن، سواری کۆمەڵێک ئۆتۆمبێل بووین، بەنێو بەرد و تاوێری چیاکان بەرەو شوێنێک دەچووین، بەS4 ناوزەدیان دەکرد، بە مەزەنەی خۆم بیست میل لەناوچەی 51 دوور بوو.

تا ئۆتۆمبێلەکە بەنێو چیاکاندا دەیبردین، بیرۆکەیەک لەمێشکمدا ڕسکا، ئەویش بەردەوام سۆسەی دەوروبەرم دەکرد، تا لەبیرۆکەکەم دڵنیابووم، کاتێک ئۆتۆمێلەکەمان لەبەردەم کۆمەڵێک بینا وێستا، بینای ئاسایی نەبوون، بیناگەلێکبوون لەنێو چیاکان بیناکرابوون، چون ئەوەی چیاکانیان هەڵکۆڵیبێت و بیناکانیان تیا بنیات نابێت، ئەو بینایانە مەحاڵبوو لەنێو فڕۆکەشەوە بیان بینیت، تەنانەت ئەگەر بە نزمیش تێپەڕ بوایە.

ترسێکم تیا ڕسکا، تۆ بڵێی ئەو بینایانە هەر دەرگا بن؟ ئەوەش کە لە ناوچەی 51 دایە لەڕاستیدا هەر هەموو شتەکان لەژێر زەویدا بەون؟ کاتێک چووینە یەک لەو بینایانەی دامێنی چیاکە ئەوەم لاڕوون بووەوە کە...

* * *

سەرەتا کە دەڕوانیتە بیناکە، بینایەکی ئاسایی چون بینای حکومەت بەرچاوت دەکەوێت، درووشمی وزارەتی بەرگری پیاهەڵواسراوە، بەتەنیشتیشیەوە درووشمی نەتەوە یەکگرتووەکان، برێ سەربازیش بە جلی سەربازییەوە لەو ناوە دێن و دەچن، کاتێک دەچیتە ناو ئاسانسۆرەکە ئەوجا هەر پاژێکی دڵت دەکەوێتە خورپەکردن و ئەو هەموو دوگمانە دەبینیت، کە ئاماژەیە بۆ ژمارەی نهۆمەکانی بیناکە، لەڕاستیدا ئەسانسوار نەبوو، لە شوێنێکی نیشتنەوە دەچوو (ئەگەر قسەکە وا هەڵگرێت) سەربازەکەی کە لەگەڵمان بوو، پەنجەی نایە دووگمەی ژمارە حەوت، دڵم بەجارێ کەوتە خورپەکردن.

درکم بەوە کرد کە ئێمە لەناو بینایەکی فرە گەورەداین، کە لەبن زەوی بنیات نراوە، دواتر زانیم بابەتەکە زۆر لەوەش گەورەترە کە مەزەندەم کردبوو، گرفتەکە لەژمارەی نهۆمەکاندا نەبوو، ئەو بینایە یەکێکە لە سەدان بینای تر کە بەژێر زەوییەوەن، لەشارێک دەچێت لەژێر زەویدا بێت، هەر هەمووشی بە هێڵی ئاسنین بەیەکەوە بەستراوە، هەر وەک هێڵی ئاسنینی کانەکانی ژێر زەوی.

ئەوەی زیاتر شپرزەی کردم، هاوڵەکانی ترم کە لەفڕۆکە لەتەکما بوون، لە نهۆمی یەکەم لێم جیابوونەوە، تەنها من و سەربازەکە ماینەوە و بەرەو خوارتر

شۆڕ بووینەوە، کارتەکەم پیشان دابوو، ئەوەی لێی حاڵی بووم، کارتەکە بەناوی (ماجیتسک) ناوی برد، بەو کارەتە دەتوانیت لەتەک برێکی کەم لەناوچەی 51 بۆ هەندێ شوێن بتبەن، بەدەر لەوەی بەو کارتەوە هەست بە خۆشحاڵی دەکەیت، وەلێ خۆشحاڵییەک ترسی لەخۆ گرتووە، کەس لەدنیادا بەم شوێنە نازانێت، تەنانەت ئەمریکییەکانیش پێی نازانن.

دەرگای ئەسانسوارەکە کرایەوە، چوومە شوێنێکەوە پێدەچوو هۆڵی چاوەڕوانی بێت، هەموو شتێک لێرە پێدەچوو کانزایی بێت، مایەی سەرسوڕمان نەبوو، خۆ ئەم بینایە لەخشتی قوڕ درووست نەکراوە. پیاوێک بە جلی سەربازی ڕەنک سپی بەرەو پیرم هات، هەرگیز لەژیانمدا جلی سەربازی وا سپیم نەبینیوە، کۆمەڵێک کاغزی پێدام بۆ واژۆ کردنیان، زۆریش بەپەلە بوو، بواری خویندنەوەی کاغزەکانی پێنەدام، وەلێ لەچەند دێڕێکییەوە کە چاوم پیا خشاند، بە درۆ نێو چەوانی خۆمم لە عارەقەی درۆ دەسڕییەوە، کاغزەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد، هەر کاتێک سنووری یاسای نهێنی دەورویەر ببەزێنی، دەستبەجێ دەستبەسەر دەکرێیت و لانی کەم بۆ بیست ساڵ زیندانی دەکرێیت.

نازانم چۆن بوو ئەو دەمە هاوسەرەکەمم بیر هاتەوە، بەو نیگایەی کە دەیکرد ئەو دەمەی غیرەی لێ دەکردم، هەندێک شت کە گرنگییان پێ دەدەیت، تووشی شتگەلێکی ڕاستەقینە دەبیت، ئەو دەم دەزانیت کە هەموو ئەوانە شتگەلێکی پڕو پووچن. سەربازە جل سپییەکە برێکی تری لەکاغز پێدام، لەزەرفێکی مۆرکراودا بوون، داوای لێکردم بیانخوێنمەوە، لەسەر کورسییەکی ئاسن دانیشتم و کەوتمە خوێندنەوەیان.

بریتیبوو له کورتەیەک لەو کارو چالاکییەی من لێرە بۆی دادەمەزرێم، لەڕاستیدا زیاد لەجارێک خوێندمەوە، تا دڵنیابم ئەوەی کە لێی حاڵی بوومە ڕاستە و وڕێنە ناکەم، بێشک بووم لەوەی کە خوێندوومەتەوە ڕاستی نییە، یا هەر قسە نییە، ڕەنگە جۆرە فێڵێک بێت، بیستبووم ئەگەر بیانەوێ کەسێک تاقی بکەنەوە، کە نهێنی دەدرکێنێت، هەندێ زانیاری درۆی بۆ دەنێنەوە، ئەگەر بڵاو بووەوە، ئەوە ئەو بڵاوی کردووەتەوە، منیش ئەوەم بەخەیاڵا هات، ئەوەندەمەی کاغزەکانم دەخوێندەوە، ئەوەی لێی نووسرابوو چون وڕینەیەکی زانستی بوو. حکومەتی ئەمریکی منیان پێویستە، کار لەسەر تێگەیشتن و کۆپی کردنی تەکنەلۆژیای نەزانراوی ناو دەفرەی فڕیو بکەم.

* * *

سەربازە جل سپییەکە بە ڕاڕەوەکاندا بردمی، هەر دەرگایەکیشمان تووش دەبوو، لەخۆیەوە دەکرایەوە، لەبەردەم دەرگایەک وەستاین، ئەو دەرگایە جیاواز بوو، بەوای ئەستووری دەرگاکەو ئەو جیهازانەی بەتنیشت دەرگاکەوە بەدیوارەوە بوون، شتێکی تر بوون، هەر کە چاوت بەو دەرگایە دەکەوێت دەزانیت ڕوو بە ڕووی کارەساتێک دەبیتەوە. سەربازەکە پێیگوتم ئەو شوێنەی کە من تێیدام، شوێنێکی تایبەتە تەنها بۆ 22 کەس لەناوچەی 51 کە بچنە ناوی، ئەو ڕوونکردنەوەیە دڵی گووشیم، هەندێ جار بەها بەخۆت نادەیت، کە دەبینیت خەڵکی چ بایەخێکت پێ دەدەن، سەربازەکە پێیگوتم ناو لەپم لەو شوێنە دابنێم کە ئیشارەتی بۆ کرد، بە دەستی ئیشارەتی بۆ شتێک کرد، لە سەکۆیەکی بچووکی قەد دیوار دەچوو، شێوەی بزمار لێوە دەرچووبوو، سەرەتا نەمزانی چۆن دەستی لەسەر دابنێم، دواتر درکم پێکرد،

پێنج شێوە بزمارن، دەبوو هەر پێنج پەنجەکەم بنێمە نێوانیانەوە. هەر کە دەستمم لەسەر دانا ڕووناکییەک دەرچوو، بەشپرزەییەوە خەریکی ڕێکخستنی چاوێلکەکەم بووم، بیرت بێ ئێمە لەهەشتاکاندابین، سکانەری پەنجەمۆر هێشتا دانەهاتبوو، لە پیاوەکەوە تێگەیشتم ئەو ئامێرە سکانەری ناولەپپە، بۆ ناسینەوە بەکار دێت، ئەوجا دەرگاکە لەسەرخۆ کرایەوە، جارێکی تر دیقەتی سکانەرەکەم دا، نەمزانی ئەم سکانەرە ڕۆژێک دێت بەرامبەر بە جیهان دەبێتە شایەتحاڵی ڕاستییەکانم.

نووسینگەیەکی گەورە، پڕە لە مێز و ئامێر و کاغزی پەرش و بڵاو، دوو پیاو سەرقاڵی شتێکن، هەر کە چووینە ژوورەوە دەستبەجێ ئاوڕیان لێ داینەوە، یەکێکیان دەم بە بزەخەنە و ڕیشێکی سووربلوی تەنک و قژە سەریشی هەر سوور، ئەوی تر چڕو چاوی گرژ و قژەسەری ڕەنگ ئاڵتوونی، ئەوی ڕووخۆشەکە (باری) بوو، لەکۆمپانیا هاوکاری کارەکەم بوو، ڕووگرژەکەش (مارلیۆنی) سەرکردەی کۆمپانیاکە بوو، لە سەرکردەی کەتیبەیەکی دەکرد، نەک سەرکردەی زاناکان، ڕووی دەمی لە (باری) کرد و گوتی:

- باری.. ئەو هاوڕێمان بەرەو هەموو شتێکی پێ بناسێنە و دوای کاتژمێرێک لە (هانگەر) دەتانبینم.

بێ خوا حافیزی لەدەرگاکە چووە دەرەوە، باری بە ڕوویەکی خۆش و بزەخەناوییەوە پێیگوتم:

- هەوەڵجار کە پێیگەیشتم هەمان خەسڵەتی هەبوو، لەتەکیا ڕادێی، بە سەرسامییەکەت حاڵیم، وەلێ بڕوا بکە ئەوەی کاری لەسەر دەکەین، شایانی هەموو ئەمانەیەو زیاتریش.

بەدەم هێور بوونەوەم پێمگوت:

- ئەوە چییە کاری لەسەر دەکەین؟

بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

- نەتخوێندەوە؟

بەشەرمەزارییەوە بزەیەکم بۆ کرد، باری لەو کەسانەبوو کە زۆربلێ بوو، هیچ زانیارییەکی لەدەم دەرنەدەچوو کە هەقی من نەبێت، وەلێ بەپەرۆشی هاتنەکەم بوو، هەر پرسیارێکیشم لێ دەکرد، دەیگوت هەر بەخۆت دەیزانیت، لێی تێگەیشتم کە لێرە دامەزراوم، وەک جێگرەوەی کەسێک لێرە مردووە، کاتێکیش پرسیاری هۆکاری مردنەکەیم لێکرد، بزەیەکی بۆ کرد و سەری نەویکرد، گوتیشی کەمێکی تر هەموو شتێک دەزانیت.

دەستێوەردانکاریم دەیکوشتم، منیش گوێم بۆ زۆربلێییەکەی باری ڕاتێرابوو، کە هیچ مانایەکی نەبوو، دواتر گوتی:

- لازار نووکە با بۆ لای منداڵەکان بڕۆین.

بە ڕاڕەوەکاندا بردمی، بە ئەسانسوارێکی تایبەت بۆ نهۆمی یەکەم بەرز بووینەوە، ئەوجا لەبیابان بۆ گۆڕەپانێکی گەورە دەرچووین، بینایەک (هانگەر)ی گەورەی تێدابوو، هانگەر ئەو شوێنەیە کە فڕۆکەکانی تیا گرد دەکرێنەوە، وەک هۆڵێکی فرە زەبەلاح لە پلێت درووست کراو، تەنها لایەکی نەگیراوە، ئەوەی لەوێ بینیم، پێم لەدووی خۆم نەدەهات زیاتر بچمە ژوورەوە.

هەر کە دیمەنەکەم بینی، خەیاڵ بردمیەوە لای ئەو فیلیمانەی خەیاڵ ئامێز کە لەتاقیکردنەوە زانستییەکاندا شکستیان دەهێنا، لەناوەندی هانگەرەکە و لەسەرسوڕمانی چاوم و دڵەکوتەم لەم شوێنە کە حکومەتی ئەمریکی بەوپەڕی نهێنییەوە دەفرەی فڕیوی شاردووەتەوە.

لەسەر خۆ هەناگاوم بەرەو دەرگای هانگەرەکە دەنا، چاوەکانم کەمێک سەوادی تێگەیشتنیان پێدام، بۆ من لەپرتاوی ئەو نیمەنە واقی ورکردم، بەخۆمم گوت ئا ئەمەیە کە لێرەو لەوێ ئەو دەفرەی فرینانە دەرکەوتوون، ئەوە حکومەتی نەفرەتلێکراوە کە کار لەسەر پێشکەوتنی ئەم شتانە دەکات. تەماشای (باری)م کرد، ئەویش بزەخەنەیەکی گاڵتەجارانەی بۆ کرد و ئەو قسەیەی کە لەدڵما بوو بۆم دووبارە کردەوە:

- نەفرەت لەحکومەت هەر بەراستی خۆ ئەمانە دەفرەی فریون.

زیاتر نزیکەوەبووم، (ئەفرۆکار)م بیرکەوتەوە، یەکەمین دەفرەی فریوی کە حکومەتی ئەمریکی دروستی کرد، وا لە مۆزەخانەی فرۆکەوانی و فەزای نیشتمانییە، تاقیکردنەوەیەکی نیمچە سەرکەوتوو بوو، توانی چەند میترێک لە سەر زەوی بەرز بێتەوە، نووکەش ئەو ڤیدیۆیەم بیرماوە کە بۆ تاقیکردنەوەکە پەخشیان کرد، وەلێ بۆ بەرزی سەرکەوتوو نەبوو.

دڵم کرایەوە، کە لە دەفرەکە نزیک بوومەوە، شتێکی تازەبوو، لووس، زۆریش لە (ئەفرۆکار) جیاوازتربوو، قەبارەی مامناوەندی بوو، هەر بەقەد کوخێکی بچووک وابوو، لەگەڵ خۆم گوتم، ئەم حکومەتەمان هەندێ بابەت دێنێتە بەرهەم ناچێتە عەقڵەوە.

بۆ یەکەمجارم بوو دەست لە دەفرەکە بدەم، زۆر سارد بوو، یانی بەو مانایە دێت کە لەجۆرە کانزایەک دروست کرابێت، ئاخۆ حکومەت سەرکەوتوو بووە لە فرینی ئەم شتە؟

هەڵوەستەیەکم لەتەک خۆمدا کرد، بیرم کردەوە، مانای کۆپی تەکنەلۆژیا یانی چی، کە لە کاغەزەکاندا نووسیبویان، ئەوی پێیان دام تا بیخوێنمەوە؟ ئەگەر ئەوان دروستیان کردووە، ئەی بۆچی دەیانەوێ کۆپی تەکنەلۆژیای

بکەن؟ ئاخۆ دەفرەی فرییوە و وڵاتێکی تر دروستی کردووە، بۆ نموونە ڕووسیا دروستی کردبێت؟

لای سەرەوەی دەفرەکە لکێنەرێکی بچووکی پێوە نووسابوو، لکێنەرەکە ئاڵای نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکابوو، بەڵێ دەستکردی حکومەتەکەی خۆمانە. باری دەستی لەشوێنێک دانا، دەرگای دەفرەکە کرایەوە، ئیشارەتی بۆ کردم تا بچمە ناوی، بێ سێ و دوو چوومە ناو دەفرەکە، شتێک لەناو دەفرەکە ناخی هەژاندم، هەر بیرۆکەیەک دامهێنابوو، یا خەیاڵم بە داهێنانی دەکرد، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دروستی بکەم.

هەندێ جار لە شوێنێکدا هەست بە غەریبی دەکەی، هەست دەکەی ئەو شوێنەی دەیبینیت، هیچ پەیوەندییەکی بەو دیمەنانەوە نییە، کە پێشتر لەسەر هەمان خاک چاوت پێکەوتوون، ئەمە واتلێدەکات ترس و دڵەڕاوکێت تووش ببێت. هەوڵ دەدەم ئەوەی لەناو دەفرەکە بینیومە وەسپیتان بۆ بکەم، ئەم شوێنە بەر لەهەموو شتێک ڕەنگی تیا نییە، هەموو ئەوەی لەناو ئەو دەفرەدا بوو، یەک ڕەنگیان هەبوو، چون ئەوەی بەڕەنگی خۆڵە کەوە ڕەنگ کرابێت، وەک ئەوەی سواری ئەو شتە دەبێت هیچ پێویستی بە ڕەنگەکان نەبێت، بێجگە لەوەش بۆردی دووگمەکانیشی تێدا نەبوو، تەنانەت بۆ بینین شووشەشی بۆ نەکرابوو، دیکۆر و جوانکاری هەر نەبوو، چرای ڕووناکیشی تیا نەبوو، تەنها و تەنها سێ کورسی زۆر بچووکی منداڵانەی تێدابوو.

هەموو شتێک لەناوەوە چەماوە بوو، گۆشەی تێدا نەبوو،تەنانەت گەیشتنی کورسییەکانیش بە زەوییەکەیەوە مایەی سەرسوڕمانم بوو، دەتگوت ئەو دەفرە پارچە پارچە نییە تا لەیکدرابێت، چون ئەوەی یەک قاڵب بێت. ئەوەی سەرەنجی زۆر ڕاکێشابووم، یەک لەدیوارەکانی وەک ئەوەی ڕوون بێت، بۆ

خۆم لە ژوورەوە باری و کرێکارەکانی دەرەوەم لێوە دیاربوو، ئەوە دیوارێک نەبوو لە شووشە دروست کرابێت، لەکانزایەک دروست کرابوو، کێشەکە ئەوەبوو لە هەشتاکان شووشەی پێشکەوتوو بەو جۆرە نەبوو، قەبارەی ناوەوەی دەفرەکە بۆ قەبارەی کەسێکی کەڵەگەت شیاو نەبوو، ئەو شتە سەیرە بۆ ئەوە دروست نەکراوە بنیادەم بیبات بەڕێوە. خۆم لێهەڵماڵی لەکونێک بگەڕێم تا مەکینەکەی خوارەوەی ببینم، ئەوەش بەسەرهاتێکی ترە.

سێ شەشپاڵوو لەسەر شێوەی سێگۆشە لەدەوری شەشپاڵوویەک دانراون، هەر چوار شەشپاڵووەکە لەشتێک دروست کراون، قەد ڕۆژێک لە هیچ فرۆکەیەک نەمبینیوە، گوێم لە باری بوو شتێکی گوت، منیش ئەوەندەم بەسبوو لەناو دەفرەکە کە بینیم، لەمێشکمدا کۆمەڵێک پرسیار ڕسکا، لەو پرسیارانەی کە وەڵامێکی بە پەلەیان پێویستە، لەناو دەفرەکە هاتمە دەرەوە.

باری بە زمانێکی گاڵتەجاڕانەوە پێیگوتم:

- بەڕێز بۆب لازار چی دەبینی؟

زمانم تێکئالا، خەریکی ڕێکخستنی چاوێلکەکە بووم، هەموویان چاوەڕوان بوون چی دەڵێم، لەسەرخۆ گوتم:

- ئەم شتە.. پێدەچێت تاقیکردنەوە بێت، هیچ جیهازێکی تیا نییە، ڕەنگیشی بۆ جوانکاری تیا نییە، وەک ئەوە وایە ئەوەی دروستی کردووە کەسێکی پراکتیکییە، زەوقی هەر نییە، واش پێدەچێت تەکنەلۆژیای تازە بەدەستییەوە بێت، تاقی بکاتەوە.

باری گوتی:

- یا ئەوەی دروستی کردووە، دووربینتر بووە لە ئێمە.

- یانی چی، باری مەبەستت چییە؟

زۆر بەجیدی پێیگوتم:

- بوونەوەرە ئاسمانییەکان.

نیوچەوانم بەیەکادا و گوتم:

- باری لەو گاڵتانە گەڕێ، ڕاستییەکەم پێ بڵێ.

باری زۆر لەسەرخۆ گوتی:

- ئەوە گاڵتە نییە، هاوڕێیەکمان لە کارگەکەی هاوشانمان زانایەکی فیزیکی ئەتۆمییە (بۆشمان) سوێند دەخوات (بەدەر لەوەی زۆر نهێنییە) کە بوونەوەری ئاسمانی ئەو دەفرە فڕیوانەیان درووست کردووە، دەشڵێت ئەو بوونەوەرە ئاسمانیانە لەناوچەی 51 وان لە گەڵماندا و وەلێ ئێمە هیچمان بەچاوی خۆمان نەبینیوە، بەڵام ئێمە بە (منداڵەکان) ناوزەدیان دەکەین، هەڵبەت لە مانای ئەو نازناوە حاڵی بوویت، کە شتەکانی ناو دەفرەکەت بینی.

قسەکەی بە لامەوە زۆر ئاسان نەبوو، ویستم شتێک بڵێم، پێمگوت:

- باری.. گوتت دەفرەکان؟

بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- بەڕێز لازار تۆ دەفرەن، هەر یەکێکیان لەهانگەرێکی وا دان.

بەرلەوەی قسەیەک لەزارمەوە دەربچێت، دەستی بەدووگمەیەکدا هێنا، دەرگای پشتەوەی هانگەرەکە کرایەوە، دەرکەوت بە زنجیرەیەک هانگەری ترەوەن بەیەکەوە گەیەنراون، لە هەر یەکێک لەو هانگەرانە دەفرەیەک بە هەمان قەبارە و شێوەی جیاواز هەن، یەکێکیان لە کڵاوی قووتی بۆش دەچێت،

یەکێکی تریان لە قاڵبی جەڵی، تاقەتی وەسپی ئەوانی ترم نەما، بەو ئاوایەی ئەو دەم لەهۆش خۆم چووم.

*　　　*　　　*

بەسەر جێ و بانێکی کانزاییەوە پاڵکەوتبووم، بڕشتم تیا نەبوو، چون ئەوەی ماسوولکەکانی جەستەم لە جووڵە کەوتبن، دووان لەژوور سەرمەوە نووشتابوونەوە، سیمایان هیچیان پێوە دیار نەبوو، ڕووناکییەکی کزۆڵە و بێدەنگییەک ئەو ناوەی گرتبووەوە، بە جووڵەی سەریان پێدەچوو لە من بدوێن، وەلێ گوێم لەهیچ دەنگێک نەبوو، ئەودەم بیرم کردەوە بیستنم لەدەست دابێت، وەلێ بە ئاسانی گوێم لەلێدانی دڵم بوو، هەروەک چرکە چرکی کاتژمێرێکی بەدارەوە کراو، یەکێکیان لە دەم و چاوم نزیکەوە بوو، دڵم پەلەتر کەوتە لێدان، چاوەکانم زەق زەق کرانەوە، جەستەم چەندم کرد بیجووڵێنمەوە، توانام نەبوو، ترس بەتەواوی ئامبازم بوو، سیمای ئەوەی لێم نزیک دەبووەوە، دەم و چاوێکی ئاسایی نەبوو، کە زیاتر داچەمییەوە سەر سەرم زۆر بە ڕوونی چاوەکانیم بینی، ، ئیدی سیمایم نەبینی، چاوانێکی بریقەدار هەر وەک هەڵماتێکی کریستاڵی گەورەی ڕەش، نەتدەزانی سەیری کوێی بکەی، قووڵ هەر وەک دەریای ڕەش، نازانی چییە، وەلێ دەزانیت کە چاکەی بۆت ناوێ، ما بەرەنگاری ئەو چاوە بکەم، چاوم لێ نەپرووکاند، تا دەستی بۆ گەردنم برد، وەئاگ...

دەنگی بلەزی کردنەوەی دەرگاکە هەموو هەستەوەرەکانی بەخەبەر هێنامەوە، خەوێکی ناڕەحەتی نێو نووسینگەکە بەنێوچەوانمەوە دەرکەوت، (باری)م بینی بەخۆی و کۆمەڵێک کاغزەوە هاتە ژوورەوەو گوتی:

- بۆب.. وا پێدەچێت خەونێکی ناخۆشت بینیبێت، خۆت بەکارکردنەوە ماندوو کردووە، بەڵام مژدەت دەدەمێ، هەفتەیەک مۆڵەتیان پێداوین، دواتر دەگەڕێینەوە.

بە چاوێلکە لارەکەی چاوم تەماشام کرد، ویستم خۆم ڕێکبخەم و چاوێلکەکەی چاویشم ڕاست بکەمەوە، باری دیقەتدانەکەی کزی پێوە دیاربوو، گوتی:

- بەم بۆنەوە، هەر ئێستا دەرئەنجامی شیکارەی ماددەکە هات، کە لەناو مەکینەی دەفرەکە بەدییان کردووە، باوەڕ ناکەی چییان دۆزیوەتەوە، بەخۆت تەماشای بکە.

کاغزەکەم لەدەستی وەرگرت و چاوم پیاخشاند، ڕاستەوەبووم و لەسەر پێ وێستام، باری.. ئەمە مەحاڵە. باری گوتی:

- بینیت.. ئەوە (115)یە.

ڕووم لەکاغزەکە وەرگێڕا، بیرم دەکردەوە، توخمی 115 توخمێک نییە ئەو ژمارە زۆرەی ئەتۆمی هەبێت، چونکە جارێ نەدۆزرابووەوە، تەنانەت ئامادەکردنیشی مەحاڵ بوو، توخمێکی ناجێگیر و خەتەرناکە. لەهەشتاکان ئەم توخمە هەر بیری لێ نەکرابووەوە، تا ئامادەی بکەن، مرۆڤایەتی سەرکەوتوو نەبوون لە ئامادەکردنی تا 2003 بە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە چەند ئەتۆمێک کە تێچوویەکی زۆر زۆری دەویست، بیرۆکەی ئەوەی مەکینەیەک لە هەشتاکان بەکار بێت بە توخمی 115 و جێگیر بێت و بە ڕێژەیەکی زۆریش کە بشێ وەک سووتەمەنی ئەوە هەر زۆر مەحاڵ بوو.

لەو ئان و ساتەدا مارلیۆنی هاتە ژوورەوە، بە زمانی نزیک لە زاراوەی مارینزەکان گوتی:

= باری.. پێنج خولەکی تر لەگەڵ بۆب بێن بۆ هانگەر، تاقیکردنەوەی سێیەمی فڕین بۆ دەفرەکە دەکرێت.

مارلیۆنی بە پەلە ڕۆیشت، باری دەستی بە گردکردنەوەی شتەکان کرد، تا بچینە دەرەوە بۆ هانگرەکە، لەچاوانمەوە حەزم بە لووت ژەنینی نۆخەکە بوو، مارلیۆنی بە دوو کرێکارەوە بەرامبەر دەفرەکە وەستابوو، باری لێی چووە پێشەوەو دەرگای دەفرەکەی کردەوە، سەرمسوڕما بەخۆی دەفرەکە لێدەخوڕێت، هەزارجار لەخۆمم پرسی چۆن کەسێکی بەساڵاچوو دەتوانێت ئەو دەفرە لێبخوڕێت، هەڵبەت لەسەر چینچک بۆی دادەنیشێت.

بە پەرۆشەوەی بینینی ئەو شتە سەیرە بووم، کاتێک بەرز دەبێتەوە، گوێی لێ ڕادەگرم، هەر هەموو هەستەوەرەکانمی لێ دەخەمە کار ، لەپڕ دەفرەکە بەرزەوە بوو...

هەموو ئامێرێک لەم دنیایە کاتێک کاری پێدەکرێت دەنگ دەردەکات، ئاخر هەموو مەکینەیەک دەنگ دەردەکات، ئەویش بەوای جووڵەی بەشەکانی مەکینەوە، بەوای سووتاندنی سووتەمەنییەکەیەوە دەنگ دەردەکات، مەکینەی فرۆکەکان تا بەرز دەبنەوە ئەرکێکی زۆر بەکار دێنن، وەلێ ئەو شتە بەرزەوە بوو، دەنگێکی وەک چپاندنی دەرکرد، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، دەرکەوتنی خەرمانەی شینی بازنەیی لەژێریەوە، دوای چەند چرکەیەک ئەو خەرمانەیەش نەما، بۆ ئەوەی لە خەیاڵتا بڕسکێت، بزانە باس لەشتێک دەکەم بەقەد کوخێکە، بێدەنگ لەسەر زەوی بەرز دەبێتەوە.

مارلیۆنی لەگەڵ باری لەڕێی سورەیاوە قسەیان دەکرد و دەفرەکەش بە شێوەی ستوونی بەرز دەبووەوە، تا بەتەواوی بەرزەوە بوو، ئەوجا مارلیۆنی لای لێ کردمەوەو گوتی:

- بۆب.. وەرە شتێکت پیشان بدەم.

دووی کەوتم، چەند هەنگاوێک بەڕێکەوتین، ڕێک بە ژێر دەفرەکەوە وەستاین، سەرم هەڵبڕی، جوێن ئاسا شتێک لەدەممەوە دەرچوو، سەرم تەکاند و جارێکی تر سەرم بڵند کردەوە، چەندین نەفرەتم لەحکومەت کرد، ئەو دەفرە بەتەواوی ون بوو، چون ئەوەی هەر نەبووبێت، مارلیۆنی دەستی گرتم و چەند هەنگاوێک دوور کەوتینەوە، ئەوجا بۆ ئەوەی تەماشای ئاسمان بکەم، بەدەستی ئیشارەتی بۆ ئەو شوێنە کرد، بەتەواوی سەرسام بووم، کاتێک دەفرەکەم بینی لەشوێنی خۆی بەحەواوە وەستاوە، بەتەواوی واقم وڕما، مارلیۆنی گوتی:

- لازار.. ئەوان هێزی کێشکرن درووست دەکەن.

چاوەکانم ئەبڵەق بوون، لەگەڵ تەماشا کردنی دەفرەکە لێوی خۆم گەست. لەدۆخی زانستی کە ئێمە لەهەشتاکانەوە لەسەری کۆکین، کە تا ئەمڕۆش لەسەری ماوین، هێزی کێشکردن شتێکی نەزانراوە، وەلێ لەتەنی زەبەلاح دەردەچێت، وەک هەسارەکان، پێویستە بارستاییەکی زۆر زۆر گەورەی هەبێت، تا ئەو هێزی کێشکردنەی لێ پەیدا بێت، خۆ ئەگەر بتەوێت بەو قەبارە بچووکەی خۆت ئەو هێزی کێشکردنە درووست بکەیت، ئەوە لەدەرەوەی سنووری زانستە زانراوەکانی ئێمەن، ئەو شتە نەک هەر لە درووستکردنی هێزی کێشکردن سەرکەوتوو بوو، دەتوانێت دەستیشی بەسەرا بگرێت، دەبێتە دژە هێزی کێشکردنەکەی زەوی، زۆر بە ئاسانی بەکاری دەهێنێت.

مارلیۆنی کە بردمیە ژێر دەفرەکە تا بەچاوی خۆم ببینم، ئەو شتە هێزی کێشکردن لەژێرەوەی درووست دەکات، هەر ئەو هێزی کێشکردنە هەموو

شتێک بەلادا دێنێ، تەنانەت شەپۆلەکانی ڕووناکیش، کە بۆ بینین لە ژێریەوە پێویستە، دواتر کە لەبنیەوە دوور دەکەویتەوە و لە لاوە دەیبینی ئەو کێشە نییە، لەبەر ئەوەی مەکینەکەی ژێریەوە ئەو هێزی کێشکردنە درووست دەکات.

مارلیۆنی جگەرەیەکی هەڵکرد، تەماشایەکی دەفرە فڕیوەکەی کرد و گوتی:

- لە دۆخی سرووشتیدا دەبێت لە دواوە شتێک دەربچێت تا ببێتە پاڵنەر بەرەو پێشەوە، هەموو مەکینەکان بەو شێوەیە کار دەکەن، وەلێ ئەمە زۆر جیاوازترە کە دەیبینم، ئەم شتە بە حەواوە بەوای دەورووبەرەکەیەوە خۆی کۆنترۆڵ دەکات، چون ئەوەی دەورو بەرەکەی بۆی داچەمێتەوە، کارەکە وەک ئەوەی تۆپێکی بۆلینگ لە ناوەڕاستی سەرینەکەت دابنێیت و دواتر بە مستت فشار بخەیتە لێواری سەرینەکە، بەو شێوەیە تۆپەکە بەرەو لار بوونەوەی سەرینەکەی لای دەستت شۆڕ دەبێتەوە، ڕێک هەر ئەوەیە مەکینەکە درووستی دەکات، داچەمینەوەیەک لە بۆشاییدا درووست دەکات، وا دەکات دەفرەکە بەرەو لای دەجووڵێتەوە، ناتوانیت چەمانەوەیەکی وا درووست بکەیت بە بێ هێزی کێشکردن.

دەفرەکە بە حەواوە کەوتە جووڵە، بینیم بۆ ئەوەی بجووڵێتەوە، دەبوو خۆی لار بکاتەوە تا بەرەو دژە لاکەی تری بڕوات، ئەمە حاڵی بووین، مەکینەکە لە لای خوارەوەی دەفرەکە هێزی کێشکردن درووست دەکات، دەفرەکە بەرەو ئاراستەی بەرامبەر دەجووڵێنێت، ئەگەرچی وای دەگێڕمەوە تا بۆتانی ئاسان بکەم، بینینی شتێکی وا لەڕاستیدا هەستێکت پێدەدات کە ئێمە چەند

دواکەوتووین، بەو مەکینە زەبەلاحانە کەدەنگێکی زۆر گەورە دادێنێت و سووتەمەنییەکی زۆریش سەرف دەکات، ئەگەر ڕۆژێک توانیمان ئەو هێزی کێشکردنە دروست بکەین، دەتوانین هەموو شتێک بکەین، گشت ئەو شتانەی لەخەیاڵی زانستیدا هەیە دەبێت بە ڕاستی، مرۆڤی ئاسایی دەتوانێت بفڕێت، یا دەست درێژ بکات و شتێک لە دوورەوە بەدەست بگرێت.

ترسەکە لەوەدایە ئەگەر توانیت هێزی کێشکردن دروست بکەیت، ئەوا دەتوانیت کاریگەریت لەسەر کاتیش هەبێت.

چاوم لێبوو زۆر لەسەرخۆ دەفڕەکە نیشتەوە، باری ڕاستی فەرموو، ئەو شتە دەستکردی سەر زەوی نییە، ئەو تەکنەلۆژیایە هی خەڵکانی سەر گۆی زەوی نییە، بەو زانستەش مەحاڵە بگەن، مەگەر دوای سەردەمانێکی تر، یانەخۆ بەر لەوەی بەو زانستە بگەن زەوی لووشیان بکات.

باری لە ناو دەفڕەکە دابەزی، بەدەم ڕێوە لەتەک مارلیۆنی کە بەرەو کارخانەکە دەڕۆیشتن قسەیان دەکرد، منیش بەدوویانەوەبووم، وەختەبوو مێشکم لە بیرکردنەوەدا بتەقێت.

کە بەڕێوەبووم، چاوم لەیەکێک لە کارخانەکان بوو، دەرگاکەی کرابووەوە، شتێکم بەرچاو کەوت، وایلێکردم هەڵوەستەیەک بکەم، دوو کرێکار بە جلی سپییەوە بەدەم قسەکردنەوە دادەچەمینەوە، چون ئەوەی قسە لەتەک بوونەوەرێکی بچووکدا بکەن، بوونەوەرێک لە کەلێنی نێوان هەردوو کرێکارەکە بەشێک لە جەستەی دیاربوو، هەناسەبڕکێیەکم تێکەوت و پاشەو پاش کشامەوە، ئەو دوو کرێکارە قسەیان لەتەک ...

هەناسەبڕکێکەم دەنگی دەرهات، دوو کرێکارەکە بە سەرسوڕماوییەوە ئاوڕیان لێ دامەوە، منیش چون ئەوەی سەراسۆی بوونەوەرەکەی پشتیان بکەم،

چاوم لێ نەبڕین، ئەوجا بەخۆما هاتمەوە، دەستم نایە سەر سەرم و بۆ گەمژەیی خۆم دەبوو ئاسایی ببمەوە، ئەو دوو کرێکارە گەمییەیەکیان بە قەبارەی منداڵێک درووست کردبوو، لێی داچەمیبووەنەوەو لەتەک یەکا قسانیان دەکرد، هیچ قسەیەکم لەتەکیانا نەکرد، ڕووم بەرەو دوا وەرگێڕاو کەوتمە ڕێ، بەدەم ڕێوە بۆ خۆم گەلێک جوێنم بەدزییەوە دا، هەستم کرد جوێن زۆر دەدەم، ئەوەش هەر لەتەک خۆمدا جوێنەکانم دەدا، لەڕاستیدا ئەو شتە گەورەترین شتە لەم دنیایە لەڕووداندایە.

چەند مانگێک تێپەڕی من لەو شوێنە کارم دەکرد، توانیمان مەکینەکە لەدەفرەکە جیا بکەینەوە، پارچە پارچە خوێندەوەمان بۆ کرد، ئەگەر ویستت دەس بۆ شەشپاڵووکە بەریت، ناتوانیت دەستی بەیتێ، وەک دوو جەمسەری لەیەکچووی موگناتیس لەیەک دوور دەکەوتنەوە، لەناو دەفرەکە هیچ وایەرێکی تیا نەبوو، ئەمە واتلێدەکات چون ئەوەی لە سەردەمی ناوەندا بژێین، ئێمەش لەشێوێکی هەزار بەهەزاری نەزانیندابین، بابەتەکە وەک ئەوە وایە بۆمبێکی ئەتۆمی ببەیت و لەبەردەم خەڵکانی ئەو سەردەمە سەرەتاییانە دابنێیت، چاویان بەو وزەیە دەکەوێت لەتەقینەوەیدا، کە لێی نزیک دەبنەوە دەمرن، ئەوەی لێرەیە هەمان لێکچوونە، ئێمە هیچ بیرۆکەیەکمان دەربارەی فیزیک نییە، کە لەژێر ئەو دەفرەوە ئیش دەکات، وەلێ ئەوەی مایەی ترس بوو، ئەو کەسەی بەر لەمن لەو کارخانەیە بوو، دواتر من هاتم و جێگاکەیم گرتەوە،

ئەو کەسە مرد، مردنەکەشی بەوای مامەڵە کردنی بوو، لەتەک یەک لەو مەکینانەی دەفرەیەک لەو تۆ دەفرەی هەبوون.

ئەوەی لە ناوچەی 51 تێبینیم کردبوو، ئەوان هەموو شتێکیان دەشاردەوە، ئاسایی بوو کۆمەڵێک زانا کار لەسەر دۆزینەوەی شتێکی وەک ئەوە بکەن، هەفپەیڤین کراوە بوو، وەلێ پرسیار کردن لێرە قەدەغەیە، بەهەرحاڵ تەنها (باری)م بەدەستەوەبوو قسەی لەگەڵ بکەم، مارلیۆنی زۆر کەم دەمانبینی، خشتەی کارکردنمان دەبوو دە ڕۆژ کار بکەین و دواتر مۆڵەتی دە ڕۆژیان پێدەداین بگەڕێینەوە ماڵەکانمان، بەدڵنیاییەوە نەدەبوو بەهیچ شێوەیەک باس لەوە بکەین چیمان لە ناوچەی 51 بینیوە، لە (باری)یەوە تێگەیشتبووم، تەلەفۆنی ماڵەوەمان لەژێر چاودێریدابوو، بێ شک بووم کە خەڵکانێک چاودێریان دەکردین.

دوای شەش مانگ بیرۆکەیەک لە هزرمدا هاتبووە جۆش، لەناو فڕۆکەدابووم بۆ لاس فیگاس، بیرۆکەکە بەمێشکمدا هات، ئەوەی لە ناوچەی 51 ڕوو دەدات، تاوانێکی زانستییە بەرامبەر کۆمەڵگای زانستی، کە شتێکی وا بزانیت و لە بەشەرەکانی بشاریتەوە، تەنها کۆمەڵە خەڵکێک پێی بزانن و قسە و باس لەو شتە قەدەغەیە، حەتمەن دەرئەنجامەکەی زیندانییە، کێشەکە ئەوەیە من لەو کەسانەم کە خاوەن بیرو باوەڕی خۆمم و مەحاڵە دژ بە بیرو باوەڕی خۆم کاری نەشیاو بکەم، بیرۆکەکەی مێشکم زۆر خەتەر ناک بوو، پێویستبوو دونیا بەهەموو شتێک بزانێت، بۆیە دەبوو هەموو شتێک باس بکەم.

لە ماڵەوە تەماشای هاوسەرەکەم کرد، بەو شێوازەی کە پێمخۆش بوو چەندین ساڵە چۆنێتی خۆی نەگۆڕیوە، بڕیارمدا هەموو شتێکی بۆ باس بکەم، هەر واشبوو، بیرمە لەتەک هەر گێڕانەوەیەک کە باسم دەکرد، هەڵچوونی

ڕوخساریم دەبینی، ئەویش وەک من سەر بەکۆمەڵگای زانستی بوو، مەحاڵبوو هاوسەرەکەم  بە هەر شتێک سۆزی بورووژێنرێت، ئاخر ئەو دڵنیابوو هەموو شتێکی بینیوە، بیرمان کردەوە  (جۆن لیر)ی هاوڕێمانی لێ ئاگادار بکەینەوە، هەر بەڕاست چووین تا ئاگاداری بکەینەوە، وەلێ ئەو وەک هاوسەرەکەم پەرۆشی بۆ نەبوو، ئەو دوودڵبوو، پێمگوت لەوێ خشتەیەک بۆ تاقیکردنەوەکانی فڕینی ئەو دەفرەانە لەو ناوچەیە هەیە، ئەو تاقیکردنەوانەش هۆکاری ئەوەن بە ئاسمانەوە دەرکەون، خەڵکانێک سوێندیان خواردووە کە بەچاوی خۆیان ئەو دەفرە فڕیوانەیان بینیوە، وەلێ کەس باوەڕیان پێ نەکردوون.

هەر بەڕاستی خشتەی تاقیکردنەوەی فڕینی دەفرەکانم بینیبوو، ڕۆژانی چوارشەممە دەفرەکانیان دەفڕاند، ئەویش بەوای ئەوەی ڕێگای تەنیشت ناوچەی 51 چوارشەممان کەمترین قەرەباڵغی بوو، بە باوەڕێکی تەواوەوە خۆم و هاوسەرەکەم و (لیر)ی هاوڕێم دوای نیوەشەو بەڕێکەوتین بۆ ئاوایی (ڕاتشێل) کە نزیکترین شوێنە لە ناوچەی 51، لەوێشەوە ڕێگای بیابانمان گرتە بەر تا ئەو شوێنەی خۆم دەمزانی، شوێنێکی زۆر خەتەر بوو، لەبەر ئەوەی ناوچەیەکی خەتەری سەربازی بوو، تەنانەت هاوسەرەکەم ترس دایگرت، کاتێک تابلۆیەکی بینی لەسەری نووسرابوو، بۆ ئاگاداری ناوچەیەکی سەربازییە، هەر کەسێک بیەوێ ئەم ناوچەیە ببڕێت، گوللە باران دەکرێت، ئەو شوێنەی من مەبەستم بوو، لەودیوی ئەو هێڵەوە بوو، وەلێ نزیکبوو بۆ بینینی دەفرە فڕیوەکان.

لەسەر زەویەکە دانیشتین، هاوسەرەکەم کامێرا تایبەتەکەی خۆمی هێنابوو، بۆ وێنەو ڤیدیو گرتن.

چەند کاتژمێرێک تێپەڕی، بەدەم تەماشا کردنی ئەستێرەکانەوە ڕاهاتین، لەپڕ بە چرپە گوتم:

- بڕوانن، ئەوە دەفڕە نەفرەتەکەیە.

پریشکێک ڕووناکی دەرکەوت، ئەگەرچی ئەو دەفڕە هیچ ڕووناکیەک دەرناکات، وەلێ تیشکی مانگە شەوەکە بەسەر دەفڕەکەوە تیشکەکەی دەدایەوە، لە ئاسمانا وەک تەنێکی ڕووناک دەرکەوت.

هاوسەرەکەم کامێراکەی دەرهێنا و دەستبەجێ کەوتە وێنە گرتن، جۆن لیر خۆی ئامادە کرد بەرپەرچی شتێک بداتەوە، ئەو بەو بەرپەرچدانەوانە ڕاهاتبوو، وەلێ وەستا و بێدەنگبوو، تەماشای تەنە فراوەکەی دەکرد، ئەوە شێوازی فڕینی فڕۆکەی زەوی نەبوو، تەنە ڕووناکەکە بە ستوونی بەرزەوە بوو، ئەوجا لارەوە بوو، تا بە پێچاو پێچی بگەڕێت، کردارەکە وەک ئەوە وابوو، لایتێکی لیزەریت پێبێت و بۆ گەمە کردن، ئەوسا بە ڕاست و چەپ تیشک بهاویت، هیچ شتێک نییە وەها بفڕێت.

هەموو شتێکمان وێنە گرت، ئەو وێنە گرتنە گەورەترین بەڵگە بوو بۆ ڕاستی قسەکانم، وەلێ دڵمان بەو کارە زۆر خۆش نەبوو، لەنێو تاریکی شەوەکە و دەوروبەرمان، کە لە کلی چاوان دەچوو، تیشکێکی سەوز چاومانی داپۆشی، هاوسەرەکەم لەترسا هاواری لێ هەستا، لەهەموو لایەکەوە پاسەوان بە دووربینی شەوانە و چەکی قورس ڕوو بە ڕوومان وەستانەوە، چەند چرکەیەکی نەبرد باڵبەستیان کردین، بەرەو نزیکترین خاڵی سەربازی بۆ پاسی ناوچەی 51 بردینیان، لەوێ دەم وچاوێکی گرژم بینی، کە هیچ ڕۆژێک حەزم پێنەبووە، دەم و چاوی مارلیۆنی.

* * *

- بۆب لازار.. هەی نەفرەتی، ئەی ئەو کەسەی ناتوانێت نهێنی ئاسایشی نیشتمانی بپارێزێت، کەچی ئێمە نهێنی پارێزین.

تەماشای (مارلیۆن)م کرد، ئەویش ئەو قسانەی دەقۆستەوە، منیش هەوڵم دەدا لێی تێبگەم، وەلێ لەو کەسانە نەبوو لێت گەڕێ بیر بکەیتەوە، ڕووی لە هاوسەرەکەم بوو، گوتی:

- بە درێژایی چەند مانگێک بەردەوام چاودێری تەلەفۆنەکەتمان دەکرد، گوێمان لە هەموو ئەو قسانە بوو، کە ژنەکەت و یەکێک لە هاوڕێ خۆشەویستەکانت دەیانکرد، دەزانی قسەی سیکسبازی بەدزییەوە چێژێکی تری هەیە.

دڵم وەختەبوو بوەستێت، مارلیۆنی تەماشای جۆن لیری کرد و گوتی:

- مەپەشۆکێ، جۆن لیر نییە، ئەو بێ تاوانە، ئەوەی باسی دەکەم (دینیس)ە.

هەندیجار فرمێسکی گەرم تاکە شتە دەتوانێت گوزارشت لەناخت بکات، لەو کەسانە نیم زوو هەڵچم و قسەی قۆڕ بکەم، ئەگەرچی ئەوەی مارلیۆنی هەڵیدا ڕوحمی دوو لەت کرد، تەنانەت بە سەرسوڕماویشەوە دیقەتی هاوسەرەکەم نەدا، ڕەنگە بەشایانی ئەوەشم نەزانیبێت لای لێ بکەمەوە، دانم بەخۆمدا گرت، لەوە باشترم پێ نەبوو تا خۆم بخەمە توونی زیندانەوە، ئەوەی زیاتر سەری پێ سوڕ کرد، دواین قسەی بوو:

- هەر هەمووتان دەردەچن و دەچنەوە ماڵی خۆتان، ئەگەر زاتی ئەوەتان کرد ئەوەی لێرە زانیتان بەوای ئەم خۆفرۆشەوە، چاک بزانن و بیکەنە گوارە

لەگوێتان، حکومەتی ئەمریکی لەزیندانێکتان دەنێت، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک جەستەتان بۆگەن دەکات.

دوای ئەو شەوە لەیەک دابڕاین، هاوسەرەکەم هیچ وشەیەکی لەمنەوە نەبیست، تەنها کەل و پەلەکانم کۆ کردەوەو دەرچووم، بۆ خۆم بەرامبەر ئەو مرۆڤە (هاوسەرەکە)م هیچ ناپاکییەکم نەکردووە، ئەگەرچی بەردەوام دڵی لێ پیس کردبووم، وادیارە ئەو کەسەی دڵی پیسە بۆ خۆی خیانەتکارە، بۆ ئەوەی خیانەتەکەی خۆی بشارێتەوە،دڵی لەمن پیس کردبوو.

برۆکانم بەوای خەمەوە قورس بوو بوون، کێشەکە لەهێنانی زانیاری نییە، بەرگەی بگریت کاتێک پێی دەزانیت، هەڵگرتنی نهێنییەکی وا مرۆڤ خەمبار دەکات، کاتێک مرۆڤەکان دێن و دەڕۆن ڕاستییەکان نازانن، زاناکان لە کۆنفرانسەکان گرد دەبنەوە و خەڵات دەکرێن، بێئاگان چی لەودیوی زانستەکان دەکرێت.

ئەوەی تێیگەیشتووم، ئەوی کە بە ناوچەی 51 دەزانن، کۆمەڵێکی کەمن لە ئەمریکا و پۆستی هەرە باڵاشیان لەناو دەسەڵاتدا هەیە، تەنانەت ئەوانەش کە لەناو ناوچەی (51)کن هیچ نازانن، ڕەنگە سەرۆکیش بزانێت یا نەزانێت، دووریش نییە هەندێ زانیاری کەم بزانێت.

ئەو نهێنییەی باری قورس کردووم، زۆرێک لەتەکنەلۆژیا ئاشکرا نەکراوە و شاردراوەتەوە، تا کەسیتر پێی نەزانێت. کاتێک (تێسلا) ویستی کارەبای بێ تەل دابهێنێت، بەرەنگاری زۆری بیرۆکەکەیان کرد، بەو ئاوایەی دژ بە بەرژەوەندی کەسانی بەرژەوەندخوازە، کارەبای بێ تەل کاتی نییە، (تێسلا)ی شرو شێت دەیویست کارەبا لە (با)وە وەرگرێت، ئاخر خاوەن پارەدارەکان چۆن خوێنی میللەت بمژن.

له ماڵەوه بەدوای ناسنامەکەم گەڕام، نەمدۆزییەوه، کاتێک ویستم دەریبهێنمەوه، کەڵله ڕەقیان نواند بۆ دەرنەکردنی، ئەوان دەیانویست لەسەر گۆی زەوی بمسڕنەوه، کاتێک قسەم لەگەڵ کۆمپانیای لۆس ئالامۆس کرد بۆ گەڕانەوەم، گوتیان کەسێک بەناوی بۆب لازارەوه ناناسن.

ڕۆژێ له ڕۆژان ئەو نهێنییه که ببوو به بار گرانی بەسەرمەوه، له کابینەیەکی گشتییەوه زەنگم بۆ هەموو ئەو کەسانه کرد، که پەیوەندیان لێلمدا قەدەغه کرابوو، دەبوو لەو کاتەدا قسه لەتەک (جۆرج ناب) بکەم که بەناوبانگترین ڕاگەیاندکاربوو، لەو کەسانه بوو گوێی به حکومەت نەدەدا.

جۆرج زۆرترین کەسێکی گوماناوی بوو، وەک خۆی دەڵێت، گوێی لەقسەو قسەڵۆکی بێ مانای لەمەڕ حەواییەکان بووه، ئەو خستمیه سەر ئامێرێکی ئاشکراکردنی درۆوه، دڵنیابوو هەرچیم گوتووه ڕاستی بووه، من دەمزانی ئاژانسی شێواندنی زانیارییەکان هەن، ئەو ئاژانسانه بەردەوام چیرۆکی گەوجاندن لەمەڕ حەواییەکانەوه دادەهێنن، تا مێشکی خەڵکی به گەمژەیی بهێڵێتەوه.

چیرۆکەکەم بەتەواوی بۆ جیهان گێڕایەوه، هەرچی ڕاستی بوو ئاشکرام کرد، ئیدی چییان لەدەست دێ بیکەن، خۆ من هەر سڕاوەمەتەوه، بەو ئاوایه قەیرانێکی ڕاستەقینەم نایەوه، ئاوایی (ڕاتشێل) بوو به مەزارگەیەکی گەشتیاری، ئەوانەی حەزیان بەحەواییەکان بوو، لەهەموو لایەکەوه دەهاتن و چەندین ڕۆژ دەمانەوه، تا ئەو دەفره فڕیوانه ببینن، که من باسم لێوه کردبوو، هەندێ ئاژانسی ڕاگەیاندن واتەواتیان بڵاو کردەوه، که من دەجاڵم و قەحپەخانه بەڕێوه دەبەم و بازرگانی به دەرمانی هۆشبەرەوه دەکەم، گشت ئەوانه بۆ ئەوه دەیانکرد تا خەڵکی باوەڕ به قسەکانم نەکەن، وەلێ دەمزانی

ڕاستی قسەکانم دەگەیشتە هەموو دڵێک، ئەوەی کە گوتووبووم ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگربوو.

ڕاستی قسەکانم دوای چەند ساڵێک دەرکەوت، توانیان توخمی 115 بدۆزنەوە، کە بە مۆسکۆفیوم ناویان برد، ئامێری سکانەری ناولەپیشیان دۆزییەوە، کە پیوانەی قەبارەی ئێسک دەکات، تەنانەت لۆس ئالامۆس ئەوانەی نکۆڵیان کرد کە پەیوەندییان بەمنەوە هەبێت، بەرامبەر بە دونیا ئەو ژمارەی ڕۆژنامەییەیان دەرهێنا، کە وێنەکەم بەسەر لاپەڕەی یەکەمەوەیەو بە بۆنەی منەوە ئاهەنگ دەگێڕن، وەلێ ئەو تەکنەلۆژیایەی کە باسم کرد، دوا قسەتان بۆ دەگێڕمەوە: ڕۆژێک دێت ئەم جۆرە تەکنەلۆژیایە تەنها سەربازی نابێت، کە تەنها فڕۆکەکان دروست بکات، بەڵکو لە هەموو ماڵێک دەبێت، بەڵێ، شتەکان لەدوورەوە جووڵەیان پێدەکرێت، وەک چۆن کەناڵەکانی تەلەفیزۆن دەگۆڕین، لە (حەوا)شدا بەرز دەبینەوە، ئەویش بە ئامێری سادە، وەلێ لێگەڕێ با جارێ لە سووتەمەنی تێر بن، ئەو پارەیەی لە سووتەمەنی کۆی دەکەنەوە، دواتر گشتی لەپێناو ئەو تەکنەلۆژیایە سەرف دەکەن، دوور نییە ئەوەی داهاتووی دوای من ئەوە بەچاوی خۆیان ببینن.

❊ ❊ ❊

بۆب لە قسەکەی بووەوە، دەستی بۆ چاوێلکەکەی برد تا ڕاستی بکاتەوە، وەک ئەوەی لە چاوانی خەڵک خۆی بدزێتەوە، هەندێ لەو خەڵکە بەچاوێک تەماشایان دەکرد، چون ئەوەی خودی ئەو حەواییەکە بێت، گوێم بە بابەتی حەواییەکان نەدەدا، تا چاوانی ئەو خەڵکەم بینی چەند بەپەرۆشەوەی بینینی

حەواییەکان بوون، شارلۆتان بەدەم کشانەوەی بە کورسیەکەیەوە بۆ دواوە، گوتی:

- دەفرەی فڕیو تایبەتە بە حەواییەکان، وا بەدەست حکومەتەوەیە، تۆش ئاشکرات کرد، ئەوانیش لێت گەڕان، ئەتەوێ ئەوە بڵێیت؟

لازار بەرپەرچی دایەوەو گوتی:

- من بەتەواوی نازانم ئەو دەفرانە تایبەت بە کێیە، لەبەر ئەوەی بوونەوەری حەواییم لەوێ نەبینی، وەلێ دەڵێم ئەو تەکنەلۆژیایە لە شوێنێکی ترە و پەیوەندی بە بەشەرەوە نییە، ئەگەر حەواییەکان دروستیان نەکردبێت، کەواتە حکومەتی ئەمریکی دروستی کردوون، ئەوەش تاوانێکی گەورەیە و بەو شێوەیە زانست قۆرخکاری دەکەن و دزەی بۆ ناو خەڵکی پێدەکەن، ئەویش لەرێی بەرژەوەندی گەورەکانەوەیە، بەداوای لێبووردنەوە، کێ پێیگوتی وازیان لێ هێنام؟

شارلۆتان چاوەکانی لێ کز کرد و گوتی:

- بۆ خۆت گوتت هەڕەشەیان لەسەر ئەوە لێکردی، وا نەبوو؟

لازار بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

- دوای لەپڕ دەرکەوتنم، ئەوان شڵەژان و سەریان لێ شێوا، دوای چەند ڕۆژێک لە پەخشکردنی ئەڵقەکە، تایەی پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکەمیان تەقاند، تا ئۆتۆمبێلەکە وەرگەڕێت و بمرم، تا مردنەکەشم قەزا و قەدەر بێت، دواتر لێم گەڕان، بینییان کوشتنم دەمکات بە پاڵەوانێکی نەتەوەیی، ئەوەش دژی ئارەزووەکانیان بوو، پێیان باش بوو لەنێو خەڵکی هەر بە گەمژەیی بمێنمەوە .

ئەو جوولەکە ڕیشدارەی چاو دەرپۆقیو لێی پرسی:

- دەڵێیت شاردنەوەی دەفرەکان تاوانکارییە، ئاخر بۆچی دەبێت تاوانکاری بێت؟ هەقی خۆیانە نهێنی سەربازی بێت، وەک دەزانیت، ئەوەی زۆرترین خۆی پڕ چەک کردووە، ئەو براوەیە.

لازار گوتی:

- ئەوە نەک هەر تاوانە، تاوانێکی قیزەونیشە، لەبەر ئەوەی پرسیارەکە بوونگەراییە" هەر ئێمە بەتەنها لە گەردووندایین؟" ئەوە لە پرسیارە گەورەکانە، ئەگەر کەسانی تر هەبن وەڵامی ئەم پرسیارە بزانن و بیشارنەوە، ئەوە تاوانیان کردووە.

ئەوجا من لێی هاتمە دەنگ و گوتم:

- تۆ گوتت زۆرێک لەو ناوچەی 51 کار دەکەن، تەنها تۆ پاڵەوانی ناویان بۆیت و قسەت کرد؟ ئەی ئەو سەدان کەسەی تر لەکوێن؟

بۆب لێوی خۆی گەزی و گوتی:

- هەر کرێکارێک لە حەوزی تاوانکاری هەموو مانگێک دەرزییەکی لێ دەدەن، ئەوەی ڕاستی بێت، ماددەی ناو دەرزییەکە تووشی وڕینەیەکی کاتی دەکات، دواتر دەیترسێنن، ترساندنێکی تۆقێنەر بەدەم خەوەوە، کە بە ئاگا دێتەوە، هیچی بیر نامێنێت، وەلێ ترسی لە قسەکردن و ئاشکرا کردنە، ئەوەش گەمەیەکی قێزەونە بەکاری دەهێنن، زۆر خۆم لە ئاشکرا کردنی نهێنی پاراست، تا گەمەکەیانم دۆزییەوە، دەرزیم بە ماددەیەکی دژە ماددەکەی ئەوان لەخۆم دەدا، بێ ئەوەی هەست بکەن.

شارلۆتان بە مست کێشای بەسەر مێزەکەو گوتی:

- با وابێت، بەم شێوەیە دانیشتنی یەکەممان کۆتایی پێ هێنا، دەعوەتی چا خواردنەوەی ناو باخچەکەتان دەکەم، کەشەکەی سیحراوییە، با بڕۆینە خوارەوە، فەرموون.

ئامادەبووان هەستان و بەرەو خوارەوە بەڕێکەوتن، منیش هاوشان توێبە بەرەو باخچەکە بەڕێکەوتین، تەماشای ئاسمانمان کرد، کەشێکی شاعیرانەی هەبوو، تا گردبوونەوەیەکمان بینی، بەدەور لازارەوە، ئەوکەسانە بوون بە پەرۆشەوەی قسەکانی بۆب بوون، بۆب قسەی بۆ یەکێکیان دەکرد و ئیشارەتیشی بۆ ئاسمان دەکرد.

- کاتێک دوو تەنی ڕووناک بە ئاسمانەوە دەبینی، دەزانیت تۆ دەفرەی فڕیوی یۆفۆ بەڕاستی بەئاسمانەوە دەبینیت، نەک یەک تەن، بەهاوتەریبی و بە یەک جووڵە دەجووڵێنەوە، ئەوە تەکنەلۆژیای ئاڵۆزە بۆ گومرا کردنی کاری سەربازی، یەک لەو تەنانە تەنها سێبەری تەنە ڕاستەقینەکەیە، بەو ئاوایەی یەک لەو دوو تەنەی بە ئاسمانەوەیە، تەنها سێبەری تەنە ڕاستەقینەکەیە، وەلێ ئەوەش زۆر دەگمەنە، زۆربەی دەرکەوتنەکانی دەفرە فڕیوەکان لەئاسمانا فرۆکەی جەنگیی نهێنین، حکومەت تاقیکردنەوەیان پێ دەکات.

لەتەکماندا ئەو پیاوە کەڵگەتە قژ درێژە وەستابوو، بەدەم تەماشا کردنی ئاسمانەوە گوتی:

- ئەوە ڕاستە، ئەمریکا فرۆکە گەلێکی هەن، ئەگەر لە گۆشەیەکی دیاریکراوەوە دیقەتیانتدا کە بە ئاسمانەوە بوون، سوێند دەخۆی کە دەفرەی فڕیون، فڕۆکەی شامۆی لاوازی چوارگۆشە، فڕۆکەی دارک ستاری دەفرەیی، خێوی ڕەش کە لە فڕۆکەی باتمان دەچێت.

توێبە بە نوکتەی بێمانەکەی بەزەیی هات و گوتی:

- بەڕێز بۆب.. مەزەندەت وایە بوونەوەر گەلێک هەن، یانی بۆ نموونە، پێت وایە بوونەوەری حەوایی لەم جیهانەدا بوونیان هەس.

بۆب لازار بزەی بۆ کرد و گوتی:

- بێشک، بەڵام پێموانییە کەللەی سەریان هێلکەیی بێت، یا شاخدار بن، ئەوانە مرۆڤەکان بۆیانیان هەڵبەستووە، مرۆڤە نەخۆشەکان وا دەڵێن.

منیش کۆمێنتم لەسەر قسەکانی کرد و گوتم:

- خودا بە جوانترین شێوە خەڵقەندەکانی داهێناوە، وەلێ بەشەرەکان کاتێک خەیاڵ بە فلیمەکانەوە دەکەن، بەردەوام شێوەیان بە ناشرین و تۆقێنەر دادێنن.

لازار سەری بەڵێی بۆ ڕاوەشاندم، کە هاوڕامە، گوتی:

- نهێنیەکتان پێ ڕادەگەێنم، ئەو دەفرەانەی لەوێ بینیمن، یەکێکیان هەر زۆر کۆن بوو، لەنێو توێژی بەردەکاندا دۆزرابووەوە، تەمەنی هەزاران ساڵ دەبوو، بەڕێزان بەسەرهاتەکەی کۆنە، ئەو بوونەوەرە حەواییانە زۆر لەمێژە هەن، خەیاڵی ئەمڕۆمان نییە، وەک مەزەندەی دەکەین.

زەلامە کەڵەگەتەکە گوتی:

- هەر ئەمریکا نەبوو پرۆژەی (کتێبی شین)ی داهێنا، کە هەموو ئەو بینینانەی تەنی نامۆی ئاسمانیان خستە گومانەوە، بەو ئاوایەی فرۆکەی سیخوڕی ڕووسیا بێ، گویم لێ بووە 12 هەزار بینراو لە لایەن خەڵکی سڤیلەوە ئەو تەنانەیان بینیوە.

بۆب زەردەخەنەیەکی تاڵی بۆ کرد و گوتی:

- دکتۆر باوەڕ بەوە مەکە، پرۆژەی کتێبی شین تەنها گومرا کردنی خەڵک بوو، ئەوەی ئەمریکا دەیکات، پەرەپێدانی فرۆکەی جەنگی و دەفرەی فڕیوە، تەنانەت ئەگەر کەسێکیش بە ڕێکەوت بەئاسمانەوە بینی، ئەو کتێبی شینە شرۆڤەی هەڵەیە و وەهمە بۆ دیاردەکانی سرووشت لە هەورەکان و ئەستێرەکان، لەڕاستیدا تاقیکردنەوەی سەربازییە.

قسەو باس بۆ لایەنی تر بردینی، بۆب لازار بەدەر لەوەی قسەی کەم دەکرد، وەلێ هەر قسیەکیشی گەنجینە بوو.

شەوە سیحراویەکە کۆتایی هات، چووینەوە ژوورەکانی خۆمان، هەر یەکە لە ئێمە ژوورێکی تایبەت بەخۆی هەبوو، هەستم کرد حەزم بە شوێنەکەیە، ئەو شەوە بە قووڵی نووستم.

ئێوارەی ڕۆژی دواتر لە هۆڵی کۆبوونەوەکە گردبووینەوە، بینیم کورسییەکەی بۆب لازار چۆڵە، شارلۆتان گوتی:

- بەڕێزان بۆب لازار بەوای سەرقاڵییەوە ڕۆمانیای بەجێهێشت.

جوولەکەکە گوتی:

- بەداخەوە، دەمویست پرسیاری ئەو شارەی ژێر زەوی لێ بکەم، کە گوتبووی لە ناوچەی 51 بنیات کراوە.

شارلۆتان بە دەنگێک چون ئەوەی لە فیشکەی مار بچێت، گوتی:

- تەنها شارێک نەبوو، 120 لادێ لەژێر زەوی بنیات کراوەو هەموو پێداویستییەکانی ژیانیشی تیا ئامادە کراوە.

سەرمسوڕما و برۆکانم قیت کردەوە و گوتم:

- باشە خەڵکی بۆچ دەیانەوێ لەژێر زەوی بژێن؟

جووەکە بە زمانێک هاتە قسە حەزم پێ نەبوو:

- تەنها زیرەکەکان ئەو شتانە دروست دەکەن، ئەمڕۆ جیهان 14 هەزار کڵاوەی ئەتۆمی تێدایە، جەنگی ئەتۆمییەکان لە ئان و ساتدایە هەڵبگیرسێت، ئەو حەشارگانە دەبێ بۆچی دروست کرابن، هەی گەمژە.

ویستم بەرسڤی بدەمەوە، شارلۆتان گوتی:

- لێگەڕێن با بچینە نهێنی دووەم، ئەمجارە نهێنی زانستی نییە، بەڵکو نهینی ڕوحیانەتە، (سۆزان جۆنز)تانتان پێ دەناسێنم، کچی قەشەی شێت ( جیم جۆنز)ە.

هەر هەموو داچڵەکین، دەفرە فڕیوەکانمان لەبیر چووەوە، هەمووان چاویان لەو کچە ئاسیاییە نەبڕی، ئا ئەمەیە کچی جیم جۆنز؟ کە ئاواییەکی پێکهێنا و خۆشی کرد بە حاکمی ئاواییەکە و هەزار کەسیش شوێنی کەوتن، قایلی خۆ کوشتنی بەکۆمەڵیانی کرد؟ تەماشای کچەکەم کرد، کە زۆر خەمبار بوو بەوەی قسەی تێدا دەکات، گوتی:

- هەندێ ناوچە لە گێڕانەوەکەدا هەیە بۆ خۆم نەمبینیوە، بەڵکو لەڕێی باوکمەوە (جیم جۆنز)ەوە بیستوومە، هەموو شتێک باس دەکەم، لە سەرەتاوە تا کۆتایی کارەساتەکە، ئەمە خوایە جیهان ئەو ڕاستییە تاڵە بزانن.

## 2

# سەربردەی دەست

# بەسەرا گرتنی عەقڵەکان

**سۆزان جۆنز : دەیگێڕێتەوە**

(( پێویستە ئەوەی دەیبینی باوەڕی پێ بکەیت، ئەگەر وەک هاوڕێ منت بینی، ئەوا دەبمە هاوڕێت، ئەگەر وەک باوک لێمتڕوانی، بۆت دەبم بە باوک، ئەگەر وەک دڵسۆزێک لێمتڕوانی، ئەوا دەبمە دڵسۆزت، ئەگەریش وەک خواوەند منت بینی، ئەوا دەبمە خواوەندت))

**قەشەی شێت جیم جۆنز**

منداڵێکی ڕووت و ڕەجاڵ، وەک چۆن لەسکی دایکی بەرەوە بووە . ئەو منداڵە ڕقی گەورەی لەدایکیبوو، بەجەستە بچووک و لاوازەکەی لە ئاواییەکی ئەمریکا گوزەری دەکرد، تەنانەت ئەو ئاواییەش نەخشەی جیهان ناوی نەبردووە، هەژار پارەی پارووە نانێکی پێ نییە، وەلێ چاوی دایکانی ئاواییەکە بۆی بە بەزەیی بوون، ئەو بەرماوانەی لەبەردەم منداڵەکانیان دەمایەوە وێیان دەدان، وەک چۆن پاشماوەی خواردن بۆ پشیلەکان فڕێ دەدرا، باوکێکی کەمئەندامی جەنگ، کە لەجەنگی جیهانی بۆمبێکی پیا تەقیبووەوە، دایکێکی چاوچنۆک لەهندییە سوورەکان، تەنانەت لەسۆزییشدا چاوچنۆک بوو، بۆ جارێکیش لە ژیانیدا باوەشی لە کوڕەکەی نەداوە، ما لەچاوانی دایکانی ئاواییەکە بەدووی بەزەییدا بگەڕێت، بۆ پارووە نانێکی پاشماوەی کە فڕێ دەدرا. بەردەوام دەگەڕا ڕۆژێک ژنی قەشە (مێرتل) دەیبینێت، لەبەردەم دەرگەی کڵێسەکە

ڕاکشاوەو لەناو سەرما لەرزی لێ هاتووە، چاوەکانیشی تووڕەو کینەیان پێوە دیاربوو، چون ئەوەی شەیتان چووبێتە جەستەی، هەڵیگرت و بۆ ماڵەکەی خۆی بردیەوە، گەرم داپۆشی وخواردنێکی گەرمیشی لەبەردەم دانا، دڵ و دەروونی گەرمەوە بوون، دواتر بردیەوە ماڵی خۆی و لەتەک دایکی منداڵەکە بەتووڕەییەوە قسانی کرد، دایکە زیاتر رقی لێ بووەوە، نەفرەتی لەو ڕۆژە کرد کە ئەو منداڵەی لێ بووە.

مێرتل بایەخی زۆری پێدا، منداڵەکە زۆرترین کاتی لەماڵی مێرتل دەبردە سەر، میرتل بەردەوام دەیبینی بێدەنگە، دەتگوت لەزمان کەوتووە، چاوەکانیشی شێوازێکی تایبەتیان هەبوو، وەک ئەوەی پڕ بن لە تۆڵە سەندنەوە، وەلێ تیبینی ئەوەی کرد، کاتێک پەرتووکی پیرۆزی بەسەرا دەخوێند، گوێی دەگرت، چاوەکانی زەقتر دەبوون، ما ئایەتەکانی پەرتووکی پیرۆزی و بنەماکانی مەسیحییەتی فێر بکات، توانایەکی زۆر باشی لە ئەزبەر کردن هەبوو، ئەزبەرکردنەکەشی لەو شێوەیەدا بوو، کە لەناو خانەکانی مێشکیدا بێت و نەک دڵی، هەر کە تێر نان دەبوو، دەکەوتە نێو بازاڕ و چەند کاتژمێرێک بەسەر دوکاندارەکاندا هاواری دەکرد، ئەوانیش بەگژ ئەو شەیتانەدا دەچوونەوە، کە شتەکانیانی دەدزی، ئەوەش نەبوو بۆ خواردنی بێت، دەیدزی و بەو ناوەدا پەرش و بڵاوی دەکردەوە، ئەو منداڵە ناوی جیم بوو، دوای ئەوە جیهان بەناوی زەبوون و کەساس ناسیان، جیهان حەز بە بیرکردنەوەی ناکەن: جیم جۆنز.

ڕۆژێکیان ژنەکەی قەشە کوڕەی بۆ کڵێسە برد، بینی باوکە (باوکە قەشە) وتار دەخوێنێتەوە، وتارەکەی ئەوەندە بەهێز بوو، چاوانی دانیشتوانی کڵێسەکەی پڕ لە فرمێسک کرد، جیمی تەماشای هیچی نەدەکرد، تەنها

دیقەتی چاوانی ئەو خەڵکەی دەدا، کە سەرسامبوون بە وتارەکە و کاریانی تێکردبوو، جیمی کە بۆ ماڵ گەڕایەوە، لاسایی قەشەی لەوتارەکەی دەکردەوە، هەمان قسەی بە هەمان تۆنی دەنگی قەشە دەگوتەوە، دایکی بۆی دەرچوو، بە پشتێنێک هەردوو دەستی بەستەوەو بە پشتێنێکی پێستە کەوتە وێزەی و بەبارگیریش ناوزەدی دەکرد، پێی گوت:

- هەتیو هەر دەچیتە لای ئەو تیتک براوە بەرەڵایە مێرتل؟ پێم بڵێ هەی نارەسەن ئەو بێ شەرەفە فێری چیت دەکات؟

جیمی هیچ وەڵامێکی نەدەدایەوە، نەش دەگریا، بە لێدان ڕاهاتبوو، بە ژێر وەشاندنی پشتێنەکەوە، چاوەکانی جیمی هەموو ئەو ڕۆژانەی بیر دەهاتەوە، کە دڵڕەقی و کینە پێی کردبوون.

جیمی منداڵێکی باش نەبوو، بەدەر لە هەموو ئەو ئایەتانەی پەرتووکی پیرۆزیشی کە ئەزبەر کردبوو، هەموو ئەو پەیامانەی مەسیحی بەسەر کردبووەوە، ئەو زیاتر بەدکاربوو، بەردەوام دەمی بە دژوێن و قسەی قۆڕ بوو، تەنانەت لەناو کڵێسەی ئاواییەکەش کاری بەدکارانەی دەکرد، جارێکیان پەرتووکی پیرۆزی دزی، لەبری پەرتووکەکە تەپاڵەی لەجێی پەرتووکەکە دانا، جارێکی تریش ئاوی ناو پەرداخی پیرۆزی بە میز گۆڕی، دڵ و دەروونی کەیل بوو بە ڕق و کینە.

بەقسەیەکی توندی قەشەو ژنەکەی جیمی چووە قوتابخانە، منداڵێکی لاسار بوو، لە ڕیزی دواوەی پۆلەکە دادەنیشت، ئەوەی سەیر بوو نمرەکانی زۆر بەرز بوو، هەموو شتێکی لەبەر دەکرد و بە ئاسانیش دەیگوتنەوە، هەچ خوێندکارێک شەڕی پێ بفرۆشتایە، نەفرەتی لەو ڕۆژە دەکرد کە هاتە قوتابخانە، ڕۆژێکیان باڵی منداڵێکی شکاند، بەهۆی لاساری و شەڕ لەتەک

خوێندکارەکان لە قوتابخانە دەرکرا، وەلێ ژنی قەشەکە هەموو جارێ دەیبردەوە بەر خوێندن، تەنانەت (مێرتل)یش نەیدەزانی بۆ ئەوەی لەتەکا دەکات، بۆ دەرگای لێ کردەوە، لەکاتێکدا تەواوی خێزانەکەی دەریان کردبوو.
لە ڕۆژی دەرچوونی لە پۆلی شەش قوتابخانە ئاهەنگێکی گەورەیان بە بۆنەی کۆتایی ساڵ گێڕا، جیمی یەکەمی سەر هەموو پۆلەکان بوو، وەلێ بەتەنیا لە بەلەکۆنی قوتابخانەکە وەستابوو، هەر دایکێک باوەشی لە منداڵەکەی خۆی دەدا و ماچی دەکرد، هەر باوکێکیش منداڵەکەی بەرز دەکردەوە، هەرچی ئەو بوو کەسی لەتەکا نەبوو، لەو ڕۆژەوە هەستی کرد دەتوانێت باوکی خۆی بکوژێت، وەلێ دەیزانی ئەو هێزەی نییە.
ڕۆژگار تێپەڕی و جیمی گەورە بوو، ئەو منداڵە بوو کە دایکی زوخاوی بەەگەروویدا کردبوو، ژیانی لێ تاڵ کردبوو، ئەو دایکە بووە یەکەمین قوربانی دەستی جیمی، ڕۆژێکیان بە هەزار حاڵ لەبن دەستی دەرچوو، دەم و چاوی خەڵتانی خوێن بوو، زۆربەی سکاڵاکان لە گۆڕانکاری بوو، لەتەمەنی هەرزەکارییەوە بووە کەسێکی لادەر، دایکی نەیدەوێرا تەماشای چاوەکانی بکات، دەیزانی ئەوەی چێندبووی هەر ئەوە دەدوورێتەوە.
خراپەو بەدکاری منداڵییەکەی گۆڕا بە کەسێکی لادەر و کاری بەدکارانەی لەتەک منداڵاندا دەکرد، منداڵانی کۆ دەکردەوەو فێری سیکسیانی دەکرد، بەشێوەیەک مامەڵەی بەدکارییەکەی لەتەکیانا دەکرد، تا ڕەحەت بوون، ناکرێ وردکارییەکانی باس بکەین، خانوادەی منداڵەکان هیچ چارەیەکیان نەبوو، ناچار لای ژنی قەشە سکاڵایان لەدەست جیمی کرد، کە فەرمانی بە جێمی کرد ئەو بەدکارییە ڕاگرێت، تەنها گوێی لە مێرتل ڕادەگرت.

له ئامادەیی بە هاوکاری ژنی قەشە هەواداری خوێندنەوەی کرد، ما دوای قوتابخانە ڕۆژ لە کتێبخانەی گشتی بەسەر بەرێت، لای ئێوارەش دەگەڕایەوە ماڵەوە، بڕێک کتێبی فەلسەفی و ئاینیش بە بن باڵیەوە، خویندنی قوتابخانە تەواو بکات.

کەس نەیدەزانی جیم بۆچی پەرتووکی پیرۆز زۆر بە جیددی دەخوێنێتەوە، دوور نەبوو لەبەر مێرتڵ ئەوەی دەکرد، مرۆڤ لەژێر کارێگەری کەسانێکدا دەبێت، کە ئەو سۆزەی وێدەدات کە لەوپەڕی پێویستیدایە، دوژمنی ئەو کەسەشە کە بە بێ هۆکار ژیانی تاڵ دەکات، بەدەر لەوەی جیمی لە بەدکاری لێل منداڵان وەستا، شتگەلێکی زۆر سەیرتری لەتەکیانا دەکرد، شتگەلێک پەیوەست بوو بە مردنەوە.

زۆر پابەندی مەراسیم و سروش و مۆسیقای مردووان دەبوو، بەتابووت و شێوەکانی، کاتێک پشیلە یا سەگێکیان دەتۆپی منداڵانی کۆ دەکردەوە، تەواوی مەراسیمی مردوویان بۆ دەکرد و وتاریشی تیا دەخوێندەوە، خۆ ئەگەر گیانەوەرێکی مردووی نەدۆزیایە، ئەوا پشیلەیەکی دەکوشت و مەراسیمەکەی بۆ دەکرد و لە خوداش دەپاڕایەوە لە گوناهەکانی پشیلەکە خۆش بێت، دوای مەراسیمەکە دەیگوت" من نێردراوی فریشتەی گیانکێشانم" ئەوە منداڵێکی لادەر نەبوو، ئەوە جیم جۆنز بوو، مێژوو بیری ناچێت، دواتر لێی تێدەگەن.

بەیانیانێک لە یاریگای بێسبۆڵ ڕووداوێک ڕوویدا، کاری لە ناخی جیم کرد، تا ئەودوای ژیانی لەناخیدا مایەوە، کاتێک بینی کۆمەڵێک گەنج کەوتنە وێزەی گەنجێکی ڕەشپێست و قسەی ناشرین نەما پێی نەکەن، ئەوە وایکرد جۆنز دان بەخۆی نەگرێت و تێیان بەربوو، هەموو سەرو گوێلکیانی شکاند، بەو هۆیەوە جۆنز و کوڕە ڕەشتپێستەکەش لە یاریگاکە دەرکران، کاتێ کوڕە

ڕەشپێستەکە سوپاسگوزاری بوو، جۆنز داوای لێکرد ببنە هاوڕێ، ئیدی بوون بە هاوڕێ و بەیەکەوە دەهاتن و دەڕۆیشتن، تەنانەت جۆنز بردییەوە ماڵی خۆیان، لەوێ هەڵوێستەکە وایکرد جۆنز بۆ هەتا هەتایە خانوادەکەی جێ بهێڵێت.

هەر کە باوکی جێم کوڕە ڕەشپێستەکەی بینی هاتە ژوورەوە، بەتوورەییەوە هەستایە سەر پێ و بە قسەی ناشرین ئەوەی نەشێ پێیکرد، هەر لەبەر ئەوەی جۆنز ئەو کارەی کرد، ئاخر باوکی جۆنز ئەندامێکی دێرینی تیپی ئیلکۆ کلۆکس کلانی تیرۆرستی ڕەگەزپەرستی خوێنمژ بوو، کەوتبوونە دووی ڕەشپێستەکان و دەیانکوشتن، دوای جنیو دان، جیم شەپازلەیەکی بە دەموچاوی باوکە نەخۆشەکەی دا، جیم هەرچی لەماڵەکە هەیبوو، کۆی کردنەوەو بۆ هەتا هەتایە جێیهێشتن.

جێم بەرەو (بلۆمنگتۆن باندیانا) سەفەری کرد، لەوێ چووە زانکۆ، دوای وانەکانی زانکۆی، لە نەخۆشخانەی ڕیدی گەورە وەک سەرپەرشتیاری قاوشێک کاری دەکرد، توانای خۆی لێ خستبووە گەڕ لە ڕێکخستنی خەڵک و ئیدارەو تەنگوچەڵەمەکان کە ڕۆژانە لە نەخۆشخانەکە ڕوویاندەدا، لە ڕاڕەوە سپییەکان و ڕاکە ڕاکی فریاگوزاران، مارسلین دەرکەوت، پاڵی بەسەدیەی نەخۆشێکەوە دەنا، بەوای نەخۆشەکەوە چاوانی سۆزی فرمێسکیان لێ دەباری، پەرۆشی مارسلین بۆ کەسێک هیچ پەیوەندییەکی پێوە نییە، مرۆڤ داماو دەبێت کە ئەو پەیوەندییەی لەدڵا نەبێت، جێم خۆی بەدیواری دڵییەوە هەڵواسی.

بەچەند چاو تێبڕینێک و چەند وشەیەک مارسلین بەدڵیەوە چوو، ما هەناسەی عیشقیان ئاوێتەی یەکدی بکەن، وەلێ حەزی بەدەسەلاتی

دەستبەسەرداگرتنی لەتەکیا هەبوو، لە چاوەکانیەوە شێتی مەزنی هەڵگرتبوو، سوکایەتی بە خۆشەویستییەکەی دەکرد، دەیهێناو دەیبرد چون ئەوەی بیەوێ دەسەڵاتی خۆی بەسەریا فەرز بکات، ئەزموونێکی باشی هەبوو بۆ داهێنانی ڕێگایەکی ناشرین بۆ ئەوەی دەست بەسەر ئەو مێینەدا بگرێ کە حەزی لێبوو، هەر جارەی کێشەیەکی بۆ دەنایەوە، لێی تووڕە دەبوو، توندو تیژی لەتەکا دەکرد، وایلێدەکرد سەرقاڵ بێت، تا ڕەزامەندی بنوێنێت، خۆ ئەگەر ڕەزامەندیش بوو، بەو ڕەزامەندییە چاوچنۆک دەبوو، خۆشەویستی بۆ ئەو وایلێدەکرد بەهەودای عیشق ئاوێزان بێت، نایەوێ دەربچێت.

جۆنز پەیوەندی لەتەک مێرتل هەر بەردەوام بوو، تەنها مێرتل بوو هامکاری دەروونی ژیانەوەی لەتەکا دەکرد، هەر مێرتل بوو لە کڵێسە دایمەزراند تا کار بکات، مجێورێکی ڕاهێنراوی ڕاهێنەر بێت، لە زانستی کاروباری پەرتووکی پیرۆز و ئەزبەر کردنی ئایەتەکانی زۆر زیرەکبوو، لەبەر ئەوەی ئامادەگی بەردەوامی لەکڵێسە لەتەک قەشەی مێردیدا هەبوو، ئەوە گەورەترین هەڵە بوو، هەر ڕۆژێک بێ، جیهان لێی خۆش نابێت.

یەکەم شتێک دوای دەست بەکاربوونی لە کڵێسەکە بە جارێ چاوەڕوان نەکراوبوو، گۆڕەپانێکی لە شوێنێکی خاڵی دروست کرد، ناویشی لێنا گۆڕەپانی کراوە، تا هەموو منداڵەکان لە هەموو نەژادەکان بتوانن بەکاری بهێنن، جیاوازی ڕەش و سپی و زەرد نەبوو، منداڵەکان بە هەموو ڕەنگەکانیانەوە بە پەرۆشی چوونە ناو گۆڕەپانی یاریگاکە بوون، تەماشای زەردەخەنەکانیانی دەکرد و بۆ خۆیشی بزەی دەهات و بە ڕەزامەندییەوە تەماشای ئاسمانی دەکرد.

کەڕەتێک جیم ویستی کاری مجێوری بۆ کوڕە ڕەشپێستەکە لەناو کڵێسە دابین بکات، بەدەر لەوەی هەموو شەرتەکانی تێدابوو، وەلێ بەوای ڕەشپێستییەکەیەوە ڕەتیان کردەوە، جیم کەنیسەی بەجێهێشت، ما ڕەخنەیان لێ بگرێ، تەنانەت ڕەخنەشی لە مەزهەبەکەیان گرت و بە ڕەگەزپەرست ناوزەدیانی کرد، لە کڵێسەیەکی تر کە مەزهەبەکەی جیاوازتر بوو، لەوێ دەمەزرا، لە ناخی (جیم)دا مرۆڤێک و شەیتانێکی تێدا بوو، ڕەنگە شەیتانبوونەکەی هەر لەمنداڵییەوە تیا ڕسکابێت، ئەوا سەری هەڵدا.

* * *

قەشە جیم جۆنز کە چووە سەر مینبەرەکە، کەس نەیدەناسی، وتارێکی خوێندەوە، کڵێسەکە لە خەڵکی پڕ بوو، تەنانەت لە ئاین وەرگەڕاوەکانی سەر شەقامیش هاتنە کڵێسە بۆ گوێگرتن لە وتارەکەی،، ناخی ئامادەبووانی هەژاند، وتارێک لەو وتارانەی لەرز دەتگرێت، هەست دەکەیت مووی جەستەت قیتەوەبوون، چون ئەوەی وزەیەکت بداتێ، تێکەڵەیەک لە خۆشەویستی و هەڵمەتبردن وەک ئاوی سەرد بەسەرتا بڕێژن، وەئاگا دێیتەوە، هەست دەکەیت کاتێکی زۆرت لە ژیانتا بەفیڕۆ بردووە، کاتێک گوێبیستی ئەو پیاوە دەبیت، هەست دەکەیت ساحیرێکە، یا کەمان ژەنێکە و بەسەر ژێکانی هەستدا ئاوازێکت بۆ دەژەنێ، پڕ بەدڵ حەز بە گوێگرتنی دەکەی، جووڵەی پەنجەکانی نەرم نەرم لێل وشەکان سارێژی خەمو ئازارەکانی دەکرد، تەنانەت ئەگەر دەنگەکەشت کپ بکردایە لەجووڵەی پەنجەکانییەوە حاڵی دەبووی، جیم جۆنزی قەشە زمانێکی پێوەبوو، لە هیچ زمانێکدا شێوەی نەبوو.

کەس نەیدەزانی ئەو قەدەرەی چۆن بۆ ڕسکا، هیچ ئەزموونێکیشی لەوتار خوێندنەوە نەبوو، چۆن دڵی ئەو خەڵکەی لە یەکەمین وتار هەواداری دەکردن، تەنانەت لە پێنج خولەکی یەکەم کارێگەری بەسەریانەوە دەرکەوت، قەشەی گەورەی کڵێسەکە کە ئەوەی لێ بینی، کردی بە گەورەی بزووتنەوەی چارەسەر کردنی گەڕەکەکە (Healing Revival) کە بزووتنەوەیەکی مەسیحییەتە زۆر بەپەلە لەنێو کڵێساکاندا بڵاو بووەوە، بەو ئاوایەی خەڵکی کۆدەکەنەوەو لەسەر سەکۆیەکی گەڕۆک قەشە چارەسەری دەردی ئەو کەسانە دەکات، کە دەردەکانیان سەختە، وەک جنۆکە چوونە لەشەوە، ئازاری درێژ خایەنی جومگەکان و ئەودەردانەی تر، خەڵکی دەنگ بەرز دەکەنەوەو هاوار و ستایشی مەسیح دەکەن، کاتێک جیم جۆنز ئەو سەرۆکایەتییەی لە کڵیسەوە پێدرا، وەک ئەوە وابوو ئاو بدەیت بە ماسییەکی وشکانی، توێنێتی شکا و تێیدا کەوتە مەلەکردن، چونکە ئەوە نیشتمانی ئەوە، نمایشکردن نیشتمانی جیم جۆنز بوو.

شەیتان زمانێکی لووسی هەیە، شەیتان قسەی خۆش دەخاتە دەروونتەوە، شەیتان بەدەور ڕوحتەوە سەما دەکات، شادت دەکات، دواتر بەدەور گۆڕەکەتەوە سەما دەکات.

جیم جۆنز نمایشی چارەسەرکردنی بردە ئاستێکی بەرزتر، ژنێکی لاق شکاو دەچێتە سەر ستەیجەکە، بەرامبەر بەخەڵکەکە دەست دەنێتە سەر شوێنی شکاوەکە، بەجۆرێک قسان دەکات، دڵ دەبات، ئەوجا بە دەنگێکی بەرز داوا لە ڕوحی پیرۆز و ڕوحی مەسیح دەکات چاکی بکاتەوە، ژنەکە بەسەر کورسییەکەوە ڕاست دەبێتەوە، دەست بەشانی کەسێکەوە دەگرێت و دواتر

هەر بەخۆی بەرامبەر بە چاوانی خەڵکەوە دێت و دەچێ، خەڵکەکە واقیان وڕ دەمێنێ.

یەکەم هەنگاو کە بەرەو دڵی خەڵکی دەهاویت، دەبێت ئەوەیان پیشان بدەیت کە کەس بۆی ناکرێت، خەڵکی بە ئاین و سۆزەوە دەژێن، ئەگەر زۆرت لە ئاین خستە بەر گوێیان، ئەو سۆزەش کە هەست دەورووژێنێت، ئەوا دڵیان لەبەر پێت دادەنێن.

ناوبانگی جیم جۆنزی وتاربێژ بەو ئاوایەی خودا پێی ڕازییە، یەکشمموان هاتوچۆی بەردەم کڵێسە ئەوەندە قەرەباڵغ دەبوو، نەبێتەوە، ئەو دڵانەی بە پەرۆشەوەی ناوی خودان، سۆزی خودان، پەرجووەکانی خودان، گشت ئەوانە جیم جۆنز دەیدات و لەنێو چاوانتی دەنێت.

جیم ئەو کڵێسەیەی جێهێشت کە کاری تێدا دەکرد، کڵێسەیەکی تایبەت بەخۆی کردەوەو ناوی باڵەکانی چاکبوونەوە (Wings of Healing)ی لێنا، تا وایلێهات چون ئەوەی بۆ حەج دەرچوون خەڵکی بۆی دەهاتن، ئافرەتی نابینا چاوەکانی دەکرانەوە، ئەو پیاوەی شێرپەنجە کڵۆڵی کردبوو، قەشە جیم دەستی دەنایە سەر سەری و چاک دەبووەوە، دواتر بەرامبەر خەڵکەکە شێرپەنجەکەی بەدەستی بەرز دەکردەوە، تا بەچاوی خۆیان خۆین ببینن کە گۆشتێکی مردووی پیسە، ئێدی هاواری گریاناوی لەنێو خەڵکەکە بەرز دەبووەوە، چون ئەوەی ڕوحی پیرۆز دابەزیبێت، مەسیح بە هەوری هاتبێتە خوارەوە، بەچاوی بەزەیی تەماشای کردوون.

جۆنز بەوە نەوەستا وەک وتاربێژێک بەدەستی هێنا، ڕەنگە وتار بۆ کاتژمێرێک کاری خۆی بکات، وەلێ دوای ئەوە وتارەکان لە گوێیاندا وەک پاسارییەک

دەدات لە شەقەی باڵ و دەفڕێت، دابەزییە گۆڕەپانەکەو وەک جەنگاوەرێک دژ بە ڕەگەزپەرستی کە دەرهەق ڕەشپێستەکان لە ئەمریکا دەکرا.

هەوەڵین یاسای پێ دەزانی تا گوێڕادێرانی خەڵک بۆ خۆی ڕابکێشێت، چەوساوەکانی نێو کۆمەڵ لەخۆت بگرە، بیریان بخەرەوە چەند بە بەهان، ئەو ژێیە بگرە کە ئازاریان دەدات، تا خەم و ئازارەکانی خۆیانت بۆ دەربڕن، ئەو چینە داماوە زۆرترین ڕێژەن لە هەموو ئەو کۆمەڵگانەی ژێر دەستەن.

کەڕەتێک دەنگۆی ئەوە بڵاو بووەوە، کە جیم جۆنزی وتار بێژ براوە بۆ نەخۆشخانە بەوای تووشبوونی بە سووکە جەڵدەیەکەوە، بە هەڵە لە قاوشی ڕەشپێستەکان خەواندیان، ئەو نەخۆشخانەیەش نەخۆشخانەی ڕەگەزپەرستی بوو، سپی لە ڕەش جیا دەکرایەوە، پەرستارەکە هات و داوای لێبووردنی لە جیم جۆنز کرد و پێی ڕاگەیاند هەر ئێستا بۆ قاوشی سپی پێستەکان دەیگوازنەوە، جۆنز لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕاستەوەبوو، قسەگەلێکی بە پەرستارەکە گوت، ئەگەر مردوو گوێی لێبوایە ڕاست دەبووەوە، قسانێک ملی بە ڕەشپێستەکان درێژ کردەوەو چاویانی پێ زەق زەق کردەوە، جۆنز ئەو گواستنەوەیەی ڕەتکردەوەو سووربوو لە قاوشی ڕەشپێستەکان بمێنێتەوە، کاتێک لەنەخۆشخانە دەرچوو، هەڵمەتێکی توندی کردە سەر نەخۆشخانەکە، تا وایانی لێکرد بگۆڕدرێن بۆ نەخۆشخانەی نا ڕەگەزپەرستی، سپی و ڕەش لەیەک جیا نەکرێنەوە.

دەستی بە دروستکردنی ڕێکخراوی کۆمەڵگەیی کرد، کەوتە هێرش کردنە سەر چێشتخانە و دامودەزگاکانی نێو شار و تاقییانی دەکردەوە، ئەگەر بینی یەکێک لەو دەزگاو خواردنگانە کار کردنی ڕەشپێست ڕەتدەکاتەوە، حەیاو شەرەفیانی دەبرد، هاموشۆکەرانی کڵێسەی ڕەنگاو ڕەنگەکان لەزیادی دەدا،

تەنانەت سپیپێستەکانیشی بۆ دەهاتن، تۆ ئەگەر ئەو چینە داماوەت گرتە خۆت، دڵی زۆرێکی تر لە چینی بەرز بۆ لای خۆت ڕادەکێشیت، بێشک ناحەزانیشت بۆ دەبێت، وەلێ لەوانەی دڵ و دەروونیان ڕەشە، ئەوانەی بەرژەوەندییان بەو بیرۆکەیەی تۆ نییە.

بۆ ئەوەی نەڵێن خاوەن نمایشکردنەو بەس، جۆنز پێنج منداڵی ڕەنگاو ڕەنگی لەخۆی گرت، هەر منداڵێک و بە ڕەنگێکی جیاواز لەوانی تر، تەنانەت ڕەگەزیشیان، خانوادەکەی ناو نا (خێزانی کۆڵکە زێڕینە)، وەک چۆن ستیڤانی کوڕی و سۆزانی کچی بەخێو دەکرد، ئەوانیشی بەهەمان شێوە بەخێو دەکرد، بەدەر لەوەی مارسلین پێشتر کێشەی لە خۆشەویستییەکەی جیم هەبوو، دوای ئەوەی ئەزموونی دەستڕۆیی بەسەر کۆمەڵگاوە بینی، کێشەکانی بیرچووەوە، ئەو دەسەڵاتی پیاو سالارییەی (جیم)یش کەمەوەبوو، بووە پشت و پەنای مێردەکەی، ئەگەرچی مارسلین پەرستار بوو، دەمەتەقێشی وانەبوو، وەلێ دڵی جێی هەزار ڕوحی هەڵچووی وەک جیم جۆنزی تیا دەبووەوە، لە ئامێزی پاڵ دەکەوت، ئاهەنگی بەو سەرکەوتنەی جیم دەگێڕا، کە توانی دڵان دەستبەسەر بکات.

*　　　*　　　*

خەڵکانێکی تر زۆر گوێیان بەوتارو ئامۆژگاری نەدەدا، نە سکیانی تێر دەکرد، نەیش هەژاری و نەدارییانی کوێر دەکردەوە، ئەوانە زۆرینەن وەلێ خۆیان شاردووەتەوە، لەشوێنانێک چاوان نەیانیدەبینی، شوێنگەلێک ڕەنگە بۆ گوزەرانیش دەست نەدات، وەلێ تیا ئاکانجی بوون، بۆخۆیان کردیان بەنیشتمان، لەبەر ئەوانە جیم جۆنز گەمەیەکی تری داهێنا، کە وایکرد

هەواداری زۆرتر بێت، بیرۆکەی چێشتی میللی و مێوە فرۆشی بەخۆڕایی دامەزراند، دەتوانی بێیت بۆ کڵێسەو بخۆیت و بخۆیتەوەو پێداویستی برنج و ڕۆن و گۆشت بەریتەوە، ئەویش لەڕێی ئەوانەی پارەیان بە کڵێسە دەبەخشی. ناوی کڵێسەکەی گۆڕی بەناوێکی تر، تا هەموو دونیا بیری بکەنەوە، ناوی نا ( پەرستگای گەلان).

دوای ساڵانێک پەرستگای گەلان لقی تری لێبووەوە، سێ پەرستگای تری گەلان کرایەوە، بەوە جیم جۆنز لەدڵی خەڵکییەوە بۆ سەر خوانی گەورەکان سەرکەوت، هەڵمەتی دژ بە ڕەگەزپەرستی دەستی پێکرد، ئەوە وایکرد سیاسییە گەورەکان لای لێ بکەنەوە، کە بینیان شتێکی باشە بۆ بەدەست هێنانی دەنگدەران، کەس لەو باشتر نییە، دەنگدەرەکان بە وتار دەنگیانیان بۆ مسۆگەر بکات، بەسەر پشتی کەسانی سادە سەرکەویت بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵات، هاوکاری کردن لەتەک گەورەکاندا بەلای جۆنزەوە قازانجێکی هاوبەشبوو، ئەو ئیمپراتۆرییەی خۆشەویستی پێویستی بە کەسانێکە پارێزگاری لێ بکەن، تەنها یەک سیاسی دەتوانێت هەوادارانی لێ دوور بخاتەوە، خەڵکیش زوو بیریان دەچێتەوە.

جۆنز توانی بەو شێوەیە خەرمانەیەکی ترس بەدەور خۆیەوە درووست بکات، بێ پاسەوانی تایبەت هاموشۆی نەدەکرد، چاوێلکەیەکی بەرهەتاویشی بە شەوان لەچاو دەکرد و بە جل و بەرگی شاهانەوە دەردەکەوت، وەک چۆن دڵەکانی بۆ خۆی قۆستەوە، پێویستە چاوەکانیش بقۆزێتەوە، خەڵکی حەز بەو دەوڵەمەندی بە بەهای ئاسایی دەکەن، کە ژیانی خۆی بەخشیوە پێیان بۆ هاوکاری کردنیان، وەلێ جۆنز لەپڕێ کارێکی سەیری لەتەکیاندا کرد، چون ئەوەی بۆ ڕۆژی خۆی شاردبێتیەوە.

جۆنز کوشتەی سۆسیلیزم بوو، ڕەنگە زیادەڕەوی نەبێت بڵێین سۆسیلیزمی دەپەرست، ئەو پێیوایە سۆسیالیزم دادپەروەرییە، پەیامی ڕاستەقینەیە دوور لە هەموو پەیامەکانی کنیسە و فێرکارییەکانی مەسیح یا هەر ئاینێکی تر، بەهیچ شێوەیەک مەزهەبی خۆی ئاشکرا نەکرد، وەلێ خۆێ بە جل و بەرگی ئاین و پۆشاکی کڵێسە وەرشاردبووەوە، سەرەتا وایکرد ئەوانەی خوا پێداو بوون بە زۆرەملی پارە بە کڵێسە ببەخشن، لەپێناو خودا و بەدیهاتنی بەرەکەتی ڕوحی پیرۆز ئەوەی لەخۆیەوە شتی دەبەخشی، بێ ئەوەی داوای هیچ بکات، خۆی دەبەخشی پێت.

دواتر وای لە شوێنکەوتووانی کرد، سۆسیالیزمانە بژێن، بێ ئەوەی بزانن ئەوە دەکەن، ئەوەی لەدەستیان دەردەچێت لە پارەو موڵک و ماڵ بە کڵێسەیان دەبەخشی، ئەوجا ئەوەی لە کڵێسە کۆدەکرێتەوە، بەیەکسانی بەسەر سەردانیکەرانی کڵێسە دابەش دەکرێت، جیاوازی لەنیوان هەژار و دەوڵەمەند ناکرێت، هەر هەموو بەیەک چاو تەماشا دەکرێت، خەڵکی بەو ئەدایە کاریان دەکرد، بێ ئەوەی بزانن ئەوە سۆسیالیزمە، ئەو کەسانەش کە نەیاندەزانی ئەو شتە چییە، کاری تێکردبوون، هەر وەک ئەوانەی بۆ یەکەمجار کاریان تێکرا.

ناوی مەزهەبەکەی ناو نا ( بەشدارانی پەیامبەران) ئەویش مانای سۆسیالیزم دەگەێنێت، نەیویست ڕاستەوخۆ بانگەشەی بۆ بکات، ئەو کە ناوەی لێنا وەک ئەوەی بیشارێتەوە، بەردەوامبوو لەچارسەرکردنی خەڵک لەڕێی شانۆی گەڕۆکەوە، کە کۆمەڵێک ئەکتەری بە کرێ بۆ گرتبوو، چون ئەوەی ئەوان نەخۆش بن دواتر لەسەر دەستی جیم چاکبوونەتەوە، زۆر بەجوانی دەورەکانیان دەبینی، گریانێک دەگریان شکت لێ نەدەکردن، بەوای ئەو

شانۆگەرییەوە خەڵکی ئامادەبوون ئەو دەستەواژەیە بگرنەبەر، هەر بەو بۆنەشەوە جیم جۆنز وتارێکی تایبەتی بۆ دەوتنەوە، وتارێک ئەودیوی سیمای دەم و چاوی شەیتان بوو.

لەو وتارە گوتی جەوهەری خودا دەتوانێت لەیەکێک لەخەڵقەندەکانی خۆی بەرجەست بکات، بۆ خۆی یەکێکە لەو خەڵقەندانەی خودا خۆی تیا بەرجەستە کردووە، بۆیە توانای چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی هەیە، دەتوانێ چاوی نابینا بکاتەوە، بەدەر لەوەش ئەو بیروباوەڕە تەنها لەگردبوونەوەی کۆمەڵە خەڵکێک دەیگوتەوە، کە شوێنکەوتووانی بە ئەمەکی بوون، ناوی لیژنەی پلاندانانی لێنا هەر ئەوانیش بەرپرسیاربوون لە وەرگتنی هەوادارانی تازە بۆ مەزهەبە تازەکەی جۆنز، هەروەها بەرپرسیاریش بوون لە جێبەجیکردنی مەزهەبەکە بەسەر ئەندامە تازەکان.

کە یەکێک بەهرەی تێگەیشتنی عەقڵی کۆمەڵگای هەبوو، دەتوانێ پارێزگاری لە شوێنکەوتوان بکات، پێویستی بەشتێکە بیانورووژێنێت، دوژمنێکی هاوبەشیان بۆ دابهێنیت، تا گشتیان لێی بترسن، دڵنیا دەبیت هەر هەموویان ئەو دوژمنە دەناسن، خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، لەیەک جیا نابنەوە، تا لەناویان نەبات، ئەو دوژمنە بە دڵنیاییەوە سۆسیالیزم بوو، کە جۆنز بە ئەمریکی ڕەگەزپەرست ناوزەدی کرد، کە ژیانی ڕەنگاو ڕەنگەکان دەبێت بە دۆزەخ کە دواتر لەچەند ساڵی داهاتوو دادێت.

❊ ❊ ❊

لە یەکێک لە وتارە زایەڵدارەکانی کە دڵی دەهێنایە جۆش، شەیتان هەستا و پەرتووکی پیرۆزی تووڕ دایە سەر زەوی و بەدەنگێکی بەرز گوتی" پێویستە

ئێدی ئەم کاغز پەرستنە لەناو بەرین" ئەوەی سەیر بوو، خەڵکەکە بە دەنگێکی بەرز دەستخۆشیان لێکرد، وەک ئەوەی کتێبێکی قێزەونی فڕێ دابێت، شەیتان بەو ئاستە ناگات، تا مێشکت بڕ نەکات، تۆش بە بێ مێشکی هاواری دەستخۆشی لێ بکەیت، ئەو هەموو بیرو باوەڕەکانتی تووڕ دایە سەر زەوی.

جۆنزی شەیتان پەرتووکێکی نووسیبوو، هێرشی کردبووە سەر پەرتووکی پیرۆز، بەرگی پاشا جێمز، دەڵێت پاشا جێمز کۆیلەی هەبوو، پیاوێکی سەرمایەدار بوو، پەرتووکی پیرۆزی ڕاستەقینەی بەلادا بردووە، ئەو بەرگەی لەبەر دەستمانە بەرگە درۆکەیە، وایکرد داماوان مل بۆ ستەمکاریی سەرمایەداری دانوێنن، وتارەکانی جۆنز بۆ ماوەیەک دژ بە مەسیحییەتی تەقلیدی بوو، داوای چوونە ناو ئاینی تازە لەژێر ناونیشانی هاوبەشی پەیامبەرێتی کرد، کە لە لای خوداوە بۆی هاتووەتە خوارەوە، مەسیحی ناردووەتە خوارەوە تا لەتاریکی بیانخاتە ڕووناکی. شەیتان تا دەهات جەماوەری زیادی دەکرد.

تا دەهات جەماوەرەکەی جیم جۆنز خۆی لەزیادە دەدا، تەنانەت جارێک خانمی یەکەمی ئەمریکا ڕۆزالین ژنی سەرۆک کۆماری ئەمریکا جیمی کارتەر لەوەتارەکەی ئامادە دەبێت، ئامادە بوونی ئەو خانمی یەکەمی ئەمریکا بووە هۆی ئەوەی لەچەپڵەلێداندا نەبیرنەوە، وەلێ ڕۆژێک لە ڕۆژان شەیتان بە بەڵایەکی ناگەهان بەخەبەر هاتەوە، کە لەخەیاڵی کەسدا نەبوو.

دەڵێن ئەگەر ویستت شەیتانێک شکست پێ بێنیت، ئەوا شەیتانەکانی چون خۆی تێبەردە، جۆنز خۆی بینییەوە شەیتانەکانی ڕاگەیاندن دەوریان لێ داوە، کە هیچ ڕۆژێک بەنیاز نەبوو هاوسۆزیان بکات، ئەوەش گەورەترین هەڵە

بوو، کە مرۆڤ تێیدەکەوێت، کاتێک دەیەوێ کۆمەڵگا بۆ تاریکی یا ڕووناکی بجووڵێنێت، هەر لەپڕێ ڕۆژنامەکان دژی کەوتنە بابەتگەلی دوا بەدوای یەک، کە گەورەترین جەنجاڵی بەدوای خۆید هێنا.

سەرەتا وتارەکانی ڕاگەیاندن ئاسایی بوون، بەدەجاڵ تاوانباریان کرد، لەشانۆگەرییە گەڕۆکەکانی دەستی بە کرێ گرتنی ئەکتەرەکان دەکرد، هەر لەو وتارانەی ڕۆژنامەکان چاوپێکەوتن لەتەک ئەندامانی پێشووتری پەرستگای گەلان کرا و کۆمەڵێک ئەکتەر دانیان بەوە هێنا، کە جۆنز بە فێڵ ئەو کارانەی دەکرد، چاوپێکەوتنیان لەتەک ئەو ژنە لاق شکاوە کرد، کە جۆنز وایلێکرد بڕوات بەڕێوە، ئەو ژنە گوتبووی، گشت ئەوانە نمایش بوون و هیچی تر، چاوپێکەوتنێکی تر کە شێرپەنجەی زەلامێکی لەجەستەی پیاوەکە دەرهێناوە، گۆشتێکی مردووی بەرز کردووەتەوە و پیشانی ئامادەبووانی داوە، ئەو پیاوە دانی بەوەدا هێناوە هیچ نەخۆشییەکی نەبووە، تەنها بەو کارە خزمەتی کڵێسەی کردووە.

دواتر بابەتەکان پەریان سەند و چاوپێکەتنیان لەتەک ئەو ئەندامانە دەکرد کە وەک نارەزایەتییەک لە پەرستگای گەلان لێی جیابوونەوە، ژمارەیان دەگەیشت دە کەس، دانیان بەوەدا هێنا کاری بەدکاری لەو پەرستگایە کراوە، جیم جۆنز وەک خواوەند خۆی دەرخست، ئاو هاتنەوەی بەقەد ئاو هاتنەوەی مەسیح بەهێزە. جۆنز بەرامبەر بەو کێشەیەی یەکەم هەنگاوی ڕاستی نا، بێدەنگی هەڵبژارد و هیچ بەرسڤێکی نەدانەوە، تەنانەت باسی لەبێ گوناهی خۆیشی نەکرد، چونکە بانزین ئەگەر ئاگری لێ نەدەی، ئاور ناگرێت، تەنانەت وتارەکانی ڕاگەیاندنیش ئەگەر وەڵامێک نەدرێنەوە، دەنگۆکە ئاسایی دەبێت،

وەلێ ئەگەر کاردانەوەی بوو، تۆش بەگژیاندا چوویتەوە، ئەوا لە بەرزترین پلەو پایە خلۆرت دەکەنەوە.

دواجار جۆنز بە مریدەکانی ڕاگەیاند هەرچی ڕۆژنامەیە هەموو ژمارەکانی بکڕن، ئەوە چارەسەر نەبوو، وەلێ بۆ وشک کردنەوەی سەرچاوەی وزەی شەیتانەکان بوو، ئەوجا جۆنز چارەسەری بنەڕەتی بەکار هێنا، کە تا ئەمڕۆش دونیا باسی لێوە دەکەن.

بیری لە دەرچوون کردەوە، نەک هەر لە ئیندیانا بەڵکو لە هەموو ئەمریکا، تەنها هەر خۆیشی نا، لەتەک هەموو شوێنکەوتووانی، هەر وەک دەرچوونی ئیسرائیلییەکان لە میسرەوە بۆ خاکی فیردەوس کە تا هەتایە تێیدا بژێن.

دەنگی جیم جۆنز لە وتارەکانیدا بەرزەوە بوو، هۆرەی بە خاکی چاوەڕوان کراوەوە دەگوتەوە، کە بە ئارامی و ئاسایشی تێیدا دەژێن، هەر مرۆڤێک چی بوێت دەیکات، بێ ڕەگەزپەرستی، دوور لەچینایەتی، تەنها ئێمەو منداڵەکانمان بە ئاشتیانە بژێین، دوور لە ئەمریکای ڕەگەزپەرستی تاوانبار، کە هەژارەکان لە هەژارترین چینن و دەوڵەمەندەکانیش لە دەوڵەمەندترین چینن، وەلێ لەوێ، لەفیردۆس کەس لە کەس باشتر نییە، هەر هەمووان یەکسانن، هەر هەموویشیان یەکتریان خۆش دەوێت و برای یەکن.

هەر ئەوە ڕوویدا، لەپڕ جیم جۆنز بۆ دەوڵەتی ئەمریکای باشوور گەشتی کرد، کەس هیچیان دەربارەی نەدەزانی، وڵاتێک بەناوی (جۆیانا)وە لە نێو دارستانێکی چڕ شوێنێکی بۆ خۆی هەڵبژارد، زەوییەکی لەوێ کڕی و خانووی لەسەر بینا کرد، لەنێو ئاوایییەکانی دونیادا ئاوایییەکی تازە هاتە کایەوە، ناوی جۆنزتاون بوو، شاری جۆنز، فیردۆسی سۆسیالیزم و خەونی خۆش، کە دونیا تووشی شۆک کرد.

هەزار کەس ماڵ و موڵک و کەسوکار و شوێنی خۆیان جێهێشت و کەوتنە دوای شەیتان بۆ خاکی چاوەڕوانکراو، لەوێ هەموو ئەوەی پەیمانی وێدابوون، دۆزیانەوە، یا هەر وەک ئەوەی مەزەندەیان کردبوو، جۆنزتاون گوندێک بوو بەدووری چەندین میل بە دارستان دەور درابوو، لەناوەندی گوندەکە کوخێکی گەورە و فراوان بینای سەنتەر بوو، لەناو سەنتەرەکە قوتابخانەو نەخۆشخانەو گۆڕەپانی یاریکردن و تەنانەت شانۆشی تێدا بوو، پیاوەکان لە کوخی تایبەت دەژیان و ژنان و منداڵانیش لە کوخی تایبەت بەخۆیان، ئەوانەش کە هاوسەرگیرییان کردبوو، لە کوخی تایبەت بە هاوسەرگیران دەژیان، هەر کوخێکیش 10 کەسی تیا نیشتەجێ بوون، لەسەر جیوبانی دوو قەرەوێڵەی بانەو بان یەک وەک هی زیندانییەکان دەنووستن، هی هاوسەرگیرانیش قەرەوێڵەکانیان لەیەک جودا بوو، هەر هەمووان لێرە لە هەڵهاتنی خۆرەوە تا ئاوابوونی کاریان دەکرد، سێ ژەم خواردنیان دەخوارد، شەوانیش دەکەوتنە گۆرانی و سەما کردن، ڕووی شوکرانەشیان لە ئاسمان دەکرد.

لەپڕ کەسێک لە ئەمریکا ڕاپەڕی، ئەو پیاوەی جۆنز کوڕە منداڵەکەی دزیبوو، وایدەرخستبوو کوڕی خۆیەتی، وەک گەمییەک سیکسی لەتەکا دەکرد، تیمۆسی ستۆن.. کە باوکی منداڵەکەبوو لەنێو هەموو ئەو خێزانانەی خۆشەویستانیان لەتەک جۆنز کۆچیان کردبوو، تیمۆسی بڕیاری دا، شەڕێکیان لەتەکا بکات، بۆ گەڕانەوەی کوڕەکەی، سەردانی هەموو ئەو ماڵانەی کرد، کە یەکێکیان لەتەک جۆنز بۆ خاکی دۆزەخ کۆچی کردبوو، ئەو نیشتمانەی جۆنز دروستی کردبوو، کۆمەڵێکی پێکهێنا و ناوی ( کەس وکاری پەیوەندیداران)ی لێنا، هەموو کەسانی نزیکی قوربانیانی تێدا کۆکردەوە، هەموو بەڵگەنامەو دانپێنانەکانیان لەلایەن ئەندامانی پێشووی دژ

به جۆنز بوون، تا بۆ هەزار ساڵ حوکم بدرێت، تیمۆسی هەر هەموو ئەوانەی هەڵگرت و بەرەو واشنتۆن کەوتە رێ، زۆر بوێرانە خۆی بە کۆنگرێسی ئەمریکیدا کرد، سوێندی خواردبوو، دەرنەچێت تا حکومەتی ئەمریکی نەجووڵێت.

تیمۆسی گوێبەنێکی گەورەی لە کۆنگرێس نایەوە، ئەندامێکی کۆنگرێس پیاوێکی دڵ نەرم بوو، بەدەنگ کێشەکەی هاتەوە، ئەویش (لیۆ رایان) بوو، بڕیاری دا دنیا لە جیم جۆنز بهێنێتە دەنگ و ئاور لەژێر پێی بکاتەوە.
ئەو شەوانە هەرچی کەناڵ و ڕاگەیاندنی ئەمریکابوو هاتنە سەر خەت، هەرچی خەڵک بوو هاواریان بەرزەوە کرد و دلوایان لە حکومەتی ئەمریکی کرد بجووڵێت، کۆنگرێس هاتە دەنگ و بڕیاری دا کۆمەڵێک لێکۆڵەر لە ئەندامانی کۆنگرێس لەتەک (لیۆ رایان) و زۆرێک لە کەس و کاری پەیوەندیدارەکان و زۆرێکیش لە ڕاگەیاندنکارەکان و وێنەگران سۆسەی حاڵەتەکە لە جۆنزتاون بکەن، ڕۆژێکبوو، لە مێژووشدا تا ئەمڕۆ حاڵەتی وا ڕووی نەداوە.
لەوێ لە ناو جەرگەی جۆنزتاون، جۆنز وتاری دەدا، وەلێ ئەمجارە مێشکەکانی بە ئەفیونی قسەگەلێکی تایبەتی بۆ دەکردن، جۆرێک لە بکوژ، هاواری تیایان دەکرد و بیری دەخستنەوە:

- ئەی پێست ڕەنگاو ڕەنگەکان ژیانتان لە ئەمریکا چۆن بوو؟ خەڵکی چۆن تەماشای دەکردن، قەد ڕۆژێکی خۆشگوزەرانتان بینی؟ دڵێکتان بینی بەزەیی پیاتانا بێتەوە و خۆشتانی بوێت؟ کەس دەستی سۆزی بەسەرتانا هێنا؟من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە هاتووم، بە هەناسەی ڕوحی پیرۆز هاتووم، بۆ ئەوەی بیرتان بخەمەوە کە ئێوە لای خودا مرۆڤی خۆشەویستن، وەلێ ئەو

دەوڵەتەی ناوزەدم کرد، وازتان لێ ناهێنن، سووتان دەکەون تا لەقژتان ڕابکێشن و دەیانەوێ بتانگێڕنەوە ناو ڕەگەزپەرستی خۆیان، ئامادەن خۆشەویستانم لەتەکیان بڕۆنەوە؟ ئەی گەلی من باوەڕتان پێکردم.

بەدەم هاوار کردن و گریانەوە:

- توومەتی قێزەونم دەدەنە پاڵ، وەک چۆن مەسیحیان توومەت بار کرد و لەخاچیاندا، ئەی کوڕانی پەرستگا لێدەگەڕێن لەخاچمان بدەن؟

خەڵکەکە بە (نا) هاواریان لێ هەستا...

- بە جل و بەرگە پۆشتەکانیان و بە سیمای درۆزنەوە بۆ ئێرە دێن، لێتان دەپرسن هەست بەچی دەکەن، پێتان دەڵێن ئەمریکا دایکە بە سۆزەکەتانە و گرنگیتان وێدەدات، ئەو دایکەی ڕۆژێک لە ڕۆژان هیندییە سوورەکانیان قڕ کرد، ئەوجا بانگەوازی وڵاتی ئازاسیان دا، ئەو دایکەی نەبوونیتان تیا بینی، دەزانن چییان پێ دەڵێین؟ پێیان دەڵێین بڕۆن بۆ دۆزەخ.

دەکەونە چەپڵە ڕێزان...

- من چاک ئەمریکا دەناسم، بە یارییەکانیان دەزانم، کاتێک دەڕۆنەوە، سوپایەک پڕ چەک دەکەن و دەدەنە سەرتان، پیاوانێکی چەک بەدەست کە دەست لەکەس ناپارێزن، ژن بێت یا منداڵ، وەک چۆن لە ڤێتنام گێڕایان.

ئەگەر هاتن قڕمان بکەن و شکۆمان بنێنە ژێر پێیانەوە، من ئەمڕۆ پێتان ڕادەگەێنم چی دەکەین. دەزانن چی دەکەین؟ وا لەجیهان دەکەین بەسەرهاتمان بگێڕنەوە، نەک وەک تیرۆریست وەک ئەوەی پیلانی بۆ دەگێڕن لەناو ڕۆژنامەکانیاندا بینووسن، ئێمە وەک پاڵەوان دەردەکەوین، تا لەئێمەوە

تێبگەن کۆمەڵگای بێ جیاوازی و دەسەڵاتێکی دادپەروەر بێتە کایەوە، هەر هەموو خەڵک یەکسان بن، ڕەتکردنەوەی ڕەگەزپەرستی، ئا ئەوەیە ئاینی هەق، نەک ئەو ئاینەی لەمینەرەکانەوە هاواری بۆ دەکەن.
دەزانن ئەگەر هاتن بۆ قڕ کردنمان چی دەکەین؟ دەزانن چۆن بە بێ چەک بەرەنگاریان دەبینەوە، ڕێ نادەین بەو دەستە قێزەونانەیان ژیانمان بەرن و دواتریش ئەوەی نەشێت لەسەرمانی بنووسن، ئێمە بۆ خۆمان ژیانی خۆمان وەردەگرین، ئێمەین کە خۆمان دەکوژین.
هاواریان لێ هەستا و خوێنیا هەڵچوون...
ئاوها هەزار کەس موگناتیساوی خەو دەکەیت، واشدەکەیت هاوار بەناوتەوە بکەن، تۆش فەرمانیان پێدەدەیت خۆیان بکوژن، تێگەیشتیت؟ جۆنز نمایشی چۆن خۆ کوشتنی بێ ئازاریانی دەکرد، مەشقی تایبەتیانی دەکرد، کە بوو بە نیوەشەو زەنگەکانی ئیش پێ دەکرد، هەر وەک ئەو زەنگانەی بۆ جەنگ لێدەدران، لەمایکرۆفۆنەکەشەوە وتارێکی دەدا، شەوی سپی، شەوی سپی، شەوی سپی، خەڵکەکەش لە خەوەکان بێدار دەبوونەوەو بەرەو ناوچەی سەنتەر بەڕێدەکەوتن، دەیانبینی لەسەر مینبەرەکە وەستاوەو دەیەوێ وتار بخوێنێت، دەڵێت:
ئەگەر بارودۆخ وایکرد خۆمان بکوژین، ئەوە پێویستە مردنێکی جەنگاوەرانە بێت، بۆ سەرفرازی جیهان، حەتمەن مەردنێکی ئازاراوی نابێت، ئێمە ئەم خواردنەوەیە دەخۆینەوە، بەچێژە کە تامی توو دەدات، تێکەڵە بە ژاری سیانید، دەمرین و دەستی یەک دەگرین، جوانترین مردن دەمرین، دەمرین بێ ئەوەی هەستی پێبکەین، مرۆڤایەتی ئەم مردنەی ئیمە دەکات بە مێژووی جەنگاوەرەکان.

بێ ئاگاکان بەدەر لەو هەمووە، هەر هاواریان دەکرد.

بەدەر لەو خوێن گەرمییەیان، مارسلین دوودڵبوو لە ستیڤانی کوڕی، کە لە جیم بووبووی، نووکە هەژدە ساڵانە، ئەگەرچی سۆزانی کچی جۆنز باوکی جێهێشت کە زانی مێشکی تێکچووە، وەلێ ستیڤان لە جۆنزتاون لێلیاندا دەژیا، حەزی بە تۆپی باسکە بوو، تا باوکی کردی بە سەرۆکی تیمی باسکەی جۆنزتاون، تەنانەت وایکرد یارییەکیان لەتەک جۆرجتاون بۆ رێکبخات، وەک یەکەم هەنگاو بۆ دانپێدانانی تیمی جۆنزتاون لە شارەکە.

هەر بەڕاستی تیپەکە چەندین یاری فەرمی کردبوو، ستیڤان بۆ یەکەمجاری بوو ئامادەی یاری ببێت، مارسلین هاتە لای ستیڤانی کوڕی داوای لێکرد بە زووترین کات لەتەک تیپەکە بە بیانووی یاریکردن شارەکە جێ بهێڵێت، پێیگوت هەر هەموو ئەو خەڵکەی شارەکەیان دەمرن، کوڕی خۆم منیش نامەوێ بمریت، دەبێت بژێیت، تۆ کوڕمی، بەدەر لەوەی جۆنز رێگر بوو کوڕەکەی بڕوات، وەلێ بە بیانووی یاریکردنی تیپەکە رێی پێدا.

* * *

ئەندامی کۆنگرێس (لیۆ رایان) لەگەڵ کۆمەلێک لە خەڵکیی دوای ماندووبوونێکی زۆر بەنێو دارستانەکە لە جۆنزتاون دابەزین، گەشتێک لێی حاڵی دەبیت ئەوانەی لە جۆنزتاونن حەز بەوە ناکەن تێیدا دەربچن. خەڵکەکەی جۆنزتاون لە بینای سەنتەری شارەکە کۆبیبوونەوەو بەدەم گۆرانییەوە سەمایان دەکرد، ئەوەو خواردن و خواردنەوە دڵیانی خۆش کردبوو، رایان و لێکۆڵەرەوەکان لێرەو لەوێ لەتەک خەڵکەکە دادەنیشتن و پرسیاری هەموو شتێکیان لێ دەکردن: ئەم شوێنەتان پێ باشە یا باش

نییه؟ کەسێک دژ بە ئارەزووەکانتان ئێوەی دەستبەسەر کردووە، کەس ئازارتان دەدات، یا بەشێوەیەکی ناشرین ڕفتارتان لەتەکا دەکات؟ وەڵامەکان لە لایەن خەڵکەکەی (جۆنزتاون)ەوە ئەو شوێنە باشترین جیگایە بە نسیبمان بووە، تا نەمرین تیا دەرناچین.

ڕاگەیاندنکارەکان و وێنەگران ڤیدیۆی ئەو گەلە دڵخۆشەیان گرت، ڕاگەیاندنکارەکان باوەڕیان نەدەکرد ئەو خەڵکە چۆنە وا لەناو دارستان خۆشگوزەرانن، ئەی ئەو هەموو سکاڵایەی لە ئەمریکا دژیان دەرچووە، چین؟ نەیاندەزانی جیم جۆنز پاشای مێشک گەمژاندنیانە، تەنها دوو ڕستە لە وتارەکەی بەرامبەر بە مانگێک لە وتارەکانی کڵێسەکانە کە مێشکیانی گەمژە کردووە.

بۆ پاراستنی ئاسایشی جۆنزتاون دەبوو جۆنز پاسەوانی چەکداری تایبەتی هەبێت، ناویانی لێنابوو بەتالیۆنی سوور، لەناو ئاهەنگەکان بە چەکەوە بڵاو ببوونەوە، سۆسەی خەڵکەکەیان دەکرد، نەبادا دژ بە جۆنز قسەیەکیان لە زار دەربچێت، بەتایبەت ئەمریکای تاوانبار، بەدەر لەوەی مێشکیانی گەمژاندبوو، هەندێکیان هەستیان دەکرد دەستبەسەرن، جۆنز تەنها زمانێکی درێژە و هەر هەموویانی بەرەو فەوتاندن دەبات. کاتێک یەکێک لە لێکۆڵەرەوەکان بەنێو خەڵکەکەدا دەگەڕا و پرسیاریانی لێ دەکردن، کەسێک شانێکی لێدا، بەو ئاوایەی بە ڕێکەوت شانی بەرکەوتووە، لێکۆڵەر (لێری) تەماشای ئەو کەسەی کرد، داچەمییەوە و کاغزێکی لەسەر زەویەکە هەڵگرت و دایە دەست لێکۆڵەرەکە و پێیگوت:

- گەورەم داوای لێبووردنت لێدەکەم، ئەم کاغزەت لێ بەرەوە بوو.

کابرا بزەیەکی بۆ (لیڕ) کرد و دوور کەوتەوە، (لیڕ)ی لێکۆڵەر کاغزەکەی کردەوە و بینی تیا نووسرابوو:

" تکاتان لێدەکەم لێرە دەرمبهێنن، من و مۆنیکای کچم دەربکەن" واژۆ (فێرتۆن) لێ بە کاغزەکەوە خۆی گەیاندە (ڕایان)ی ئەندام کۆنگرێس و کاغزەکەی پێدا، بەدزەیەکەوە ئیشارەتی بۆ ئەو پیاوە کرد، کە کاغزەکەی پێداوە و ناویشی (فێرتۆن)ە، ڕایان لە فێرتۆن نزیکەوە بوو، کە لەناوەڕاستی خەڵکەکە بوو، لەتنیشت فێرتۆن وەستا و بزەخەنەیەکی دیبلۆماسییانەی بۆ کرد، چون ئەوەی خۆشڕفتاری لەتەکا بکات، بە فێرتۆنی گوت:

- هەر بەڕاست تۆ دەتەوێ لێرە بڕۆی؟

- بەڵێ، تکاتان لێدەکەم خۆم و کچەکەم لێرە دەربهێنن.

ڕایان بەدەم تەماشا کردنی بەر پێی خۆی، گوتی:

- بەیانی هەردووکتان لەناو فڕۆکەکە لەتەکمانا دەبن.

پیاوەکە بە ترسەوە گوتی:

- ناتوانین تا بەیانی چاوەڕوان بین، تۆ ناترسێی لێرە لەخەتەردای، ئەم شوێنە دۆزەخە.

بەدەر لەو وتە ترسناکەی شەوێ هیچ ڕووی نەدا، کە بەیانی لە جونزتاون بووەوە، مارسلین بۆ دواجار لەتەک هەندێ لێکۆڵەر پیاسەی دەکرد و باسی ژیانی جۆنزتاونی بۆ دەکردن، بەتایبەت نەخۆشخانەکەو باخچەی منداڵان و قوتابخانەکە، بە شانازییەوە باسی لەخۆشگوزەرانی منداڵەکان دەکرد، دواتر جۆنز لەتەک ئەندامی کۆنگرێس پیاسەیان دەکرد، ڕایان بە جۆنزی گوت:

- پانزه کەس لە هۆزەکەت داوایان لێ کردووین لەتەکمانا بڕۆن، ئەوە چۆن لێک دەدەیتەوە؟

جۆنز بە دەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوە:

- با بڕۆن، ئەوان لێرە باشتریان دەست ناکەوێت بۆ ژیان، بەڕێز ڕایان ئەو پیاوە لەوێ دەبینی؟

ڕایان ئاوڕی دایەوە فێرتۆنی بینی، ئەوەی کاغزەکەی پێدابوو، جۆنز گوتی:

- فێرتۆن خۆی و کوڕەکەی هاتن بۆ جۆنزتاون لەتەکمانا بژێن، ئەمڕۆش داوای لە بەڕێزتان کردووە ئێرە جێبهێڵێت، خۆی و خۆشەویستەکەی ئێرە جێبهێڵن، وەلێ ئەوەی تۆ نایزانی، فێرتۆن بەچاکی زانی کوڕەکەی لێرە لە جۆنزتاون جێبهێڵێت، دەزانیت بۆ دەیەوێت کوڕەکەی لێرە جێبهێڵێت؟

ڕایان گوێی بۆ شل کرد، چون ئەوەی ئامادەیە حاڵی بێت، جۆنز گوتی:

- ئەو چاک دەزانێت ژیانی کوڕەکەی لە ئەمریکا دەبێت بە دۆزەخ، ئێوە زۆرتان ماوە تا سیستەمی ڕەگەزپەرستی هەڵوەشێننەوە، منداڵێکی ڕەشپێستی وەک ئەوە هەلی ژیانی شکۆمەندی لە ئەمریکا بۆ ئەو کوانێ.

ڕایان دەستی نایە سەرشانی جۆنز و گوتی:

- بەڕێز لە قسەکانتەوە هەست بە خەمت دەکەم، خەمی ناوێت، 15 کەس لەنێو هەزار کەس لات دەردەچن، بۆ کۆنگرێس دەگەڕێمەوە، پێیان دەڵێم ئەو شەست کەسەی لەتەکمانا چووبوون بۆ هێنانەوەی کەس و کاریان، کەس لە کەسو کارەکانیان ئامادە نەبوون بگەڕێنەوە، پێشیان دەڵێم هەموو شتێک لە جۆنزتاون باشە، تۆش پیاوێکی باشیت.

تیمەکە و پانزە کەسەکەی لەنێو هەزار کەسی جۆنزتاون داوایان کردبوو بگەڕێنەوە.

❊ ❊ ❊

جۆنز بەسەر مینبەرکەوە وەستا، تا شەرابی مەستبوون بەگوێی بێ ئاگاکاندا بکات، جۆنز گوتی:

- حکومەت هات و ڕۆیشت، پانزە لە نەوەکانی ئێمەی برد، دەزانن لەوێ لەتەکایان چی دەکەن؟ دادگاییان دەکەن و دەیانخەنە توونی زیندان تا بۆگەن دەکەن، ئەوەندە نابات و بەچاوی خۆتان دەبینن ئاسمان سەرباز بەسەرمانا دەبارێنێ، ئەوەندە زۆرن لە ژماردن نایەن، گوولە بارانمان دەکەن، هەر وەک ئەوەی ئێمە بەراز بین و بمانکوژن، بە گەلی ئەمریکای مەزن دەڵێن، چووین بۆ ئەوەی ئازادیان بکەین، ئێمەیان بە تیرۆریست لێک دایەوە، دەستیان لێ کردینەوە. ئێوە خۆشەویسترین کەسی منن، مەزنترین شتێکیش کە ڕوو دەدات، چاوپێکەوتنەکانتانە کە ڕاگەیاندنەکان لەتەکتانا کردیان، ئەودەم دونیا تێدەگەن چۆن شارێکی جوان درووست بکرێت، دوو زمانی تیا نەبێت، دەوڵەمەندی نەفرەتلێکراو و تاوانباری تیا نەبێت، لە ئێمەوە فێر دەبن کۆمەڵگایەکی درووست بێننە ئاراوە، سادەو جوان کەس ئێرەیی بە کەس نەبات، شارێک وەک جۆنزتاون.

کەسێک هاتە لای جیم و بەگوێیدا چرپاندی، خۆی ڕێکخست و درێژەی بە وتارەکەی دا، ئەمجارە دەنگی مژدانەی لێ هەڵبڕی و گوتی:

- ئەی گەلی جۆنزتاون ئا لەم چرکە ساتەدا، کە ئێمە سەرقاڵی قسە کردنین، کەچی تیمی کۆنگرس لە ئامادەباشیدان بۆ ناو فڕۆکەکانیان، بەم بۆنەوە بەتالیۆنی سوور لە کوڕە بە ئەمەکەکانمان لێیان هاتنە دەست و گوللەبارانیانیان کردن، هەر هەموو تیمەکە بە پانزە کەسەکەی خۆشمانەوە کوژران، وان لەناو خوێنی خۆیان، دەزانن بۆچی وامانکرد؟

بێدەنگی خەڵکەکە بۆ خۆی چاوەڕوانی وەڵامی جۆنز بوو:

- تا دووجار بیر نەکەنەوە، ئەو دەنگەی ناختان وەسوەسەتان نەکات، جێگرەوەی ئەوەش هەیە کە لەسەری ڕێککەوتووین، دوای ئەو کوشتارەی تیمی کۆنگرێسی ئەمریکی نەک هەر سەربازمان بەسەرا دەبارێنن، بۆمب بارانیشمان دەکەن، ئەمڕۆ ئێمە دژایەتی دەوڵەتێک دەکەین، ئەوەش بۆیە دەکەم، سوور دەزانم ئەگەر کەسیشمان لێیان نەکوشتایە، دەستبەرداری قڕ کردنمان نەدەبوون، ئەی گەلە چاو نەترسەکەم، ئێوە لەم جیهانە تاکن، ئێوە مێژووی مرۆڤایەتین، ئێوەن یەک دەست بەرامبەر سەرمایەداری دڕندە وێستانەوە، کە هەموو شتێکیان بۆ خۆیان دەوێت، ماڵ و حاڵی خۆمان جێهێشت، لەبەر کێشەیەک باوەڕمان پێبوو، کۆمەڵگایەکی یەکگرتوو پێکبهێنین، باوەڕمان بە ڕەگەزپەرستی نییە، کۆمەڵگای جۆنزتاون کۆمەڵگەیەکی مرۆڤ دۆستە، ئێمە وانەیەک بە مێژوو دەڵێینەوە قەد لەبیر نەچێتەوە.

- ئەی جۆنزتاونەکان ئەمڕۆ ڕۆژی کۆتایی مەزن و نەمرەکەیە کە هەموومان دەینووسینەوە، بە پیرۆزیی ڕوحی پیرۆز ڕوحمان دەگاتە شانشینی ئاسمان، دەستمان لەناو دەستی یەکدا، لەناو دەستی منداڵەکانمان کە لەتەکمانا ئەو گەشتە پیرۆزە دەکەن، و...

مارسلین کە گوێی لەدواین قسە بوو، هاواری کرد، ویستی شتێک بڵێت، وەلێ پاسەوانەکان دەمییان بەست و پەلکێشیان کرد و لە ژوورێک بەندیان کرد، بەدەر لەوەی ڕەزامەند بوو لە خۆکوشتنی بەکۆمەڵ، وەلێ بۆ منداڵەکان ڕازی نەبوو، ڕوحی ئەوەندە نەشێوابوو بگاتە کوشتنی منداڵەکان، دەمبەستن و باڵ بەستن و بەندکردنی مارسلین بەو شێوەیە نامەیەکبوو بۆ هەموو ئەوانەی گوێیان ڕاسێرابوو، ئەگەر مردن بە شەرابی ژاراوی نەبێت، ئەوا بەدەستی پاسەوانەکان دەبێت، ئەوە بەهێزترین خاڵی وتارەکە بوو.

بەرمیلەکانی دۆشاوی توو بە سیانید تێکەڵ کراو بەسەر شانی پیاوانی جۆنزەوە هاتن، بەرمیلەکانیان لە گۆڕەپانی سەنتەرەکە داناو دەست بە ئاهەنگ کرا.

دەبوو بەر لەگەورەکان منداڵەکان بمرن، ئاهەنزووڵەی دایکان بەرزەوەبوو، منداڵەکان لە یاریکردندا بوون، وایاندەزانی یارییەکی تازەیە، لە خۆشیا بۆ یاریە تازەکە لەکێبڕکێدا بوون، یەکەم پەرداخ لەبەرمیلەکە هەڵکێشرا و درا بە یەکەمی ڕیزەکە، کاتێک شەرابەکەی نایە سەرەوە، لەخۆشیا هەڵدەبەزی و هاواری دەکرد ئەو شەرابە چەند بە تامە، یەک لە پاسەوانەکان باوشی پیا کرد و لەبەر چاوان دووری خستەوە، بەتایبەت ئەو دایکەی ئاواتەخوازبوو بەر

لەمنداڵەکەی بیخواردایەتەوە، وەلێ بۆ چرکەیەکیش مردنی کوڕەکەی بە بەرچاویەوە نەبینیبایە.

سێ سەد منداڵ خەندەیان لێ بڕا، ڕوحیا بەرزەوە بوو، ئەوجا پیاوان و ژنان ڕیزیان بەست، ئەگەرچی ئەوە تابلۆیەکی سیریالییە کەس ناتوانێت لەوێنەکێشانی سەرکەوتوو بێت، ڕەگەزگەلێکی ڕەنگا و ڕەنگ لەنێو دارستانێکی گومرا وەستاون، ژمارەیان خۆی لە شەشسەد کەس دەدات، شەرابی ژاراوی بە دۆشاوی (توو)وەوە دەخۆنەوەو بەردەبنەوە، بەسەر یەکا کەڵەکەبوون، ئەوە دوای مردنی منداڵەکان بوو.

لەنێو ڕیزەکان شەیتان سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو وتاری دەگوت، دەیگوت:

- هەموو پەیامبەرکانی پێشە ئەو گوتبوویان ناتوانیت ژیانم لێ بستێنیت، ئەوە موڵکی منە، ئەگەر دەستت درێژ کرد کۆتایی بە ژیانم بهێنیت، ئەوا خۆم کۆتایی بەژیانی خۆم دێنم، چاکترە لەوەی بیدەمە دەستی تۆ کۆتایی پێ بهێنیت، ئەوە موڵکی تۆ نییە، کە هاتووین و لێرە گردبووینەتەوە، لەم گردبوونەوە پیرۆزە بانگی ئاشتی دەدەین، نەهاتووین بۆ جەنگ، نەشهاتووین بۆ توونداو تیژی و ڕق کینە هەڵگرتن، ئێمە لەدەست گشت ئەوانە هەڵهاتووین، وەلێ لێمان ناگەڕێن، خیانەتمان لێ دەکەن، وەک چۆن خیانەتیات لە مەسیح کرد، ئەمڕۆ شوێنکەوتووی مەسیح دەبین، بۆ لای مەسیح بەرز دەبینەوە، لەتەک منداڵەکانمان بەرامبەر خودا دەوەستین، دەست لەدەستی یەک بنێن، لەتەک یەکا بمرن، دوو دڵ نەبن لەوەی بۆی هاتووین.

کەسانێک هەبوون ڕەتیانکردەوە شەرابەکە بخۆنەوە، وەلێ ئەو کەسانە لە لایەن پاسەوانەکانەوە مێشکیان دەپێکرا، ئەوانی دواتر ترسان، پێیان باشتر بوو شەرابەکە بنینە سەر، مرۆڤ بەردەوام زۆڵمی دەکرد، بێ ئاگان، تا هەنووکەش...

ژمارەکان لە کەمیان دەدا، بەردەوام بەدوای یەک بەردەبوونەوە، جۆنز لە هاواری خۆی نەدەکەوت:

- گوێ بەهاوار و گریان و لالانەوە مەدەن، مردن هەزار جار باشترە لە دەرۆژ ژیان کە ئەوان دەیانەوێ، ئێوە چاک دەزانن چی لەوان چاوەڕوان دەکرێت، ئامادە بن بۆ ئەوەی بۆی هاتوون، ڕێ مەدەن کەس ژیانتان ببات، ئەگەر نەتوانین بە ئاشتییانە بژێین، با بە ئاشتییانە بمرین.

مارسلین لە ژوورەکە دەریانهێنا، بلەز بۆ لای جۆنز ڕۆیشت، تا لەبارو دۆخەکە حاڵی بێت، بینی لەسەر زەویەکە کەوتووە، دەمی کراوەتەوەو بەنێوچەوانیشیەوە چاڵێکی بە فیشەک پێکراو، ئەو خەڵکەی بینی بەسەر یەکا کەوتبوون، ئەوەشی بۆ ناو دارستانەکە هەڵهات، مایکرۆفۆنەکە بێدەنگببوو، هەر هەموو بەوای ژارەکەوە مردبوون، مارسلین پەرداخەکەی لە بەرمیلی ژارەکە هەڵکێشا و نایە سەرەوە، دوایین قوربانی بەسەر خاکی جۆنزتاون بەرەوە بوو، شەیتان کۆتایی ئەو چیرۆکەی بەدەستوخەتی خۆی نووسیەوەو وارژۆی کردبوو.

بێدەنگی هەمووانی گرتەوە، فرمێسک بەچاوانی ژنانەوە هاتە خوارەوە، چاوانی پیاوانیش ئەبڵەق بووبوون، بەدەر لەوەی لەدوورەوە کارەساتەکەم بیست، وەلێ گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە لە کەسێکی نزیک لە ستەمکار وات لێدەکات

حاڵەتەکە تێبگەیت، وەلێ ئەو حیکایەتە کێشەیەکی نایەوە، چون دووفاقییەکی دەروونی لە چاوانی دانیشتواندا لەنێوان بەزەیی و ڕق لەتەک جۆنز، لەناخەوە لەرزم لێهات، بەڕاستی مرۆڤ سۆزدارە، دەتوانیت بە قسە بیانگریتە خۆت، چی وەک زمانە، ژنە هیندییەکە لەنێو فرمێسکەکانیدا گوتی:

- من باوەڕ ناکەم ژن بتوانێت دەستی بچێتە کوشتنی منداڵەکەی، نەک تەنها ژنێکیش، بەڵکو زۆرێک لە ژنان، ئەوە چ شێتییەکە تووشیان بووە؟ بەڵکو ئەوە چ شەیتانێکە ؟!

سۆزان گوتی:

- خانم باوەڕم پێبکە، من لە جۆنزتاون ژیاوم، لەتەک خەڵکەکەی مامەڵەی ژیانم کردووە، ئەوان گەورەترین توێژن سادەو دڵساف ڕەزامەند بەو ژیانەیان، ئەوان قوربانین.

دانم بەخۆما نەگرت و گوتم:

- باسی کام باشی دەکەیت؟ ئەوانە تاوانبارن بەدەستی خۆیان منداڵەکانی خۆیان کوشت، ئێستاش لە دۆزەخ تا هەتایە دەسووتێن.

تەماشای سۆزانم کرد، فرمێسک بەچاوانیەوە هاتە خوارەوە و گوتی:

- حوکمیان بەسەرا مەدە، تۆ لەتەکیانا نەژیای، ئەوانە ئاشتیخواز بوون، تەنانەت دەمەقاڵی بچووکیشیان لەتەک یەکا نەبوو، زۆربەیان بەدەست پاسەوانەکانەوە کوژران، خۆیان نەکوشت.

شارلۆتان بۆ گۆڕینی بابەتەکە هاتە بەینەوەو گوتی:

- سۆزان خاتوون، تۆ گوتت باوکت بە فیشەک کوژرابوو، خۆی خۆی کوشت، یا یەکێک کوشتی؟

سۆزان سەری داگرت و خەم دایگرت و گوتی:

- باوکم پیاوێکی زۆر سالّح نەبوو، ترسنۆک بوو، هەرکاتێک گوێی لەناوی حکومەت بوایە ڕەنگی دەبووە زەردەچەوە، ئەگەر ئازابوایە، لەو شەرابە ژاراوییەی دەخواردەوە، مردنێکی بێ ئازار بوو، پێموابێت باوکم دەیویست دوای کوشتنی ئەو خەڵکە هەڵبێت، یەک لە پاسەوانەکان کوشتی.

ئایەتێکی قورئانم بیر هاتەوە" کاتێک شەیتان کردەوەکانیانی بۆ ڕازاندنەوەو گوتی ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێت و بێگومان من پەنادەرو پارێزەری ئێوەم، ئەمجا کاتێک هەردوو دەستەکە ڕوو بە ڕووی یەکتر بوونەوە، شەیتان پاشەو پاش خۆی کشاندەوەو گوتی، بەڕاستی من بەریم لە ئێوە، ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن"

(شرۆڤە سورەتی ئەنفال، ئایەتی 48)

سۆزان بەخەمبارییەوە قسەکەی تەواو کرد، دۆش دامابوو، چون ئەوەی بیر لەشتێک بکاتەوە:

- دوای ئەوەی دایبابم منیان لە هەتیوخانە گرتە خۆیان، باوکم بەردەوام ئەوەی دەدایە بەرگوێم " کچە نەفرەتلێکراوەکەم کەڵکی هیچی نییە" لەدوورەوە گوێم لەدەنگی بوایە لەرز دەیگرتم، کە گەورەبووم، زۆر لەلایان نەمامەوە، لێیان دوور کەوتمەوە، باوکم بەری لێگرتم تا نەڕۆم، چینێکی باش لێیدام، تا خۆم لێیان دزییەوە.

ژنە هیندییەکە هەستایە سەر پێ و دەستی نایە سەر سەری سۆزان چون ئەوەی ئارامی بکاتەوە، نازانم چۆن بوو، تەماشای ئەو کچە سەرپۆش بەسەرەم کرد، کە لێلماندابوو، ئەوەی گوێمان لەدەنگی هەر نەبوو، هیچ کۆمێنتێکیشی لەسەر هیچ شتێک نەدەکرد، دەمانبینی خەم بریبوویەوە، چاوەکانی کارێگەری بەسەرهاتەکەی سۆزانیان بەسەرەوە بوو، پیاوێکی تەمەن شەست ساڵ لەتەنیشتیەوەبوو، ئەو پیاوە قژە سەری نەرمی زیوینی هەبوو، تەماشای سۆزانی کرد و گوتی:

- خاتوون، چیت لەجۆنزتاون بینی وایلێکردی هەڵبێی؟ جیم جۆنز سیستەمێکی سۆسیالیزمی لەوێ دانەهێنابوو، دادپەروەری بۆ هەمووان دەستەبەر بکات، خەڵکەکە بەو ژیانەیان دڵخۆش نەبوون؟

سۆزان فرمێسکەکانی سرییەوەو گوتی:

- ئێمە لە جۆنزتاون بینیمان پاسەوانەکان لوولەی تفەنگەکانیان ڕوو کردبووە ئێمە، هەر هەڵەیەک یا تەوەزەڵییەک لە کارکردن، بەرامبەرمان توندو تیژ دەبوون، ئەگەرچی زۆربەی دانیشتوانی جۆنزتاون پیر و منداڵبوون، تەنانەت باوکیشم لە پەیامەکەی ڕاستگۆ نەبوو، کەڕەتێک گوێم لێبوو لەتەک بەرپرسێکی شوعی دەیگوت من بێ باوەڕم، باوەڕم بە ئاین نییە، کەچی لای خەڵکەکەشی دەیگوت من نێردراوی خودام، شتگەلێکی سیکسی قێزەونی لەتەک ژنان و ئەو منداڵەی دزیبووی دەکرد، پێم شەرمە باسیان بکەم، ئەوە بەشێکی ئەو هۆکارەن وایلێکردم لەو شوێنە هەڵبێم.

هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

- له جۆنزتاون تۆ بەتەواوی لە جیهانی دەرەوە دابڕاوی، نە تەلەفۆن و نەیش تەلەفیزۆن لەوێ هەبوون، تەندرووستی و خوێندن لەوێ دیاری کراو بوو، کەسە نزیکەکانی جۆنز پشکی زیاتریان لەهەموو شتەکاندا هەبوو، کێشە گەورەکە باوکم بوو، دەستی بە بەکارهێنانی مادەهۆشبەرەکان کردبوو، ئەویش لەکاتی وتارەکانیدا هەستم پێکرد، دەمی تێک دەئالاو زمانی لاڵەپەتەیی بوو، چون ئەوەی گوێ لەوتاری گەمژەیەک بگریت، خوورەوشتی نامۆ بوو، وەک ئەوەی بە ئاشکرا میزی دەکرد، باری تەندرووستی خەراپ بوو، تەنانەت لە ڕۆیشتندا دەبوو یەکێک دەستی بگرێت.

شارلۆتان کێشای بە مێزەکە و گوتی:

- بەڕێزان با وابێت، ئەمە کۆتایی دانیشتنەکەمانە، خاتوو سۆزان هەر هەموومان دڵمان لاتە، ڕوحی هەموو قوربانیانی جۆنزتاونیش ئارام و شاد بن.

خەڵکەکە بڵاوەی لێکرد، دابەزیمە باخچەکە هەناسەیەکی پاک و خۆش هەڵمژم، توێبە بە سەرزەنشتییەوە پێی گوتم:

- کاکە شێخ، ئەوەی لەوێ باست کرد هەڵەبوو، ئەو داماوانە فێڵیان لێ کرابوو، چۆن دەڵێیت وان لە دۆزەخدا؟

بەتووڕەییەوە لێم ڕوانی و گوتم:

- توێبە قسە بە فەرموودەکانیاندا دێنیتەوە؟ ئەوانە کافرن، خوا نەناسن، هەر هەموویان بۆ ناو ئاگرن، خودا نەیگوتووە ( (وەهەر کەسێک دوای هەر

ئاینێک بکەوێت جگە لە ئاینی ئیسلام ئەوە لێی وەرناگیرێت وە ئەو لەڕۆژی دواییدا لەزەرەرمەندانە ))

شرۆڤەی سورەتی ئالعەمران ئایەتی 85

توێبە بە حیرسەوە گوتی:

- کاک شێخ (یەبتەغی) یانی داوای ئاینێک دەکات بێجگە لە ئیسلام، ئەوان ئیسلامیان نەزانیوە تا داوای بکەن، گەمژەبوون و شەیتان زەفەری پێهێناون، تۆ کلیلی دۆزەخ و بەهەشتت پێ نییە، تا...

لەدڵی خۆم ورد بوومەوە و ئامادەی تووڕەییم لەناخا هەڵچوو:

ئەوەی من دەمەوێ بیڵم ئەوەیە کە خودا فەرموویەتی و هیچیشم بۆ زیاد نەکردووە.

پشتم تێکرد و بەرەو ناوەوەی دارستانەکە بەڕێکەوتم، باخچەکەم بوارد، تا بزانم ئەودیوی چی لێوە دیارە، دیمەنێکی تا بڵێی دڵگیر و جوان گۆمێکی گەورە و ئاوێک چون زوڵاڵ، مانگی لەباوەش گرتبوو، بەسەریەوە وەستام و بیرم لەوە دەکردەوە کە گوێم لێبوو، نازانم تۆرەی من کەی دێت قسە بکەم، ئەگەر ڕیزبەندییەکەیان بە پێی ناونووسینی هاتنی خەڵکەکە بێت، ئەوا من دەکەومە کۆتایی هەموویان.

- شێخی پیرۆز سەرمایەداری چۆن دەبینیت؟

هەر بە نرکەی دەنگەکەی ناسیمەوە، کە لە فیشکەی مار دەچوو، ئاوڕم لێ دایەوە، لەپشتمەوە تەماشای گۆمەکەی دەکرد، بەڕاستی پێمگوت:

- سەرمایەداری سیستەمێکی هەڵەیە، دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر دەکات و هەژارەکانیش هەژارتر.

بە چاوە شینەکانی دیقەتی چاوەکانی دام، هەستم کرد لەتاریکیدا دەدرەوشێنەوە، گوتی:

- ئەی سۆسیالیزم؟

پێمگوت:

- سیستەمێکی هەڵەتر لە سەرمایەداری، وادەکات دەوڵەمەندەکان لە وڵات هەڵبێن، نەوەک کەسێک یا لایەنێک دەس بەسەر موڵک وماڵەکەیدا بگرێت.

زیاتر لێم هاتە پێش و لە خوارمەوە تا تەوقی سەرمی ڕوانی و گوتی:

- تۆ چارەسەرت هەن؟

دڵم خورپەیەکی کرد و وەختەبوو دۆش دامێنم، هەنگاوێک لێی چوومە دواوەو گوتم:

- بەڵێ، سیستەمی ئیسلامی.. زەکات و سوود و سەلەم.

ئیزنم لێ خواست و بەجێمهێشت. ئەوە چ تێڕوانینێکە لەو چاوانەی؟ سەروسیمایەکی ئاسایی هەیە، ولێ تێڕوانینەکانی دڵ دەخەنە دڵەڕاوکێ، تەنانەت قسەکردنیشی هەندێجار هەست دەکەیت نائاساییە، هەندێجاریش جیددیە و بەهێزە، مێشکی خۆمم لێ داتەکاند و بەرەو ژوورەکەی خۆم ڕۆیشتم تا ئەو شەوە بەخەو بەسەر بەرم.

ڕۆژی دواتر، کەمێک لە دانیشتنەکە دوا کەوتم، شتێکم بەدی کردبوو، چون ئەوەی کتێبخانە لەو ئۆتێلە هەبێت، چوومە هۆڵی دانیشتەنکە، دیاربوو چاوەڕوانیان دەکردم، شارلۆتان بە تووڕەییەکەوە دیقەتی دام، سەرم بۆ دانوواند وەک لێبووردنێک بۆ دوا کەوتنەکەم، بلەزیش چاوم بە ئامادەبوواندا خشاند، کورسییەکەی سۆزان چۆڵ بوو، شارلۆتان پێیگوتم:

- خاتوو سۆزانیش ئێرەی جێهێشت، پێمگوتبوون ئەوەی چیرۆکەکەی تەواو کرد ئەگەر نیازی ڕۆیشتنی هەبوو، دەتوانێت بڕوات، پێویست ناکات تا کۆتایی کۆنفرانسەکە بمێنێتەوە.

وەک ڕەزامەندییەک سەرم بۆ ڕاوەشاند، شارلۆتان هەناسەیەکی هەڵکێشاو تەماشایەکی پیاوە شەست ساڵەکەی کرد و گوتی:

- بەڕێز تارت ئەمڕۆ ڕۆژی تۆیە، سەربردەی نهێنی ڕوحی مەزن ، گشت گوێڕایەڵی سەربردەی داکشانی ئەستێرەییەکەت دەبین.

3

# داکەوتنی ئەستێرەیی

---

**تشارلز تارت دەیگێڕێتەوە**

( (بەدرێژایی تاقیکردنەوەکانم لەسەر داکەوتنی ئەستێرەیی لەپرسیاردابووم، ئاخۆ بەو توانەیە گەیشتووین کە پێغەمبەرەکان هەیانبوو))

---

ساتگەلێک لە سرپبوونێکی بە چێژ، بەنێو ڕوحی قەمچکراومدا ڕۆچوو، کاتێک جەستەم بە تەواوی بەسەر کورسییە کانزاکەی نەخۆشخانەوە شل و شاو کرد و پێکانیشم بەسەر کورسییەکی بەرامبەر درێژ کرد، چون ئامادەگییەک بۆ سەرخەوشکاندن، نازانم نەخۆشخانە بە ئیدارە گەمژەکەیەوە چ پێویستی بە پزیشکێکی دەروونی وەک من بۆ نۆرەکاری دوای نیوەشەو هەیە، کێشەکە ئەوەیە من پزیشکێکی ئاسایی نیم، ئەو پۆستەم بواردووە بۆ پلەی پرۆفیسۆر و دەبوو...

لەتەک خەواڵوو بوونم هۆشیشم ڕۆیشت، جەستەم خەو بردیەوە، تەواو لەشم شلەوە بوو، لەپڕ بەسەر کورسییەکەوە بەرەوەبووم، ئەویش بەوای زەنگی ئاگادار کردنەوە لەتەواوی نەخۆشخانەکە، چرای سووری سەر هەموو دەرگاکانیش پێبوون، ئەوەش مانای ئەوەیە کارەساتێک هەیە، سەرقاڵی لەپێکردنی پێڵاوەکەم بووم، هەر کە دەرگای ژوورەکەمم کردەوە، بینیم هەموو

مرۆڤەکانی ناو نەخۆشخانە بە پەلە بۆ یەک ئاراستە ملیان دەنا، ناچار منیش دوایان کەوتم، سەردانیکەرێکی نامۆ لەژووری نەخۆشە پیرەکە بەڕێز (ئیشیدا) لەخۆیەوە کەوت و مرد، کامێرای چاودێری سەردانیکەرەکەی دەرخست بەوریاییەوە لەقەرەوێڵەکەی (ئیشیدا)ی نووستوو نزیک دەبووەوە، کە لەبێهۆشیدا بوو، دواتر سەردانیکەرەکە لەجێی خۆی وشکەوەبوو، چاوەکانی دەرپۆقین و خوێنیش لەدەمیەوە هات، بوو بەلاشەیەکی بێ گیان، چون ئەوەی شەیتانی نەفرەتی بینیبێت.

پۆلیسی پشکنەرەکە بەدیاریەوە دۆش دامابوو، پشکنینەکانی کە بۆ مردووەکە کرابوو، بێخەوش بوو، جەستەی هیچ نەخۆشییەکی نەبوو تا بیکوژێت، بەلای پزیشکەکانەوە حاڵەتێکی زۆر سەیربوو، بە گرتەی کامێرای چاودێرییەکە زیاتر لەسەدجار پیا چوونەوە، هیچ شتێکیان لە ژوورەکە نەبینی جووڵەی هەبووبێت، تەنها سینەی بەڕێز (ئیشیدا) نەبێت، کە زۆر لەسەر خۆ هەناسەی دەدا، بەوای بێهۆشییەکەی کە بە پێی راپۆرتی پزیشکی بێهۆشیەکەی نزیکەی ساڵێک دەخایەنێت، (ئیشیدا)ی پیرە پیاوی ملیاردێری ژاپۆنی دەیتوانی ئەو نەخۆشخانەیە بەناوئاخنەکەشیەوە بکڕێت.

کێشەکە دژ بە نەزانراو قەمچ کرا و لە دۆسێ لەبیرکراوەکاندا هەڵگیرا. چەند رۆژێک بەسەر کێشەی ناو نەخۆشخانەکە تێپەڕی، دوو زەلامی ژاپۆنی پاڵیان بە عارەبانەیەکی پێچکدارەوە دەنا، کە پیرەژنێکی ژاپۆنی بەسەرەوە بوو، لە کامێرای چاودێرییەوە تەماشایانمان دەکرد، بەدیار قەرەوێڵەکەی (ئیشیدا)

وەستان و دوو زەلامەکە لەتەک یەکا قسانیان دەکرد، دواتر لە ژووری (ئیشیدا) دەرچوون، لەکاتی دابەزین بۆ گۆڕەپانی نەخۆشخانەکە، تیمی پزیشکی سەیریان پێهات، کە بینییان زەلامەکان تووشی (فێ) هاتن و بەرەوە بوون، پیرەژنەکەیش بەسەر عارەبانەکەوە سەری بۆ سەر سنگی لارەوە بوو، هەرسێکیان لەهەمان ساتەوەختدا مردن، کێشەکە دەنگی دایەوە، تەنانەت دوای چەند کاتژمێرێک بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەبابەتەکە پۆلیس ئەو ناوەی کۆنترۆل کرد.

پیاوێکی لەڕولاوازی ژاپۆنی هات و لە کامێرای چاودێرییەکە وردەوە بوو، گوێی لە هەر سێ کەسەکە گرد، کە لە ژووری (ئیشیدا)ی ملیاردێر بە ژاپۆنی قسانیان دەکرد، قسەکانیانی لەسەر کاغزێک نووسیەوە، کورتەی قسەکان وابوو.. ئەو پیرەژنەی سەر کورسییە پێچکدارەکە خوشکی (ئیشیدا)یە و دوو زەلامەکەش کوڕین، ئەو پیاوەش کە پێش چەند ڕۆژێک سەردانی (ئیشیدا)ی کردووە، برا گەورەکەیەتی، هەر هەموو ئاواتەخوازی مردنی (ئیشیدا) بوون، تا وەرەسەکەیان بەسەرا دابەش بکرێت، وەلێ پیرە ملیاردێری ڕێوی وەک بەو شێوەیە ناوزەدیان دەکرد، وابەستەی ژیان بوو، گیانی بەدەستەوە نەدەدا. پیاوە ژاپۆنییە لاوازەکە لەنووسینەوەی ڕاپۆرتەکەی بووەوە، لەپڕێ ئەویش لەرز دایگرت، لەسەر کورسییەک دانیشت، من یەکەم کەسبووم وەک پزیشکی دەروونی قسەم لەتەکا کرد، بەڕاستی قسەیەکی زۆر سەیری بۆ کردم.

گوتی زۆری دەربارەی بەڕێز (ئیشیدا)ی بیستووە، تەنها یەک شرۆڤەش بۆ مردنەکان هەیە، کە بەسەر هەموو ئەوانەی لەم دواییەدا سەردانیان کردووە، لە کەلەپوری ژاپۆنی دا هاتووە، کاتێک کەسێک کینە لەدڵ دەبێت بەرامبەر کەسێکی تر، ئەوا بەشێک لە ڕوحیانەتی لەجەستەی دەردەچێت و دەکەوێتە ئازاردانی ئەو کەسەی بەرامبەری، ئەو بەشەی ڕوحیانەتی کە بۆ تۆڵە سەندنەوە لە جەستەی جیا دەبێتەوە، بە (ئیکیرۆ) ناوزەد کراوە، ئەوەش باوەڕبوونێکە چون ئێرەیی، بەسەرهاتی بنەماڵەکەی (ئیشیدا) زانراوە، براکانی پیلانیان دژی گێڕا و کوڕەتاقانەکەیان کوشت، تا وەرەسەکەیان بۆ بمێنێتەوە، ئەوانیش لەبەرامبەر ئەو قسانەی لە ژوورەکەیدا کردیان، پێدەچێت ڕوحیانەتی ئیکیرۆکەی تایبەت بە (ئیشیدا) دەرچووبێت، هەر هەمووشیانی کوشتبێت، ئەفسانەکە وا داهاتووە، ئەو حاڵەتە لە کاتی دەردێکی زۆر گەورە یا لەکاتی بێهۆشیدا ڕوو دەدات، ئەوەش ڕێک لەتەک ڕوحی بەڕێز (ئیشیدا) دەگونجێت.

لێکۆڵەرەکە بە شێوازێک بەسووکی بەسەر شانی شارەزا لاوازەکەدا کێشا، وەک ئەوەی بڵێت ئەوەی گوێ لەگەمژەیەک ڕابگرێت، دەبێ دواتر سۆزێکی بەرامبەریدا هەبێت، بەهەرحاڵ پاڵیان پێوەناو یەک وشەیەکیشیان لەڕاپۆرتە پڕوپووچەکەی وەک گوزارشتیان لێوە کرد نەنووسیەوە، دووبارە کێشەکە بەرامبەر نەزانراوێک قەمچ کرا و خرایە دووتوێی دۆسیەکەوە، من و پەرستارە جوانەکە (زۆیا) بوو بە مشتومڕمان، کە تەڵفیسی بە وشەی (ئیکیرۆ)دا

هاتەوە، منیش مشتومڕەکەم لەتەکیدا لەوەوە داهات ڕەنگە شتێک لە ڕاستی تێدا بێت، لەکۆتاییدا زۆر بە ڕوونی پێمگوت:

-ئەگەر بەڕاستی باوەڕت بە هیچ و پووچی بابەتەکەیە، بۆ ناچیت بۆ ژوورەکەی (ئیشیدا)و لەبەرامبەری قسەی ناشرینی پێبکەیت، بەوای ئەوەی زۆر ماندووی کردووی لە پەرستاریەکەت ئاواتەخوازی مردنی ئەویت، وەک ئەوەی هیچ سوودێکی نەبێت؟

زۆیا بێ سێ و دوو بەرەو ژووری (ئیشیدا)ی نووستوو بەڕێکەوت، تەماشایەکی (ئیشیدا)ی کرد و قسەی ناشرینی پێکرد، ئەوجا ژوورەکەی بەجێهێشت و هاتەوە ناو ژووری کامێرای چاودێری، برادەران بە هاتنەوەی زۆیا ئارام بوونەوە، زۆیا بە پەرداخێک (چا)وە چوون ئەوەی لە پاڵەوانێتییەک گەڕابێتەوە.

زۆیا لەتەکمانا دانیشت و کەوتە زۆربلێی لەسەر ئەفسانەکان و چۆنێتی گواستنەوەی بۆ عەقڵی زانست و هۆشیاری مرۆڤ، دواتر بێدەنگبوو، ئێمەش بێدەنگبووین و تەماشای چاوە لەرزۆکەکەیمان کرد، گەردنیشی دەهاتەوە یەک، دەستەکانیشی بەترسەوە دەلەرزین، ئەوجا چاوەکانی سپی هەڵگەڕان و سەریشی بەلادا هات، هەموومان ترس دایگرتین و خۆمان بەدیوارەکەوە نووساند، لەدەمی (زۆیا)وە کەفاوێکی سپی هاتە دەرەوە، بەسەر دەموچاویدا کەوت و مرد.

لەژیانی هەموو مرۆڤێک گرتەیەک هەیە و دواتر ژیانی وەک خۆی بۆ ناگەڕێتەوە، تەنها گرتەیەک بیرکردنەوەت دەگۆڕێت، دووریش نییە باوەڕبوونت تەواو بگۆڕێت، گرتەکەی زۆیا ئەوە گرتەی ژیانی بوو، بیرمە ئەو ڕۆژە لەو نەخۆشخانەیە و ئەودوای نەخۆشخانەکانی تریش دواین کارم بوو، بۆ ماوەیەکی زۆر لەماڵەوە دانیشتم، بەردەوام لە پەنجەرەکەم دەڕوانی، بیربڵاوانە بیرم لەو دڵۆپە ئاوانە دەکردەوە کەدادەهاتن و دواتر بەهەڵم دەبوون، تەنانەت بڕیارێکی بڕیاردەرمدا، کە وەک من نییە ئەو جۆرە بڕیارە بدات، بڕیارمدا بگەڕێمەوە بەر خوێندن، ئەوە چ خوێندنێکە کە مرۆڤ بیری لێ دەکاتەوە دوای ئەوەی بە پلەی پرۆفیسۆری گەیشتووە و مووچەکەشی بەشی ساڵێک لەگوزەرانی خێزانەکەی دەکات، گشت ئەو شتانەم وەلا نا و بڕیارمدا بکەومەوە بەر خوێندنی شتێکی جیاواز، کە پێش من بیری لێ نەکراوەتەوە، لەبەر ئەوەی لە زانستی (ماددی)دا زانایەک نییە بەهەموو توانای عەقڵییەوە بەشێک لەکاتی خۆی تەرخان بکات بۆ شتێکی نادیاری دوور لە مادییەتەوە، کە خەڵکی لەقسەو باسەکانیاندا و لە ئاینەکانیاندا باسی دەکەن و زانستیش گوێی پێنەداوە، تەنانەت زانست نایەوێ بیر لە بوونیشی بکاتەوە، زۆر بەئاسان و ئاسایی پێیدەڵێن ڕوح.

ڕوح بەربەرەکانی زاناییمان دەکات، کاتێک جەستە لەبەرامبەرماندا نقەی لێ دەبڕدرێت، هەموو ئامێرەکانیشمان بەجوانی کار دەکەن، لە هەموو خانەکانی شلەی ژیانەوە دەخەینە گەڕ، وەلێ کەسەکە مردووە، هەموو پەرتووکێکی

تەندرووستی لەسەر زەوی پێت دەڵێت ئەو کەسە یا ئەو ئامێرە زیندەکارە هەڵبەتە دەبێت ئیش بکات، هەموو شتێک تێیدا لێدەدات و باروبۆخەکەی زۆر باشە، وەلێ تەنها یەک شت لە چرکەیەک نامێنێت و هەموو شتێک کۆتایی پێ دێت، شتێک پێی دەڵێین ڕوح، ئەگەر پزیشکانی هەموو دونیا گردبنەوە، بیانەوێ ئەو جەستەیە بۆ ژیان بگەڕێننەوە، هیچیان پێ ناکرێت، کە ئەو ڕوحە لە جەستەدا ون بوو یا دەرچوو، مەحاڵە مردوو بە بێ ئەو ڕوحە بژێت.

بۆ خوێندن لە بواری ڕوح لەهەموو یاساکانی ماددە دابڕام، کە زانست پێی بەڕێوە دەچوو، ئەو بیربۆزانە با بۆ دۆزەخ بچن. خوێندنم لە بواری ڕوح چەندین ساڵی خایاند، هەموو شتێکم دەربارەی ڕوح خوێند، دواتر پەیوەندیم بەشوێنێکەوە کرد، زانستی خۆم ئاسای تێدابوو، ئەویش سەنتەری لێکۆڵینەوەی زانستی دەروونی ڕوحیانەت بوو، زاناکانی ماددە دژی ئەو سەنتەرە بوون، ناویان نابوو سەنتەری کات بەفیڕۆ بردن، ئەندامانی سەنتەرەکە زۆر سەرسام بوون پیاوێکی وەک من بەو پلە زانستییەم چوومە ناویان، لەسەررووی سەنتەرەکە دایاننام، تا هەموو ئەو تاقیکردنەوانە ببەمەڕێوە کە دەیەوێ ڕوح بدۆزێتەوە، کۆمەڵگای زانستی هەڵمەتی داخستنی سەنتەرەکەیان دا، ناچار بووین ناوی سەنتەرەکە بە زانکۆی سۆفیا بگۆڕین، ما لەپاڵ تاقیکردنەوەکانمان وانەی تیا بڵێینەوە.

لەناوەندی وانە وتنەوەکانم کە ڕووپۆش کردن بوو بۆ تاقیکرنەوەکانم بۆ ئاشکرا کردنی ڕوح خەریکی تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینە بووم، ئەگەرچی سەنتەرەکە لەڕاستیدا تەندرووستی بوو، دۆخی بیهۆشیشمان وەردەگرت، کە تۆشدەری دەستی لێ شووشتبوو، یەکەم تاقیکردنەوەم لەسەر شێتێک بوو، دوای ئەو حاڵەتە کەوتم کە دەمانزانی و دڵنیاشبووین ئەمڕۆ دەمرێت، نەخۆشەکەم لەسەر تەرازوویەکی زۆر هەستیار دانا، کێشەکەیم بەر لەمردنی کێشا، دواتر دوای ئەوەی ڕوحی تیا نەما، کێشامەوە، هیچ نەبێت بە پێوانەی یەک لە هەزار گرام کێشەکەی دەبوو دابەزێ، کێشی مردووەکە هەر وەک خۆی بوو، بەو ئاوایە بێت کەواتە ڕوح کێشی نییە.

بەدواداچوونم بۆ هەندێ حاڵەتی تری مردن کرد، بە تیشکی سەروویی بنەوشەیی چاودێری ژووری نەخۆشەکەم کرد کە لەسەرەمەرگدا بوو، بەو ئاوایەی دەرچوونی ڕوح ببینم، هیچم نەبینی، کەڕەتێکی تر سۆسەی نەخۆشێکی ترم کرد ئەویش لەسەرەمەرگدابوو، ئەوجارە بەتیشکی نەبینراوی ژێر سوورەوە، لەوەش بەهیچ نەگەیشتم، دواتر دووربینی گەرماوزەی موگناتیزیشم بەکارهێنا، هەر بێ سوود بوو، چون ئەوەی ڕوح دۆخێکی سرووشتی نەبێت، تا بەچاو یا ئامێری هەستیار ببینرێت، شتێک بە هزرمدا هات، هەندێ گیانەوەرمان هێنا و لە ژووری نەخۆشەکە دامانناو، بەو هیوایەی ئەگەر ئامێرە هەستەوەرەکان دركیان پێنەکرد، وەک لەناو خەڵکیشدا باوە کە گیانەوەرکان هەستەوەرترن بۆ بینینی ڕوح، چاودێری گیانەوەرەکەمان

کرد، ئەمە خوایە گوێ قووت کاتەوە، یا هەست ڕابگرێت، یا چاو بۆ شتێک بگێڕێت، لەوەشدا بەهیچ نەگەیشتین، نائومێدی سەنتەرەکەی گرتەوە.

دوای ڕامانێکی قووڵ بەمێشکمدا هات، بۆ ئاشکرا کردنی ئەو شتە نابێت بە ڕێگایەکی باو بێت، کە لەسەری ڕاهاتووین، بەڕێکەوت شتێک بەخەیاڵما هات، دەرگای سەنتەرەکەمان واڵا کرد، بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئەزموونیان هەیە کە لەسەرەمەرگدا چی ڕوودەدات، دوای ئەوەی ڕۆژنامەی زەرد چاوپێکەوتنیان لەتەکا دەکردن و هەرایان دەنایەوە، سەنتەرێکی زانستی پێشوازی لێ دەکردن و تاقیکردنەوەی بەکۆمەڵی زانستی بۆ لێکۆڵینەوە لەهەموو ئەوەی دەیانگوت.

گوێمان لەقسەکانیان دەگرت، ئەوەی لەسەری ڕێککەوتبووین ئەوانەمان لێ وەردەگرتن، مەحاڵە کۆمەڵێک مرۆڤ یەکڕابن لەسەر گێڕانەوەی یەک شت و لەدواییشدا قسەی پڕوپووچ بێت، لەقسەکانیاندا شتێکی هاوبەشمان بەدیکرد، کە هەموویان هاوڕابوون لە گێڕانەوەیاندا، جیاوازیمان لە گێڕانەوەکانی سەرەمەرگدا نەبینی، دەیانگوت خۆیان لەدەرەوەی جەستەی نیمچە مردوویاندا دەبینی، دەوروبەرەکەشیان بە ڕوونی دەبینی، خۆشیان لەدەرەوەی جەستەیاندا بینیوە، دەیانگوت لە گۆشەیەکی ژوورەکە دەوەستان و تەماشای پزیشکەکانیان دەکرد، کە بە شۆکی کارەبایی هەوڵی ژیانەوەیان دەدان، هەندێکیشیان دەیانگوت گوێیان لە لە پزیشکەکان بووە، هەواڵی مردنی

ڕاگەیاندوون، لە دەرەوەی ژوورەکە گوێی لە شین وهاواری کەس و کاریشی بووە.

شتێکی تریش ئەوپەڕی سەرسوڕمانە، ئەوەبوو هەر هەموویان لەگێڕانەوەکانیاندا باسیان لە تونێلێکی درێژ کردووە، لەکۆتایی توونێلەکە ڕووناکییەک دەرکەوتووە، هەندێکیشیان نەیانتوانیوە توونێلەکە ببڕن، ئەگەر واماندانا شتێک لە درۆیان تێدابووە، ئەی بۆچی هەر هەموویان باسیان لەتوونێلەکە کردووە، بۆچی کەسێکیان نەیگوتووە دەرگا یا پەنجەرەیەک هەبووە؟ بۆچی هەر هەموویان لەسەر توونێلەکە سوور بوون، ئەمەو بەدەر لە ڕەگەز و ئاستی ڕۆشنبیرییان و باروئۆخیان و خوورەوشتیان جیاوازبوو، کەچی هەموویان لەسەر بابەتی توونێلەکە سوور بوون.

وەک مەسیحییەک وابزانم ئەو توونێلە کە هەموویان بینیویانە (پەتکی زیوین)ە کە لە پەرتووکی پیرۆز باسی لێوە کراوە، تێیدا هاتووە کە خودامان لەبیر نەچێت، بەر لەوەی پەتکی زیوینمان لەجەستە جیا بێتەوە، کە ڕوح بەجەستەوە دەبەستێت، مەزەندەی ئەوە دەکەم گەشتی ڕوح بۆ دەرەوەی جەستە بەو پەتکەدا ڕەت دەبێت و لێیەوە دەردەچێت و دەبێتە هۆی مردن.

هەموو ئەوانەم بە وردی لە توێژینەوەیەکی زانستیدا تۆمار کرد، بێگومان بە وشەیەکیش باسم لە پەتکی زیوین نەکرد، لێدوانەکانم هەموو تۆمار کرد و گونجاندنم لەنێوانیاندا ڕێکخست، هەر هەموو توێژینەوەکانم تەواو کرد، بەهیچ شتێک نەگەیشتم. بەلای زانستەوە تەنها سەربردەو گێڕانەوەی دەماو دەمە،

بۆ متمانە کردن هیچ شتێکی تێدا نییە، چونکە بەتاقیکردنەوە تاقیناکرێتەوە، بەو پێیە بڕیارماندا تاقیکردنەوەکانمان بەرزتر بکەینەوە، بۆ بازی داکشانی ئەستێرەیی.

* * *

ئەوانەی گەیشتنە سەرەمەرگ، یاخود بڵێین لە مردن نزیک بوونەوە، ڕوحیان لەجەستەیان جیا بووەتەوە و لەجەستەی خۆیان و کەس و کاریانیان ڕوانیوە، وەلێ لەم جیهانەدا بنیادەمگەلێک هەن، لەهەچ کاتێکدا بیانەوێ بەخواستی خۆیان ڕوحیان دەردەهێنن و دواتر دەیگێڕنەوە ناو جەستەیان، ئەوانە (وەک باسیان لێوە کراوە) بە ڕوحیانەوە لەناو ماڵەکانیاندا و لەدەرەوەی ماڵەکانیاندا دەگەڕێن، چون ئەوەی توانای شەیتانیان بەدەست هێنابێت، ئەو توانایەیان بە داکشانی ئەستێرەیی ناوزەد کراوە، هەر لەگەڵ ڕەزامەندی سەنتەرەکەمان بۆ داواکردنی ئەو جۆرە لەخەڵکی و تاقیکردنەوە لەسەریاندا، ئێمەیان لە خانەی زانستی درۆزنە دانا، بەچاوی خۆمان ئەو وتارە تەڵفیسیانەمان خوێندەوە لەهەندێ گۆڤاری زانستیدا بڵاو کرابووەوە، کە بەرامبەر سەنتەرەکەمان کرابوو، وەلێ ئەوە کۆڵی پێنەدام، زیاتر لەسەر ئەو بابەتە سوور بووم.

ڕاشکاوانە دەڵێم: ئەو نموونانەی بۆ سەنتەرەکە دەهاتن، ڕێک لەگەڵ وەسپەکەمان بوون کە شێتۆکەن، گەنجت دەبینی لەوانەی ڕەشیان لەبەرەو گوارە لەگوێ بوون، پیاوانگەلێک چاویان بە کل ڕشتوو، ژنگەلێک ماکیاژی

ڕەشیان بەدەموچاویانا ساویبوو، بۆ خۆشتان ئەو جۆرە کەسانە دەناسن؟ لە گێڕانەوە هیچ و پووچەکانیاندا دەستمان بە گوێمانەوە دەگرد، هەموو لە تاقیکردنەوەکان شکستیان دەهێنا، کێشەی ئەوانە ئەوەیە هەوڵی ئەوە نەدەن، لەڕێی وەهمی دەروونییانەوە فێڵ لەخەڵکی بکەن، ئەوانەش کە لەشەقامەکان و لە شانۆکاندا خەڵکیان هەڵدەخەڵەتاند، وەلێ کە بەرامبەر تاقیکردنەوەیەکی زانستی دەبوونەوە، بەو ئامێرە هەستیاریانەی هەن، هەستت دەکرد قسەی پڕوپووچ بەولاوە هیچ شتێکی بەڵگەداریان پێ نییە، دیمەنی ڕەشپۆشییەکەشیان تەنها شێوازێکە بۆ ئەوەی متمانەیان پێبکرێت.
یەکەم کەس نەبووم کە لەسەر گۆی زەوی تاقیکردنەوەی زانستی لەسەر داکشانی ئەستێرەیی بکەم، حاڵەتێکی خەتەرناک بوو، پێشی من تاقیکردنەوەی تر کراوە، ئەوانیش تووشی درۆی کەسەکان بوونە، کە ئامادەگییان بۆ تاقیکردنەوەکە هەبووە، بەناوبانگترینیان کارە شاراوەکانە، زاناکان تیمێکیان لەو داکشانی ئەستێرەییە هێناو کارتیان بۆ شاردنەوە، بەمەرجێک لەبەر چاویان نەشاردرێتەوە، داوایان لێکردن شوێنی کارتەکان بدۆزنەوە، لەوەشدا شکستیان هێنا. کۆمەڵگای زانستی ئەو پیاوەی بیر ناچێتەوە، کە گوتبووی دەتوانێت ڕوحی لەجەستەی دەربکات، بەڕادەیەک گوتبووی دەتوانێت ئاسمان بگەڕێت، زاناکان داوایان لێکرد وەسپی ناو هەسارەی موشتەری بکات، کە تا ئەو ڕۆژە زاناکانیش وەسپی هەسارەکەیان نەدۆزیبووەوە، ما پیاوەکە وەسپی هەسارەکە بکات، شتگەلێکی باس کردبوو،

زۆر ورد بینی تیا بوو، دواتر که زانست وەسپی هەسارەکەی دۆزییەوە، ئەوەی بۆیان ڕوون بووەوە سێ لەسەر چواری وەسپەکانی پیاوەکە ڕەڵەبوو، ئەو بەشەی لە چوار بەشەکە زانیاری گشتی بوو.

بەدەر لە هەموو شتێک تاقیکردنەوەکانم تەواو کرد، داوای نموونەی زۆرترم کرد، ئەوەی دەمویست هاتە دی، تاقیکردنەوەی سەرکەوتووم بەدەست هێنا، هەندێجار ڕێکەوت لەم تاقیکردنەوانەدا ڕۆڵی خۆی دەبێت، تەنانەت تاقیکردنەوەی زانستیش سەرکەوتوو دەبێت و دەشێ بۆ دووبارە کردنەوە، هەر بەڕاستی تاقیکردنەوەکانم دووبارە کردەنەوە، دیسان سەرکەوتووبووم، خەڵکانێکم دەستکەوت زۆر بە وردی باسیان لەو شتانەی نهۆمی سەرەوە دەکرد، کە بۆی سەرنەکەوتبوون، بەتایبەت شتگەڵێکمان لەنهۆمی سەرەوە دانابوو، بەمەزەنەش نەدەدۆزرایەوە.

جەختم لەو کەسانە کردەوە و بەشێوازی تر هەندێ دەرئەنجامم دەست کەوت، ڕاست نەبوون، وەلێ یەک کەسێک لەنێو هەموویاندا لەهەموو تاقیکردنەوەکان سەرکەوتوو بوو، خانمێکی تەمەن چل ساڵ بوو، ڕەتیکردەوە ناوی خۆیمان پێ بڵێت، چەندمان کرد هۆکارەکەی پێنەگوتین، بۆخۆمان ناومان نا خاتوو (Z)، بینیمان ملوانکەیەکی پیتی زێدی ئینگلیزی لەگەردندا بوو.

ئەو ئافرەتەم سوێند دەدا هەچ زانیارییەکی لایە کە چۆن بەو توانایە گەیشتووە پێمیبڵێت، دەخەنییەوەو تەماشای زەوی دەکرد و دەیگوت ئەگەر جیهان شتێکی لەم توانایە پێبزانێت، کێشەی زۆر ڕوو دەدات، خەڵکانی

دەروون نزم بەکاری دەهێنن. هەرچەند هەوڵم لەتەکیدا دا، بێسوود بوو، ڕۆژێکیان پێمگوت:

-خاتوو (Z) (Z) دەزانیت ئەگەر توانیمان بوونی ئەو داکشانی ئەستێرەییە بسەپێنین، ئەوە تەنیا دەلیلی زانستی دەبێت بۆ بوونی ڕوح؟ تۆش دەبیتە هۆکاری باوەڕ کردنی زۆرێک لەخەڵکی بەو خودایەی ڕوحی خوڵقاندووە؟

بەشێوازێکی بڕێک لە توونددی گوتی:

-ئەگەر ئەوان پەرتووکی پیرۆز بخوێننەوە، دەیانزانی مەسیح بە خەڵکی دەگوت چییان لەماڵەوە کۆکردووەتەوە، دەینازانی ئەم داکشانی ئەستێرەییەش هەقە، ئەو توانایەش خودا بەو بەندانەی خۆی دەبەخشێ کە مەبەستێتی.

خاتوو (Z) مەسیحی نەبوو، سەرپۆشی موسوڵمانانی بەسەرەوە بوو، دووریش نەبوو موسوڵمان بێت، وەلێ هیچ شتێکی لەو بارەوە پێنەگوتین، بینیم سووربوون لەسەر داواکارییەکەم کەوایلێکرد هەندێ قسە بنێتە دووتوێی قسەکانی، ئەویش وەک ئەوەی نەیەوێت پرسیاری لابەلای لێبکەین، بۆ نموونە جارێکی گوتی:

-مەزنترین عەقڵەکان کاریان لەسەر داکشان دەکرد و ڕوحیانی لەجەستەیاندا وەدەر دەنا، تا بەسەر جەستەیانەوە بێت، ئەو دۆخە مەزنترین بیرۆکەی پێگەیاند، کە بەشەریەتی گۆڕی، ئینیشتاین، ئەدیسۆن، تەنانەت هونەرمەندی بلیمەت (سلڤادۆر دالی)یشی پێگەیاند.

خاتوو (z) له زانیاری دەربڕین چاوچنۆک بوو، پشتم وەختەبوو بشکێت ئەوەندە داچەمیمەوە سەر ژیاننامەی ئینشتاین و ئەدیسۆن و دالی، تا ئەوەی بەدوویدا دەگەڕام دۆزیمەوە ئەو خاتوونە مەبەستی چی بووە، ئەو سێ کەسە خۆیان دەخستە دۆخێکەوە ناوێکی زانستی نامۆی لێ نرابوو(Hypnagogia) دۆخێکە لەدەرەوەی هۆشیاری و دەرەوەی خەو، هەرسێکیشیان باسیان لە حاڵەتەکە کرد، ئەو دۆخەیە کە مرۆڤ دەتوانێت مەزنترین بیرۆکەی زانستی و هونەری دابهێنێت.

بۆ نموونە.. ئەدیسۆن بە دانیشتنەوە لەسەر کورسییەکەی دەنووست، دۆلکەیەکی ئاسنی لەناوگەڵی دادەناو پارەیەکی ئاسنیشی لەسەر خۆی دادەنا، هەر کاتێک پارە ئاسنەکە لەسەری بەربوایەتەوەو بکەوتایەتە ناو دۆلکە ئاسنەکە، دەنگێکی دەردەکرد، هەندێ لە هۆشیاری عەقڵی لەکاتی خەودا بۆ دەگەڕایەوە، دوای نیو کاتژمێر بە ئاگا دەهاتەوە، بەو حاڵەی گەیشتبوو.

سلڤادۆر دالی وێنەکێشێکی بلیمەت بوو، خۆی لە دۆخێکدا دەنا پێیدەگوت پارانۆیا، بەو دۆخەی شتگەلی سەیری دەبینی، لەوێوە تابلۆکانی دەکێشا، دەخەوت و کلیلەکانی لەچنگ دەگرت و دەفرەیەکیشی لەبن دەستی بەکلیلەکەوە دادەنا، هەر کە دەچووە خەوێکی قووڵەوە، کلیلەکە لەدەستی بەردەبووە ناو دەفرەکە، ئەودەم عەقڵی لەنیو خەوەکەدا هۆشیار دەبووەوە.

ئەو زانیاریانە ئەگەرچی شتێکی نامۆن، دڵم پێیان ئاوی نەدەخواردەوە، خاتو (Z)م بەو ئاوایە تاقیکردەوە، مەحاڵبوو ئەوەی ئەو دۆخەی دەبوارد درۆزن بێت، واملێکرد بنوێت، لە بنمیچەکە کاغزێکم شاردەوە، ژمارەیەکی دوور و درێژم بەسەر کاغزەکەوە نووسی، ژمارەکە دەخانەیی بوو، دوای کاتژمێرێک بە ئاگاهاتەوە، بە وردی ژمارەکەی بۆ خوێندمەوە، ئەودەم لەبەرامبەری بۆ سەر پێیەکانی داچەمیمەوە، لەوەدا بووم پێی ماچ بکەم، هەر بۆ ئەوەی شتێکم پێبڵێت لام ڕوون بێتەوە، قسەیەکی بۆ کردم، ئەوەندەی تر پەرۆشی کردم:

-ئەگەر هەزار ساڵ تەرخان بکەیت کە لە کتێبە مادییەکانتانا نووسراوە، بەهیچ ناگەیت، ڕوح لە ماددەکانی ئێوە جیاوازە، ئەگەر دەشتەوێ بەدویدا بگەڕێیت، کەس لەم دونیایەدا بەو توانا زانستییە نازانن، تەنها پیاوانگەلێک لە ڕێکخراوی نهێنی (سۆفی)دا نەبێت، ئەوانیش لەنێو چیاکانی (تبت) خۆیان شاردووەتەوە، ناوی خۆشیان ناوە (برایانی سارمۆنگ).

لەنێوان تاوستانی بیابان و دڵتەنگی چیاکان بەڕێوەبووم، هەموو زانستەکانی زانکۆکانم جێهێشتن و بەدووی شتێک دەگەڕام واهیمە بوو، لەپێشمەوە پیاوێکی سەر ڕووتاوە لە (تبت)ییەکان بە کراسێکی سوورەوە و بەسەر پشتی وشترێکەوەیە، خۆ ئەگەر کەسێکی تر بێجگە لە خاتوو (Z) باسی لە ڕێکخراوەکانی نهێنی (سۆفی) کە لە چیاکان خۆیان وەرشاردووە بکردایە، کە زانیارییەکی شاراوەیان هەس، پێڵاوەکەم تێ دەسرەواند، ئەوەتا بەدووی

(تبت)ییەکەوە بەسەر وشترەوە دووی کەوتووم، ئەو تبتییە پیاوێکی کەمدووە و بەقسەی خۆی بابەتی برایانی سارمۆنگ دەزانێت، بەرامبەر بە ئاڵتوونێکی زۆر رێنمایی ناویانم دەکات، ئەو قەومە باوەڕیان بە دراوی کاغزی نییە.

بەسەراهاتی دۆزینەوەم بۆ ئەو پیاوە (تبت)ییە باسی هەنووکەییمان نییە، ڕەنگە دواتر بیگێڕمەوە، وەلێ لێمگەڕێ بڵێم ئەو سارمۆنگانە شوێنکەوتووانیان لەهەموو دونیادا بڵاو بووەتەوە، وەلێ بەناوی جیاواز نەک سارمۆنگ، هەرهەمووشیان موسوڵمانن و مەزهەبی سۆفییان هەس، دوور لە سۆفییەتی موسوڵمانەکان، ڕازی بوونی یەکێکیان ڕێنماییت بکات بۆ سەنتەری سارمۆنگەکان، مەرجێکی سەیری هەیە، دەبێت ڕوحت بێگەرد بێت، گێرەشێوێن نەبیت، هەوڵ نەدەیت خۆت بە زیرەک بزانیت، نازانم ئەوە چۆن دیاری دەکەن، وادیارە لە ڕێگادام بۆ زانینی.

لەبەقووڵاچوونی دەریای ڕوحیانەت کە خۆمم بۆ تەرخان کردبوو، بۆ گەڕان بەنێو کتێبەکانی ڕوحیانەت، بۆم دەرکەوت خەڵکانێکی زۆر کەم هەن، دەتوانن لەجەستەیاندا دەربچن، وەلێ ڕێگاکەت پێ ناڵێت، هەموو ئەو ڕێگانەم تاقی کردەوە کە لەکتێبە زەردەکاندا خوێندبوومەوە، بینیم قسەی پڕوپووچ بوون، ڕێگای (ئەدیسۆن و ئینیشتاین)م تاقیکردەوە، تەنها ڕۆچوونە بە سڕکردنی خەون، هەندێ خەونی تیا دەبینی، ئەوان لەو خەون بینینەیان سوود مەند دەبوون، بیرۆکەیان دادەهێنا، تا هەنووکەش بابەتەکە هەر خەون بینینە، ئەوەش نییە کە من بۆی دەگەڕێم.

بەوای پیاوێکەوە کە بەسەر وشترەوەبوو لە خەیاڵەکانم بە ئاگاهاتمەوە، ئیشارەتی بۆ دوو چیا کرد، بەر لەوەی پرسیاری لێ بکەم، بەوشترەکەیەوە بەرەو دوا وەرچەرخا، بێ ئەوەی شتێک بڵێت گەڕایەوە، زانیم دەیەوێ بڵێت ئەوە شوێنەکەیە، لەسەر وشترەکە هاتمە خوارەوەو وشترەکەم بەدارێکەوە بەست و خۆم ئامادە کرد بۆ ڕۆیشتن، چاوم بە خەڵکانێک کەوت جلی سپییان پۆشی بوو، لە مێزەری بچووکتر ڕەنگ سپییان بەسەرەوە بوو، پیاو گەلێکی بەخۆ و بە کۆمەڵێک گەنجەوە بە بزەخەنە پێشوازییان لێکردم، ترس و دڵەڕاوکێکەم لێ ڕەوییەوە، بەڕاست بەر لەو دیمەنە پیاوێک بووم، دواتر پیاوێکی تر.

لەنێو تاوێرەکانی چیاکەدا قشڵەیەک بینا کراوە، وەک کۆشکەکان بریق و باق نییە، هەر کە چاوت پێدەکەوێت، دەزانیت بۆ ئەوە بینا نەکراوە تەنیا کەسێک تێیدا ئاکانجی نەبێت، بەڵکو کۆمەڵێک تیا دەژین، چووینە گۆڕەپانێکی گەورەی ناو قشڵەکە، پیاوانگەلێک بە جلی سپییەوە کۆمەڵ کۆمەڵ دانیشتوون، هەندێکیان کتێبیان بەدەستەوە، وەک زانکۆیەک دەهاتە بەر چاوم، کچگەلێکیش بە جلی سپییەوە و سەرپۆش بەسەریانەوە، لەگۆشەکان قسەیان لەتەک یەکدا دەکرد.

دوو پیاوە یاوەرەکەی بۆم دەستنیشان کرابوون، بردمیان بۆ شوێنێک فەرشی سەوزی تیا ڕاخرابوو، داوایان لێکردم کەوشەکانم داکەنم و بچمە ناوەوە، هەموو تەمەنم نەچووبووم مزگەوت، وەلێ دەمزانی مزگەوت چییە، ڕەنگە

یەک دوو مزگەوتم لە فلیمەکان بینیبێت، لەناوەوە چاوم بەکۆمەڵێک گەنج کەوت، دانیشتبوون و دەقێکیان بە کۆمەڵ دەگوتەوە، هەر یەکەو کتێبۆکەیەکیان بەدەستەوە بوو، دەیانخوێندەوە، تێبینی ئەوەم کرد بەدەم خوێندنەوە، بەرەو دواو بەرەو پێشەوە خۆیان لار دەکردەوە.

هەر کە چوومە ئەو شوێنە هەستم بە ئارامی کرد، ناخم لە دڵەڕاوکێ کەوت، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە خەڵکەکە سادەبوون، بەردەوام دەم بە بزە بوون، دووریش نییە بەوای جلە سپییەکانیانەوە بووبێت، چاوم بەگەنجەکان کەوت لەپڕ لە خوێندنەوە کەوتن، هەر هەمووشیان بە پەرۆشەوە تەماشای یەک شوێنیان کرد، منیش چاوم بۆ ئەو شوێنەی ئەوان بڕی، بۆ یەکەمین جارم بوو پێشەواکەیانم بینی، کەوشەکانی داکەند و هاتە ناو مزگەوتەکە، خەڵکێکی زۆر بەدەور پێشەواوە بوون، لەهەوڵی ئەوەدا بوون زیارەتی دەستەکانی بکەن.

پێشەوا سیمایەکی سپیکەڵانەی فرە جوان بوو، ڕەنگە بڵێم بەهەموو تەمەنم پیاوێکی واجوانم نەبینی بێت، تەنانەت لەهۆڵیوودیش، وەلێ پیاوێکی خاکی زۆر سادە. بە پەرۆشییەوە چاودێریم دەکرد، بزە لەسەر لێوی نەدەبڕا، لێم نزیکەوە بوو، دەستم درێژ کرد تەوقەی لەتەکا بکەم، دەستی هێناو تەوقەی لەگەڵما کرد، دواتر کە دەستی کشانەوە، ماچی دەستی خۆی کرد، چون ئەوەی شانازی بە تەوقەکردنەکەمەوە بکات، ئەوەش ئەوەندەی تر دڵنیای کردم.

پێشەوا دەستی گرتم و بەرەو بەلەکۆنەیەک بردمی، دیمەنی چیاکان لەتەک ئاوابوونی خۆر لەو دەمەیدا هەستم کرد دەیەوێ شتێکم پێ بڵێت، ئەوجا دیقەتیدام و قسەی کرد، ئەگەرچی قسەکانی کەم کەم دەردەبڕی، وەلێ وەک سەرکردەیەکی سەرکەوتوو دەدوا، پێیگوتم:

-تۆ لەوپەڕی دونیاوە هاتووی بەدووی زانستێک دەگەڕێی کە ئێمە شاردوومانەتەوە، ئیشت بەوە چییە؟

بە دڵنیاییەوە پێمگوت:

-دەمەوێ زانستی ماددییەت دان بە زانستی ڕوحیانەت بێنێ، ئەوە یەکە ڕێگایە بۆ ئاشتبوونەوەی زانست و ئایین.

پێشەوا بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

-ئەم زانستە نایەتە دی بە دڵە پاکەکان نەبێت، وەک ڕوحی بەرێزتان، هەرچی دڵە کرمێکانە ناتوانێت لەتەک ڕوح ڕاستگۆ بێت، ئێدی چۆن دەستی بەسەرا دەگرێت.

بە پەرۆشییەوە پێمگوت:

-دەتوانم ئەو داکەوتنی ئەستێرەییە بگێڕم؟

تەماشای زەوییەکەی کرد و بزەیەکی تری بۆکرد و گوتی:

-ئەو ناولێنانە لەبیر خۆت بەرەوە، هەرچیشت لەو بارەوە بیستووە یا لەهەچ پەرتووکێک خوێندووتەتەوە دیسان لەبیری خۆتی بەرەوە، هەرچی لەبارەیەوە نووسراوە لادەری بووە، وەلێ تۆ لێرە کە دەردەچیت دەتوانیت

ئەوەی ناوی لێنراوە داکەوتنی ئەستێرەیی وەک چۆن هەناسە دەدەیت، هەر واش ئەوە دەکەیت، ئەمە خوایە زانا مادییەکانیش وەک مادییەت ڕوحانییەتیش بەسەر بکەنەوە.

❊ ❊ ❊

حەوت مانگی ڕەبەق لەو شوێنە مامەوە، تا بەتەواوی فێری زانستی داکەوتنی ئەستێرەیی بووم، دەمتوانی هەموو ڕۆژێک ئەو داکەوتنە بگێڕم، تەنانەت لە خاتوو(Z) باشترم دەگێڕا، هۆکاری ئەوەم پێزانی کە زانستی مادییەت نەیدەدۆزییەوە، ئەویش لەبەر ئەوەبوو خودی ڕوح مادده نەبوو، بەڵکو یاساکانی لەسەرووی کات و شوێندا بوو. پێشەوا ڕێی پێدام بەرامبەر بە شوێنکەوتووانی باس لەداکەوتنی ئەستێرەیی بکەم، ئەوەش بۆ من زۆر گرنگ بوو، دەمتوانی ئەو تاقیکردنەوە زانستییانەی لەسەر بکەم، بێ ئەوەی بۆ دونیای ئاشکرا بکەم. ئەو قسانەی کە دێت باسێکی تەواوی داکەوتنەکەیە، هەر کەسێکیش ڕوحی پاک و بێگەرد بێت دەتوانێت بیگێڕێت.

بەو ڕێگایە هەرچیم پێشتر خوێندبووەوە، بۆم دەرکەوت ڕاست نییە، سەرەتا دەبێت هەموو هەستکردنت بەگوناهەکانت داتەکێنیت، چونکە هەستکردن بە گوناه ڕوح قورس دەکات، مەبەستیشم لێرەدا گوناهە ڕوحییەکانە، وەلێ هەرچی گوناه مادییەکانە وەک سیکس کردن و ئەوانی تر، پاش کەمێکی تر ئەوەش باس دەکەم، گوناهە ڕوحییەکان کە دەبێت لەخۆتی داماڵیت وەک لووت بەرزی و خۆ بەزل زانین، ئەگەر هەستت بەشتێک لەوانە کرد،

داکەوتنەکە سەر ناگرێت، ڕەنگە ئازاری ڕوحیشت بدەیت، ئەگەر ڕقت لەکەسێکی دوور یا نزیکیش بوو، دەستبەجێ ئەو ڕقە لەخۆت داماڵە و لێی خۆش بە، ڕق ڕوح قورس دەکات، ئەگەر ئازاری کەسێکت دابوو، یا زوڵمت لێ کردبوو، ئەوەش لەخۆت داماڵە، لەبەر ئەوەی عەقڵی نائاگایی ڕوح قورس دەکات، خۆ ئەگەر هەستیشت کرد ئێرەیی بەکەسێک دەبەیت، ئەو ئێرەییە لەخۆت داماڵە، چونکە ئێرەیی بردن خەتەرناکترین شتە و ڕوح قورس دەکات، ئەگەر شتێک یا کەسێک تووڕەی کردی، دان بەخۆتا بگرە، چونکە ئێرەیی و تووڕەیی ڕوح ناجێگیر دەکەن.

دوور نییە گوێت لێ بووبێت یا خوێندبێتتەوە، گەیشتن بۆ واڵا کردنی ڕوح پێویستە لە لەززەتەکانی سێکس دوور بکەویتەوە، یانەخۆ لێی دابڕێی، تا ڕوح شکۆمەند ببێت، لەڕاستیدا دابڕان لە هەوەسبازی جەستە ئازار بەجەستە دەگەێنێت، لەبەر ئەوەی جەستە پێویستی بە هەوەسبازییە، هەر کە لێی دادەبڕێی، جەستەت لەتەک ڕوحدا دەکەوێتە دۆخێکی ناجێگیر، ئەوەش وا دەکات ڕوحیش ناجێگیر بێت، ئەوەی ڕاستی بێت، پێویستە ئەو هەوەسبازییەی جەستە کارا بێت، جەستە هەست بە هێوربوونەوە بکات، ئەوە زۆر گرنگە، لەبەر ئەوەی زیاتری هەوەسبازی کە ئەنجام دەدرێت، وادەکات جەستە داوای زیاتر بکات، بەوەش ڕوح واڵا دەبێت.

مەزنترین هەردوو شەهوەتی نان و گان (سیکس) پێویستن بۆ گەیشتن بە ڕوح، تا ئەو دووانە تێر بن، ڕوح شکۆمەند دەبێت، نەک دابڕان لێیان، زیاتر

ڕوونی بکەمەوە، ئەوەندە نان نەخۆیت تا برسیت دەبێت، کە نانیشت خوارد، لە پێویست زیاتر مەخۆ، یانی کە تێر بووی زۆر لەخۆت مەکە، کەداوەتیش دەبیت ئەوەندە مەخۆ سکت بکەیت بە ئامبار، یەک تیکەی زیاد دۆخەکە دەگۆڕێت، سیکسیش وەک نان تا برسی هەوەسبازی نەبوویت مەیکە، هەموو ڕۆژێکیش مەئالێ گانکردنەوە، ئەوەندەش چاوەڕوان نەبی تا قەدەر ئەو ڕێکەوتنەت بۆ دەگونجێنێت بۆ سیکس کردن، ئەگەر بێ هاوسەر بوویت بە (زینا) کردن سیکس مەکە، لەبەر ئەوەی زینا گوناه دەنێتە دڵتەوە، هەر ئەوەندەش هەستت بەو گوناه کرد، ڕوحت شکۆمەند نابێت، دەستدرێژی سیکسیش گوناه دەنێتە دڵەوە، لێگەڕێ شەهوەتەکەت سرووشتی بێت، بە سرووشتی خاڵی ببێتەوە، ئەویش لەڕێی خەونەوە درووست دەبێت، لە دەسپەڕیش دوور کەوە، ئەوەش گوناهێکی ترە، لێگەڕێ خەون شەهوەتت بێنێتەوە، جەستە بۆ خۆی میکانیزمی هاوسەنگی خۆی ڕادەگرێت، پێویست ناکات تۆ دەستکاری بکەیت، ئەوەندەش چاو لەدەر مەبە، ئەوەیە شەهوەت دەورووژێنێت و گوناهت پێ دەکات، بەتەواوی لەمەی خواردنەوە دوور بکەوە، یا هەر شتێک مێشک مەست بکات، وەک ماددەهۆشبەرەکان، چونکە مەستکردنی عەقڵ هۆشیاری دەبات، تۆش کە لەتاقیکردنەوەی داکەوتنی ئەستێرەبیدای پێویستت بە هۆشیارییەکی تەواوە، بۆ ئەوەی ئەنجامی بدەیت. کاتێ ئەوانە دەکەیت، دەتوانین بڵێین هەموو شتێک کە ڕوحت قورس دەکات لێتمان داماڵیوە، ئەوجا دەتوانین بۆ قۆناغی دووەمت بگوێزینەوە، ئەویش

بەرز کردنەوەی ڕوحە. بۆ بەرزکردنەوەی ڕوحیشت پێویستە بەردەوام مەشق لەسەر سەرخەو شکاندن بکەیت، ئەوسەرخەو شکاندنەش بۆ چارەگە کاتژمێرێکە، لەگەڵ خەو بردنەوەت نەک ئەو دەمەی لەسەر جێوبانەکەت پاڵ دەکەویت، بۆ خۆی ئەو سەرخەو شکاندنە وەرزشی ڕوحە، کە ئەدیسۆن و ئینیشتاین و دالی ئەنجامیان دەدا، تا ئیلهامیان بۆ بێت، پێویستە ئەو سەرخەو شکاندنە هەموو ڕۆژێک بیکەیت.

هەرچی خەوی ئاساییە لەشەواندا بۆ پشووی جەستەیە، نابێت لە شەش کاتژمێریش زیاتر بێت، بەهەرحاڵ کاتێک ڕادێیت لەسەر سەرخەو شکاندن، بە بێ دابڕان مەشقی لەسەر بکە، بۆ ئەوەی شەوێ ئیلهامەکانت بۆ بێت، دەکرێ دابڕان لە ژوورەکەت بکەیت، لەکاتی تێڕامان هیچ شتێک مەکە، تەنانەت مەخوێنەرەوە، مۆبایلەکەشت بکوژێنەوە، لەتەک کەس قسە مەکە، لێگەڕێ عەقڵت بیر بکاتەوە، واش مەکە عەقڵت ناچار بکەی بیر بکاتەوە، لێگەڕێ عەقڵت بۆ خۆی ئازاد بێت، بیر لەوە بکاتەوە کە دەیەوێ بیری لێ بکاتەوە، بۆ تێڕامانیشت لەنیو کاتژمێر زیاتر نەبێت، لەو نیو کاتژمێرەش کەمی مەکەرەوە.

ڕۆژانە سەرخەوشکاندن و تێڕامان پێویستن، تا لێگەڕێی ڕوح مەشق لەسەر شکۆی خۆی بکات، بۆ ئەوەی ئامادەگی هەبێت بۆ داکەوتنی ئەستێرەیی خۆی.

❊ ❊ ❊

دوای ئەوەی لە قۆناغەکانی دوایی ڕوحت شکۆمەند بوو، پێویستە پەیوەندیت لەتەک خەونەکانتدا شکۆمەند بێت، لەبەر ئەوەی تەنها ڕێگا بۆ داکەوتنی ئەستێرەیی خەونەکانە، هیچ ڕێگایەکی تر نییە بۆ ئاشکرا کردنی ڕوح لەوە زیاتر، ڕۆژانە هەموو خەڵکی خەون دەبینن، هەر کە وریا دەبنەوە واهەست دەکەن خەونیان نەبینیوە، ئەوا خەونەکەیان بیرچووەتەوە، تەنانەت ناشزانن خەونیان بەچییەوە بینیوە، ئەوە بنەمایەکی جێگیرە، تەنانەت ئاژەڵەکانیش خەون دەبینن. یەکەمین هەنگاومان لێرەوە دەست پێدەکات، چۆن بیری خەونەکانت دەکەیتەوە.

هەر کە بەخەبەر دێیتەوە، بیرکردنەوەیەکی کورتت بۆ خەونەکەت دەبێت، ئەوەندەش نابات ئەو بیرکردنەوە کورتەشت بیر دەچێتەوە، بۆ ئەوەی بیرکردنەوەکەت لەدەست نەدەیت، سەرنجت ورد بکەوە، هەوڵبدە ئەوەی دێتەوە بیرت بینووسە، بەر لەوەی بچێتە دووتوێی لەبیرچوونەوە، خۆ ئەگەر لەنیوەشەویشدا بە ئاگا هاتیتەوە، هەندێ وشە بنووسە وەک سەردێڕی خەونەکەت، دواتر بچۆرەوە خەوی خۆت، ئەوە بۆ ماوەی یەک مانگ دووبارە بکەرەوە، لەکۆتاییدا هەست دەکەیت بیرکردنەوەت بۆ خەونەکانت بەهێز بووە، بەم فێڵە سادەیە توانیمان برەو بە پەیوەندی نێوان خەون و هۆشیاری بدەین، دوای ئەوەی هۆشیاری خەونەکانی بیر دەچووەوە، ئێستا بیری دەکەوێتەوە، ئەوەش یەکەمین پەیوەندییە لەنێوان دوو جیهانی هۆشیاری و خەوندا. دوای ئەوەی خەونی مانگێکت بە نووسراوی دەبێت، بگەڕێوە بیخوێنەوە، تیبینی

شتێکی سەیر دەکەیت، لەماوەی خەونەکانتدا بە شتگەلێک واتدەزانی شتگەلێکی ئاسایین، با سەیریش بووبێت، بۆ نموونە خەونێکت بە ئۆتۆمبێلێکی نوێوە بینی هەشت ئەسپی سەوز ڕایدەکێشن و بەشەقامێکدا گوزەرت پێیان دەکرد، بەدەر لەوەی دیمەنەکە سەیرە، ئەوا لەخەونەکەدا ئەو دیمەنەت بینیوە لەچرکە ساتێکدا و بۆ ئەودوای خەونەکانت ڕۆیشتووی، چون ئەوەی بەلاتەوە ئاسایی بێت، وەلێ ئەگەر لە هەقیقەتدا ببینیت، بێشک هەڵوەستەی بۆ دەکەیت، چون ئەوەی ئەوە نمایشێکی ڕیکلامانە بێت، دووریش نییە خەنینەوەت پێبێت و وێنەیەکیشی بگریت، ئەی بۆچی لەناو خەونەکەتدا گرنگی پێ نادەیت و پێت سەیر نییە؟

هەر بەڕاستی شتێک لە ژیانی خەونەکانتدا هەیە واتلێدەکات لەرز نەتگرێ و پێتیش سەیر نەبێت بۆ ئەو خەونەی دەیبینیت، ئەو شتەش ونبوونی هۆشیارییە، کە واتلێدەکات بیر لە شتەکان بکەیتەوە و پێت سەیر بێت، لەخەوندا تۆ تەنها پشیلەیەکی ئیرادە دزراوی و بەرامبەر شاشەی سینەما دانراوی، تەماشای هەموو شتێک دەکات و هیچ کاردانەوەیەکی بۆ نییە، دواتر لە هۆڵەکە دەردەچێت و هیچی لەبیر نییە.

وەلێ ئێستا دوای مانگێک توانای بیرکردنەوەی خەونەکانت پردێکی بۆ درووست کردووی لەنێوان هۆشیاری و خەون، ئێدی پشیلەکە هۆڵەکە بەجێ ناهێڵێت و هەموو شتەکانیشی بیر چووبێتەوە، بەڵکو هەموو وردەکارییەکانیشی بیر ماوە.

فێڵی دواتر که دەیکەین، فێڵی هۆشیارییە لەخەوندا، لەکاتی خەونەکەشدا بزانیت خەون دەبینی، تێبینی ئەوە دەکەیت ئەو شتە بە شێوەیەکی سرووشتی ڕۆژانە لەتەکدا ڕوو دەدات، بۆیە بیرت دێت جارێک یا دووجار ئەو خەونەت بینیوە، ئەو ساتانە بەنرخن، ساتی هۆشیاری نێو خەونە، لەم دۆخەدا هەر ئەوەش مەشق دەکەیت.

فێڵەکە وایە: هەر کاتێک لە نیوەشەودا یا لەکۆتایی خەوەکەت خەبەرت بووەوە، هەوڵبدە بگەڕێیتەوە ناو خەونەکە، بێشک چەندین جار ئەو هەوڵەت لە ژیانتدا داوەو سەرکەوتوو بوویتە، وەلێ ئەو کاتە نەتدەزانی ئەوە یەکەمین قۆناغتە بەرەو داکەوتنی ئەستێرەیی.

ئەگەر لەهەموو خەونێک کە دەتبینی هۆشیار بوویتەوە کە خەون دەبینی، ئەوا بەشێک لە هۆشیاریت گواستەوە ناو خەونەکانت، وەک پشیلەکە نابیت لەکاتی تەماشا کردنی فلیمی سینەماکە ئیرادەی دزرابێت، بەڵکو ئەو پشیلەیە دەگۆڕدرێت بۆ مرۆڤێک دەزانێت تەماشای فیلمێکی ڕاستەقینە ناکات، مرۆڤێک دەزانێت خەون دەبینێت.

بۆ ئەوەی خۆت ڕابهێنیت هەموو ڕۆژێک و لەنیوەشەودا و لە شیرین خەودا بە زەنگەکە خۆت بەخەبەر بکەیتەوە، ئەو خەبەربوونەوەشت لە نیو کاتژمێر تێپەڕ نەکات، دواتر خۆت ڕادەستی خەو بکەرەوە بەو ئاوایە بگەڕێیتەوە نێو خەونەکەت، زەنگەکە بنێرەوە، تا لەو خەونەدا سێ جار بەخەبەرت بکاتەوە،

هەموو جارێکیش هەوڵبدە بگەڕێیتەوە ناو خەونەکەت، بەو شێوەیە لەماوەیەکدا هەست دەکەیت توانای ئەوەت هەیە بۆ دووبارە کردنەوەی.

ئەوجا پێویستە بابەتەکە سەختتر بکەیت، لەهەر یەکێک لە بێداربوونەوەت لەو سێ بەخەبەربوونەوەی نیوەشەو کە خۆت بەئاگا دەکەیتەوە، هەوڵبدە ماوەی بەخەبەر بوونەوەکەت لە دوو خوولەک زیاتر بێت، ئەوجا بگەڕێوە ناو خەونەکەت، ئەوە چارەسەری کێشەی خەوت دەکات، لە خەوەوە دەتگوێزێتەوە ناو خەون، وەلێ چوونەوەکەت گران دەبێت، بەڵام مەشقێکی گرنگە، ئەگەر توانیت لەماوەی یەک خوولەکدا دوای بەئاگابوونەوەت بگەڕێیتەوە ناو خەونەکەت، دەتوانیت لەماوەی دوو خوولەکدا دوای بە ئاگابوونەوەت بگەڕێیتەوە ناو خەونەکەت، باوەڕیش ناکەم ئەم قۆناغە تێپەڕێنیت مەگەر دوای دوو مانگ لە مەشق کردن.

ئەگەر ئەوەت کرد، فێربوویتە هۆشیاری لەناو خەونەکاندا بخولقێنیت، هەنگاوی دواتر چۆن فێر بیت ئەو هۆشیارییە بەکار بهێنیت.

* * *

هەر کاتێک هۆشیاریت لەناو خەوندا هەبوو کە خەون دەبینیت، ئەو دەم دەبینیت ئۆتۆمێلێکی نوێ کۆمەڵە ئەسپێکی سەوز ڕایدەکێشن، ئەوە یانی عەقڵت لەناو خەونەکەدا دەکەوێتە بیرکردنەوە، بەوە تووشی سەرسوڕمان دەبیت، مانای سەرسوڕمانەکەت یانی تۆ هۆشیاریت هەیە، سەرەتا تێبینی ئەوە دەکەیت، هەر کە لەناو خەونەکەدا سەرت سوڕما، ئەوا تۆ بەخەبەر

دەبیتەوە، بۆیە ڕۆژانی دواتر مەشقی ئەوە بکە، چۆن سەرت سوڕ دەمێنێت و بە ئاگاش دێیتەوە.

دوای ئەوەی دەبیتە مرۆڤێکی هۆشیار و تەماشای شاشەی سینەما دەکەیت و سەرت سوڕ دەمێنێت و بە ئاگاش نایەیتەوە، کاتی ئەوە هاتووە تەنها تەماشا کردن بەس نییە، بۆیە پێویستە جووڵەشی لەتەکا بکەیت، یانی کاتی ئەوەش هاتووە ئەو کەسە کە تەماشای شاشەکە دەکات، بەخۆی بچێتە ناو شاشەکەوە.

کاتێک خەونەکەت پیشان دەدات هەوڵبدە تەنها لە شاشەکە ورد نەبیتەوە، هەوڵبدە بەڕاست و چەپی شاشەکەدا بڕوانە، تا ئەودوای دیمەنەکە ببینی کە خەون تۆی تیا هاویشتووە، ئەو دەم وەک ئەوە وایە بڕوانیتە کەسێک یاری ڤیدۆی (جیم) دەکات و تۆش ناچاریت تەماشای دەستوبردی کەسەکە بکەیت، پاشتر خۆت ببیت بەکەسەکە و تەماشای ڕاست و چەپ بکەیت تا دەورو بەری یارییەکە بەتەواوی ببینیت.

مەجووڵێ، هەوڵمەدە لەو قۆناغە بگەڕێیت، تەنها سەرنجی دەوروبەرەکەت بدە، چون ئەوەی لە دەوڵەتێکی نامۆدایت، یا خاکێکی غەریبدایت، دواتر لەخۆت بڕوانە، تەماشای دەست و پێت و جلوبەرگەکەت بکە، تەنها و تەنها لێیان بڕوانە و بیانپشکنە.

ئێستا تۆ لەسەرەتای ئەستێرەییدایت، ئەگەر بشتەوێ دەتوانیت تەماشای (پەتک.هەودا)ی زیوین بکەیت، لەخەونەکەدا خۆت بە خۆتی دیکەتتەوە

دەبەستیت، پەتکێکی ماددی نییە، وەلێ شەبەنگێکە لەهۆشیاری، ئەگەر لێتەوە دیار نەبوو، پێویستە خەیاڵی پێوە بکەیت، تا بتوانیت لەنێو جیهانی خەونەکەتدا بگەڕێی، هەر پێنج هەستەوەرەکانتی لێ بخەرە گەڕ تا ئامادەگیت هەبێت. بینین و دەستبەرکەوتن دوو ئاسانترین هەستەوەرن بۆ گواستنەوە، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بۆ ناو جیهانی خەون دەگوێزرێنەوە، وەلێ هەرچی هەستی بیستنە پێویستە کاری لەسەر بکرێت، هەوڵبدە گوێ بگریت، گوێ لەهەموو دەنگێک بگریت، تەنانەت لە دیمەنەکانیش، ڕەنگە دەنگ دەربکەن، وەک ئۆتۆمبێل یا خەڵکانێک قسان دەکەن.

ئەگەر لەگواستنەوەی هەستی بیستن سەرکەوتوو بوویت، زۆر وریا بە، دوور نییە گوێت لە دەنگگەلێک بێت پێیان ڕانەهاتوویت، وەک ژاوە ژاوێک لەنێوان دەنگی ئاسایی و تەقینەوەدا، بەدووریشی مەزانە گوێت لەدەنگی گیانداران بێت، یا دەنگی کەسانێک بانگ لەناو بکەن، لەوەشدا بەدووری مەزانە ناوی تۆشی تێدا بێت، هەرچەندێکیش ئامادەگیت بۆ ئەو دەنگانە هەبێت، ترست هەر تیا دەرسکێت، وا هەست دەکەیت لەجیهانی شەیتاندایت، ئەوە زۆر ئاساییە، جیهانی خەونەکان پڕن لەدەنگە دەنگ، بە پێی کات ئەو دەنگانە کەمتر کارێگەرییان بەسەرتەوە دەبێت، تەنانەت کە گوێت لەناوی خۆتیش بوو، لەسەری ڕانێی، وەک ئەوەی بە سووکی گوێت لەناوی خۆت بێت، دواتر لەهەموو گەشتەکانی خەونەکانتدا ئەو دەنگانە بۆ چرپە دەگۆڕدرێن.

هەوڵبدە هەستەوەری بۆنکردن و چێژکردن بەهەمان ڕێگای پێشوو بۆ گواستنەوەی تاقی بکەرەوە، هەوڵبدە هەموو شتێک بۆن بکەیت، بیرت بێت تۆ لەجیهانێکی نامۆدایت و یاساو ڕێساکانی نازانیت، پێویستە ئەو یاسانە فێربیت، هەروەک چۆن یاسای ئەم جیهانە مادییە فێربوویت.

بەر لەوەی جەستەت بجووڵێنیت و لەناو جیهانی خەوندا بگەڕێیت، پێویست ماددەی ئەستێرەیی تاقیبکەیتەوە، کە ئەم جیهانە سەیرەی لێ پێکهاتووە، دەبینیت هەزاران گەردی نوورانی هەموو شتێکی پێکهێناوە، ئەگەر لەو گەردانە وردبوویتەوە، دەبینیت جووڵەیەکی دڵەکوتەیان هەیە. پەلە لە گەڕان مەکە، دەمەوێ لە جێی خۆت هەفتەیەک چاودێری جیهان بە وردەکارییەکانیەوە بکەیت، دڵنیاش بە هەموو هەستەوەرەکانت کار دەکەن، دەبینیت خەون دیمەنێکت بۆ نمایش دەکات، تۆش لەناو دیمەنەکەدایت، وەلێ پشتگوێی دەخەیت، لەدەورویەری خۆت دەڕوانیت چون ئەوەی چاودێری وردەکاری دەوروبەرەکەت بکەیت، تۆ کامێرایەکت پێیە گرێ دەدەیت بۆ ئاشکرا کردنی شوێنەکە.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێیت، هەوڵبدە لەو ژوورەی خەونەکە بۆتی داهێناوە دەربچیت و بچیتە ژووری بەرامبەرەکەی، دەبینیت هەندێ دیمەن لەکاتی تێڕوانینتدا دروست دەبێت، چون ئەوەی بابەتەکە یاری ڤیدیۆی (جیم)ە و لە ئەنتەرنێت یاری پێدەکەیت، دواتر قۆناغێک دێت، پەیوەندییەکە

لەسەرخۆ دەبێتەوە، تێبینی ئەو خاڵانەی ژینگەی پێکهێناوە، لەکاتی یاریکردنەکە دەرسکێت.

ئەوە چاک بزانە کە یەکەمجار ئەوە دەکەیت ئاڵودە دەبیت، داکەوتنی ئەستێرەیی ئاڵودەبوونە، ئەوا من ئاگادارم کردیتەوە، بەهەرحاڵ لێگەڕێ پێتبڵێم لەو داکەوتنە ئاستەکان هەیە، تۆش لە ئاستی یەکەمدایت.

پاش ماوەیەک تێبینی ئەوە دەکەیت گەیشتوویتە بەخاڵێک ناتوانیت بجووڵێیت، پێکانت لەجووڵە کەوتوون، ڕەنگە شتێک ببینیت و بتەوێت کارلێکردنێکی لەتەکا بکەیت، ناتوانیت، لەکاتی هەوڵدانتدا ئەو شوێنە جێ بهێڵە، یا واز لەو شتە بێنە، بەخەبەر دێیتەوە.

ئەوەی لێرەدا ڕوویدا ئەوەیە تۆ ڕۆ چوویتە ناو جیهانی داکەوتنەوە، تا زیاتر ڕۆ بچیت، زیاتر لەجەستەی ڕاستەقینەت دوور دەکەویتەوە،، ئەگەر دووربینێکت پێ بێت دەتوانیت ڕوحت ببینیت، تا دەگاتە ئەوەی جەستەی نووستووت لەجەستەی ڕاستەقینەت زۆر بەرز دەبێتەوە.

ئەگەر گەیشتیتە ئەو شوێنەی ئێتر ناتوانیت تێیدا بگەڕێیت، ئەوا لەڕاستیدا تۆ گەیشتوویتە بە شوێنێک لەنێوان دوو ئاستی ئاستەکانی داکەوتنی ئەستێرەیی، پێویستە شێوازی جووڵەکەت بگۆڕیت، ئەگەر توانای هاتوچۆت نەبوو، پێویستە بەرزتر تاقیبکەیتەوە، یانی فڕین، سەرسام دەبیت کە جەستەت لەو جیهانە دەتوانێت لە زەوی بەرزەوە بێت و بفڕێت، دەبینی فڕین بەرەو ئاستێکی بەرزتر بەرزترت دەکاتەوە، بۆ ئەوەی لەسەر بەرزبوونەوەکە

ڕابێیت، هەوڵبدە بازی بچووک بۆ بەرزبوونەوە بدە، لەناخیشتەوە ئارەزووی بەرز بوونەوە بکە، دەبینی بەرەو بەرزی دەفڕیت.

جەستەت لەو جیهانە دەتوانێت بێجگە لەفڕین شتی تر بکات، وەک بڕینی دیوار، کەواتە پێویستت بە دەرگاش نابێت، ڕێک وەک ئەو مۆتەکانەی لە فیلمەکان دەیبینیت، ئەوەش پێویستی بە مەشق کردنە، بۆ نموونە ئەگەر لەخەوندا خانوویەکت بینی، هەوڵبدە لەدەرگاوە بچۆرە ژوورەوە و دەربچۆ، ئەوجا هەوڵبدە لە دیوارەوە بچۆرە ژوورەوە، زۆر بە ئاسانی بەوە ڕادێیت.

هەر کە جەستەت ئەو توانایانەی تیا ڕسکا، دەگەیتە ئاستێکی تر لە داکەوتنەکە و ناتوانیت بیبواریت، دەگەیتە شوێنێک ماددەی ئەستێرەیی تیا ونە، لەجێی ئەوە ڕووناکی سەیر جێی دەگرێتەوە، وەک ئەوەی شاشەکە تێکچووبێت و ڕەنگ دابێنێت، لەویوە هیچ نابینیت.

* * *

هەوڵمەدە لەناو ڕەنگە بەیەکداچووەکاندا بگەڕێیت، تەنها بگەڕێوە ئەو ئاستەی کە تێیدابوویت و دان بەخۆتا بگرە، ناتوانیت بیبواریت تەنها لە قۆناغەێکی پێشکەوتوودا نەبێت.

لێگەڕێ نووکە بچینە قۆناغێکی زۆر خەتەرتر، ئەویش ئەو قۆناغەیە کە زانستی داکەوتنی ئەستێرەیی لادەر دەکرێت و دەگۆڕدرێت بە زانستی شەیتانی، دواتر ئەوەش ڕوون دەکەمەوە.

دوای ئەوەی توانیت لە شوێنەکە بگەڕێیت و دەستنیشانکردنی مادییەتی ئەستێرەییەکە کە هەموو شتێکی لێ پێکدێت، لەسەرتە فێر بیت چۆن ئەو شتانە درووست دەکەیت، شتەکە ئاسانە، زۆریش ئاسانە، ئەگەرچی سەیرە، تۆش تا شتێک درووست بکەیت، پێویستە سەرەتا خەیاڵ بەو شتەوە بکەیت، دەبینی لەبەرامبەرتدا ئەو شتەی خەیاڵت پێوە کردووە دادێت، وا خەیاڵ بکە خەنجەرێکت بەدەستەوەیە، ڕێک خەنجەرێک لەدەستت دەرسکێت، بەڕاستی هەستێکی جوانە، داهێنانی شتگەل لەخەیاڵەوە قورس نییە، پێویستی بەکەمێک ڕاهاتنە.

سەر هەڵبڕەو تەماشای ئاسمانی خەونەکە بکە، خەیاڵ بە بوونی ئەستێرەوە بکە، ڕێک ئەستێرەیەک دەرسکێت، هەوڵبدە لە شوێنێکی دیمەنەکە خەیاڵ بە ئاگر بەربوونێکەوە بکەی، لێی نزیک بەرەوە و هەوڵبدە هەست بەگەرمییەکەی بکەیت، ئەوجا خەیاڵ بە تەواوی دیمەنەکەوە بکە، بۆ نموونە تەماشای ئاسمان بکەو خەیاڵ بە بەربەیانەوە بکە، تا دیمەنی بەربەیانت لا دەرسکێت، خەیاڵ بە هەڵکردنی (با)وە بکە، تا با هەڵبکات، ئیتر هەر وا...

ئێستا دەبێ ئاگادارت بکەمەوە، هاوەڵانی ڕێکخراوە نهێنییەکان وەک (ڕۆزیکرۆشن) کە سەرچاوەی ڕێکخراوێکی ماسۆنییە، شوێنکەوتوانی خۆیان فێری داکەوتنی ئەستێرەیی دەکەن، وەک چۆن تۆم فێر کردووە، وەلێ لەم قۆناغەدا بە هاوەڵەکانیان دەڵێن ڕێورەسمێک بکەن و ناوێلێکی تایبەت بانگ بکەن، ئاگاداری خۆت بە ئەو قسانە قسەی پڕوپووچن، ئەوە ناوی

شەیتانەکانە، بۆ کەشی داکەوتنی ئەستێرەیی لایەنێکی کفرە پێویست ناکات، ئەوان کە پێویستیان پێیەتی بۆ ئەوەیە گەورەکانی خۆیان شەیتانەکان ڕازی بکەن، ئەوان دەروونیان نەخۆشە.

لەوانەیە پێتبڵێن ناوی (یۆرووس) بدرکێنە و خەیاڵ بە (با)وە بکە تا هەڵبکات، بەهانەی ئەوە دێننەوە کە یۆرووس ناوی (با)یە لەو جیهانە، لەڕاستیدا ناوی شەیتانە، پێویستت پێ نییە، تەنها خەیاڵ بە (با)وە بکە، هەڵدەکات.

تا ئەتوانی ئاگاداربە، ئەگەر لەم قۆناغە بانگت لەشەیتانەکان کرد، دێن و گەمەت پێدەکەن، بەهیچ شتێک ناگەیت کە دەتەوێ، ئەم تاقیکردنەوەت دەگۆڕنەوە بە شتێک پڕ لەترس و تۆقین و خۆفرۆشتنی خۆت بەشەیتان، ئەو حاڵە ببوارەو بەردەوام بە.

ئێستا دەمەوێ خەیاڵ بە گیانەوەرێکەوە بکەیت، تا لەبەرامبەرت بوەسکێت، دواتر خەیاڵ بەوەوە بکە ئەو گیانەوەرە شتێک دەکات، وەک ئەوەی لە دارەکەی بەرامبەر دەخوات، ئەگەر توانات بەوە گەیشت ئەو دیمەنە دابهێنیت، بزانە گەشیتوویتە بە حاڵی کۆتایی و ئامادەیت لە جەستەت دەربچیت.

کێشەی دەرچوون لەجەستە تەنها دەرچوونی ڕوحە و لەجەستەت دووری دەخەیتەوە، ئەوەش دۆخێکی خەتەرناکە، ئەگەر کەسێک لەو دۆخەدا بە ئاگای هێنایتەوە و ڕوحیشت لەجەستەت دەرچووبوو، ڕەنگە کات بەدەستەوە نەبێت بۆ گەڕانەوەی ڕوح بۆ ناو جەستە، ئەوجا دەستبەجێ چارەنووس

مردن دەبێت، وەلێ دوو دڵ مەبە، ڕێگا هەیە بێ ئەوەی ڕوحت لە جەستەت دەربکەیت و بۆ خۆتیش بگەڕێی.

فیلێکی تازە دەکەین، خولقاندنی کیانێکی تەواو کە کۆپی بێت لەخۆت، کیانەکە ناوی (هاوبوون)ە.

چاوەکانت داخەو خەیاڵ بە وێنەی خۆتەوە بکە، ئەوەی ڕوودەدات، خولقاندنی وێنەیەکی ناوەوەیە لەخۆت لەناو وێنە خەونییەکە کە تۆی تێدایت، شرۆڤەی ئەو دۆخە زۆر قورس و ئاڵۆزە، وەلێ لەو قۆناغەدا هەر هیچ نەبێت شەش مانگت تێپەڕاندبێت، بەرەو هەنگاوەکانی تر مەڕۆ چونکە شکست دێنیت و هەر هەمووشی جێ دەهێڵیت.

ئەو ئامانجەی دەمانەوێت پێی بگەین گەیشتنە بە قۆناغێک، چاو بنوقێنیت و جەستەی تەواوی خۆت ببینیت و ئەوەی دەتەوێ بەجێی بگەێنێت، هەرچەند کاتێکی درێژ خایەن بۆ ڕا کردنی خەیاڵ بکەیت، ئەوەی بەدەستی دێنیت گەورە بوونی دەسترا کردنە، بۆ ئەو جەستەیەی خەیاڵت پێوە کردووە، جەستەیەکی دەستکردە و لەهەمان گەردی ڕووناکی کە ئەم جیهانەی پێ دروستکراوە، ناویشی (هاوبوون)ە دەتوانێت لەتەک ئەم جیهانی ئەستێرەییە یەک بگرێت و بەئاسانی مامەڵی لەتەکا بکەیت.

ئێستا خەیاڵ بەکورسییەکەوە بکە تا دروست بکرێت، دواتر لەسەر کورسییەکە دانیشە و خەیاڵ بە هاوبوونەوە بکە و ئامادەی بکە و بەرامبەر دانیشتنەکەت بەسەر کورسییەکەوە ڕابگرە، ئەوجا خەیاڵ بەخۆتەوە بکە،

هەستەوەرەکانت بەناو هاوبوونەکەوە بگوێزەرەوە، ئەوە زۆر زەرووره و ئاگاداریە ئاسانیش نییە، پێویستت بە چەندین هەوڵدانە بۆ ڕا کردنی.

دەتوانیت بە زۆرێک لەمەشق کردن بچیتە ناو ئەو هاوبوونەتەوە و لەوێوە ببینیت، هەستەوەرەکانی ترتی بۆ بگوێزەرەوە بە هەمان ڕێگای گواستنەوەی هەستەوەرەکانت بۆ جیهانی ئەستێرەیی.

ئێستا گرنگترین ڕاستیت لە زانستی داکەوتنی ئەستێرەیت پێ ڕادەگەێنم: هەموو شتێک لەدونیادا هاوڵێکی لەجیهانی ئەستێرەییدا هەیە، کەسەکان لەجیهانی ئەستێرەیی هاوڵێکیان هەس، تەنانەت شتە بێ گیانەکان و تەنانەت شوێنەکانیش، بۆ نموونە خانووەکەت کە تێیدا دەژیت هامشێوەی لە جیهانی ئەستێرەییدا هەیە، زانکۆکەشت هەروەها، ئەو ڕاستییەی کە نایزانیت، کاتێک ئەوانەت لەخەونتدا دەبینی، تۆ گەشتت بۆ ئەو ناوە کردبوو، تەنها وێنەیەک نەبوو لە خەیاڵدانتدا.

کەسە نزیکەکانت لە بنەماڵەکەت و کەسوکارت کە لەخەوندا دەیانبینیت، ئەوا هاوبوونەکانی ئەستێرەییت بینیون، نابینی خەڵکانێک لەخەوندا دەیانبینیت کە بەهیچ شێوەیەک پێیان نەگەیشتوویتە، بەسیما و دەنگی خۆیان دەیانبینیت، کە ڕەنگە ڕۆژێک بەدیداریان بگەیت و بیانبینیت وەک چۆن لەخەونی ئەستێرەییدا بینیوتن، تۆ هاوبوونەکەیانت لەجیهانی ئەستێرەییدا بینیوە، وەلێ کەسەکان ڕاستەقینەن، خەیاڵی داهێنانی عەقڵت نین.

ئەوەی لەسەر تۆیە بیکەیت بەوای بەکارهێنانی هاوبوونەوە، خەیاڵ بەو ژوورەوە بکەیت کە حاڵی حازر تیا نووستوویت، دەبینیت لەبەرامبەرت درووست بووە، ئەوە هاوبوونی ئەستێرەیی ژوورەکەتە، دەتوانیت بەناویدا گڕ بخۆیت و تەماشای شتومەکەکانی ناوی بکەیت، دەشتوانیت لە ژوورەکە دەربچیت و لەدەرەوە تەماشای خانووەکە بکەیت، هەر کە چوویتە دەرەوەی خانووەکە، شەقامەکە دەناسیتەوە، تەنانەت شارەکەتیش دەناسیتەوە، دەشتوانی بە ئارەزووی خۆت تیایاندا بگەڕێیت، هیچ خەتەرناکییەک لە دوورکەوتنەوەی ڕوحدا نییە، چونکە ئەوەی دەگەڕێت هاوبوونەکەتە، خۆت نیت.

بەدەم گەڕانی هاوبوونتەوە هەست بە هێزێکی گەورە دەکەیت، دەتوانێت بفرێت تەنانەت لەدیواریشەوە ئاودیو بێت، هەچ شوێنێکی بوێت دەتوانێت خۆی پیا بکات، ئەگەر بەوای هاوبوونەکەتەوە چوویتە خانوویەکەوە، پێویست ناکات کەسەکانی ناو خانووەکە ببینیت، دوور نییە هاوبوونەکەت لەو ساتەدا خەون بە خەونێکی ترەوە ببینێت. بۆ نموونە ئەگەر چوویتە ماڵی هاوڕێیەکت ئەویش بەوای خەونێکیەوە گەشتی ژاپۆنی کردبوو، ئەودەم لەماڵەوە نایبینیت، بەڵام بەرێکەوت گەشتت کردبوو بۆ ژاپۆن بەوای خەونی ئەستێرەییتەوە، دەیبینیت و قسەی لەتەکا دەکەیت و ئەویش لەخەونەکەیدا دەتبینێت، وادەزانێ تەنها هەر خەونە، ئەو نازانێت بە هاوبوونەکەت گەیشتووە، کە تۆ کۆنترۆڵت کردووە.

ڕەنگە بەوای دیوار بڕینەوە بچییە سەر نامووسی خەڵکەوە، خۆ ئەگەر ئەوەت بۆ کرد، ئەوا هەست بە گوناە دەکەیت، ئەودەم جیهانی ئەستێرەییت پەرت و بڵاو دەبێتەوەو نامێنێت، دەگەڕێیتەوە جەستەی نووستووی شەهوەتیت. جیهانی ئەستێرەیی بەهیچ شێوەیەک شەهوەتبازی تێدا نییە، تۆ تا بەو ئاستەی ڕوحت بگەیت، لەهەموو گوناهەکانت خۆت پاک کردووەتەوە، بەتایبەت شەهوەتبازی، ئەگەر بیرت بۆ لای شەهوەت بازی ڕۆیشت ڕیسەکەت دەبێتەوە بەخوری.

دوایین شت کە دەمەوێ ئاگادارتی لێبکەمەوە، گوێت لە عیرفانییەکان دەبێت، دەڵێن ئەو هاوبوونە یا جەستە نوورانییەکە (وەک ناوزەدی دەکەن) دتوانێت چارەسەری دەردی دەردارێک بکات، ئەویش بەگواستنەوەی ئازاری ئەو کەسە بۆ هاوبوونەکەی بەوەش ئەو چاک دەبێتەوەو هاوبوونەکەی دەرد و ئازارەکە دەگرێت، دواتر دەڵێن هاوبوونەکەش باری تەندرووستی باشە، پێشتدەڵێن ئەولیائەکان ئەوانەی ئەو جەستە نوورانییە درووست دەکەن لەتواناياندایە ئەو هێز و توانایەی خواوەندی هەبێت، وەک داباراندنی باران و دابەشکردنی بژێوی ژیان، پێتدەڵێن مەشقی زۆرت دەوێ تا بەو پلەیە بگەیت، لەڕاستیدا گشت ئەوانە فرتوفێڵ و درۆیە، کەس بەو پلەیە ناگات، لەبەر ئەوەی لەڕاستیدا ئەو پلەیە بوونی نییە.

جیهانی ئەستێرەیی جیهانێکی هاوتەریبە لەخەونەکاندا دەرسکێت، هەرچەند کاری تێدا بکەیت، لەڕاستیدا تۆ هەر لەخەوندایت، خەون هیچ کارێگەرییەکی

بەسەر واقیعدا نییە، کەس هەڵتنەخەڵەتێنێت، ڕەنگە پێت بڵێن پێغەمبەرەکان بەم زانستە پەرەجوویان دەکرد، گشت ئەوانە هەڵبەستەی شوێنکەوتووانی شەیتانن.

گەورەترین شتێک لەدەستت بێت، دەرخستنی بیرۆکەیە بۆ ئەو حاڵەتەی داکەوتنە، کەسی ڕاستەقینە خۆی لەناو خەونەکەیدا دەبینێتەوە بیر دەکاتەوە، هەروەک وەسوەسەی جنۆکە، کاتێک لەشوێنێکەوە بیرۆکەیەکت بۆ دێت، وادەزانیت بیرۆکەی خۆتە، نەخێر ئەوە وەسوەسەی جنۆکەیە، وەک چۆن جنۆکەکان ناتوانن کاریگەرییان بەسەر جیهانی ماددیەوە هەبێت، هەر بەو چەشنەش هاوبوونەکەت ناتوانێت کاریگەری بەسەرەوە بێت.

شارلۆتان لەم بەسەرهاتە زۆر بە وردی گوێی گرتبوو، زۆریش دوودڵنەبوو لەباسەکە، ئەگەرچی بۆ خۆم بە ئەفسانەی دەزانم، کێ دەتوانێ دەسەلاتی بەسەر ڕوحدا هەبێت، کە تەنها کاری خودایە؟ شارلۆتان گوتی:

-ئەو پیرە پیاوە (ئیشیدا) توانی بە ڕوحی ئازاری ئەوانی تر بدات، چۆن دەڵێی ڕوح کاریگەری بەسەر ماددەوە نییە؟

تارت خۆی ڕێکخست و گوتی:

-ئەکیرۆی ژاپۆنی ئێرەییە، هیچ پەیوەندییەکی بە داکەوتنی ئەستێرەییەوە نییە.

توێیەی یەمەنی خەیاڵ بردبوویەوە، یا بیری دەکردەوە، چاوی لەتارت نەدەبڕی، دواتر گوتی:

-بەداوای لێبووردنەوە، من عیرفانیم و لەسەر ڕێبازی عەلەوی لە حەزرەمووت، قەد گوێم لە سارمۆنگ نەبووە.

بلەز ئاوڕم لە توێبە دایەوە، عیرفانی؟ پێدەچێت هاوسۆزی یەکەمم لەتەکتا درۆزنە بوو، چاوێکم لێ زەقەوە کرد، توێبە ڕووی لەتارت کرد و پرسی:

-لای ئێمە ئەولیاکان پەرەجووی زۆر سەیریان کردووە، یانی ئەوانیش داکەوتنی ئەستێرەییان داهانیوە؟

تارت بە نەخێر سەری بۆ ڕاوەشاند و گوتی:

-لەو کتێبانەی داکەوتنی ئەستێرەیی بەدرۆ دەخەنەوە، دەڵێن هەموو شتێک لەدونیادا گەوهەری ناوەوەی لەناوڕۆکی ڕاستەقینەی شتەکەدا هەیە، هەرچی پێکهاتەی دەرەوەیە، تەنها بۆتەیەکە، دەڵێن دەتوانیت کارێگەری بەسەر پێکهاتەی دەرەوەدا بکەیت، ئەگەر کارێگەریت لەناوکی ناوەوە کرد، دەڵێن دەتوانیت فێری ئەوە بیت بە پەیوەندیکردن بە فریشتەکانەوە، لەڕاستیدا ئەوەش هەر هەمووی قسەی پڕووپووچە.

توێبەە بە گرنگی پێدانەوە گوتی:

-من بیرمە ئەوجووڵانانەمان لەکاتی زیکرکردندا بەکۆمەڵ دەکرد، دوای تێپەڕبوونی پێنج خولەک، هەستم دەکرد هزرم لەتەک هەموو ئەوانی تر دەبووە یەک جەستەو یەک ڕوح، ئەوەش هێزی بە زیکرەکەمان دەدا.

بەتووڕەییەوە پێمگوت:

-ئەو قسە پڕووپووچانە گەڕێ، ئەو شتە لە ئیسلامدا هەر نییە، ئەوە بیدعەیەکی خراپە، خودا ئەو دەسەڵاتەی دانەگرتووەتە سەر زەوی.

شارلۆتان بە ڕقەوە تەماشای کردم و گوتی:

-ئەگەر جارێکی تر بەم شێوەیە دژایەتی بکەیت، لە کۆنفرانسەکە دەرت دەکەم، وەلێ ئەگەر پرسیارت هەیە بیکە، ئەگەر نا بێدەنگ بە.

دوای ئەو ئاگادارکردنەوەیەی شارلۆتان گوتی، هەر هەموو بێدەنگ بوون، خۆم بە مێزەکەی بەردەممەوە سەرقاڵ کرد، تارت بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی:

-سارمۆنگەکان سەمایەکی بەکۆمەڵی تایبەت بەخۆیان هەیە، هەوڵجار کە بینییانم پێم سەیر بوو، ئەوان بە شێوازێکی جیاواز لەسەمای تیپێکی ڕێک و پێک دەجووڵانەوە، چون کەڤاڵێکی گەردوونی دەردەکەوتن، هەستت دەکرد شتێک بەناختا ڕۆ دەچوو، وەک ئەوەی گوزارشت لە گەردوون بکات، یا شتێک وەک ڕوح مرۆڤ ئارام بکاتەوە.

ئافرەتە هیندییەکە دیاربوو زۆر سەرسام بوو بە قسەکان، وەک ئەوەی گەنجینەیەکی دۆزیبێتەوە، گوتی:

-بەڕێز تارت پێم بڵێ، سەیرترین شتێک لەو هاوبوونەت چی بوو کە کردبێتت؟

تارت بزەیەک گرتی و ما بیر لەو شتە بکاتەوە و گوتی:

-سەیرترین شت ئەوەبوو کاتێک لەخەونەکانمدا بەڕێوە دەڕۆیشتم، هاوبوونەکەم بەتەکمەوە بوو، هەستم دەکرد دوو کیانی لەیەک جىزىدابن، نازانم چۆنت بۆ وەسپ بکەم، وەلێ لێگەڕێ شتێکت پێ ڕابگەێنم، ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیر بوو، توانیم هاوبوونەکەم بگۆڕم بە گیاندارێک و لەسیلەمدا بڕوات بەڕێوە، جارێکیان گۆڕیم بە گورگێک، بەتەنیشتمەوە دەڕۆی بەڕێوە، هەر کە یەکێک لەو جیهانی داکەوتنی ئەستێرەییە تووشم دەبوو، بەترسەوە دەکشایەوە، گورگەکەش وەک گورگ دەیلووراند.

شارلۆتان هەردوو دەستی لەیەک ئالأندبوو پێیگوت:

-لیستی تۆمارە ئەکاشییەکانت بینوە؟

تارت بزەیەکی بۆ ئەویش کرد و گوتی:

-بەدەر لەوەی زۆرم لەبارەیەوە بیستبوو، وەلێ لەهیچ شوێنێک نەمبینی.

تویێبە بە وریاییەوە گوتی:

-ئەو لیستی تۆمارە ئەکاشییانە چییە؟

شارلۆتان بەدەم دیقەتدانی (تارت)ەوە گوتی:

-دەتوانم بڵێم تۆمارکراوێکە بۆ هەموو ڕووداوەکان و قسەو باس و هەستەکانە لەگەردووندا لەڕابردوو و لە ئێستادلو بانەڕۆژیش، تەختە تیشکن بۆ هەتا هەتایەی ئەم گەردوونە، بە وێنەوە وەک فیلم تۆمار دەکرێت و کراویشە، دەڵێن بەوای داکەوتنی ئەستێرەییەوە دەتوانی پێی بگەیت، بەوەش نهێنی ڕابردوو و بانەڕۆژ پێدەزانیت.

به تووڕەییەکەوە نیقەتی (شارلۆتان)م دا و گوتم:

-ئەوەی تۆ باسی دەکەیت لای خودا پارێزراوە، نەک بۆ ئەم و ئەو.

شارلۆتان چون مشتومڕێک گوتی:

-بەر لە خەڵقەندەیی ئادەم.. ئیبلیس بەسەری کردووەتەوە، لەوەوە زانی کە دەبێتە هۆکاری وێران کردن و گەندەڵکردنی گۆی زەوی؟

بە تووڕەییەوە پێمگوت:

-لای ئێمە شتێک نییە بەو شێوەیە، ئەوە دەستکری ئیسرائیلییەکانە.

کابرای جوولەکە بەدووچاوی دەرپۆقیویەوە لێی ڕوانیم و گوتی:

-ناکرێ هەر شتێکت بەدڵتان نەبێت بیخەنە سەر ئێمەی ئیسرائیل، ئێمە هەرگیز ئەو تەختە ئەزبەرکراوەمان هەر نییە.

شارلۆتان بە مست کێشای بەسەر مێزەکە، وەک ئەوەی کۆتایی بە دانیشتنەکە بهێنێت، ئەو ڕاستەوەبوو، ئێمەش هەستاینە سەر پێ، چون ئەوەی ئێمەش بمانەوێ کۆتایی بە دانیشتنەکە بهێنین، بۆ خۆم تووشی شۆک بووم بەرامبەر توێبە، بینیم لەسیلەمەوە بە پەیژەکە دادەبەزی، پێمگوت:

-توێبە وامزانی زیرەکی، تۆ بەو خەڵکە دەڵێیت بەدەم زیکری خوداوە سەماتان دەکرد؟ ئەوان ئێستا چی بە ئاینەکەمان دەڵێن؟ دەتەوێ وا لێمان حاڵی بن کە کۆمەڵێک شێتۆکەین، وەک شێخەکانت.

توێبە دەستبەجێ لەشوێنی خۆی وەستاو بە تووڕەییەوە تێیڕوانیم و گوتی:

-ئەکەی ناوی شێخەکانم بێنیت، دەزانی گرفتی ئێوە چییە؟ ئێوە فەرموودەی پێغەمبەرتان بیر چووەتەوە، کە لەحەجی ماڵئاواییدا فەرمووی((سوێند بەخوا لێتان ناترسم شەریک بۆ خودا درووست بکەن، بەڵام لەوە دەترسێم ڕکابەری لەسەر بکەن)) هەرچی ئێوەن ژیانی خۆتان تەرخان کرد بەدوای شەریک لەدڵی خەڵکیدا بگەڕێن.

بە سەرسامییەوە سەرم هەڵبڕی و گوتم:

-ئێمە؟

پێیگوتم:

-تۆ چاک دەزانیت مەبەستم چییە، خودا تووشی دەردێکی کردوون، هەر خەریکی چاودێری کردنی خەڵکن، خەریکی چین و بەتەمای چین، هەموو دانیشتەکە تۆ هەر خەریکی ئەوەبوویت و دەتگوت چاوت لەو عارەقخۆرەیە، ئەو ژنە سەرپۆش بەسەرە زوڵفەکانی بەدەرەوەن، گوێ لە ئیمام مالک بگرە، کە دەڵێت((تەماشای گوناهی خەڵکی مەکەن، تەماشای گوناهی خۆتان بکەن، خەڵکی تووش بوونەو چاک دەبنەوە، ڕەحم بەو خەڵکە داماوانە بکەن، سوپاسگوزاری خودا بن کە ساغن)).

جوولەکەکە بەتەنیشتمانەوە ڕۆیشت، بەچاوێکی سووکەوە دیقەتی داین، بە توێبەم گوت:

-ئێمە فەرمانمان پێکراوە کە فەرمان بە چاکەکاری بکەین و لە خراپەشدا بێینە دەنگ، ئەوەندەش مشتومڕم لەتەکا مەکە، بەس نییە کە تۆ هەر سۆفییت.

تویێبە بەدەم دیقەتدانی جوولەکەکەوە گوتی:

-یاشێخ دەترسم بکەونە بەربەرەکانیان، ئەمەت باش لەبیر بێت.

بەیانی دواتر بەرەو ناندێنەکە بەڕێکەوتم بۆ نانی بەیانی، هەر هەموو ئامادەببوون، نانەکەم خستە سەر قابلەمەکەو دوور لەتویێبە دانیشتم، لە کورسییەکی دەورووبەر چۆڵ دانیشتم. کورسییەکەم ڕێک بەرامبەر ئافرەتە هیندییەکە بوو، لەتەنیشت ئافرەتەکەوە پیاوێکی لەڕو لاواز و ڕوخسار نائومێد دانیشتبوو، تیبینی شتێکی سەیرم لە ژنە هیندییە کرد کە نانی دەخوارد، چون ئەوەی کەڵبەی هەبێت، یا من وڕینەم دەکرد؟ بەخۆما چوومەوە، قسەکەی تویێبەم بیر کەوتەوە، ئاخۆ من خۆم بە کاروباری خەڵکییەوە سەرقاڵ کردووە و چاودێریان دەکەم؟ پیاوە لەڕو لاوازەکە گوتی:

-تێبینی ئەوەتان کردووە بەڕێز تارت دیار نییە؟ وادیارە ئەویش ئێرەی بەجێهێشتووە، وەک چۆن بەڕێز لازار و خاتوو سۆزان لێرە ڕۆیشتن.

شتێکم بیرکەوتەوەو پێمگوت:

-بەڕێز شارلۆتان ئەوەی گوت، هەر کەسێک بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە ئەگەر نیازی ڕۆیشتنی هەبوو، مەرەخەس کراوە.

پیاوە بێئومێدەکە بە دوو چاوی لێکۆڵەرانەوە گوتی:

-باشه بۆچی خواحافیزیمان لەتەکا ناکەن، هەر هەمووشیان بەوشێوەیە و لەپڕا جێمان دەهێڵن؟

گوێم بەقسەکەی نەدا و گرنگیشم پێنەدا، ئەوەی مەبەستی ڕۆیشتنە دەرگا کراوەیە.

لای ئێوارە لە کۆنفرانسەکە ئامادە بووم، تەماشایەکی شوێنەکەی (تارت)م کرد، چۆڵبوو، کەسیش گوێی پێنەدا، شارلۆتان گوتی:

دانیشتنی چوارەم پشکی دکتۆری مەزن (هاتشیسۆن)ە، خاوەن نهێنییەکی زانستییە، کاتێک ئاشکرای کرد، کێشەیەکی ڕاستەقینەی ورووژاند.

فەرموو دکتۆر..

# 4

# چیرۆکی سێگۆشەی بەرمۆدا

## جۆن هاتشیسۆن دەیگێڕێتەوە

(( ئێمە ئەو ڕووداوانەی لە بەرمۆدادا ڕوو دەدات ناومان ناوە میتاسروشت، لەڕاستیشدا لەناو سروشتدایە، ئێمەین لەمیتا سروشتداین))

کەشتییەکی جەنگی فرە زەبەلاح، بیست هەزار تۆن پۆڵای بەبانەوەیە، بە دەریای بەرمۆدادا دەڕۆیشت، سێسەد مرۆڤیش ئەو بارە مەزنە بۆ ئەمریکا دەگوێزنەوە، ناوێکی زەبەلاحی وەک هەئیەتەکەی (سایکلۆبس)ی لێ نراوە، بەزمانی یۆنانی سەرچاوەی ڕەگەزی زەبەلاحییە، کاپتنی کەشتییەکە پیاوێکی زمان پیس و توونده تیژەو هەر هەموو ڕقیان لیدەبووەوە، کاپتن جۆرج سمێڵێکی گەورەی بەرداوەتەوە، پیاوێکی کەڵەگەتی ڕێکوپێک، جلە سەربازییەکەی بەردەوام لەبەردایە، لەتەنیشت (جۆرج)ەوە (لۆرا)ی کچە نازدارەکەی کوتومت دەچووەوە سەر باوکی، باڵی باوکی گرتبوو، جۆرج خۆی دابووە پاڵ پەرژینی کەشتییەکە و تەماشای دەریای دەکرد، کچە بە باوکی گوت:

-باوکە نامبەیت بۆ ئاسمان؟ هەموو ڕۆژێک لەم دەریا بۆ ئەو دەریا دەگەڕێن.

بەدەم غایەلەکرینەوە گوتی:

-بەڵێ کچی خۆم، حەتمەن دەتبەم ب...

یەک لە دەستەی بەڕێوەبردنی کەشتییەکە بەهاوار کردنەوە:

-گەورەم.. کینێس مرد، پەروانەکە پارچە پارچەی کرد، خوێن ئەو ناوەی لەوتاندووە، گەورەم تۆ فەرمانت پێکردین پەروانەکە هەڵبکەین، پەلەشت لەهەڵکردنی پەروانەکە پێکردین، بێ ئەوەی دڵنیابین کە کەس لە ژوورەوە نییە، پەروانەکەمان هەڵکرد.

بەدەم دیقەتدانی بۆ پیاوەکە چاوەکانی سوور هەڵگەڕان، بۆ ئەوەی گوزارشت لە ترسێک بکات و بڵێت:

-هەی بەنەفرەت بیت، بۆ ئەو بابەتە وشەیەکی ترت لەزمان دەرچێت فڕێت دەدەمە ناو دەریاکە، بڕۆن لاشەکە کۆ بکەنەوەو شوێنەکەش لەخوێن پاک بکەنەوە و...

لۆرا بە هێز دەستی باوکی ڕاکێشا و گوتی:

-باوکە، ئاسمان، باوکە...

زۆر لەسەر خۆ وەڵامی دایەوە:

-کچم دان بەخۆتا بگرە بۆی دەڕۆین و...

هەر هەمان پیاو قسەکەی پێ قاچی و گوتی:

-گەورەم ئاسمان، ئاسمان.

بە سەرسوڕمانەوە لێی ڕوانی، دواتر تەماشای خەڵکەکەی کرد، هەر هەموو تەماشای ئاسمانیان دەکرد، ئەویش ڕووی لەئاسمان کرد، ئەو تەماشاکردنە

دوایین سەردەمیان بوو لەدونیادا. ئەو ڕۆژە ساڵی 1918 بوو، کەشتییە جەنگییە زەبەلاحەکە سایکلۆبس بە هەموو خەڵکەکەی ناویەوە و ئەوەی سەرپشتیشی لە ئۆقیانووس ون بوون، بەدەر لەدەستەی نادراو کە چووبوون بەدوایاندا بگەڕێن، هیچیان بۆ نەکرا، تەنانەت جەستەی یەکێکیشیان نەدۆزیەوە، خەڵکی گوێیان لەسەرۆک کۆماری ئەمریکی گرت، کە بەخەم و پەژارەوە دەیگوت ((تەنها خودا و دەریا دەزانن کەشتی جەنگی سایکلۆبس لەکوێ ون بووە)).

※ ※ ※

پۆلێک فڕۆکەی جەنگی لە گۆشەیەکی بەرمۆدا بەئاسمانەوە خەریکی مەشقی سەربازیبوون، بە سەرپەرشتی کاپتن تشارلز کە سێ هەزار کاتژمێری ژیانی بەئاسمانەوە بردبووە سەر، تا ئاسمانی ناسی و ئاسمانیش بەو ئاشنا بوو، لەچالاکییەکی مەشقپێکردندا بوو، چون دەیان مەشقی تر کە بۆ خۆی سەرپەرشتی دەکرد، ئەوە یەکەمجاریان بوو بچنە ئەو ناوچەی ئۆقیانووسە، بەتیلەی چاوی تەماشای قیبلەنومای فڕۆکەکەی کرد، کە یاری دەکرد، وەک ئەوەی جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت، جوێنێکی دا و جیهازی ڕادیۆکەی کردەوەو بانگی لە سەنتەری پەیوەندییەکان کرد.

وژە وژی دەنگەکە بەرزەوە بوو، کاری کردبووە سەر دەنگی کابرای سەنتەرەکە، تشارڵز زیاتر لە چەند جارێک بە سەنتەری ڕادەگەیاند کە

قیبلەنومای فڕۆکەکە یاری دەکات و دەیوێ بزانێت پۆلە فڕۆکەوانەکان هان لەکوێ، هەر ئەوەتا دەنگی کابرای سەنتەرەکەی بەگوێدا هات کە گوتی:

-ئێرە سەنتەری پەیوەندییەکانە، کێشەت چییە؟

تشارڵز لێوی خۆی گەزی، بۆ دواجار ڕستەکەی دووبارە کردەوە و گوتی:

-قیبلەنوما نەفرەتییەکە بەتەواوی تێکچووە، پەیوەندیم بە پۆلە فڕۆکەوانییەکەوە نەما و نایانبینم، نازانم چۆن بۆ سەنتەر بگەڕێمەوە.

لەناو وژە وژی بێزارکەرەکە پیاوی سەنتەرەکە گوتی:

-خۆر بخەرە لای باڵی ڕاستی فڕۆکەکەت، ئەوە ئاراستەی باکوورە.

تشارڵز بەر لەوەی دەست بخاتە سەر سووکانی ئاراستە گۆڕین، دڵەکوتەی تێکەوت، بەدەم تێڕوانینی بۆ ئاسمان گوتی:

-نەفرەتت لێ بێت ئەی شتە نەفرەتکراوەکە.

شەوی ساڵی 1945 ئەو پۆلە فڕۆکەیە بەفڕۆکەوانەکانیانەوە ون بوون، پۆلێکی تری فڕۆکە بەهەموو جۆرە ئامێرێکی پشکنینەوە لێیان گەڕان، ئەو پۆلە فڕۆکەیەش دیار نەمان و ون بوون، چون ئەوەی دەریا لووشی دابن.

*　　　*　　　*

کاپتن وورمێل بە سەرکردەی کەشتیوانی ناسراوە، پیاوێکی قژ لوولی سپی و دوو چاوی شینی ڕوون وەک دەریا، ددانە شاشەکانی ددانێکی ئاڵتوونی ئاخێنراوەتە ناوەندی ددانەکانی، جەستەیەکی زەبەلاح و دەنگێکی گڕ. لە کەشتییەکی چارۆگەدار بەناو کەشتی (کارۆل دێرینگ) بەرەو چارەنووسی

لەناوچەی بەرمۆدادا کەوتبووە گەڕ، وەک هەمیشە لەتەک دەستەکەی توند و تیژ بوو،هەر ئەو جۆرە  توندو تیژییە بوو کردبووی بەسەرکردەیەکی سەرکەوتوو، وورمێل هاواری بەسەر یەکێک لەدەستەکەیدا کرد:

-کوانێ ماکلیلانی گەمژە؟ ئەگەر دووبارە خۆی مەست کردووەتەوە، شووشەی عارەقەکەی بەسەرا دەشکێنم.

پیاوەکە بەدەم سەر نەوی کردنەوە گوتی:

-ئەو وا لەژێرەوە، ماوەیەکە گەرماوەکەی لەسەر خۆی کلۆم داوە.

کەشتیوانەکە نارەحەتی خۆی دەربڕی و گوتی:

-ئەگەر من نەبوومایە، ئەو گەمژەیە ماوەیەکی باش لە زیندان دەبوو، چیرۆکەکەیم بۆت نەگێڕاوەتەوە، ڕۆژێک لە (باربادۆس) بۆ پشوو لامان دا، بینیم لە بارەکە پشت ملیان گرتبوو، خستیانە زیندانەوە، ئەو ڕۆژە...

وەختەبوو وورمێل هەمان چیرۆک بۆ پیاوەکەی بگێڕێتەوە، کە چەندین جار بیستبووی، تا لەو چیرۆکەش بێزار بووبوو، وەلێ وورمێل دەستبەجێ لەگێڕانەوەکەی وەستا، کاتێ بینی ماکلیلان بەسەر کەشتییەکەوەیەو لارەلار بەشووشەی مەیخواردنەوەکەیەوە لەوپەڕی سەرمەستبووندایە. کاپتن وورمێل کە دەستی بە مست دەکرد و دەیکردەوە، ئەوە مانای ئەوەبوو لەوپەڕی هەڵچوونیدایە، دووریش نەبوو شتێکی گەورەی لێ بوەشێتەوە، ماکلیلان گەمژانەو بە سەرسوڕمانەوە لەخاڵێکی دەڕوانی، هەر هەموو ڕوویان بەرەو خاڵەکە وەرچەرخاند، کۆتایی کەشتی کارۆڵ دیرینگ بوو، ئەوە ساڵی 1919

بوو، کە بەناوبانگترین قوربانی بەرمۆدا بوو، لەبەر ئەوەی کەشتی کارۆڵ دیرینگ تاکە کەشتی بوو لەنێو کارەساتێکی زۆر بەچەند ڕۆژێک نۆزرایەوە، ئەوە تاکە هەل بوو بۆ جیهان لەهەموو شتێک حاڵی بن.

❋ ❋ ❋

1975

هەموو شتێک لە کۆمەڵگەی زانستی چۆن ویسترابوو بڕوات بەڕێوە هەر وا کاری بۆ کرا، تا هاتشیسۆن دەرکەوت، ئەو زانا کەنەدییەی کردەو ڕوخساری نامۆ بوو، لە شوقەیەکی بچووک دانیشتبوو، شوقەکە جێی خۆی تیا نەدەبووەوە پڕیشی کردبوو لە جیهازو کتێب و کاغز، قژێکی نارێکی دانەهێنراو و کەللەیەکی گەورە و جەستەیەکی پڕی چون زۆرانبازی هەبوو، هەر لەیەکەم چاوپێکەوتنت بۆی وا هەست دەکەیت گۆرانیبێژی ڕۆکە، وەلێ کە لەتەکیا دەکەویتە قسەکردن پێچەوانەکەیت بۆ دەردەکەوێت، پیاوێکی زۆر هێمن و لەسەرخۆ، چاوەکانی بریقەی ڕوحێکی زیرەکانەی پێوە دیارە، ئەو بەیانییە هاتشیسۆن کە لەخەو بەئاگا هاتەوە، ماندووبوونێکی زۆری پێوە دیاربوو، ئاخر تا درەنگانی شەو سەرقاڵی خوێندنەوەی بابەتێکی ئاڵۆز بوو، کە پەیوەست بوو بە درێژی شەپۆلی درێژخایەنی (تێسلا)، کاغزەکانی سەر سنگی لابرد و تەماشای ئەو ئامێرە کۆمەڵکراوانەی ناو شوقەکەی کرد، کە جێی پێی تیا نەدەبووەوە، کۆمەڵە ئامێرێک بوو پێشتر هێنابووی بۆ تاقیکردنەوە.

هاتشیسۆن تەنانەت دەموچاویشی نەشووشت، بلەز یەک بەیەکی ئامێرەکانی بەسەر کردەوە، هەر کە لەوە تەواو بوو، جلوبەرگی گۆڕی بەپەلە بەرەو جێی کارەکەی بەڕێکەوت، تەنانەت بیرچوو ئامێرەکانیش بکوژێنێتەوە، هەمووشیان مولیدەبوون بە درێژترین شەپۆلی جیاوازی وەک کۆیلی تێسیلا و مەودای کارۆموگناتیسییان درووست دەکرد ، مولیدەی دووبارەیی لاسلکی و شتگەلی تر، کە بە پارەیەکی کەم دەست دەکەوتن.

لای ئێوارە هاتشیسۆن گەڕایەوە شوقەکەی خۆی، پالتۆکەی توڕ دایە سەر کەرەویتەکە، لەوەدا بوو جلوبەرگەکەی بگۆڕێت، لەپڕ لەجێی خۆی ڕەق هەڵگەڕا کاتێک شتێک بەر شانی کەوت، مەزەندەی مشکی کرد بەربووبێتەوە سەر شانی، وەلێ بەسەرسامییەوە پاشەو پاش گەڕایەوە، ئەوەی بەر شانی کەوت، مشک نەبوو، پێنووسێک بوو بە حەواوە ئاوێزانبوو، هەر وەک زەردەواڵە دەسووڕایەوە، سەرەتا هاتشیسۆن هاوارێکی لێ بەرزەوە بوو، دیمەنی فیلمە ترس و تۆقێنەرەکانی سینەمای هێنایە بەر خەیاڵی خۆی، ما بە دەوروبەری خۆیدا بڕوانێت، ئا لەوێدا ترسەکەی ڕەوییەوەو لەبری ترس سەرسوڕمانی ڕاستەقینەی لا درووست بوو، تەنها پێنووسەکە سەری پێ سوڕ نەکردبوو، هەرچی کاغز و چەتاڵی نان خواردنە کە بەتەنیش کەرەویتەکەوە دانابوو بەحەواوە بوون، خۆ ئەگەر ئەو حاڵەتە بێجگە لە هاتشیسۆن تووشی هەچ کەسێک بوایە، نەک هەر لەشوقەکە هەڵدەهات، تەنانەت خۆی دەگەیاندە کڵێسە تا بەدەنگیەوە بچن و ڕوحە شەڕانگێزەکانی دەربەڕێنن، لێ چاوەکانی

هاتشیسۆن بە تێڕوانینێک گۆڕا لەم جیهانە زۆر زۆر کەم ڕوویداوە، وەک تێڕوانینەکانی ئەرشمیدس و نیوتن و ئینیشتاین، نیگایەک لە ڕووناکی، ئەو ڕۆژە هاتشیسۆن شتێکی شاراوەی لە لۆچەکانی دەریای زانست ئاشکرا کرد، توانی بێ سیحر شتەکان لەدوورەوە بجوولێنێت، تەنها بەزانست.

1920

گردبوونەوەیەکی پیاوانی دەریاوان و لێکۆڵەرەکان بەدیار بەلەمێکەوە وەستاون و بە ورياییەوە لەو شوێنە نزیک دەبوونەوە کە کەشتییەکەی کارۆل دێرینگ پێش چەند ڕۆژێک ون بووبوو، هەر لەو شوێنە نۆزرایەوە کە خەتەرترین ناوچەیە، دەریاوانەکان ئەو ناوچەیەیان بە گۆڕستانی ئەتڵەنتیک ناوزەد دەکرد، چونکە شوێنێکی نەفرەتلێکراو بوو، زیاتر لە پێنج هەزار کەشتی تێکشکاوی تیا نۆزرابووەوە، شەپۆڵەکانی ئۆقیانووس بەرەو ئەو گۆڕستانە ڕایماڵیبوون، لەنیو پیاوەکان ئافرەتێک بە چاوە غەمبارەکانییەوە پەرۆشی دایگرتبوو، لە گریان نەدەکەوت، ئاخر وورمێڵ خاوەن قژی لوول و دوو چاوی شین کە کاپتنی کەشتی کارۆڵ دیرینگی ون بوو بوو باوکی ئەو ئافرەتە بوو، ئەمڕۆ بە ئومێدی ئەوەی باوکی نەمردبێت و چاوی پێ بکەوێتەوە.

پیاوەکان بەسەر بەلەمەکەوە وەستابوون و قسەو باسیان لەسەر ئەوەبوو چۆن لە گۆرستانی کەشتییەکان نزیک ببنەوە، ( (لولوا))ی کچی کەشتیوانە ون بووەکە گوێی پێیان نەدا، لەدوورەوە تەماشای کەشتییەکەی دەکرد و

فرمێسکەکانی دەسڕیەوە، پیاوەکان بڕیاریاندا هێدی هێدی لە گۆڕستانەکە نزیک ببنەوە، کێشەکە ئەوەیە کاتێک ناوچەیەکی تەنکاو لەناوەندی ناوچەیەکی قووڵدا دەبێت، کەشتی بەو تیژڕەوییەی بەر زەوییە تەنکاوەکە دەکەوێت، بەتایبەت کە زەوی تەنکاوەکەش دیار نەبێت، مەلەکردنیش لە گۆڕستانەکە مەحاڵە، لەبەر ئەوەی شەپۆڵەکان بەرزن و لوول پێچن، دوای زۆر نزیکبوونەوە بەوریاییەوە بە پێچاوپێچی بەدەور کەشتییەکەوە سوڕانەوە، لای شەوێ پێی گەیشتن.

بەوای ڕووناکی مانگەشەوەکەی پشت هەورەکان پیاوەکان چوونە سەر پشتی کەشتییەکە، یارمەتی ((لولوا))شیان دا تا سەربکەوێت، هەرهەموویان بەترسەوە تەماشای ناو کەشتییەکەیان دەکرد، بەوای مانگەشەوەکەی پشت هەورەکان و تاریکی شەو هەموو شتەکان ڕەنگی تارماییان هەبوو، لێک بەرکەوتنی شەپۆڵەکان و جیرە جیری تەختەو دار لەو بێدەنگییەدا، پەردەیەکی دڵبردە داهات، لەو کەشە خەمۆکییە تەنها (لولوا) زیندوو دیاربوو، هەر هەموو ڕوحیان تیا نەمابوو، ئەو بەوای هەستەوە کە لەچاوەکانی پەرۆشی پێوە دیاربوو، بێ ترس بەملاو ئەولادا دەیڕوانی، دەگەڕا بۆ شتێک ئاماژە بێت بۆ باوکی.

دەریاوانەکان دڵخۆشبوون بەو دۆزینەوە مەزنە، ئەوە یەکەمجارە دوای سەدان ڕووداوی کارەساتباری بەرمۆدا کەشتییەکمان بۆ دەنێرێتەوە، وەلێ هەرچەند زیاتر بە ناو کەشتییەکەدا دەگەڕان بیرۆکەی دۆزینەوەی مەزنیان لا بچووکتر

دەبوو، تا بەتەواوی ون بوو، ئەو کەشتییە ڕووشانیشی پێوەنەبوو، ئەوەش نیشانەی ئەوەبوو نە زریان و نەیش بەرکەوتنی بەر تەنکاو یا بەرد کەوتبێت، کەشتییەکە تەواو بێ زەرەرمەندی پێوەدیاربوو، تەنانەت هیچ شتێکی بان ڕەفەکانیشی نەکەوتبوو، لێکۆڵەرەکان وردتر پشکنینیان بۆ کرد، بست بە بستیان بەسەر کردەوە، (لولوا).. لە ژوورەکەی باوکی بەدیار جلو بەرگ و کەوشەکانی و تەنانەت وێنەکەی خۆیشی کە بەسەر کۆمەدییەکەوە بوو دەگریا، بیری دەنگی دەکرد، بیری قژە لوولەکەی دەکرد، کە منداڵبوو چنگی لێ گیردەکرد، ئەو ماچانەی سەر گۆنای بیرە کە باوکی دەیکرد، هیچ لەوانە نەماون، هەرچەندێک تەماشای شتەکانی دەکرد، دڵنیایی خۆی دەدایەوە کە باوکی نەمردووە، بەلەمێکی ڕزگاربوون دیار نەبوو، خۆی و دەستەکەی کەشتییەکەیان بەوای هۆکارێکەوە جێهێشتبوو، هیچ شتێک لێرە دیار نییە کە تووشی گرفتێک بووبن.

سەرکەوتە سەر پشتی کەشتییەکە، پاڵی بە پەرژینی کەشتییەکەوە دا، فرمێسکی دەڕژییە دەریاکەوە، لەتەنیشتییەوە گوێی لەپیاوێکی بەساڵاچووی دەریاوان بوو، پێدەچوو سەرکردەیان بێت، پێیگوت:

-کچی خۆم مەگری، مێژوو باوکتی بیر ناچێت، بەر لەباوکت زۆرێک لە دەریاوان بێرەدا تێپەڕین، مەخابن بەرمۆدا لووشی دان، ئاوەو ئاوا چوون و شوێنەواریشیان بەجێ نەما، هەرچی باوکتە کەشتییەکەی خۆی نەدایە دەست بەرمۆدا، ڕزگاری بوو، پێدەچێت باوکیشت ڕزگاری بووبێت.

دڵ و دەروونی ئارام بووەوە، کابرا بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە، گوتی:

-کچی خۆم دەزانیت؟ باوکت دوای کۆڵۆمبۆس دووەمین کەسە شکستی بە بەرمۆدادا هێناوە، بزانە کۆڵۆمبۆس یەکەمین کەس بووە بۆ ئێرە هاتووە.

بەدەم گوێگرتنەوە فرمێسکەکانی دەسڕییەوە:

-کۆڵۆمبۆس و پیاوەکانی بەسەر پشتی کەشتییەکەیانەوە بوون و تەماشای ئاسۆیان دەکرد، وەک چۆن من و تۆ تەماشای ئاسۆ دەکەین، چاویان بە تیشکێک کەوت بەرەو ئاسمان بەرز دەبووەوە، کە تا ئەمڕۆش شرۆڤەی بۆ نەبووە، ئەگەرچی دەستەکە چون ئەوەی گلەییان هەبێت کە (با)ی بەرەبەیان زۆر کز بوو، وەلێ دوای ئەو تیشکە دەریا بێ ئەوەی با هەبێت کەشتییەکەیانی بەرز کردەوە، کۆڵۆمبۆس گوتبووی دەریا ئەوەندە بەرزەوە بووبوو، مەگەر لەچیرۆکی دەرچوونی جوولەکە لەمیسر دەریا ئەوەندە بەرزەوە بووبێت.

هەردووکیان بێدەنگبوون و تەماشای ئاسۆیان دەکرد، تا ئەو کاتەی پیاوێک بە ئامێری ڕادیۆوە هات و گوتی:

-گەورەم لەوێ شتێک دی...

لە ئامێری ڕاکاڵەکە دەنگێکی پەشۆکاو هەبوو، بێئومێدی بارو دۆخەکەی خۆی دەگوتەوە، دەیگوت:

-بۆ سەنتەری 406 ئەمە (نۆلان)ە، تەمێکی چڕ ناوچەکەی داپۆشیوە، قیبلەنوماکەش لەکار کەوتووە، کەس گوێی لێمە؟ بەنەفرەت...

کاپتن گوێی پێنەدا و تەماشای ئاسۆکەی کرد و گوتی:

-مارک لەوە گەڕێ، ئەوە بانگێشتی کۆنە.

کابرا چرچاوی گرژ بوو، گوتی:

-گەورەم هەر ئێستا ئەم بانگەوازەمان لە ڕاکاڵەکەوە پێگەیشت، دەبێ...

کاپتن ئەودوای قسەکەی پێبڕی و گوتی:

-مارک.. جارێ تۆ لەدەریاوانی پێنەگەیشتوویت، سەنتەری 406 لەمێژە وێران بووە، مارک دەزانیت فڕۆکەوانەکانی جەنگی ڤێتنام گوییان لەڕادیۆی ناو فڕۆکەکانیان دەگرت، گوییان لە بانگەوازی فریاکەوتن دەبوو، بۆیان دەرکەوت ئەو بانگەوازە هی سەردەمێکی تربووە، دوای لێکۆڵینەوە بۆیان دەرکەوت گوێیان لەفڕۆکەوانەکانی جەنگی کۆریا دەبوو، بەر لەبیست ساڵ فڕۆکەوانێکی زۆر مردن.

ئەوانەی دەوروبەری کاپتن دڵیان کەوتە خورپەکردن، زیاتر لێی نزیکەوە بوون، تا زیاتری لێ ببیستن، کاپتن بە زمانێکی دانایانە گوتی:

-ئەوەی زاناکان دەیڵێن ئەوەیە ئەو نامانەی بانگەوازخوازیانە بە حەواوە ماون، کاتێک لەڕێی ئاوهەواوە دادەبەزێت و ئامێری ڕاکاڵ وەریدەگرێت.

مارک کە ئامێرەکەی هەڵگرتبوو، سۆسەی دەوروبەری خۆی بە ترسەوە دەکرد:

-گەورەم مەبەستت ئەوەیە ئەو نامەیە هی کەسێکە لە ڕابردوو لێرە مردووە؟ یانی ئەوە بانگەوازی هی مۆتەکەیە؟

کاپتن بەنیوە بزەخەنەیەکەوە گوتی:

-ئەوە یەکەمجارە کە کەسێک لەگۆڕستانی ئەتلەنتیکدا دەنوێت، وەک ئەوەی ئەمڕۆ کردمان، هەزاران کەشتی لێرە لەناوچوون، هەزاران ڕوح بەرەو ئاسمان بەرزەوەبوون، سەدان بانگەوازخوازی لێرە بەرزەوە بوون، لێرە مەزەندەی چی دەکەیت گوێت لێ بێت؟ بڕۆ لێم دوور کەوە، وریا بە ئامێری ڕاکاڵەکەشت نەکوژێنیتەوە، تا پەیوەندیمان بە سەنتەرەوە نەبڕێت.

بەدەر لە پەرۆشی (لولوا) بۆ باوکی، ئەویش چووە پاڵ گرووپی دڵەکووتە ترساوەکان.

1975

هاتشیسۆن بیری چووبوو شتێک هەیە پێی دەڵێن خەو، لەشوقەکەی خۆیدا بە قژە درێژەکەیەوە بەسەر هاوکێشەکانی بەردەمیەوە داچەمیبووەوە، وەک ئەو زانایانەی فیلمی خەیاڵی زانستی دەردەکەوت، ئەوانە شتەکان بە ڕوویاندا دەتەقییەوە، وەلێ هاتشیسۆن خەیاڵ نەبوو، هەقیقەتێکە دوای هەفتەیەک وەک برووسکە دەکەوێتە سەر کۆمەڵگەی زانستی.

بیرۆکەکە فێربووبوو، زانایەک هەبوو ناوی دکتۆر (ئێروین موون) بوو، توانی لەبەرامبەر کامێرا تەزوویەکی کارەبای یەک ملیۆن ڤۆڵت بە جەستەیدا ڕەت بکات، ئەوەش بە گۆڕینی هاتوچۆی شەپۆڵەکانی بەکارەباکرد، هەرچی هاتشیسۆن بوو، بیرۆکەی تاقیکردنەوە تازەکەی گۆڕینی هاتوچۆی

شەپۆڵەکانی کارۆموگناتیسی بوو، تێبینی ئەوە بکە شتە سووکەڵەکان لەسەر زەوی بەرز دەبنەوە، تا توانی میزڵدانێکی درێژ بەحەوادا بکات و بەرز و نزمی بکاتەوە، تەنانەت توانی شتگەلێک لەحەوادا بەتیژی بەڕێوە ببات، وەلێ لەهەموو تاقیکردنەوەیەکیدا تووشی تەم و مژی سپی دەبوو، هەموو شتەکانی ڕووپۆش دەکرد و بریسکەیەکی وەک برووسکەی بەدواوە دەبوو، تەومومژێک نەیدەتوانی لایبەرێت، پێدەچوو جووڵاندنی شتەکان بێ ئەوە نەدەکرا، لەتەک هەر ئاشکرا کردنێک لەو تەمو مژییە گەرووی وشک دەبوو، ئەو شتانەی دەیکردن لە زانکۆ نەیخوێندبوو، لە هیچ کتێبێکیش نەیخوێندووەتەوە.

ڕۆژانی دواتر لەکاتی تاقیکردنەوە شتگەلێکی زۆر سەیر ڕوویدا، جارێکیان ئاوێنەی ژوورە دوورەکە بێ هیچ هۆکارێک وردوخاش بوو، جارێکیش شتگەلێکی وەک ئاسن و خشت ئاوریان گرت، هەموو ڕۆژێک دڵی دەکەوتە خورپە کردن، دەیزانی ئەو هێزەی دۆزیویەتەوە توانایەکی تۆقێنەری هەیە.

هاتشیسۆن شتە قورسەکانی زۆر بەزەحمەت هەڵدەگرت، بەو شێوەیە سووربوو لەسەر هەڵگرتنی ئاسنێک کێشەکەی 100 کیلۆ زیاتربوو، توانی ئەوە بکات، ئەو ڕۆژە پشتی بەدیوارەکەوە نا و گریا، ئاخر ئەو توانایە ئاسان نەبوو، بابەتەکە وەک ئەوە وابوو هێزێکی تازە تاقیبکەیتەوە وا لەمرۆڤ بکاتب بتوانێت بەحەواوە بفرێت هەرچی شتیک مەبەستی بێت بیجووڵێنێتەوە، هەر بەڕاستی ئەوەی کرد.

هاتشیسۆن هاوڕێ زاناکانی بۆ شوقەکەی بانگ کرد، هەموو شتێکی نیشاندان، دوای بەسەرکردنەوەیان بۆ شتەکان بۆیان دەرکەوت هیچ فێڵێکی تێدا نییە، بۆیە هاتشیسۆن بڕیاریدا زانکۆکەی لەکەندا لێ ئاگادار بکاتەوە، ڕۆیشت و هەموو شتێکی باس کرد و بانگهێشتی شوقەکەی خۆشی کردن، هەر هەموویان سەریان سوڕما، ئەو هەموو بە وزەیەکی زۆر کەم کرا، کە تەنها لەکارەبای شوقەکەیەوە بەرهەمی دێنێت.

هاتشیسۆن لەکەناڵە لۆکاڵییەکانی تەلەفیزۆن دەرکەوت و نمایشی چۆنێتی هەڵگرتنی شتەکانی هەیە هەر وەک سیحریازێک، دەرگای سەرکەوتنەکانی بۆ کرایەوە، شەوێک لەشەوانی زستان بەتووندی لەدەرگای شوقەکەی درا، کە دەرگای کردەوە، پۆلیسی کەنەدی پاڵیان پێوە نا و بە پشتا کەوت و پۆلیسەکانیش کەوتنە پشکنینی شوقەکەی، ما دیقەتیان بدات کەوتبوونە وێزەی ئامێرەکانی و دەیانجووڵاند، بەر لەوەی وشەیەکی ناڕازی لەزمانییەوە دەرچێت، یەک لە پۆلیسەکان کەلەپچەی کرد.

هاتشیسۆن کەسایەتییەکی بەهێزی نەبوو، زۆریش قسەی نەدەکرد، زۆر لەسەر خۆ و بە خەمبارییەوە پرسیاری لێکردن، ئەوانیش بەوە وەڵامیان دایەوە کە چەکی لەماڵەکەیدا هەڵگرتووە و ڕێگە پێنەدراوە. دەمانچەیەکی کۆنی باوکی بەدیاری پێیدابوو لە شوقەکە گیرا، ویستی بۆیان باس بکات، هیچ دەرفەتێکیان پێنەدا و بەباڵ بەستراوی لەشوقەکە دەریانهێنا، خەڵکی

کۆبوونەوە، تا لەدراوسێکەیان بڕوانن، چەندین ساڵە هیچ کێشەیەکیان لەتەکیدا نەبووە، هەر لەمنداڵییەوە لەوێ ژیاوە.

ئەفسەرەکە پێی ڕاگەیاند هەموو ئامێرەکانی ناو شوقەکەی دەستی بەسەرا دەگیرێت، ئەگەر دوای چەندین ساڵ لەزیندان دەرچوو، ویستی کارگەیەک دامەزرێنێت، پێویستە مۆڵەتی بۆ وەربگرێت، لای شەوێ، دوای ئەوەی هاتشیسۆن لەدەرگاکانی شکۆمەندی ڕامابوو، چاوی بەو زیندانیانە کەوت، کە دیقەتی میوانە تازە نامۆکەیان دەدەن، ئەویش بەو پەرپووتییەوە دۆش دامابوو.

*　　　*　　　*

1920

لە ئەمریکا ڕۆژنامەیەک نەما باس لە دۆزینەوەی کارڵ دیرینگ نەکات، لەماوەی چەند هەفتەیەک بابەتەکەی بڵاوبووەوە، تا ببێتە بابەتی ڕای گشتی، لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەش بۆ نووسینگەی سەرۆک کۆماری نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرزەوە کرا، ئەو دەم (هیربەرت هۆڤەر) سەرۆک بوو، هۆڤەر بەجەستە زلەکەیەوە لەبەرامبەر پەنجەرەی نووسینگەی کۆشکی سپی وەستابوو، (لاوڕنس)ی یاریدەدەری بە گرنگییەوە پێیگوت:

-گەورەم سەرۆک.. لەبارەی (کارڵ دیرینگ)ەوە، کەشتییەکە، هەرچەند لێکۆڵینەوەمان لەتەکا کرد، شتی سەیرترمان بۆ دەردەکەوت.

سەرۆک هیچی نەگوت، لاورنس هەنگاوێک کشایەوەو بەردەوامی بە قسەکەی دا:

-لەم ساڵەدا زریانێکی وێرانکەر ناوچەی باشووری بەرمۆدای گرتەوە، کە گەورەترین زریان بوو تووشی ئەتڵەنتیک بووەوە، بەو ئاوایە کەشتییەکی زۆر بوونە قوربانی، هەرچی کارڵ دیرینگ بوو، لەو پەڕی باکووردا بوو، لەزریانەکەوە زۆر دوور بوو.

سەرۆک بە دەنگێکی سەنگین گوتی:

-بەرمۆدا ئەو سەدان پاپۆڕو فڕۆکەی لووش دا، مادام فڕۆکەشی گرتووەتەوە کەواتە زریانی دەریا هۆکار نییە.

لاورنس هەندێ کاغزی هەڵدایەوە و گوتی:

-گەورەم ڕاپۆرتی مارینزیشمان پێگەیشتووە، باس لەبیردۆزەی ونبوونی کەشتییەکان دەکات، ئەو کەشتییانە بەناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەند بە (هایدرەیتی میساتۆڵ)دا تێپەڕیوە کە گڕکانی دەریا دەریدەکات، بەوەش چڕی ئاوەکە دەگۆڕێت، دەبینی کەشتییەکە لەئاوێکدایە خۆی بۆ هەڵناگیرێت، بێ سەرکەوتن نووقووم دەبێت، بەڵام گەورەم ڕاپۆرتێکی ترمان بۆ هاتووە، گوایە هەموو ناوچەی بەرمۆدا ئەو ماددەیەی تێدا نییە.

سەرۆک هیچی نەگوت و بەدواداچوونیشی بۆ نەکرد، خەریکی ڕێکخستنی ملپێچەکەی ملی بوو، ئەوەش بە لای لاورنسەوە، یانی پەلە لەقسەکانت بکە، گوتی:

-هەر لە ڕاپۆرتی مارینزەکاندا هاتووە، ناوچەی بەرمۆدا لەجیهاندا لەو ناوچە کەمانەیە کە باکووری قیبلەنوما لەتەک باکووری ڕاستەقینە جووتن، ئەوەش دەبێتە هۆی هەڵەکردن لە ئاراستەکان لای هەر مرۆڤێک لەو ناوچەیە بگەڕێت، یا بەسەریەوە بفڕێت، ئەوەش دەبێتە هۆی ونبوون و بەرکەوتن لەتەک هەر شتێکدا.

سەرۆک بە تووڕەییەوە تەماشای کرد و گوتی:

-مەهێڵە ئەو قسە پڕووپووچانە بڵاو بکەنەوە، تا بەگەمژەمان نەزانن، هەموو پاپۆڕێک نەخشەی بە هەموو لادەریی قیبلۆنما هەیە، هەر ئەو نەخشەیەیە لە بەرمۆداو غەیری بەرمۆدا هەموو لەسەری دەڕۆن.

لاوڕەنس ویستی درێژە بەقسەکانی بدات، سەرۆک قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

-دەزانیت گرفتی ونبوونی کەشتییە ونبووەکانی بەرمۆدا لێرەیە، لەم نووسینگەیە؟ لەبەر ئەوەی ئاسایشی نەتەوەیی، هەواڵگری ڕووسی دوور نییە خۆیان کەشتییەکانیان ڕفاندبێت، یا چەتەکانی دەریا ڕفاندوویانە.

لاوڕەنس بەدەم سەرسوڕمانییەوە گوتی:

-بەڵام گەورەم کارۆڵ دیرینگ نەڕفێندرا، تەنها دەستەکەی ونن، خۆ ئەگەر چەتەکانی دەریا هێرشیان کردبێتە سەریان بۆ نموونە، ئەی بۆچی بەلەمێک ونە؟ ئەی بۆچی باری خەڵوزەکەی ناو کەشتییەکە کە بارێکی گرانبەهایە، نەدەبوو چەتەکانی دەریا نەیبەن؟ گریمان گرفتی گەورە ئەگەر تووشی زریان بوونەو لە کەشتییەکە هەڵاتوون، هیچ شتێک نییە لەناو کەشتییەکە تووشی

کەشوهەوای خراپ بووبن، شتەکان وەک خۆیان لەجێی خۆیان ماون و بەرنەبوونەتەوە، تەنانەت ڕووشانیش بە کەشتییەکەوە دیار نییە.

سەرۆک بەدەم بیرکردنەوەشەوە هیچی نەگوت، لاوڕەنس بە پەشۆکاوییەوە گوتی:

-ئا.. بەدەر لەوانەش شتێکی سەیرمان بۆ هاتووە، پیاوێک بەناوی (گرای) ئەم شووشەیەی بۆ هێناوین.

سەرۆک بە سەرسوڕمانەوە تەماشای کرد، بینی لاوڕەنس شووشەیەکی دەم داخراوی بەدەستەوەیەو شووشەکەش نامەیەکی تیا ئاخێنراوە، سەرۆک شووشەکەی لەدەست وەرگرت و نامەکەی تیا دەرهێنا، کەوتە خوێندنەوەی:

(( کەشتییەکەمان دیرینگ لە لایەن بەلەمێکی هەڵمییەوە دەستی بەسەرا گیرا، هەر هەموو دەستەکەمان دەستبەسەر کراین، هیچ هەلێکی هەڵاتنمان نەبوو، تکایە کۆمپانیای دیرینگی لێ ئاگادار بکەنەوە)).

شتێک لە ساختەیی لەنامەکەدا دیاربوو، ڕەنگە کەسێک لەوانەی ڕۆژنامە خوێنن نووسیبێتی، وەلێ سەرۆک بە (لاوڕەنس)ی گوت:

-ئەو پیاوە شووشەکەی لەکوێ دۆزیوەتەوە؟

-لەکەنار بۆکستۆن، بەڵام وەک دەبینیت پێدەچێت ساختە بێت، بەدەر لەوەش بەدواداچوونمان بۆ ئەو جۆرە شووشەیە کرد، بینیمان لە ڕیۆ دی جانیرۆ لە بەرازیل دۆزراوەتەوە، ئەوەش ڕاستی نامەکە دەردەخات، لەبەر ئەوەی ڕیۆ لە ئاراستەی کەشتییەکەدا بوو، ڕەنگە یەکێک لەدەستەکە ئەو

شووشەیەی لە کاتی دابەزینیان بۆ ڕیۆ کرێ بێتی، کاتێکیش ڕفێندراون، ئەو کەسە نامەکەی نووسیبێت و لە شووشەکەی نابێت و فڕێی داوەتە دەریاکەوە، بەو هیوایەی دەست کەسێک بکەوێت.

سەرۆک هۆڤەر گوتی:

-کات بەم قسە پڕووپووچانەوە مەکوژن، تەنها یەک چارەسەر بۆ ئەو پاپۆڕە هەیە، لەناو کەشتییەکە کودەتا کرابێت، یانی دەستەکە سەرکردەی کەشتییەکەیان کوشتبێت و بە بەلەمەکە هەڵاتبن، ئەوان ئێستا لەشوێنێکی تر ئازادن، ئێمەشیان لەناو بازنەیەکی خاڵی ئەفسانەیی جێهێشتووە، پەلە بکەن ناوی دەستەکە بەسەر هەموو بەندەرەکاندا بڵاو بکەنەوە و بگەڕێن بەدوای ناوی هاوشێوەیان.

لاوڕەنس نووسینگەی سەرۆکی جێهێشت و بەپەلە بۆ نووسینگەکەی خۆی گەڕایەوە تا فەرمانی سەرۆک بگەێنێت، بینی (لولوا) کچی کاپتن وورمێڵ بەو پەڕی دڵەڕاوکێ و پەرۆشییەوە چاوەڕوانێتی، هەوڵی ئارام کردنەوەی (لولوا)ی دا، بابەتی کودەتاکەشی نەگێڕایەوە کە ڕەنگە باوکیان کوشتبێت، وەلێ باسی شووشەکەی بۆ کرد، (لولوا) هەر کە گوێی لەو هەواڵە بوو، ڕووی کرایەوە، بەو مانایەی ڕفاندن لەگۆڕێدایەو ڕەنگە باوکیشی زیندوو بێت، دوای تکا کردنێکی زۆر بۆ دڵنیای لاوڕەنس شووشەکەی دایە دەستی، ڕەنگە بەوە کەمێک سەرقاڵی ئومێدی بکات، چونکە (لولوا) هەموو ڕۆژێ دەهاتە

نووسینگەکەی. پێدەچوو باوکی هەموو شتێک بێت بۆی، ئارام نابێتەوە تا ئەو مەتەڵە هەڵنەهێنێت.

❊ ❊ ❊

ناوی 11 پیاو لە لایەن (FBI) بەوێنەوە بەسەر هەموو بەندەرەکان و فڕۆکەخانەکان بڵاو کرایەوە، بەو هیوایەی کە کۆدەتا کرابێت و هەڵاتبن، هەر زوو بەرهەم هات، لە نووسینگەی لاوڕەنس یاریدەدەری سەرۆک پەیوەندییەک هات، کەسێک ناوەکەی هاوشێوەی ناوی یەک لەدەستەکەیە کە بەسەر کارۆڵ دیرینگەوە بووە، ئەو کەسەش لە دانیمارکەوە بە پاپۆڕێکی گەورە هاتووە و لای نیوەڕۆ دەگاتە تکساس و ناویشی (پیتەر نیلسۆن)ە، لاوەڕەنس بەپەرۆشەوەی هەواڵەکە بوو، فەرمانی دا لە بەندەری تکساس تیمێکی سەربازی (FBI) چاوەڕێی بکەن، لەگەڵ گەیشتنی پیتەر بەخۆی نەزانی و دەستبەجێ تیمە سەربازییەکەی گەیشتنە سەری و دەستبەسەریان کرد، پیاوەکە هیچ خۆی تێکنەدا و بەربەرەکانیشی نەکرد، گوتی کە دەریاوانێکی دانیمارکییەو لەوڵاتەکەی کار لەسەر بەلەمێکی بچووک دەکات، بەهیچ شێوەیەک گوێی لە ناوی کارڵ دیرینگ نەبووە، بەدەستبەسەری هێشتیانەوە تا زانیارییەکانیان پشتڕاست کردەوە، دوای لێکۆڵینەوە، دەرکەوت ئەوەی باسی کرد درۆی تیا نییە، ئەو ڕۆژەی دیرینگ ونبووە ئەو لەدانیمارک بووە، نە لەدوور نە لە نزیکەوە کاری بەوە نەبووە.

لاوڕەنس بە تووڕەییەوە مستی بە مێزەکەی بەردەمیدا کێشا، ئاخر ئەوەندەی نەمابوو مەتەڵەکە هەڵبێنێت. گوێی لە تەقەی دەرگای نووسینگەکەی بوو، خۆی ڕێکخست و فەرمووی هاتنە ژوورەوەی کرد، (لولوا) بوو، شووشەکەی بەدەستەوە و ڕووی گەشاوەتەوە، بلەز پێیگوت:

-دڵنیام ئەم شووشەیە ڕاستەقینەیە، باوکم ڕفێندراوە، سەردانی هەموو کەسوکاری ونبووەکانم کرد و یەک بەیەک نامەکەم دایە دەستیان، بەو ئاوایەی دەست و خەتەکە بناسنەوە، ژنی ئەندازیار (هێربێرت بیتس) ئەو پیاوەی لە کەشتییەکەدا لەگەڵیان بوو، خەتەکەی ناسیەوە، بە ڕاوێژی پسپۆڕی خەت لەتەک نامەیەکی لای ژنەکەی دەرکەوت هاوشێوەن و دەست و خەتی یەک کەسن، ئەوەش نامەی هێربێرتە لەناو شووشەکە.

لاوڕەنس وەک ئەوەی باوەڕ نەکات تەماشایەکی (لولوا)ی کرد و دواتر تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و بەتوندییەوە گوتی:

-هەر ئێستا (گاری) ئەوەی شووشەکەی هێناوە بۆ کۆشکی سپی بهێنن. نزیکەی کاتژمێرێک تێپەڕی، (لولوا) بەدڵەڕاوکێوە بەناو نووسینگەکەی لاوڕەنس دەهات و دەچوو، لەپڕ لەدەرگا درا، یەک لە پیاوەکانی لاوڕەنس (گاری) دابووە پێش، ئەویش بەترسەوە لێیانی دەڕوانی، ئاخر پیاو بۆی نییە هەموو ڕۆژێک بچێتە کۆشکی سپییەوە و بەسەلامەتی بێتە دەرەوە.

لاوڕەنس گوتی:

-باسی ئەم شووشەیەم بۆ بکە، هیچ وردەکارییەکی نەبواریت، بۆ خۆت دەزانیت های لەکوێ.

(لولوا) بە پاڕانەوە پێیگوت:

-تکات لێدەکەم، من کچی کاپتن (وورمێڵ)م، ئەوەی دەیزانیت بیڵێ، بەڵکو دەگەین بەشتێک.

کابرا سەری نەوی کرد، هەناسەیەکی هەڵکێشا، پێنەدەچوو خەبەرەکە باش بێت، گوتی:

-گەورەم من ئەو چیرۆکی شووشەیەم داهانی، من بۆ خۆم نامەکەم نووسیوە.

(لولوا) مەچەکی کابرای گرت و ما لێی بپاڕێتەوە:

-دڵنیان دەست و خەتەکە هاوشێوەی دەست و خەتی یەکێکە لەدەستەی کەشتییەکە.

گاری ڕووی وەرگێڕا و گوتی:

-لەڕاستیدا من داوام کرابوو لە تەکیاندا کار بکەم، گەورەم داوای لێبووردن دەکەم، ئەو نامەیە ڕاستەقینە نییە.

فرمێسک بەچاوەکانی (لولوا)دا هاتە خوارەوە، هەستی ورووژا، لاوڕەنس فریا کەوت و گوتی:

-تۆ دەستبەسەری بەوای ئەوەی زانیاری ساختە بڵاو دەکەیتەوە، بیخەنە زیندانەوە.

کابرایان برده دەرەوەی ژوورەکە، (لولوا) دوای کەوت، بەو هەواڵە پشتی شکا، ئەوە دوایین ئومێد بوو بەدەستییەوە.

پیاوێک بە پەلە خۆی بە ژوورەکەی لاوڕەنس دا کرد و چرپاندییە گوێی و گوتی:

-گەورەم لێکچوونێکی تری ناوەکانمان دۆزیەوە، ئەمجارە تەنها لەیەکچوونی هەر ناوەکە نییە، تەنانەت لێکچوونە لەشێوەش، بۆبی ڕانی ئەمریکییەکی ڕەشپێست، یاریدەدرەی ئەندازیارە، بەسەر پشتی کارۆڵ دیرینگەوە بووە، لە بەندەری ئەسینا دۆزیمانەوە، چاوەڕوانی ئەو کەشتییەبوو بیگوێزێتەوە بۆ نیویۆرک.

بێئومێدی ڕوخساری (لاوڕەنس)ی گرتەوە، بەدەم گەزتنی لێویەوە گوتی:

-ئەسینا.. ئاخر ئەوێ زۆر دوورە لە دەسەلاتی ئەمریکا، پێیان ڕابگەیەنە لەئەسینا دوورا و دوور چاودێری بکەن، دڵنیابن کە سواری کەشتییەکە دەبێت، گوێت لێم بوو؟ ئەو پیاوەم لە نیویۆرک دەوێت.

قەدەر بە ئاراستەیەکی پێچەوانە کەوتە گەڕ، بۆبی ڕانی.. کە لەبەندەرەکە دانیشتبوو چاوەڕوان بوو، لەجێی خۆی هەستا و داوای کرد گەشتەکەی هەڵوەشێنێتەوە، هەموو ئەوانەی چاودێریان دەکرد، ناڕەحەت بوون، وەلێ فەرمانبەری تکتبرەکە زۆر شارەزانە پێیگوت ناتوانێت گەشتەکەی هەڵبوەشێنێتەوە، دەنا پێ بژاردنی زۆر دەبێت، دواتر پێیگوت شوێنگرتن بۆ ماوەی مانگێک دادەخرێت، پێشنیاری گەشتەکەی بۆ کرد.

ڕانی کەمێک بیری کردەوە دواتر گوتی:

-باوابێت، لەم گەشتەدا دەڕۆم.

ڕانی سوار کەشتییەکە بوو کە بەرەو نیویۆرک کەوتە ڕێ، لاورەنس بە خۆی و هێزێکی فیدراڵی بۆ نیویۆرک ڕۆیشت تا لەپێشوازی (ڕانی)دا بێت، کەشتییەکە گەیشتە بەندەری نیویۆرک ، سەرنشینەکان دوا بەدوای یەک هاتنە خوارەوە، تا بۆب ڕانی دەرکەوت، ئەو پیاوە تاکە کەس بوو بتوانێت نهێنی بەرمۆدا ئاشکرا بکات، لەچەند چرکەیەک لاورەنس بە ڕیزێک سەربازەوە بێ هیچ قسەیەک تەماشایان دەکرد.

لاورەنس یەک پرسیاری ئاراستە کرد:

-تۆ یاریدەدەری ئەندازیاری سەر کەشتی کارۆڵ دیرینگ بوویت؟

ڕانی دەمێک بە سەرسوڕمانەوە دیقەتی دا و گوتی:

-بەڵێ.

خۆشییەک ڕوخساری (لاورەنس)ی گرتەوە، تا گوێی لەودوای قسەکەی بوو، ڕانی گوتی:

-بەڵام بەر لەوەی بکەونە ڕێ بەنیو کاتژمێر بەجێمهێشتن، وادیار بوو ئەوەش بەختی من بوو کە نەڕۆیشتم، دواتر پێمزانین نووقووم بوونە.

لاورەنس چڕوچاوی بەیەکا داو بەسەربازەکانی گوت:

-بیگرن.

سەربازەکان باڵبەستیان کرد و دەستبەسەریان کرد، قەدەری ڕانی باشی هێنا، دوای لێکۆڵینەوەی ورد، بۆیان دەرکەوت ناوی بەسەر لیستی دەستەکەدا بوو، وەلێ نیو کاتژمێر بەر لە ڕۆیشتنیان ئەم پەشیمانەوە بوو، بە هەموو ڕێگای لێکۆڵینەوە دانیان بەقسەکانیدا هێنا کە ڕاستی گوتووە. مێژوو دوایین ئومێدی ئەو کۆد کردنەوەشی لەدەستدا، بابەتەکە هەر وەک خۆی مایەوە، تا کاتێکی تر.

* * *

1975

ئەوەندەیان کووتیبوو دەموچاوی شین هەڵگەڕابوو، کراسەکانی ونجڕ ونجر کرابوو، بەوای شەڕانگێزییەوە کە وایان بۆ هەڵبەستبوو، گواستیانەوە زیندانی تاکەکەسی، ما لەبنمیچی زیندانەکەی بڕوانێت، بێئومێدی زۆری بۆ هێنابوو، بیری لە خۆهەڵواسینی خۆی دەکردەوە، بەڵکو ڕوحی بچێتە شوێنێکی ئارام لەم جیهانەدا، وەلێ کاربەدەستانی زیندان بنمیچەکەیان ئەوەندە بەرز کردبوو، نەوەک کەسێک بیر لەخۆهەڵواسینی خۆی بکاتەوە، دەیزانی زیندانیکردنەکەی دەستێکی لەپشتەوەبووە، دەترسا یەکێک لەهاوڕێکانی خەبەری لەدەست دابێت کە چەکی لەماڵەوە هەڵگرتووە، تا داهێنانەکەی بدزێت و بەناوی خۆیەوە بڵاوی بکاتەوە، هاتشیسۆن بەردەوام ڕۆژنامەکانی بەسەر دەکردەوە، پرسیاری لە سەردانیکەران دەکرد، هیچ داهێنانێک ئاشکرا نەکراوی، هاتشیسۆن دەیزانی ئەو داهێنانە جیهان دەگۆڕێت.

بەدەم گوێگرتنی لە هاموشۆی پاسەوانەکە، بیری دەکردەوە، بەڕاستی نەیزانی بۆچی لەزیندانی تاکەکەسیدا زیندان کرا، ئاخر من دەمتوانی ژیانتان باشتر بکەم، تەنها گوێم لێ بگرن، گوێی لەپاسەوانەکەبوو، گوتی:

-هاتشیسۆن.. سەردانیکەرت هەن.

دەرگاکە کرایەوە، هاتشیسۆن بە پەرۆشییەوە دیقەتیدا، وەلێ کە چاوی بە سەردانیکەرکە کەوت، نیوچەوانی گرژ کرد، پیرە پیاوێکی ڕەشپێستی ئەمریکی، لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا، پاسەوانەکە پیاوەکەی لە ژووری هاتشیسۆن جێهێشت و دەرگای لەسەر داخستن.

دەمێک بێدەنگییان هەڵبژارد، هاتشیسۆن چاوەڕوانی پیرە پیاوەکە بوو بێتە دەنگ، وەلێ دواتر هاتشیسۆن فەرمووی دانیشتنی لەکابرا کرد، زۆر بە ڕێزەوە گوتی:

-فەرموو باوکە.

پیاوەکە دانیشت و تەماشای هاتشیسۆنی دەکرد و بە دەنگێکی لەسەرخۆ گوتی:

-کوڕم تۆ پیاوێکی باشیت، تۆم لە تەلەفیزۆن بینیوە.

هاتشیسۆن سەری لەکابرا سوڕما، وایدەزانی ئەو کەناڵە لۆکاڵیانە خەڵکی تەماشای ناکەن، ڕەنگە تەنها هەر پیرەکان بەدیاریەوە دانیشن بۆ کات بەسەر بردن، پیاوەکە بزەخەنەیەکی بۆکرد و گوتی:

-تۆ لەخۆت دەپرسیت من کێم و بەم حاڵەمەوە چ پێویستییەکم بەوەیە بێمە لات.

هاتشیسۆن بەپەلە گوتی:

-نەخێر، بەڵا...

پیرە پیاوەکە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

-من ناوم (بۆب ڕانی)یە، تەنها ڕزگاربووی کەشتی کارڵ دیرینگ، قوربانییە بەناوبانگەکەی سێگۆشەی بەرمۆدا.

هاتشیسۆن لەدوورەوە گوێی لە سێگۆشەی بەرمۆدا بووبوو، هیچ وردەکارییەکی نەدەزانی، تەنها جارێک لە ڕۆژنامە شتێکی دەربارەی خوێندبووەوە، کە شوێنێکی زۆر مەترسیدارە.

پیرەپیاوەکە گوتی:

-ڕەنگە وابزانیت کە پەیوەندیت بەو بابەتەوە نییە، ڕووداوێک بەر لەپەنجا ساڵ ڕوویداوە، تۆ کارت بەسەر ئەوەوە چییە؟

پیرەپیاو نیشانەی کارێگەری بەڕوخساریەوە ئەوەتا دەردەکەوت، گوتی:

-کاتێک بەرنامەکەتم بینی، گوتم کەس لەم دونیایە شایانی ئەو نهێنیە نییە، کە تا ئێستا نەمدرکاندووە، پەنجا ساڵە لەخۆما کڵۆمم کردووە.

هاتشیسۆن هەستی بە خرف بوونی کابرا دەکرد، بیری لەڕێگایەک دەکردەوە پوولی پێوە نێت، پیرە پیاو درێژەی بەقسەکەی دا و گوتی:

-ئەو کارەساتەی بەسەر کارۆڵ دیرینگدا هات، پەیوەندییەکی زۆری بە قسەکانتەوە هەیە کە لە کەناڵەکە گوێم لێگرت، هەواڵتم پرسی، سەرمسوڕما کە لەزینداندایت، سویندم خوارد بێمە دیدارت و هەموو شتێکت لا بدرکێنم.

❊ ❊ ❊

بۆب ڕانی دەڵێت:

ئێمە یانزە کەس بووین کە بەکەشتییەکە بەدەریادا کەوتینە ڕێ، نەماندەزانی بەرمۆدا چییە، زۆریش گوێمان بەوە نەدا، کەشتیوانەکەمان پیاوێکی دڵنەرم بوو، وەلێ توندوتیژیش بوو، ناوی وورمێڵ بوو، بۆ خۆم تەمەنم لە بیستەکانبوو، گەنجێکی زۆر بەخۆ بووم، جەستەم وەک جەستەی وەرزشوانێک بوو، کوڕی خۆم وەک ئێستای تۆ بووم، وەلێ زۆریش لەتۆ بەخۆتربووم، گرفتەکەی بەسەرمانا هات، شتی وا نەبووە، لەئاسمانەوە بروسکە دایگرتین، هەوری چڕیش بە ئاسمانەوە نەبوو، تەنانەت بۆنی بارانیش هەر نەدەهات، بڵێین دەبارێت، بەڵام شتێک وەک تەم بەئاسمانەوە بڵاو دەبووەوە، زۆریش بە پەلە، بەرچاومان گیرا، سوێند دەخۆم ئەوە تەم نەبوو، بۆخۆم دەمزانی تەم چۆن دەبێت، وەلێ ئەوە شتێکی تربوو، شتێک چون ئەوەی ئاسمان و دەریا ڕەنگ بکات، کەش و باکەی بە ڕەنگی سپی ڕەنگکرد، ئێدی نەدەتوانی ئاسمان لەدەریا جیا بکەیتەوە، تەنانەت دووری مەتریک یا دوو میتریشمان لێوە دیار نەبوو.

له ڕادیۆەکەوە وژە وژە پەیدا بوو، چون ئەوەی لەخۆیەوە کار بکات، ئەو کات زۆر گرنگیمان بە ڕووداوەکە نەدا، کاپتن وورمێڵ لە ژوورەکەی خۆی بە قیبلۆنمایەک هاتە دەرەوە، ڕوخساری پەشۆکابوو، ئەو پیاوە خاوەن ئەزموونێکی دەریاوانی زۆری هەبوو، هەرگیز وەک ئەو دۆخە سەیری پێ نەهاتبوو، چوومە لای بۆ ئەوەی لە گرفتی قیبلۆنماکە حاڵی بم، بۆ خۆم یاریدەدەری ئەندازیارەکە بووم، بینیم دەرزی قیبلۆنماکە بە پێچەوانەی میلی کاتژمێر دەسووڕایەوە، دڵم گوشرا، بەتایبەت کە وژە وژی ڕادیۆکە تا دەهات لەگەڵ بروسەکەکانی زیاتر دەبوو، ترس دایگرتین، بەتایبەت کاتێک (هێربێرت بیتس)ی ئەندازیار سەرکەوتە سەر پشتی پاپۆڕەکە، گوتی پاپۆڕەکە فێی لێهاتووە، یانەخۆ شێتبووە، هیچ ئامێرێک کار ناکات، تەنانەت مەکینەکەش لەکار کەوتووە، وەک ئەوەی تووشی هێرشێک بووبین بۆ سڕینەوەی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان، تەنها ڕادیۆکە بوو دەنگێکی بێزار کەری لێوە دەردەچوو، ئەوجا تەواوی شتەکان کوژایەوە کاتێک چراکانیش لەیەکرا کوێر بوونەوە، ترس ئامبازمان بوو.

ئەوە هەندێک پێشبینیی بەرمۆدا بوو، کە خەراپترمان بەسەر دێنێت، گوێم لەبەرمۆدا بووبوو، هەر کەسێک ڕۆژێک چووبێتە دەریاوە دەیناسی، وەلێ هەر هەموو ئەو قسانەم بەقسەی پڕوپووچ دەزانی، دەمگوت ئەوە قسەی ڕۆژنامەکانە حەزیان بە ورووژاندنە، هەندێ شت لەناو بەلەمەکە کەوتە جووڵە،

چون ئەوەی بلەرێتەوە، گوێمان لەڕادیۆکە بوو، دەنگی پەخشکردنی ئافرەتێک بوو:

(( ئێرە سۆ هۆ ونگە، باسی سەربازە ئەمریکییەکان دەکەین لەڤێتنام، بارو دۆختان چۆنە ئیلّگی ئای گۆ؟))

بیتسی ئەندازیار لە ڕادیۆکە نزیکەوە بوو، گوێی لەنامەیەکی تر گرت، ئەویش دەنگی ئافرەت بوو.

(( ئێرە ئیمیلیا ئیرهارتە، ئەوەندە سووتەمەنیم پێ نەماوە، هەر بایی نیو کاتژمێر، کەس گوێی لەدەنگمە، ئێمە بۆ 3105 دەڕۆین، دادەبزینە 1000 پێ)).

ئەندازیار ڕادیۆکەی بە بێنرخ گرتە دەست و دەیویست بیکوژێنێتەوە، ئا لەو دەمەدا زیکەیەکی تی ژلە ڕادیۆکەوە بەرز بووەوە، لەدەست بیتس بەرەوە بوو، زیکەکە نەبڕایەوە، دەستمان بەگوێمانەوە گرت، بەرەو ڕادیۆکە ڕۆیشتم تا بیکوژێنمەوە، نەمتوانی دوو هەنگاو برۆم، بەلەمەکە بە لای چەپ و ڕاستا کەوتە لەرینەوە، کاپتن هاواری لە ئەندازیار کرد:

-دابەزە لای مەکینە نەفرەتییەکە، هەرچۆنێ بێ لێرە دوورمان بکەرەوە.

دواتر هاواری لەدوو کەسی دەستەکە کرد:

-ئەودوای چارۆگەکان هەڵدەن.

بە لارە لار هەر یەکە بەرەو شوێنی پێویست بە پێی فەرمانی کاپتن جووڵاین، ئەودەمەی بیتس دابەزیە خوارەوە بۆ لای مەکینەکە و دەرگاکەی لەسەر داخرا

شتێکمان بەچاوی خۆمان بینی، نە جنۆکەو نەبنیادەم شتی وایان نەبینیوە، تەنانەت بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە، هەر هەموو شتەکانی سەر بەلەمەکە بەوانەی سەر دیوارەکانیشی بەرزەوە بوون، وەک ئەوەی شەیتان بەرزی بکاتەوە، چوپی فریاکەوتنەکان بەرەو ئاسمان بەرزبوونەوە، هەر وەک ئەوەی کەسێک لە ئاسمانەوە بەرزی بکاتەوە، گوریسەکان بەرزەوەبوون و لەیەک ئاڵان وەک ئەوەی مارین و لە یەک بئاڵێن، هەر هەموو ئەو ڕووداوانە هی ئەوەبوون دەم داخەین و چاوەکانمان بلەرزێن، ئەوەی هاواری پێکردین، کاتێک بەندەرە ئاسنینەکان بە ئاسمانەوە ئاوێزان بوون و دەسووڕانەوە، دیقەتدانمان بۆ ئاسمان هیچ هۆکارێکمان بۆ ئەو دۆخە نبینی، تەنها برووسکەکان لێرەو لەوێ بێدەنگ لێیان دەدا، کاپتن وورمێڵ هاواری بەسەر هەموویانەوە کرد:

-خۆتان بە هەر شتێکەوە بگرن، ئاسمان کێشکەرە بۆ...

قسەکەی تەواو نەکرد، لەپڕ و لەخۆوە دەستی بەرزەوەبوو، هەر زوو دەستی بە چمکێکی چارۆگەکەوە گرد، وەلێ هەستم بە جووڵەی پێی خۆم کرد، خۆم بۆ ڕانەگیر و بەرەوەبووم، پێکانم بەرزەوەبوون، هێزم وەبەر خۆم ناو پێکانم شۆڕ کردنەوە، دەستم بە لێواری بەلەمەکەوە گرت، بینیم هەر هەموو دەستەکە هەوڵیاندەدا بگەنە شتێک و دەستی پێوە بگرن، ترس هاواری پێکردین، مرۆڤ ڕۆژی وای بەخۆیەوە نەبینیوە کارەساتی کێشکردن بەرەو ئاسمان ڕووداوێکی زۆر سەیربوو، کەس باوەری نەدەکرد تەنانەت

لەخەونەکانیشیاندا غەزەبی ئاسمان بەو شێوەیە بێت، پێدەچوو کێشەکردنەکە لە بەرمۆدا دا نەبوو، بەقەد ئەوەی لە ئاسمانەوە بوو.

زیکەی ڕاپێۆنەکە کەمێک ئارام بووەوە، خۆمان گردکردەوە، لەخولەکی دواتر ئەوەی ڕوویدا دڵی خەمبار کردین، (ماکلیلان)ی سەرمەست هەر لەسەرەتاوە هۆشی لای خۆی نەبوو، هەر کە بینی شتەکانی دەوروبەر بەرز بوونەوە، واقی وڕماو دەمی کرایەوە، دواتر کە ئێمەی بینی خۆمان بەشتەوە گرتووە، خۆی بە پەرژینەکەوە گرد، مەی هەر مەستی نەکردبوو (هۆش)یشی لەدەست دابوو، تەنانەت لەش و لاریشی خاو کردبووەوە، بە لای ئاسمانەوە سەخت نەبوو هەڵیکەنێت و بۆ لای خۆی هەڵکێشێت، تەماشای بەرزیمان کرد، ماکیلانمان بینی بەدەم لەرزەوە بەرز دەبووەوە، تا لەنێو تەم و مژەکەدا لەچاو ونبوو، لەڕاستیدا ئەوە دیمەنێک بوو، بەتەواوی تۆقاندنی.

گوێمان لەنووزانەوەی کەسێک بوو، هەر هەموومان دیقەتماندا، ئەویش پیرە دەریاوان (فین)بوو، برشتی بەرەنگاریکردنی هێزی کێشکردنی ئاسمانی نەمابوو، کاپتن وورمێڵ هاواری لێکرد:

-فین لاقت لەو ئەڵقەیە گیر بکە.

فین.. بە خەمبارییەوە لای لە کاپتن کردەوە، فرمێسک بە ڕوومەتەکانیدا هاتە خوارەوە، تەواو برشتی لەدەست دابوو، دەستی شلەوە بوو، بەرزەوە بوو، ئەوە یەکەمجارم بوو کاپتن وورمێڵ ببینم فرمێسک بەچاوەکانیدا بێتە خوارەوە

و لەرز دایگرێت، فین.. هاوڕێیەکی زۆر نزیکی بوو، دواتر بینیمان دەرگای ژووری خوارەوە مەکینەکە کرایەوە، وورمێڵ هاواری کرد:

-بیتس.. هۆ بیتس دەرمەچۆ، لەشوێنی خۆت بمێنەرەوە.

دەرگاکە کرایەوەو بیتس بەهێز دەرپەڕی، وایزانی چەتەکانی دەریا هێرشیان کردووەتە سەریان، پیاوێکی سەنگین بوو، وەلێ ئاسمان بەزەیی بە کەسدا نەدەهاتەوە، بەرەو خۆی (ئاسمان) بەکێشی کرد، بیتس بەدەم کێشکردنەوە سەری بەر دەرگاکە کەوت، شۆکێکی تر بوو بیتس لەدەست بدەین.

نوزانەوە لە هەندێک لەدەستەکە بەرگوێمان دەکەوت، ئەوەی خۆی بەدەستەوەی نائومێدی نەدەدا وورمێڵ بوو، وەک فەرمانێک هاواری بەسەرما کرد و گوتی:

-ڕانی بەرەو بەلەمی فریاگوزاری بڕۆ، دەستیش لە پەرژینەکە بەر نەدەیت، (جاک)یش لەتەک خۆتا بەرە، ئێوە جەستەتان زۆر لە ئێمە بەهێزترە.

تەماشای بەلەمەکانم کرد، کەمێک دوور بوون، وەلێ خۆم بۆ جووڵاند، بەخۆشم وابوو ئەوە تەنیا چارەسەرە بۆ ڕزگار بوون لەم دۆخە نەفرەتییە، جەستەم یارمەتی دام و لەسەر خۆ بۆی چووم و (جاک) یش دووم کەوت، پێ بە پێ دەڕۆیشتین، تا دەستمان لە بەلەمەکان گیر کرد، گوریسی بەلەمەکەمان کردەوە، ئاخر زۆر سەختبوو، پێمان لە شتێک گیر بکەین و بەلەمەکەیش بەدەست بکەینەوە.

کێشەکە لای جاک بوو، گوریسەکەی زۆر بەتووندی ڕاکێشا، لەکاتێکا دەیویست خۆی بەشتێکەوە جێگیر بکات، ئاسنەکە هەڵکەندرا و بەر دەموچاوی کەوت، ئێدی دەست و قاچی شلەوە بوو، وەلێ دواجار توانیم بیگرم، لەترسا هەر هاواری بوو، ئەو هێزەی بۆ گرتنی بەکارم هێنابوو، بڕشتی لێ دەبڕیم، کەس ئەو هێزەی تاقینەکردووەتەوە، هێزێک دژ بەهێزی کێشکردن بەکار بهێنێت تا لەسەر زەوی بمێنێتەوە، لەهەمان کاتدا جەستەیەکی تریش بەدەستێکەوە بگرێت، ئەوەندەی نەبرد لەدەستم بووەوە، بەرەو چارەنووسی خۆی ڕۆیشت.

هێزێکی زۆرم بەکارهێنا تا بەلەمی ڕزگاربوون بکەمەوەو دایگرمە ناو دەریاکە , بەهێز بانگم لە دەستەکە کرد، ئومێدێکیان هاتەوە، بەوریاییەوە هاتنە ناو بەلەمەکە، کاپتن هەر نەجووڵا، تەنها چاودێرییانی دەکرد، هاوارم لەویش کرد:

-کاپتن وورمێڵ وەرە خوارەوە، بێم بە شوێنتا؟

کاپتن دیقەتێکی دام، قەد ئەو دیقەتدانەیم بیر ناچێتەوە، گوتی:

-ڕانی.. کاپتنی باش کەشتییەکەی جێ ناهێڵێت، کاپتن لەو شوێنە دەبێت کە کەشتییەکەی لێ دەبێت.

هاوارێکی ترم لێکرد:

-کاپتن.. دواتر دێینەوە سەری، با لەم کارەساتە دەرباز بین، بۆی دێینەوە.

بابەتەکە یاسای دەریا بوو، کەشتیوان لەو شوێنە دەبێت کە کەشتییەکەی لێیە، تەنها کاپتنە ڕاستەقینەکانی وەک وورمێڵ ڕێز لەو یاسایە دەگرن، نەیدەویست ئەو یاسایە بشکێنێت ئەگەر سەریشی تێناوە، وورمێڵ بەو دوو چاوە شینەی دیقەتی دامەوە و گوتی:

-ڕانی.. ئەگەر ڕزگارت بوو، بە (لولوا)ی کچم ڕابگەیەنە خۆشم دەوێت، پێشی بڵێ باوکت سەردانیت دەکات، هەر ئەو (لولوا) بچووکەیە لە پێش چاوم.

چاوەکانم فرمێسکیان داهات، ما بەلەمەکە ئامادە بکەم، دوای ئەرکێکی گەورە ئەو دوای دەستەکە گەیشتنە ناو بەلەمەکە، وەلێ کێشەکە هەر یەخەی پێگرتبووین، کاتێک لەهەوڵی ئەوەدا بووم یەکێکیان بێنمە ناو بەلەمەکە، پێی هەڵخلیسکا، ویستم بیگرم، فریای نەکەوتم، وەلێ دەستێکی تر گرتی، ئەو دەستەی هاوڕێکەی بوو کە دەستی یەکیان گرتبوو، ئەوی دەستی گرتبوو لەپڕ بەرزەوە بوو، ئەویشی لەتەک خۆیدا بەرزەوە کرد، هەردووکیان بەرەو ئاسمان بەرزەوە بوون.

بەدەم ڕوانینمەوە بۆ دەریاکە نەفرەتم لەو دۆخە کرد، کە بەوشێوەیەی گەیاندین، تەنها چوار لەدەستەکە ماینەوە و خۆشم پێنجەم بووم، بەسەرکەوتوویی گەیشتنە ناو بەلەمەکە و خۆیان جێگیر کرد، دوا نیگامان لە کاپتن وورمێڵ بڕی، کە بەسەر پشتی کەشتییەکەوە بە خەمباری دیقەتی

ئەدەاین، کەوتینە سەوڵ لێدان، چاومان بە فرمێسکەوە بوو بۆ کاپتن، خۆشمان دەویست، ئەوە دوا یەکتر بینینمان بوو.

بەلەمەکە وردە وردە لەکەشتییەکە دوور کەوتەوە، ئەو هێزی کێشکردنە سەوڵەکانمانی بەرز دەکردەوە، ئێمەش بەهەموو هێزمانەوە سەوڵەکەمان لێدەدا تا بەرەو پێشەوە برۆین، دوای سێ کاتژمێر شان و باڵمان لەسەوڵ لێدان نەما، بۆیە هەر جارەی کەسێک یان دووانمان پشووی بە شان و باڵی خۆی دەدا، تەمە سپییەکە هەر بەردەوام بوو، هیچمان لە ئاسۆکە لێوە دیار نەبوو، ئەوجا خەو دەیویست زەفەرمان پێبەرێت، هەمووشمان دەمانزانی هەر کەسێکمان خۆی ڕادەستی خەو بکات، چارەنووسی بەرەو ئاسمان دەبێت.

دەمو چاومان بە ئاوەکە تەڕ دەکرد، تا خەو نەمانباتەوە، تیامانا بوو هەوڵیدا لە ئاوی دەریاکە بخواتەوە، وەلێ خەو کە هات کێ دەتوانێت پێشی لێ بگرێت؟ کێن ئەوانەی دەتوانن شکست بەخەوە بێنن؟ دەمانزانی بابەتەکە کاتە درەنگ یا زوو خەو دەمانباتەوە، تاقەتی سەوڵ لێدانیشمان نەبوو.

یەکەم کەسمان بەرەوە بوو، یا بڵێین بەوای خەوەوە بەرەو ئاسمان بەرزەوە بوو، هەوڵماندا دەست و پێی خۆمان لەنێو تەختەی ناو بەلەمەکە جێگیر بکەین، بەشێوەیەک ڕێگر بێت لە بەرز کردنەوەمان، بۆ ئەوەی خەو نەمباتەوە کەوتمە گۆرانی چڕین، وەلێ هەستم دەکرد خەیاڵێک دەیویست لێم نزیکەوە بێت، ئەویش خەو بوو، کە تەماشای هاوڕێکانم دەکرد، ئەوانیش وەک من

بوون، هەموویان دەمیان کرابووەوە، ئەوەندەی نەبرد خەو زەفەری پێبردم، هەموو شتێک تەواو بوو.

*　　　　*　　　　*

هاتشیسۆن بە پەرۆشییەوە گوتی:

-ئای خودایە! دواتر چی ڕوویدا؟

ڕانی پیرەمێرد گوتی:

-هیچ، هەر کە چاوم کردەوە، بینیم لەناوەندی ئۆقیانووسم، تەنها و تەنها هەر خۆم بووم، کەس لەهاوڕێکانم لەتەکما نەبوون، من قاچەکانم لەنێو دوو تەختە داری بەیەکاچوو گیر کردبوو، تەنانەت بە ئاسانیش بۆم دەرنەدەهات، ئێدی بەلامەوە گران نەبوو بکەومە سەوڵ لێدان، تا بگەمە وشکانی.

هاتشیسۆن لێی پرسی:

-تۆ بۆ ئێرە هاتوویت، پێتوایە ئەوەی لە کشتییەکە ڕوویدا، ڕێک وەک ئەوەیە کە من لە کەناڵەکە باسم کردووە، بواری موگناتیسی؟

ڕانی پیرەپیاو گوتی:

-بەڵێ، هەر هەمان تەم و برووسکەی بێدەنگ و هەمان بەرزی، کوڕی خۆم تکات لێدەکەم، لەو داهێنانەت بەردەوام بە، لەبارەی ئەو دەستەبەرییە زۆری ناویانەتە سەرت تا بێئومێد بیت لەدەرچوون، ئەو پارەی کەفاڵەتم گشتی داوە، دەنا نەیاندەهێشت بێمە سەردانیت، کوڕی خۆم دەرچۆ ئەو جیهانە ڕووناک بکەرەوە، شکست مەهێنە.

بەردەوام گوێم لێبووە عەرشی شەیتان لەسێگۆشەی بەرمۆدادایە، کە هەموو وزە نەشیاوەکانی تێدایە، نەک هەر ئەوە تەنانەت مەسیحی دەجالیش لەوێ خۆی شاردووەتەوە، بوونەوەرە ئاسمانییەکان گەمە بە بوونەوەرەکانی ناو زەوی دەکەن، هەموو شتێک پێچێک لەجیهاندا شەڕانگێزییە، وەلێ ئەو پیاوە (کەنەدی)یە بەسەرهاتێکی گێڕایەوە زۆر سەیر بوو، پێشتر شتی لەو جۆرەم نەبیستبوو، بەشێک لەناخمدا باوەڕی بەو قسە پڕوپووچە نەبوو، بەشێکی تری ناخم دەیگوت ئەمە ڕاستییە و ئەودوای کە وتراوە درۆن، بەهەرحاڵ لەوە ناچێت درۆ بکات، بۆخۆم دروزن دەناسمەوە کاتێک قسان دەکات، بینیم هەر هەموویان بێدەنگی بردبوونیەوە، تا هاتشیسۆن هاتە قسەو گوتی:

-مەودای موگناتیسی بە شەپۆلە جیاوازەکانی بەسەر ناوچەیەکی دیاریکراوی سێگۆشەی بەرمۆدا، ئەو مەودایە زریان و برووسکەو لادانی موداەکە لەناوچەکە دەبێتە شوێنێکی خەتەرناک و هەموو شتێکی سووکەڵەی تەنانەت وەک مرۆڤیش هەڵدەکێشێت، ئەودوای شتەکان لەجێی خۆی جێدەهێڵێت، ئەوەش شرۆڤەی ونبوونی دەستەی کەشتی کارۆڵ دیرینگ دەکات.

شارلۆتان بە گومانەوە گوتی:

-بەڵام شرۆڤەی ونبوونی کەشتییە جەنگی و فڕۆکەکان ناکات، ئەوە تەنها دەستەو سەرنشینەکانی ون نەکردووە، هەر هەموو ونبوونە.

هاتشیسۆن هەر کاتێک بەستی نایە ژێر چەناگەی، ئەوە مانای ئەوەیە بەجیدی قسە دەکات و گوتی:

-ئەو مەودایە توانای زۆر بەرزی هەیە، وەلێ لەبارودۆخێکی تایبەتدا، لە سەریردەکە ئەوەم نەگێڕاوەتەوە، هەر شتێک بکەوێتە ئەو مەودایە لووشی دەدات، وەک چۆن کونە ڕەشەکە دەروبەری خۆی لووش دەدات، لووشدان مانای وێران کردن نییە، ئەو شتەی لووش دراوە، لەشوێنێکی تر دەردەچێت، فرۆکە هەبووە لە بەرمۆدادا ونبووە، لە شوێنێکی ترەوە دەرکەوتووە، وەک فرۆکەی 201 کە لە ڕادارەکە بینرا لەناو سێگۆشەی بەرمۆدادا ونبووە، دواتر 50 کیلۆمەتر دوور لەو شوێنەی ڕادارەکە دەریخستبوو کەوتووە .

شارلۆتان برۆکانی بەرزەوە کرد و گوتی:

-ئەوە ئەو فرۆکەوانەم بیر دێنێتەوە، کە گوتبووی فرۆکە بچووکەکەی لەپڕ چووەتە ناو هەور و ڕێی لێ ونبووە، کە چاوی بە برووسکە کەوتووە لەم لاو ئەولای داوە، وەختەبوو عەقڵ لەدەست بدات، دواتر کە لەهەورەکە دەرچووە، خۆی لەتەنیشت میامی بینیوە، کە یەک کاتژمێر دوور بووە، وەک ئەوەی هەورەکە مەوداکەی بۆ قەمچ کردبێت.

پیاوە دەم و چاوە ڕەقەڵەکە بەدەم نووسینەوەی شتێک هاتە قسەو گوتی:

-بەداخەوە، بەرمۆدا ئەوە ئەفسانەیەکەو ڕۆژنامەکان بەدانایی خۆیان دایانهێنا، خوێنەری ئەو بابەتانە زۆر زۆرن، کۆمپانیای فیلم و کەناڵەکان و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە بەوای بەرمۆداوە قازانجێکی زۆر زۆریان کرد، ئەگەر بەچاوی پشکنین و بەدواداچوون لە دەریاوانەکانی جیهان بڕوانیت، دەبینیت ڕێژەی ونبوونی ئەو کەشتییانەی بێجگە لە بەرمۆدا، هیچی لە ونبوونی

کەشتییەکانی بەرمۆدادا کەمتر نییە، چاودێرانی دەریەندەکان ئەوەیان ئاشکرا کردووە، ئەو کەشتییانەی بە سلامەتی لەو سێگۆشەیەی بەرمۆدادا تێپەڕیون، زۆر لەوانە زۆرترن کە ونبوونە، کۆمپانیاکانی بیمەی گەورە بۆ کەشتییەکان باجی زۆریان لەو کەشتییانە وەرنەگرتووە کە بەو ناوچەیەدا تێدەپەڕ دەبوون، ئەوەی لەسەر بەرمۆدادا وتراوە قسەی پڕوپووچە.

هاتشیسۆن بە هێمنی گوتی:

-بەرێزم، ئەو مەودا کارۆموگناتیسییە شەپۆڵ جیاوازانە تەنها لە بەرمۆدادا ڕوو نادات، بەڵکو لە هەموو دەریا و ئۆقیانووسەکانی دونیادا ڕووی داوە، یانی ئەو کێشکردنی ئاسمانە لەهەموو شوێنێک بەرامبەر کەشتییەکان ڕوو دەدات، تۆ هەڵەیت کە تایبەتم کردبێت بەس بە بەرمۆدا، وەلێ ئەوە دیاردەیەکی سرووشتییە و لەهەموو شوێنێک بۆی هەیە ڕوو بدات.

شارلۆتان مستێکی بە مێزەکەدا کێشا و گوتی:

-ئێمە بەو شتە نامۆیانە دەڵێین میتاسرووشت، وەلێ لەڕاستیدا، ئێمەین لە سەرووییەوە. سبەی لەهەمان کات لێرە کۆ دەبینەوە، ئێستاش بۆتان هەیە بڵاوەی لێبکەن، بیرتان بێت، هەر هەموو بەسەرهاتەکانتان دەخرێنە بەردەم لایەنی زانستی دوای کۆنفرانسەکە.

ئەو دەم و چاو ڕەقەڵەم بینی ، بۆ لای دکتۆر هاتشیسۆن ملی نا و بە دەنگێکی کزەوە چون ئەوەی کەس گوێی لێ نەبێت، پێیگوت:

-بەرێز هاتشیسۆن، تۆش ئێرە جێدەهێڵیت، وەک ئەوانی تر کە دوای بەسەرهات گێڕانەوەکەیان ئێرەیان جێهێشت؟

هاتشیسۆن پێکەنی و گوتی:

-نەخێر، من مۆڵەتێکی کراوەم بۆ کراوە، ناڕۆم تا دوایین سەربردەکان گوێ دەگرم.

کەمێک لەسەر قەنەفەی هۆڵەکەی خوارەوە دانیشتم، ئەو ئافرەتە سەرپۆش بەسەرەم بینی لێم نزیک دەبووەوە، بەشەرمەوە سەری نەویکردبوو، پێدەچوو دەیویست دەیەوێ شتێک بڵێت، بە دوودڵییەوە پێشی کەوتم و گوتم:

-سڵاو خاتوون، فەرموو.

بە زمانی ئینگلیزی و زاراوەیەکی سەیر گوتی:

-بەداوای لێبووردنەوە، دەتوانیت ئەم بازنگەم لەدەست بکەیتەوە، کە لە مەچەکیان ناوین؟ بە هەموو شێوەیەک هەوڵمدا بۆم نەکرایەوە.

بە بەڵێ سەرم بۆ لەقاند، دەستی درێژ کرد، تەماشای بازنگەکەم کرد، ئاسایی بوو، لەڕاستیدا نەمویستبوو لەدەستمی بکەمەوە، گرفتم پێ نەبوو، تەماشام کرد، هیچ شوێنێکی نەبوو بۆ کردنەوە، قۆڵی کراسەکەی خۆمم هەڵماڵی و تا بە ئازادانە بازنگەکەی خۆم بپشکنم بۆ کردنەوەی، سوودی نەبوو، ئافرەتەکە لەسەر کورسییەکەی بەرامبەرم دانیشت، چون ئەوەی چاوەڕوانی دەرئەنجامەکە بێت، هەوڵەکانم هیچیان سەری نەگرت، پرسیارم لێکرد:

-تۆ لەکوێوە هاتوویت؟

پێیگوتم:

-تشینگ یانگ، لێم ڕوانی، دواتر گەڕامەوە لای بازنگەکە و هیچم نەگوت، پێدەچوولە موسوڵمانەکانی چین بێت، گوێم لە فیشکەی مارەکەی پشتمەوە بوو، گوتی:

-یاشێخ خۆت ماندوو مەکە، ئەو بازنگە بە بەرنامە کراوە، دوای هەفتەیەک بۆ خۆی دەکرێتەوە.

ویستم لای لێبکەمەوەو قسەی لەتەکا بکەم، ئەو ڕۆیشت، تەماشای دەورویەری خۆمم کرد، ئەو پیاوە ناچێتە عەقڵمەوە، ئەم شوێنەش هەروەها.
ڕۆژی دواتر چوومە هۆڵی کۆبوونەوەکان، هەوەڵ شتێک کە کردم، دیقەتی کورسییەکەی (هاتشیسۆن)م دا، بینیم چۆڵە، دڵم کەوتە غایەلەوە، ئەو نەیگوتبوو نارۆم تا دوایین سەربردە گوێ دەگرم، هەڵەیەک لە گۆڕێدا هەیە.
هەر هەموو ئامادەبوون، گورجوگۆڵ دیاربوون، تەنها ئەو ڕوخسار ڕەقەڵەیە نەبێت، کە بەدوو چاوی زەقەوە لێی ڕوانیم، بە شارلۆتانم گوت:

-بەڕێز هاتشیسۆن ڕۆیشتووە؟

شارلۆتان بێ گوێدان گوتی:

-بەڵێ ئێرەی جێهێشت، سوپاس بۆ پرسیارەکەت.

چەند کابرایەکی وشکە، ئەو ڕوخسارەت هەر لە مار دەچێت، لیوی خۆمم گەزت وەک نارەزاییەک، چاوەڕوانبووم ناوی قسەکەرەی دواتر بڵێت، شارلۆتان گوتی:

-خاتوو بریانکا شۆنرا، ئەمڕۆ نورەی تۆیە. بابەتەکەی ئەمڕۆ نە زانستییە، نەیش ڕوحانییە، بەڵکو میتا سرووشتییە، خاتوون ئەوەی پێتە بۆیانی باس بکە.

5

# خوێنمژەکان

---

## بریانکا شۆنرا دەیگێڕێتەوە

(( کوڕی خۆم من دایکتم، وەلێ ئەگەر بینیت پرچم درێژ بوو، کەڵبە ددانەکانم چەمانەوە و ڕقم لە ڕووناکی بەربەیان بوو، کوڕی خۆم بمکوژە))

---

قینم لەو ڕۆژانە دەبێتەوە کە یەکێکبووم وەک ئێوە، چون ئێوە بیرم دەکردەوە، خەونی چکۆڵەم دەبینی و بەدووی ئاواتێکی درۆزنەوە کەوتبووم، قسەم بۆ خەڵکی دەڕازاندەوە، بۆ ئەو کەسانەی حەزیان بەقسەی زەرد و سوور بوو، کتێبێکی زۆرم دەخوێندەوە، تا وەک ڕۆشنبیرێک لەبەرامبەر ئەوانەی نەیاندەخوێندەوە دەرکەوم، ئەوەتا تەماشای باری نالەباریتان دەکەم و دواتر بە بزەخەنەوە لەئاوێنەکەم دەڕوانم، پێشکەوتنی ڕاستەقینە لەشتێکدایە ئێوە بیرتان بۆ نەچووە، شتێک بە ئاسانی پێی نەگەیشتووم، کەسایەتییەکی خۆپەرستیش نیم تا هەر بۆ خۆمم بوێت، بەڵکو مەبەستمە خەڵکیش بەو ئاستە بگەن، کە من پێیگەیشتووم، هەر کە یارمەتی کەسێکم دابێت تا پێشبکەوێت بۆ ئەوەم بووە ئەویش پێشکەوتن بە خۆیەوە ببینێت، دەگەڕامەوە لای ئاوێنەکەم بزەیەکم بۆ دەکرد و کەڵبەکانیشم بە ڕەزامەندییەوە بزەیان دەهات.

قسەکانم سادەتر دەکەمەوە، ئێوە پێویستان بەو سادەگۆیەیە، من دکتۆر (بریانکا شۆنرا)م، ڕاوێژکاری بەناوبانگی نەخۆشییەکانی خوێنم و لەنەخۆشخانەی بنەماڵەی پیرۆز لەبۆمبای هیند خوێندکاری زانکۆ بووم، کە پیاوەکەم کۆچی دوایی کرد، لەو مێردەم منداڵێکم هەبوو، ناوم نا (ڕاج) و ژیانی خۆمم بۆ تەرخان کرد تا ژیانێکی بەختەوەری بۆ دابهێنم، دوای تەواوکردنی زانکۆ، لەسەر نەفەقەی وڵات بۆ بەدەستهێنانی ماجستێر و دکتۆرا بۆ نەخۆشییەکانی خوێن ڕۆیشتم، دواتر بۆ هیندستان گەڕامەوە.

بە پلەیەک گەیشتم هەموو دکتۆرێک خەونی بەو پلەمەوە دەبینی، ئۆتۆمبێلێکی گرانبەها، خانوویەکی گەورە لەشاری بۆمبای، مووچەیەکی زۆر گەیاندمییە باروبۆخی دەوڵەمەندەکان، گشت ئەوانە لەماوەی چەند مانگێکدا، جوانترین پەروەردەی (ڕانج)م کرد، هەموو شتێکم بۆ دابیندەکرد، تا بەتەمەنی بیست ساڵی گەیشت، تەنانەت زۆریشم لێکرد بچێتە زانکۆی پزیشکی، لەوەش زیاتر هاوسەرگیری کردنی لەتەک ئەو کچەی دەیویست بیخوازێت نارەزاییم دەربڕی.

باسی باری کۆمەڵایەتیتان بۆ ناگێڕمەوە، ئێوە پێویستان بەوە نییە، وەلێ ئەوە پێشەکییەکبوو، بۆ ئەوەی باسی بەسەرهاتێکتان بۆ بکەم، تا لەدەریای هیچ و پووچی ڕزگارتان بکات بۆ پێشکەوتن و ژیانێکی خۆش، ئەویش دەستەبەر کردنی شتێکی مەزنە بەناوی (بۆرفۆریا)، ئەم وشەیەتان بیر بێت.

خوێن بوونەوەرێکی باڵایە، تەنها شلەیەک نییە وەک سەرچاوە پزیشکییەکان باسیان لێوە کردووە، لەبەر ئەوەی زیندووە کەواتە خوێنیش بوونەوەرە، شتێکە پرۆتینەکان وەک بارهەڵگرێک دەگوێزێتەوە بۆ خانە سپییەکان، کە هەر دوژمنێک لێوەی نزیک بێتەوە دەیخوات، لەباشترین خویندنگاکانی جیهان فێری خوێن بووم، پێیانڕاگەیاندم (بۆرفۆریا) دەردێکی پیسە، کە تووشی خوێنی مرۆڤ دەبێت، بۆیە پێویستە بەزووترین کات لەناو ببرێت، بەر لەوەی زیاتر پیسی بکات، ئەوەی ڕاستی بێت زاناکان هەوڵی زۆر زۆریاندا بۆ چارەسەرکردنی، تێیدا سەرکەوتوو بوون، بەڵام ئەوەی لێی بێ خەبەربوون، بۆرفۆریا حاڵەتێکی پیرۆزە، خوێنی مرۆڤ کە پیا تێدەپەڕێت تا باڵا بکات، بەهەرحاڵ دەرد نییە، ئەوان بەوە وەسپم دەکەن کەسێکم پشکۆی ئاورێکی فێنکم لەبیابانێکی زۆر سەردا دۆزیوەتەوە، وایان مەزەندە کرد کە بەستەڵەکەکە دەیسووتێنێت.

کتێبە کەموکوڕییەکانیان دەڵێن خوێن لە ماددەیەکی ئاڵۆز پێکهاتووە بە ناوی هیمۆگلۆبین، کە لەش لەماددەیەکی زۆر سادە بەناوی (هیم)ەوە دروستی دەکات، ئەوەیە شەو و ڕۆژ قسە زلەکانیان دادێننەوە، کاتێک گۆڕانێکی ناحاڵی دروست دەبێت (وەک ئەوان دەڵێن) لەماددە ساکارەکەی (هیم)دا، ئەوە هێمۆگلۆبین دروست ناکات، بەڵکو ماددەیلێکی تر نامۆ دروست دەکات ( وەک ئەوان دەڵێن)، یەکێکیان (برۆفرین)ی ناوە، ئەمیان کاتێک لەخوێندا کۆ دەبێتەوە، دەیگەێنێتە دۆخێک پێی دەڵێن بۆرفۆریا.

فێریان کردین کە چاومان بەنەخۆش کەوت چۆن بزانین بۆرفۆریای هەیە، ئازارێکی زۆری ناوسک، ڕشانەوە، هەستەوەری بۆ تیشکی ڕووناکی، دواتر درێژ بوونەوەی ددانی کەڵبەکانی، پێویستی بەخوێنە، وردە وردە زیاد دەکات، ئەمە شتێکتان بیر دەخاتەوە؟ بێشک ئەو نەخۆشە دەبەنە نەخۆشخانەو هەموو ئەو خوێنەی دەدەنێ کە پێویستێتی، دواتر لە خەڵکی جیای دەکەنەوە، تا کەسی تر تووش نەکات، تا دەگاتەوە بارو دۆخی سرووشتی خۆی چارەسەری دەکەن.

ئەوەی کتێبەکانیان باسیان لێوە نەکردووەو ئەوەی عەقڵی زاناکانیان پێی نەگەیشتووە، ئەوەی خوێنەکەی لەخوێنی بنیادەمییەوە دەگۆڕدرێت، تا سرووشتێکی تری باڵاتری هەبێت، سرووشتی (فامبایەر)ی، یا وەک خۆیان بەزاراوە ناتەواوەکانیان بە خوێنمژەکان ناوزەدی دەکەن. ئەو ناوەیان لە ئیمپراتۆر (فلاد)ی سێیەم فەرمانڕەوای ناوچەی (والاچیا) لە ڕۆمانیا، کە نازناوی (دراکۆلا)یان پێدا یا شەیتان، بەدەر لەوەی هیچ پەیوەندییەکی بە شەیتانەوە نەبوو، بەڕێز (فلاد)ی مەزن ئەفسانەیەکی خەیاڵی نەبووە، بەڵکو پێاهەڵگەڕا و لە سرووشتی بنیادەمییەوە بۆ سرووشتی (فامبایەر)ی پیرۆز وەرچەرخا، ئەو گەورەو دەمسپی خێڵی فامبایەر نەبوو، وەک خەیاڵە نەخۆشەکانیان وای بۆ چووبوون، وەلێ ئەو زۆرترین ناوبانگی دەرکردبوو، فلیمێکی زۆریشی لەسەر درووست کراوە، پارەیەکی زۆریان لەو بەسەرهاتەی بەدەست هێنان.

زۆرێک لەو کەسایەتییە بەناوبانگانەی بێئومێدبوون، تووشی برۆفۆریا بوون، وەلێ پزیشکەکان بەر لەوەی کامڵ بێت برۆفۆریاکەیان تێدا کووشت، بەناوبانگترینیان پاشا جۆرجی سێیەم و (ماری ستیوارت)ی داپیرەی. ئێوە پێتان وایە فامبایەر ڕەگەزێکی ترسناکە و وەک شەیتان و جنۆکە ئازار بەخشن، ئەوە نەفامییە، ئاواتی خوێنمژەکان بەرەو پێشەوەچوونە. باسی سەربردەی خۆم لەتەک پیرۆزبی (بۆرفۆریا )تان بۆ دەکەم، لەهیندستان چۆن لە ڕاوێژکارییەکی بنیادەمیی گێلۆکەوە بۆ گەورەترین خوێنمژییەوە دەرکرد.

ساڵی یەکەمم بوو لەنەخۆشخانەی بنەماڵەی پیرۆز کارم دەکرد، هەر بەڕاست ئەوە تەنها ناو بوو لەنەخۆشخانەکە نرابوو، سەر بەهیچ بنەماڵەیەکەوە نەبوو، سەربردەکە لەوێوە داهات، کاتێک کچێکی نیمچە جوان و هەرزەکار هاتە کلینکەکەم، ڕەنگی لەکچە هیندییەکان کراوەتربوو، دوو چاوی بێئومێد، پرچێکی زەردی ئاڵتوونی، نەخۆشی پێوە دیاربوو، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، بەو وەسپەم بێت دەبوو کەمخوێنی هەبووبێت، بەردەوام کچان بەوای کەمخوێنییەوە دەهاتنە لام، هەر کە کچەکە دەستی بەقسەکرد، دەرکەوت دۆخەکەی کە پزیشکان لێی شارەزان، کاری زۆری بەسەرەوەیە.

بۆرفۆریا، بەدڵنیاییەوە، پێشتر ئەو حاڵەتی بۆرفۆریایەم زۆر بەکەمی بینیبوو، ئەودەم لە لەندەن خەریکی نامەی ماجستێرەکەم بووم، نەخۆشەکە هەستی بەژانەسک دەکات، ورێنە دەکات، زۆربەشیان بۆ نەخۆشخانەی دەروونی بۆ

چارەسەر دەیانبردن، کچەکە ناوی ((ڕیا))بوو، ئەو یەکەمین حاڵەتی بۆرفۆریا بوو لەهیندستان بینیم.

وەک هەر پزیشکێکی ڕاوێژکار کە شایانی پۆستەکەی بێت کارم لەسەری کرد، کەوتمە سروتی چارەسەرکردنی وەک چۆن فێری بوومەو فێری خوێندکارەکانم دەکرد، وەلێ (ڕیا) زۆریش بە توندی چارەسەرکردنەکەی ڕەتدەکردەوە، تەنانەت بەسەر قەرەوێڵەکەوە باڵبەستمان دەکرد، تا دەرزیی خەوی لێ بدەین، نازانم بۆچی بۆ لای ئێمە هات، کە چارەسەرکردنەکە بەو شێوەیە ڕەتی دەکردەوە، ئەوەی گوتبووی تەنها لەساڵی یەکەمی زانکۆدایە، دەیەوێت لە ئازارەکانی کەوێت، بۆ خۆیشی لە ماڵەوە هەڵاتبوو.

-پیرۆزە هەناسەکانمان، پیرۆزە خوێنەکانمان، لەتاریکی پیرۆزەوە هاتووین، هەر لەتاریکی پیرۆزیشدا دەژین، بۆ تاریکی پیرۆزیش دەگەڕێینەوە.

-ڕەیا.. ئەوە چی دەڵێی؟

-لەو دەمەی خوێن لەسەر زەوی خوڵقا، ئێمەش خوڵقاین، ڕووناکی بەسەرمانەوە حەرامە، بەساڵداچوونمان حەرامە.

-کچی خۆم.. تا کەی لەم واهیمانەتدا دەژێیت؟

-خوێنی ئێوە خوراکی ڕوحمانە، بەوە تینێتیمان دەشکێت و...

-ڕەیا بێرەوە سەر خۆت، خودا بەزەیی پیامانا بێتەوە.

-ڕۆژی ئێوە شەوی ئێمەیە، شەویشتان ڕۆژی ئێمەیە...

-ڕیا؟

-بانگەوازی ئێمە شەرەفە بۆ ئێوە، کێ لە ئێوە بە شەرەف رازییە، کێش بە ئابرۆچوون رازییە.

ریا.. فامبایار ببوو، ئەودەم هیچم نەدەزانی، خوێنی بەو دۆخە ئازاراوییەدا تێدەپەڕی، کە دەبوو هەرکەسێکی فامبایەر پێا ڕەت بێت، بە هۆکارێک چارەسەری تەواوم پێنەدەدا، ڕەنگە بەزەیی هاتنەوە بێت، یا بەدەنگ ئارەزووەکانییەوە چووبم، یا دەمویست لەنزیکەوە حاڵەتەکە ببینم، بینیم ئەو گەندەمووانەی سەر گۆناکانی لێ ڕوا، چۆن کەڵبە ددانەکانی درێژتر دەبوونەوە، حاڵەتەکە بەرەو ترسناکی دەچوو، بەتووندی بەسەر قەرەوێڵەکەیەوە دەمبەست، هێزێکی وەبەر خۆی دەهێنایەوە، دەسرازەکەی دەکردەوە، دەمزانی درندەییەکەی چەندە، کاتێک چرنووکی نینۆکەکانی ڕومەتی ڕووشاندم، چۆن پیاوانی ئاسایش هەوڵیاندا بیگرن، سەیریان لەو جەستە لاوازەو ئەو هێزە گەورەیەی هەبوو، چۆن دزەی کرد و لەنەخۆشخانەکە هەڵات، لەو ڕۆژەوە ژیانم گۆڕا، هەموو ڕاستییەکم بۆ دەرکەوت.

هەموو شتێکم دەربارەی فامبایەر و ڕەگەزەکانی خوێندەوە، هەرچیم دەخوێندەوە قسەی بەتاڵ بوو، باسیان لەکوشتنیان دەکرد بەسیر و دەرکەوتنی خاچ لەبەرامبەریان ئازاریان دەدان. من فامبایەرم و ڕۆژانە بەجوانی کابانی خۆم دەکەم، بەردەوام سیر لە چێشتلێنانەکانم بەکار دەهێنم، خاچێکی ئاڵتوونی بچووک بە گەردنمەوە هەڵدەواسم، ئەگەرچی هیندیشم

باوەڕم بە هیندۆسییەت نییە، من بۆ خۆم مەسیحیم و لەهیندم، دەڵێن گوایە فامبایەرەکان تەمەنیان درێژە، ئەوە ڕاست نییە، ئێمەش وەک ئێوە دەمرین، تۆخی پیرۆزیمان پەیوەندی بە تەمەنەوە نییە، ئێمە تەنها پیر نابین و کوڕ نابینەوە، بەو شێوە ئێوە دەمرن، لەڕاستیدا خوێندنەوەم بۆ قسەو قسەڵۆکانە سەری سوڕ کردم، وایلێکردم بۆ خۆم لەنزیکەوە حاڵەتەکە بخوێنمەوە.

بەدەر لەبوونی کۆمەڵێک پزیشکی پسپۆر لەبواری خوێن، داوام لەنەخۆشخانەکە کرد، ببمە بەرپرسی هەموو ئەو حاڵەتانەی بۆرفۆریا کە بۆ نەخۆشخانەکە دەهاتن، نەخۆشەکە بەوای ئازاری سکییەوە دەهاتە لام و نەیدەزانی تووشی برۆفۆریا بووە، کە دەسنیشانیم دەکرد، لێدەگەڕام لەناخیدا گەشە بکات، نەک هەر ئەوە هەوڵمدەدا زووتر پێبگات، پێدەچێت ئەوە نائاسایی بێت؟

لەتەک کاتدا تادەهات ئەزموونم لەتەک نەخۆشەکان زیاتر دەبوو، بە زنجیر نەخۆشەکەم بەسەر قەرەوێڵەکەوە دەبەستەوە، تابەدواداچوون بۆ حاڵەتەکە بکەم، بەوای ئەوەی لەنەخۆشخانەکە بەرپرسی یەکەمی بەشی نەخۆشییەکانی خوێن بووم، هەرچیم بویستایە بێ سێ و دوو جێ بەجێ دەکرا، بەتایبەت کە دەمویست بەتەنیا لەتەک نەخۆشەکەدا بم، یا ڕێگر دەبووم لە سەردانیکەرانی کەس و کاری نەخۆشەکە، تەنانەت بە بیانوی بڵاو نەبوونەوەو تووشبوون بەو نەخۆشییە پەرستارەکانیشم ئاگادار کردبووەوە بێ من نەچنە سەریان، چونکە حاڵەتەکە ترسناکە و دەبێت لێوەی دوور بن.

له قۆناغی خوێندنەوەی حاڵەتەکە بۆ قۆناغی حاڵی بوون پەڕیمەوە، تێگەیشتم ئەو نەخۆشانە دەگۆڕدرێن بۆ خوێنمژێکی زۆر درندە، بەتایبەت کاتێک دەست و پێیان کۆت دەکرێن، وەلێ ئەوە گرفت نەبوو، بۆ خۆم بە ڕێژەیەکی باش دەرزی خەوم لێدەدان، هەر کە دەمزانی گەیشتوونەتە دوایین قۆناغی نەخۆشییەکەیان، لەوشەی بنیادەمی دوور کەوتوونەتەوە، ئەودەم بەرەڵام دەکردن.

ئەوەی بەلامەوە سەیر بوو، دوای دەرچوونیان لەنەخۆشخانە وەک مرۆڤی ئاسایی هەڵسوکەوتیان دەکرد، دوای بەدواداچوونم وەک پزیشکێک بەوردی هەستم کرد دەماری ددانەکانیان جیاواز لەدەماری ددانی مرۆڤی ئاسایی بوو، کاتێک تووڕەدەبوون کەڵبە ددانەکانیان درێژتر دەردەکەوت، کاتێکیش لەدۆخی ئاساییاندا دەبن، هیچێک بە کەڵبە ددانەکانیانەوە دەرنەدەکەوت.

کێشەکە ئەوەبوو بەردەوام پێویستیان بەخوێن بوو، هەر کاتێکیش بهاتنایەتە لام بۆ خوێن، خوێنم تێدەکردن، ئەگەر لەخوێن بەدووریان بگریت، درندەییان زیاتر دەبێت و ئەو دەم پێویستە دەست و پێیان کۆت بکەیت، هەموو خوێنێکیش قبووڵ ناکەن، تەنها خوێنی تازە نەبێت.

خوێندنەوەیەکی زانستی وردم بۆ دەکردن، ڕەنگە ئەو نامەیە بووبێت بەهۆی کوشتنی خەڵکانێک یا ئازاردانیان، زۆر بەوردی مامەڵەم لەتەکیانا دەکرد، تێگەیشتم هەموو گەشەکردنی ئەندامەکانیان هۆکار بوون بەوای تووڕەبوونەوە.

دواتر هێدی هێدی هەستم بەترس کرد، خەونەکانیشم جەنجاڵی و خوێنی ڕەشیان تێکەوت، هەموو شەوێ بەدەم خەونەوە ڕادەچڵەکیم، هەندێ خەونم بەمردنی خۆمەوە دەبینی، لەبری ئەوەی داڵ و کەرخۆر بمخۆن، دەمبینی خوێنمژەکان دەیانخواردم، هەندێ جاریش گوێم لە زەنگی کڵێسەکان دەبوو، بەدەم زەنگەکەوە دەچووم و ئەوانیش بەدوومەوە بوون، زۆربەشیان لەو نەخۆشانەی خۆم بوون، شەوانێکی زۆر سەختم بەسەر برد، سوێندم خوارد بگەڕێمەوە کاری ڕاوێژکارییە ئاساییەکەی خۆم، تا ڕۆژێک بەوای ئازارێکی زۆری سکمەوە بەئاگا هاتمەوە.

ترس دایگرتم، تووشی هیستریا بووم، چوومە نەخۆشخانە تا شیکارەکانی کە داوام لە نەخۆشەکان دەکرد بۆمی بیکەن، بۆیان کردم، دەرئەنجامەکان پاک بوون، وەلێ ئەوە مانای ئەوە نەبوو تووش بوومە یا نا، چونکە شیکارەکان لەگەڵ دەرکەوتنی سەرتای بۆڕفۆریادا دەردەکەوێت، بەدیوێکی تر دەکرێ ئەوە تەنها ئازاری گەدەم بێت، بەم دواییە دڵم خواردنی نەدەبرد.

ئازارەکە هەر بەردەوام بوو، ڕشانەوەش هاتە سەری، هەستم بە بێهێزی دەکرد، زۆر بەزەحمەت دەجووڵامەوە، (ڕاج)ی کوڕم تووشی دڵەڕاوکێ بوو، تەنانەت مۆڵەتی لەزانکۆ وەرگرت تا بەدیارمەوە بێت، دەیگەیاندمە نەخۆشخانەو هەموو شیکارەکانی بۆ دەکردم، دەرئەنجامەکان پاک بوون.

ڕۆژانی دواتر هۆشیارتر بووم، مەبەستم زۆر هەستیارتر بووم بەرامبەر هەموو شتێکی دەورووبەرم، بەرامبەر بە دەنگە دەنگ هەستیاربووم، تەنانەت

هەستیاربووم بەرامبەر وەستانی ڕاج لەبەردەم دەرگاکە بەر لەوەی دەرگاکە بکاتەوە، بەرامبەر بۆن هەستیاریم هەبوو، لەهەمووشی زیاتر هەستیاریم بەرامبەر ڕووناکی هەبوو، سەرەتا هەستم بەسەرئێشە کرد، کاتێک چرای ژوورەکەم داگیرسابێت، یا ڕووناکی ڕۆژ کە بەیانیان دونیای ڕووناک دەکردەوە، ئەوجا سەرئێشەکەم زیاتر دەبوو، چون ئەوەی گڕە بردبێتمی، بەدەر لەو هەمووەش دەرئەنجامی شیکارییەکانم هەر پاک بوون، سەیرم پێهات، ئاخر هەستم دەکرد (بۆرفۆریا)مە، بۆ خۆم باشتر لەو نەخۆشیەم دەزانی، دواتر من وڕێنەم دەکرد، ئەگەر دانم بەخۆمدا نەگرتایە تووشی شێتی دەکردم.

هەڵبەت دەمویست بمرم و ئەم سیناریۆیە تەولو نەکەم، ڕۆژێک کوڕەکەم بەسەرما هات، زۆر بەتووڕەییەوە داوام لێکرد بمکوژێت، تا لەکۆڵ ئەو هەموو ئازارە ببمەوە، ئەو نەیدەزانی بۆ خوێنمژی دەگۆڕدرێم، دەترسام ئەو یەکەم قوربانیم بێت، مەحاڵە، ئەوە (ڕاج)ی کوڕمە، بەدونیای ناگۆڕمەوە . ڕاج بەوای قسەکانمەوە سەری سوڕما، ما دڵم بداتەوە، پێیگوتم کە باش دەبم، شیکارەکان پاکن، نیشانەی هیچ نەخۆشییەکی کوشندەی تێدا دەرنەکەوتووە، وەلێ من شێتانە هاوارم دەکرد، دواجار ناچاربوو دەرزییەکی خەوم لێبدات، خەوم لێکەوت.

( (لەگەڵ خولّقاندنی خوێن لەسەر زەوی ئێمەش خولّقاین، ڕووناکی بۆ ئێمە قەدەغەیە، کوڕ بوون بۆ ئێمە قەدەغەیە))

دوای ئەو خەوە بە لەتە چاوێکەوە لەدەوروبەری خۆمم ڕوانی، بینیم ڕاج لەسەر کورسییەکی نزیکمەوە دانیشتووە، ئەو کوڕەم زۆر بەسۆزە، ئەوەی بیری لێ دەکەمەوە خۆکوشتنە، ئەوە دوایین دادپەروەریمە تا لەهەموو گوناهەکانم خۆش بم، شریتی حەبی دژە فشارەکەم دەرهێنا، خۆم بۆ خۆکوشتن ئامادە کرد، لەپڕ ڕاج بە ئاگاهاتەوە، لەسەرخۆ لێم وردەوەبوو، کاتێک زانی بەنیازی چیم چرچاوی گرژ کرد، پەلاماری حەبەکانی دەستی دام و تووڕیدا، بەخەمبارییەوە دیقەتمدا، دواتر ئەو خەمبارییەم بوو بەتووڕەبوون.

(( پیرۆزە هەناسەکانمان، پیرۆزە خوێنەکانمان))

بەتووندی هاوارم بەسەریا کرد، وەک چۆن لەمنداڵیدا هاوارم بەسەریا دەکرد، فەرمانم پێدا لێگەڕێت چیم دەوێت بیکەم، وەلێ ئەو کوڕەم بەهاوار و توندو تیژییەکەم ڕاهاتبوو، هاوارم بەسەریا کردەوە بمگەێنێتە نەخۆشخانە بۆ شیکارکردنی خوێنەکەم، ئەو زیاتر سووربوو لەسەر مانەوەم، باوەشی لێدام هێورم بکاتەوە، دەموچاویم بە چڕنووک ڕووشاند، نە جارێک و نەدووان دەموچاویم نەهێشت، وەلێ ئەو دانی بەخۆیدا گرت، دەستی برد دەرزی سرکەرەکەی هاتە دەست، لەدەستیدام و دەرزییەکە دوور فرێدرا، دووبارە هاوارم بەسەریدا کرد و چڕنووکم لەدەموچاوی گرت، هاوارم لێکرد؟

( (بانگەوازمان شەرەفە بۆ ئێوە، تیاتانە بە شەرەف ڕازییە، تیاشتانە بە شورەیی ڕازییە))

لەپڕ (ڕاج)ی کوڕم سەروسیمای گۆڕا و وەک پڵنگێکی زیندان کراو، باوەشی توندی لێدام، بە سەرسوڕماوییەوە لێم ڕوانی، بەو ئاواتەی چاوەکانم هەڵە بن، کەڵبە ددانەکانیم بینی، درێژتر بووبوون. دەیویست بەگەردنم بگات، کوڕە خۆشەویستەکەم دوو چاوی تۆقینەری هەبوو، درندەییم لەو دوو چاوانەی بینی، توند گرتمی، تا بۆی بمێنم دەبوو بەرەنگاری ببەمەوە، جەستەم هێزی تیا نەما، ئەوەی بیرم هاتەوە ئەوەبوو بەردەوام ڕاج شیکارەکانی وەردەگرت و دەرئەنجامەکانی پێدەگوتم، بۆیە بە پێویستم نەدەزانی بە شیکارەکاندا بچمەوە، دڵنیابووم لە کوڕەکەم، خۆم بەدەستەوەدا، کەڵبەددانەکانی لە گەردنم چەقاند، هەستم بە ئازار نەکرد، بەڵکو هەستم بەسرپوون کرد، دەمێکبوو دەمویست هەست بەم هەستە بکەم، لەسەرخۆ چاوەکانم نووقاند، ڕاج هەڵیگرتم و لەسەر جیوبانەکەی خۆم دایناَم، نیوچەوانیشی ماچ کردم.

بەو ئاوایە بۆ خوێنمژی گوێزرامەوە، چوومە ڕەگەزی باڵای پیرۆز، لەوێ هەست بە شکۆمەندی دەکەیت، منیش دەمەوێت هەر هەمووتان وەک من بن، ئێمە درندە نین، وەک فیلمەکانتان باسیان لێوە کردووین، ئێمە پیرۆزین، بەرانبەرتان درندە نابین، مەگەر بۆ ئەو حاڵەتەی بمانەوێ ببن بە ڕەگەزی باڵا، ڕەگەزی فامبایەر.

سەیرم بە قسەکانیدا هات، بەدرێژایی قسەکردنەکەی لێی ڕامام، هەستم بەترسێک کرد، بەتایبەت کە کەڵبەددانەکانی دەردەکەوتن، زۆر بەجوانی دیاربوون، وەلێ هەستی زیاترم ڕق بوو، ئەو تاوانبارە نەخۆشی پیس لەنێو

نەخۆشەکانیدا بڵاو دەکردەوە، ئاخر عەقڵە پیسەکەی وای مەزەندە دەکرد ئەو حاڵەتە گەیشتنە بە باڵا و شکۆمەندی، زۆر خۆی لە مرۆڤ بە گەورەتر دەزانی، هەمان ڕق و کینەم لەچاوانی هەندێک لەدانیشتوان بینی، هەندێکی تر یاخەی کراسەکەیان بەرز کردەوە وەک خۆپاراستن لەو بوونەوەرە کە نازانین چییە، یەک لە دانیشتوان کە پێشتر گوێم لەدەنگی نەبووە، ڕیشێکی تەنکی هەبوو، چاوێلکەیەکیشی لەچاو بوو، گوتی:

-پێدەچێت نەفامی سەردەمی ناوەند عەقڵی ئەم سەردەمەشی گرتووەتەوە، وەلێ بە پێچەوانەوە، لەسەردەمی تاریکیدا دادگای مەسیحییەت شەشسەد نەخۆشی بۆرۆفریای بە بەرچاوی خەڵکییەوە لەسەر دار بەستەوەو ئاوری تێبەردان، بە بیانوی فامبایرزەوە، ئەمڕۆ دوکتۆرێکی ڕاوێژکاری تێگەیشتوو فامبایرز بەرەڵا دەکاتە ناو خەڵکی.

دکتۆرە هیندییەکە گوتی:

-دادگای لێپرسینەوە زاهیدەکانیشیان سووتاند، هەر کە گەیشتینە ئەم پلە باڵایە تێگەیشتین ئەوە هەڵەبوو، ئێستا من داواتان لێدەکەم بۆ ئەو پلەیە بەرزەوە بن، لەوە دەرباز بن کە ئەوەی بانگەوازی بۆرۆفۆریای بۆ هاتووە نەفرەتی بکەن.

کابرای چاوێلکە لەچاوەکە پێیگوت:

-تۆ پێت وایە لەخەڵکی پلە باڵاتری، کەچی تۆ لەڕەگەزێکی ئاساییت، تەنانەت لەمێژووشدا تایبەتمەندیتان نییە.

دکتۆر توڕەبوو، چاوەکانی زەق زەق لێکردنەوەو گوتی:

-هیند لەسەر گۆی زەوی یەکەمین شارستانییەتبوو، ئەی ئەمریکی بێ مێژوو.

شارلۆتان هاتە نێوانیانەوەو مستێکی بەمێزەکەدا کێشا و گوتی:

-ئەگەر ئەوە دووبارە بکەنەوە هەردووکتان دەردەکەم، ئەمە دوایین ئاگادارییە.

هەردووکیان بێدەنگبوون، وەلێ هەر بەچاوی ڕقەوە لەیەکیان دەڕوانی، پێدەچوو هەردووکیان ڕەگەزپەستبن، شارلۆتان گوتی:

-پەیوەندی بۆرفۆریا بە فامبایزەرەوە دیارە، لێکۆڵینەوەی زانستی ئەوەی ڕوون کردووەتەوە چۆن فامبایرەز لەنێو نەتەوەکان گەشەی کردووە.

توێیە وەک شۆخی پێکردنێک بۆ ئارام کردنەوەی دۆخەکە گوتی:

-یانی دراکۆلا تەنها پێویستی بە دکتۆرێک بوو تا چارەسەری بکات؟

شارلۆتان بەزمانێکی جیددیانە گوتی:

-دراکۆلا خوێنمژ نەبوو، هیچ بەڵگەیەکیش نییە کە تووشی بۆرفۆریا بووبێت، تەنها پیاوێکبوو فەرمانڕەوایی هەرێمی والاکیای لە ڕۆمانیادا دەکرد.

ئەو ڕەقەڵە بێئومێدەی تا هنووکەش ناویم نەپرسیوە گوتی:

-ئەوەی حاڵیبوونە بۆڕفۆریا ببێتە ئەفسانە، دوای سووتاندنی بۆرۆفۆریاکان لە لایەن دادگای بەدواداچوونی مەسیحییەت لەناو خەڵکی ئەفسانەی بۆڕفۆریا ترسیان لەخاچ بوو، وەک ئەفسانەکان دەیگێڕنەوە بەوای ئەو حاڵەتەوەش

حەزیان بە ڕووناکی نەبوو، ڕووناکی هەتاو پێستیانی دەسووتاند، تەنها شەوان وەک شەیتان دەردەکەوتن، وەلێ ئەوەی ئەم دکتۆرە کردوویەتی تاوانە دەرهەق بە مرۆڤایەتی، نابێت بابەتەکەی بۆ کۆمەڵگای زانستی بەرز کرێتەوە، بەڵکو ڕادەستی پۆلیس بکرێت.

دکتۆر بەزمانێکی خۆ بەزل زانین گوتی:

-ئەوە نەزانەکانن بەهای زانست نازانن، توێژینەوەکەم وەک ئەوانەی پێشووتر پێشکەشیان کرد، منیش پێشکەشی دەکەم، بۆ دونیاش دەیسەلمێنم بۆرفۆریا نەخۆشی نییە، بەڵکو ئەوە نیعمەتە.

چون کەسێکی قێزەون وابوو لەلام، گوێم لە شارلۆتان بوو کۆتایی بە مشتومڕەکانمان هێنا، بەو ئاوایەی دانیشتنەکە کۆتایی پێهات، ئەوەندە گوێم بە بەسەرهاتەکەی نەدا، وەلێ شتێکی تر لەهزرمدا سەرقاڵی کردبووم، چاودێری دکتۆرم کرد، ئاخۆ ئەویش وەک ئەوانی پێشووتر ئێرە جێدەهێڵێت، ما بەگومان بم.

چوومە ژووری کتێبخانەکە و لەسەر کورسییەکی نزیک پەنجەرەکە دانیشتم و سۆسەی کەسێکم دەکرد لە ئوتێلەکە بچێتە دەرەوە، هەرچۆنێکبوو کتێبێکم بەدەستەوە گرت چون ئەوەی خەریکی خوێندنەوە بم، چەند کاتژمێرێک تێپەڕی کەس نەچووە دەرەوەی ئۆتێلەکە و کاتیش لە دەی شەو نزیکەوەبوو، هیچ کەسێکم نەبینی، تەنها دارەکان نەبێت، با دەیلەراندنەوەو لەپشت دارەکانەوە ناوی ئۆتێلەکە بە چراخانییەوە جارەو بار دەردەکەوت.

PURGATORIUM ناوێکی ناخۆش و بێزارکەر، لەسەر کورسییەکە هەستام و لەنێو کتێبخانەکە کەوتمە گەڕان بەدووی فەرهەنگێک بەو ئاوایەی ماناکەی بزانم، یەک فەرهەنگم دۆزییەوە و بە دوودڵییەوە کەوتمە گەڕان بەدووی ناوی ئۆتێلەکە، چاویشم لە دەرگای ئوتێلەکە نەدەبڕی...

پیتی P دواتر پیتی U دواتر ...

دڵم ترسێکی پیا چزا، کە مانای ناوەکەم خوێندەوە...

بۆرگاتۆریم بەلاتینی یا بۆرگاتۆری بە ئینگلیزی، شوێنێکە خەڵکانی گوناە کار بۆی دەچن، ئەوانەی بەتەواوی تۆبەیان لەگوناهەکانیان نەکردووە، بۆ ئەوە دەچنە ناوی تا بە ئەشکەنجەدان پاک ببنەوە، بتوانن بچنە شانشینی خودا، ئەوەی کاری خراپەی لەسەر زەوی کردووە، چارەنووسی بۆرگاتۆریومی نابێت وەک ئەوانەی ژیانێکی ساڵحانە ژیاون.

ئەوە چ شێتێکە ئەو ناوەی بۆ ئوتێلەکەی داهێناوە؟ ئەوە لەمانای بەرزەخەوە نزیکە، کە مەبەست لەو دونیای دووەم دەکات.

لە پەنجەرەکەوە شتێکم بەدی کرد، تارمایی کەسێکبوو لەئوتێلەکە دەردەچوو، سەرم بۆ دواوە هێنا، بەو ئاوایەی ئەو نەمبینێت لەدرزێکەوە تەماشام کرد، ئەو ئافرەتە هیندییە بوو، بە جانتاکەیەوە بەرەو دەرەوەی ئوتێلەکە دەڕۆیشت، شارلۆتان لەتەکیدا دەڕۆیشت، بینیم لەتەکیدا مشتومڕی بوو، ئەوجا بەڕێکەوت و ئافرەتەکەش بەدوایەوە دەڕۆیشت، بلەز خۆم گەیاندە دەرەوەی ئوتێلەکە و خۆم لەنێو دارەکان شاردەوە، ئاخر بۆچی سواری

ئۆتۆمبێلەکە نەبوون، ئەگەر نیازی گەیاندنی بێت بۆ فڕۆکەخانە؟ موچڕکەیەکم پیا هات، ئێرە پێناچێت ...

لەدیمەنێکدا وەستام، هەر کە چاوم بەشتێک کەوت هەموو جەستەم کەوتە لەرزین، ئەو هیچ و پووچە دەیەوێ چی لێ بکات؟ ئەو...

گوێم لەبەرەنسکێکی تەنیشتمەوە بوو، بینیم ئەو ڕەقەڵەیەی ناویم نەدەزانی ئەویش لەپاڵ دارێک خۆی شاردووەتەوەو لە دیمەنەکە دەڕوانێت، بەچاوێک دیقەتیدام وەک ئەوەی لەهەموو شتێک حاڵی بووبێت.

خوێنم هەڵچوو، لەوەدابووم بچمە سەریان، لەپڕ شتێک بەر سەرم کەوت و خۆم بە پێوە نەگرت، ئاوڕم دایەوە، ئەو شۆفێرە لاوازە ڕووسیە بوو کە منی بۆ ئێرە هانی، دارێکی ئاسنی بەدەستەوەبوو، بەزمانی ڕووسیەکەی گوتی:

-ئەی شێخی گەمژە دەمزانی کێشە دەنێیتەوە.

دووبارە کێشای بەسەرما، ئەو کەوتنە کەوتم، جووڵەم لێ بڕا.

* * *

دەنگە دەنگێک چون چەکوشکاری، بۆن و بەرامەیەکی ژەنگهەڵگرتوو، هاواری ژنێک لەشوێنێکەوە دەهات، ژانەسەرێک گرتمی، وەلێ بەوای ئازارەوە چاوەکانم کرانەوە، چراگەلێکی کز، خەریکە بڕشت لەدەست دەدەم، بەسەر ئەژنۆکانمدا دانیشتم، گوێم لەهاواری ئافرەتێکە بۆ فریاکەوتن، بەترسەوە

لەدەوروبەری خۆمم ڕوانی، دڵم گووشرا، ئەوەی بینیم وەختەبوو بمگێڕێتەوە بێ هۆشی.

تۆ کەس بە سکەخشکێوە هێدی هێدی دەڕۆیشتن، هەندێکیان لەهەوڵی ڕاستبوونەوەدان و هەندێکی تریان دەلەرزین، بەسەر سەریانەوە پیاوێکی قەڵەو، چرایەک بەبەری پشتیەوە، لەتاریکییەکە سیمای دیار نەبوو، وەلێ ڕووتانەوەی کەللەسەری نەشاردرابووەوە، بەترسەوە لە دەوروبەرەکەم ڕوانی، قەفەس گەلێک و ئامێرگەلێکی کۆنی ژەنگاوی و تەرمی کفن کراو چون سێدارە بە بنمیچەوە هەڵواسراوە.

بەدەر لەکزی چراکان، وەلێ چاوەکانم بەو ڕووناکییە کەمە ڕاهاتن، ڕوخساری ئەو مرۆڤانەی دەوروبەری خۆمم بینی، کە ڕاکشابوون، هەر هەموویان لەمیوانەکانی کۆنفرانسەکە بوون، دۆخێکی نالەباریان هەبوو، دەکرووزانەوە، شارلۆتانی سەر ڕووتاوە بە هەنگاوی ورد و لەسەرخۆ بەرەو پیرم هات و گوتی:

-ئێوە هەر وابوونە، زوو تێدەگەن و درەنگ بەئاگا دێنەوە.

دارێکی نەخشینراوی کورتی بەدەستەوەبوو، نایە سەر سەرم و سووک سووک دەیماڵی بەسەرما، چون ئەوەی ڕەشەوڵاخ بم، ئاخم هەڵچوو، هێزم وەبەر خۆمدا و ڕاستەوە بووم و ناقرگەیم گرت، لەپڕ هەستم بە قرتە قرتی مەچکم کرد، دەتگوت دەهاڕدرێت، ناچاری کردم بەو پەڕی هێزمەوە هاوار بکەم، بەترسەوە لە مەچەکی خۆمم ڕوانی، بینیم ئەو بازنگەی مەچەکم

دەبریسکێتەوە، پارچەکانی لێک دەبوونەوە، چاوەکانم کردنەوە، تەماشای سەر ڕووتاوەکەی بەرامبەرم کرد و گوتی:

-بیرم چوو پێتبڵێم ئەم بازنگانە ئارامی دەپارێزن، هەر کاتێک هەستت کرد ناخت دەیەوێت هەڵبچێت، ئەو حاڵەتە ڕادەگرێت، و ئازارت پێدەدات، ئەی نابینی هاوڕێکانت بێئومێد بوونەو بەسەر زەویەکەوە ڕاکشاون؟

چاوم لەباروتۆخیان بڕی، وەک ئەوەی هەموویان سەر مەستبووبن، شارلۆتان بەو دەنگە گڕەی کە ڕقم لێبوو، گوتی:

-نەمدەویست لەپاکژبوونەوەدا کۆتان بکەمەوە، هەر مرۆڤێک پانتاییەکی تایبەتمەندی شایانە لەکاتی هەق و حیسابدا.

ئەوجا دیقەتی من و ئەو لەڕولاوازە بێئومێدەی داو گوتی:

-وەلێ هەندێکتان سوورن لەسەر ئەوەی لووت بژەننە کارێک کە کاری ئەوان نییە، بۆیە منیش پەلکێشی ئەو ئاهەنگەی دەکەم، کە دەیەوێت دەورو خوولی بدات.

ئەوجا دەنگە گڕەکەی گڕتر بوو، بە ڕق و کینەیەکی زۆرەوە گوتی:

-ساڵانێکی زۆرە لەنێو کۆمەڵگاکانتان چاودێری کردەوەکانتان دەکەم، زانستێک بڵاو دەکەنەوە، عەقڵی خەڵکەکە بە ئاراستەیەک دەبەن کە خۆتان دەتانەوێ، ئەوانیش وەک گوێرەکە دووتان کەوتوون و قسەکانتان دەڵێنەوە، چون ئەوەی ڕانە مەڕ بن و زمانی تووتیتان نابێتە هزریانەوە.

دارە کورتەکەی دەستی بەرز کردەوەو ما بیخوولێنێتەوە، گوتی:

-بڕێکتان ئەوەی دەیخەنە ڕوو ڕاستگۆن، وەلێ بڕێکی ترتان درۆزنن، بڕێکی تریشتان حەزی بە خۆ دەرخستنە، کەوا دەکات خۆی بە بلیمەت بزانێت، چون ئەوەی ئەو دەیگێڕێتەوە ئەوانی پێشووتر درکیان پێ نەکردووە، لەڕاستیدا ئەوانە لەکەر کەرترن.

چاوەکانی لێ کز کردنەوەو گوتی:

-هەندێکتان حەزی بەوەیە خەڵکی وەک بەهرەمەندێک لێی بڕوانن، زۆرێک لەدەجاڵی بە هەقەوە ئاوێتە دەکات، خەڵکی گێرەشێوێن حەزیان بە دەجاڵییە، وەلێ خەڵکانێکی زانا حەزیان پێ نییە، هەروەک مامۆستاکەیان کە لەقوتابخانە ڕقیان لێبوو،

لەسەر کورسییەکی بچووک دانیشت و دارەکەی لە زەویەکە گیر کرد و گوتی:

-گەشتەکەتان بەو هەموو سەربردانەی لەڕاستگۆیی و درۆ کردنتان ئەمڕۆ تەواو بوو، ئەمڕۆ...

بەدارەکەی کێشای بەزەویەکە و گوتی:

-ئەمڕۆ لەسەر کردەوەکانتان لێپرسینەوەتان لەتەکا دەکرێت، ئەگەر ڕاستگۆ بوون، سەرفراز دەبن، بۆ خۆم لەو دەرگایەوە بەرەو ڕووناکی دەتانبەم.

دواتر ڕوخساری بۆ تووڕەیی گۆڕا و گوتی:

-خۆ ئەگەر درۆشتان کرد، ئەوا لە ڕەگەزی کردەوەکانتان ئازار دەدرێن، ئازار و ئەشکەنجەیەک ڕوحتان تیا دەردەچێت.

شارلۆتان لەسەر کورسییەکەی ڕاستەوە بوو، بەنێو لاشە ڕاکشاوەکاندا کەوتە گەڕ و گوتی:

-پێنج لەئێوە قسەی خۆیان کرد، سێانیان ڕاستگۆ بوون سەرفراز بوون، دووانیان درۆیان کرد.

لەپڕ گوێمان لە دەنگێکبوو، وەک ئەوەی شتێک بەسەر زەوییەوە ڕاکێشرێت، بەترسەوە دیقەتماندا، تراکتۆرێک قەفەسێکی ئاسنی ڕادەکێشا، هەر هەمان شۆفێرە ڕووسیەکەبوو، ئەوەی ناو قەفەسەکەش ژنە هیندییەکەبوو، تۆقیبوو، تکای دەکرد و دەگریا:

-بەڕێزم تکات لێدەکەم، من گومرا بووم، سوێند بە هەموو دڵۆپە خوێنێک خواردبێتم ناگەڕێمەوە سەر ئەوەی کردبووم.

بە ڕوخساری شارلۆتانەوە نیشانەی تووڕەبوون دەرکەوت، گوتی:

-خوێنی بنیادەمەکان دەخۆن و دواتریش کە دەیانهێنن بۆ ئێرە داوای بەخشین دەکە، دەڵێن ئەگەر گەڕاینەوە چاکەکار دەبین، کە گەڕانەوە دەبنەوە خوێنمژ.

ئەوجا بەدارە کورتەکەی کێشای بە قەفەسەکە، ڕووسییەکە دەرگایەکی بچووکی کردەوە، بوونەوەرێکی تووڕەی لێوە هاتە دەرەوە، ژنە هیندییەکە هاواری لێ هەستا، لەپڕ سەری بەر ئاسنی قەفەسەکە کەوت، ما دیقەتی ئەو بوونەوەرە بدەین، بەقەد مشکێکی گەورە دەبوو، دوو باڵی هەبوو،

سەروسیمایەکی تۆقینەری هەبوو، دوو کەڵبە و دوو چاوی شەڕانگێزی هەبوو، شارلۆتان گوتی:

-شەمشەمەکوێرە تەنها بوونەوەرە لەسەر خوێن دەژێت، ئەگەر تا ڕۆژێک خوێن نەخوات، دەمرێت.

ئافرەتە هیندییەکە هەناسەبڕکێی تیکەوت و لەرز دایگرت، پاشەو پاش کشایەوە خۆی لە شەمشەمە کوێرەکەی بەدوور دەخست، شارلۆتان گوتی:

-ئەم شەمشەمە کوێرەیە نزیکەی بیست کاتژمێرە دڵۆپێک خوێنی نەمژیوە و...

شارلۆتان پێویستی بەوە نەبوو قسەکەی بۆ تەواو بکات، شەمشەمەکوێرەکە لەناو قەفەسەکە دەستی بە فڕین کرد، ژنە هیندییەکەش دەستی ڕادەوەشاند بۆ ئەوەی لێی دوور بکەوێتەوە، دواتر شارلۆتان بە دارەکەی دەستی کێشایەوە بە قەفەسەکە کابرای ڕووسی دەرگای سەرەوەی قەفەسی بان قەفەسەکەی کردەوە، بڕێکی زۆر شەمشەمە کوێرەی برسی بۆ ناو قەفەسی ژنە هیندییەکە دابەزین، پەلاماری ئافرەتە هیندییەکەیان دەدا بۆ ئەوەی خوێنی بمژن، تا توانی هاواری کرد، بێسوود بوو، بەرەوە بوو، شەمشەمەکوێرەکان لێی نەگەڕان، شارلۆتان گوتی:

-ئەو شەمشەمە کوێرانە بە کەڵبەکانیان جەستەی بریندار دەکەن و ئەوجا دەکەونە خوێنمژینی.

ئافرەتە هیندییەکە هیور بووەوە، ئەوجا کۆمەڵێک شەمشەمەکوێرە خۆیان دا بەسەریا و لەبرینەکانیەوە ما خوێن بمژن، چاوەکانی نووقاند، وەلێ دەمی کردەوە، ڕوحی لەنێوان کەڵبە ددانەکانی دەرچوو، ئێدی دەنگ نەما، تەنها دەنگی شەمشەمەکوێرەکان نەبێت، دڵەکوتەی ئێمەش کە وەختەبوو لەترسا لە لێدان بکەوێت.

بەئیشارەتێکی شارلۆتان چون چەقەنەلێدان، کابرای ڕووسی ئەو قەفەسەی دوور خستەوەو قەفەسێکی تری هێنا، هاتشیسۆنی کەڵەگەتی تێدا بوو، لەخۆم پرسی ئەویش درۆی کرد، ئەوجا شارلۆتان دەرگەی قەفەسەکەی کردەوەو ئیشارەتی بۆ هاتشیسۆن کرد بێتە دەرەوە.

پێدەچوو هاتشیسۆن هەر سووربوو لەسەر ئەو بەسەرهاتەی گێڕایەوە، بۆیە بە دەنگێکی نێرانە گوتی:

-هۆ.. من درۆم نەکردووە، گوناهی من چییە گەورەکان داهێنانەکەی منیان لەگۆڕ نا و لەبەر چاوی خەڵکی منیان ڕەش کرد، من درۆ ناکەم.

شارلۆتان بەزمانێکی ترس ئامێز گوتی:

-تۆ ناتەوێت دان بە درۆکانت بنێیت، تۆ نەبووی گوتت کە تایبەتمەندی شەپۆڵەکانی موگناتیست گۆڕیوە، توانیوتە شتی قورس بەرزەوە بکەیت، تۆ نەتگوت کارێگەریت بە دکتۆر (ئیروین موون)ەوە بووە، کە بەرامبەر بەخەڵکی تەزوویەکی یەک ملیۆن فۆڵتی بە جەستەی خۆیدا ڕەت کردووە، بێ ئەوەی هیچی لێ بێت.

هاتشیسۆن بە دڵنیاییەوە گوتی:

-بەڵێ، ئەوە ڕاستە، دوکتۆر موون تایبەتمەندی تەزووی کارەبای بەهەمان شێوەی من گۆڕی.

شارلۆتان بزەیەکی بۆ کرد و دەستی بۆ یەکێک لە ئامێرە فرێدراوەکانی هۆڵەکە برد و گوتی:

-ئەوە باشە، ئێستا تاقی دەکەینەوەو ئەوە بەسەر جەستەتەوە ڕەت دەکەین.

چەقەنەیەکی لێدا و چراکان کوژانەوە، لەپڕ و لەو شوێنەی کە ئیشارەتی بۆ کرد، برووسکەیەکی زیکەی کارەبایی دەرکەوت، چراکان ڕووناک بوونەوە، شارلۆتان بەدیار ئامێرەکەوە دەرکەوت، گوتی:

-کاکی کەنەدی.. پێڵاوەکانت داکەنەو بچۆرە سەر ئەو پلێتە، تەزوویەکی یەک ملیۆنی کارەبات پێ ڕەت دەکەین، وەک چۆن دکتۆر موون کردی، تۆش ئەگەر ڕاستگۆ بوویت، ئەوا دەڕۆیتەوە.

هاتشیسۆن چووە سەر پلێتی ئامێرەکە، ترسێکی تیا دەرکەوت، پێڵاوەکانی داکەند، شارلۆتان ئیشارەتی بۆ ڕووسییەکە کرد دوو پلێت بخاتە سەر پێکانی، وەک چۆن دکتۆر موون کرابووی، هاتشیسۆن چین چین عارەقەی دەردەدا، کابرای ڕووسی چووە لای ئامێرەکەو دەستی بە دەسکی ئیشکردنەکەوە گرت و ئامادەیی خۆی بۆ شارلۆتان دەربڕی.

شارلۆتان بە پەنجەی چراکانی کوژاندەوە..

هاتشیسۆن دەستی بەرز کردەوە کە ئامادەیە، ئەوجا شارلۆتان هاواری کرد:

-ئیشی پێبکە.

ڕووسییەکە دەسکەکەی بەرزەوە کرد، تەزوویەکی یەک ملیۆن ڤۆلتی لێوە دەرچوو، بەجەستەی هاتشیسۆن دا ڕەتبوو، هاتشیسۆن هاوارێکی لێوە بەرزەوە بوو، ڕووسییەکە دەسکەکەی داگرتەوە و ئامێرەکەی کوژاندەوە، هاتشیسۆن شەل و کوت ببوو، وەک دارێکی وشکەڵاتوو بەرەوە بوو. ویستم فریای بکەوم، وەلێ ترس ڕێی پێگرتم، کابرای ڕووسی داچەمییەوەو دەستی بۆ گرێ ملی برد، تا ترپەی دڵی سەح بکاتەوە، دواتر سەری بەرزەوە کردو تەماشای شارلۆتانی کرد و پەنجەی بەرزەوە کرد، شارلۆتان برۆکانی بەرزەوە بوون، گوتی:

-پێدەچێت هاوڕێکەمان لەتاقیکردنەوەکەی دکتۆر موون ڕزگاری بوو، کەواتە گۆڕینی شەپۆڵەکان ئاراستەکەشی گۆڕی.

تەماشای جەستەی (هاتشیسۆن)مان کرد، لەرز بەری نەدابوو، کابرای ڕووسییەکە چووە بن باڵیەوەو بەرزی کردەوە، شارلۆتان گوتی:

-بەڕێز کاکی کەنەدی تۆ ڕاستگۆ بوویت، لەم دەرگەوە دەچیتە دەرەوە، وەلێ بەڵێنت پێ نادەم بەو عەقڵەتەوە بچیتەوە جیهانی خۆت، پێدەچێت ئەو ڤۆڵتییە بەرزە دەمارەکانتی لەکار خستبێت.

هاتشیسۆن خۆی دەتەکاند، شارلۆتان بەرەو ڕووی ڕۆیشت و شانی دایە بن باڵی، بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتن، لەدەرگاکەش ئاودیو بوون، تا لەچاو ونبوون.

کابرای ڕووسییەکە دوویان کەوت، ما ئیمەش لەیەک بڕوانین. دواتر شارلۆتان هاتەوە ناومان، ترس جارێ بەتەواوی بەری نەدابووین، لەگەڵ هاتنەوەی ئەوەندە بەسام بوو، وەک ئەوەی ئیزرائیل هاتبێتە ناومان.

شارلۆتان لەسەر کورسییەک دانیشت و ما دیقەتمان بدات، چون ئەوەی یەکێکمان بۆ سەربردەی داهاتوو هەڵبژێرێت، دواتر چاوی لەسەر جوولەکەکە وەستا. کاتێ شارلۆتان بەدارە بچووکەکەی ئیشارەتی بۆ کرد، ترس تەواو شێواندی، دەنگی چون فیشکەی مار، گوتی:

-ئەی جوولەکە باسی ئەو قسانەمان بۆ بکە، کە بۆ خەڵکی قسەت کردوون، یەک وشە چییە نایگۆڕیت، ئەگەر وشەیەکت لێ گۆڕی ئەوا ئەشکەنجەدانت لەپێشە، هیچ شتێک فریات ناکەوێت تەنها ڕاستگۆیی خۆت نەبێت، دەی بکەوە قسان و ئەوەی پێتە هەڵیڕێژە، من دەزانم ئەوەی پێتە هەمووان سەرسام دەکات.

کابرای جوو لەرز دایگرت و گوتی:

-بەڕێزم، گەورەم لێدەگەڕێت بەسەرهاتەکە لەدوودیدگاوە باس بکەم؟ لەبەر ئەوەی پاڵەوانەکە دووانن، تەنها کەسێک نییە، چیرۆکەکەیانم لەکتێبێکی بڵاوکراوەی خۆمدا نووسیوەتەوە، سوێندت بۆ دەخۆم کە ڕاستگۆ دەبم.

شارلۆتان سەری بە بەڵێ نەوی کرد کە ڕازییە، کابرای جوولەکە خۆی گردکردەوەو دەستی بە گێڕانەوە کرد.

# 6

# بەسەرهاتی خەڵکانێکی بۆشایی ژێر زەمین

ریمۆند بیرنارد .. دەیگێڕێتەوە

( (کەس بە جەمسەری باکوور نەگەیشت، لەبەر ئەوەی لەڕاستیدا جەمسەری باکوور بوونی هەر نییە، وەلێ خۆری هەقیقەت ڕۆژێک دێت لەچاوی تاریکیدا دەدرەوشێتەوە، ڕۆشناییەکەی بەسەر ئەوانەدا دەدرەوشێتەوە کە لەتاریکیدا ئاکانجین))

بەتەنها لەدەریای باکوور سەرەڕۆ بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ بەدەم شەپۆڵەکانەوە گیرۆدە دەبوو، هەموو جارێک شڵپێ ئاوی بەدەم و چاویدا دەدا، تا بزانێت جارێ زیندووە، تەمەنی بیستی بەڕێنەخستبوو، ئەوەتا بەسەر تەختە دارێکەوەو بەسەر ئۆقیانووسێکی بەستەڵەکدا سەرەڕۆ شەپۆڵەکانی دەریا دەیانبرد، ئۆقیانووسی ئەرکتکتی.

هەر چوار پەلی سڕیبوو هەستی پێ نەدەکرد، گوێشی لەدەنگەکەی نەبووبوو، وەلێ چاوەکانی دەلەرینەوە، هەستی دەکرد دەستێک بە ڕوومەتەکانی دەماڵێت تا بە ئاگا بێتەوە، ئەوە دەریاوانەکان بوون لەپاپۆڕەکە دابەزیبوونە سەری و لەئاوێکی شلەتێنیان نابوو، تەنها لەرزی لێهاتبوو، هیچ دەنگێکی

نەبوو، تەنانەت کە جەستەشی گەرمەوە بوو، وەک ئەوەی ڕوحی بەستبێتی نەدەهاتەوە سەرخۆی.

زۆر بە پەرۆشی بیستنی چیرۆکی ئەو کەشتییەی ڕزگاری بووین، کاپتنەکەشی پیاوێکی سمێڵ ئەستووری برۆ پڕی شەڕانگێز، ڕوحی گەنجەکە ئارام بووەوە، ما لەدەوروبەری خۆی بڕوانێت، کاپتنەکە پێیگوت:

-ئەی گەنج تۆ کێی؟ کوا کەشتییەکەت و...

گەنجەکە بەدەنگێکی خنکاوەوە گوتی:

-ئاگارتا.

ڕوخساری دەریاوانەکان گۆڕا کاتێک گوێیان لێبوو، لێی گردبوونەوە، کاپتنەکە گوتی:

-ئەی گەنج.. قسەی پڕوپووچمان بۆ مەکە، تۆ نازانیت لەکوێی، تۆ وای لەزیندانی حکومەت (هالک)دا.

گەنجەکە داچڵەکی، کە لەدەستەکە ورد بووەوە، جلی سەربازییان لەبەردا بوو، کاپتنەکەشیان برێ ئەستێرە بەسەر شانەوە، ئەوجا تەماشای زەوی کرد، دەستی بەگێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە سەیرەی مرۆڤ لەسەدەی پێشووتریش گوێی لێ نەبووە، چونکە درۆ دوایین شتە بە هزری مرۆڤدا بێت، کە کەسێک لەکەشێکی بەستەڵەکی ئۆقیانووس ڕزگاری بووبێت، دەریاوانەکان بە گرنگیدانەوە گوێان لێ گرت، بە پشت بەستن بەو زانیارییانەی پێشکەشی کرد، قسەکانیشی کارێگەری بەسەر ئاسایشی نیشتیمانییەوە دەبێت، لە

زیندانی ناو پاپۆڕەکە دەستبەسەر کرا، لەزیندانی ئۆقیانووسەوە بۆ زیندانی مرۆڤ، گەنجە نەیزانی ساڵانی داهاتووی ئەو چیرۆکە بۆ جیهان دەگێڕێتەوە، کە بەچاوی خۆی بینیویەتی، ئەو زەوییەی کە بەسەریەوە دەژێین، وەک ئەوە نییە کە مەزەندەی دەکەین. ناوی (ئۆلاف جانسن) و مێژوو ناوی تۆمار دەکات، کە تەنیا کەس بووە (ئاگارتا)ی بینیوە.

* * *

بەدەر لەوەی پینتاگۆن وەک شانەی هەنگ کە خەڵکی لە پێنج قوڵەوە تێی وروژابوون، ئا لەو ڕۆژەدا ترسێک داهات، دوای پڕوپاگەندەیەکی زۆر کە باسیان لەدۆزینەوەی جەمسەری باکوور دەکرد، ئەدمیڕاڵ ریتشارد بێرد و فلۆید بینیت سەرکەوتووبوون لە دۆزینەوەی جەمسەرەکە، بە زانیارییەکی زۆر خەتەرناک گەڕانەوە، سەرۆکی ئەمریکا (فۆرد) بڕیاریدا لە کۆبوونەوەیەکی زۆر نهێنی لەتەکیانا کۆ ببێتەوە، کۆبوونەوەکەیان پێنج کاتژمێری خایاند، ئەوەش دوای ڕزگاربوونیان لەکارەساتێکی ڕاستەقینە، کاربەدەستانی پێنتاگۆن بە پەرۆشەوەی زانیاری وردی ئەو دۆزینەوەبوون، لای شەوێ کاربەدەستەکان لە پێنتاگۆن دەرچوون، هەردوو ناوبراو ئەدمیراڵ و هاوڵەکەی لە زیندانی پینتاگۆن دەستبەسەر کران، تا سەرۆک لەبابەتەکەیان دەکۆڵێتەوە.

ئەو شەوە بەر لەوەی سەرۆک پینتاگۆن جێبهێڵێت، لای لە بێرد کردەوەو گوتی:

-دەزانم شەهوەتی چوونە ناو مێژوو پەرۆشی کردوویت، بەو ئاوایەی جیهان وەک مەزنترین دۆزەرەوەی مێژوو دوای ئەوەی بینیت باست لێوەبکەن، وەلێ بەرێز بێرد یەک وشە لە بابەتەکە هەموو شتێک دەدۆڕێنیت، پلەت، ئازادیت، مێژووت، شکۆمەندیت.

بێرد گوتی:

-گەورەم من پیاوێکی سەربازم، فەرمانەکانم گشت بەجێ گەیاندووە، بەڵام ئەم بابەتە، ناکرێت بێ...

سەرۆک قسەکەی پێبڕی:

-مەدالیای شەرەفتان پێ دەبەخشین، بەرزترین مەدالیای سەربازی لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاتان پیا هەڵدەواسین، تا شکۆمەند بن و مێژووش بەنەمر ناوتان ببات، وەلێ ئەو چیرۆکەی لاتانە بفەیە، خۆ ئەگەر یەک وشەتان درکاند، بزانە هەموو شتێک لەدەست دەدەن.

* * *

هەر کە تەماشای باوکی (ئۆلاف جانسن) دەدەیت، دەزانیت ئەو پیاوە نەرویجییە و لە نەرویجییە ڕەسەنەکانە، ئەویش بەوای بانتۆڵە پان و فلْتەکەی و ئەو چاکەتە قورسەی بان بانتۆڵەکەی و ئەو شەپقە شۆڕەوەبووەی سەر چاوەکانی و ئەو سبیلە درێژ و باریکە سپییەی نێو پەنجەکانی و ئەو شێوازەی دووکەڵی توونتنەکەی بە چێژەوە دەری دەکرد، بەختەوەرترین پیاو بوو کە لەو دواییەدا ئەو کەشتییە تازەیەی کڕی، ئەویش بەوای بەخششی خواوەند

تۆردییەوەبوو کە بەتەنگیەوە چووبوو، بەدەم دانشتنەوە بە پێلاوەبریقەدارەکانی پێیەوە لەسەر سندووقێکی بەردەمیدا پێی ڕاکێشا، بەو ئاوایەی لەسەر کورسییەک دانیشتبوو، (بابەکی سەرد شەپقەکەی دەلەراندەوە، ئەو کەشی دووکەڵەکەی کە دەریدەدا لێی تێکدابوو، بە (تۆلاف)ی کوڕی گوت:

-ئای لەبای باکوور، کوڕم دەزانی، ئەو با سەردە دڵ دەبەستێت، ئەگەر (تۆدین)ی خواوەند نەبوایە هەموو زەویم داگیر دەکرد، وەلێ لەژێر دەستی ئەو بۆم دەرناهێنرێت.

لەڕاستیدا تۆلاف باوەڕی بە خواوەندی تۆردییەکان نەبوو، کە باوکی سووربوو لەسەر ئەوەی باوەڕی بە خواوەندەکەیان هەبێت، وەلێ تۆلاف مشتومڕی لەتەک باوکیدا ئەو پرسیارانەی ورووژاند:

-باوکە ئەو (با)ی باکوورە لەکوێوە دێت؟

باوکە دڵیخۆشبوو، چون ئەوەی کوڕەکەی هاتبووە سەر خەت:

-کوڕی خۆم باکوور ئاراستەی ژیرییە، کوڕی خۆم پێویستە لەباوباپیرانتەوە فێر بیت، هیچ دەریاوانێک نییە بتوانێت (با)ی باکوور ببڕێت، هەر کەسێکیش سەرکەوت بە سەر (با)ی بکوور، ئەوا بەچاوی خۆی دەبی...

باوکە کادووی سبیلەکەی بە (با)دا کرد، ما کوڕەکەی پەرۆشی بیستنی ئەودوای قسەکانی بێت، گوتی:

-ئەو زەوییە دەبینێت کە پێیان وایە ئەوپەڕی دونیایە، کەچی ئەوە بنەمای هەموو شتێکە.

تۆلاف بە پەرۆشیەوە گوتی:

-باوکە ئەوە چ خاکێکە؟

بەدەم ڕوانینیەوە بۆ ئاسۆ گوتی:

-خاکێکی ناوازەیە، هەڵبژێردراوەکان تێیدا نیشتەجێن.

بابەتەکە هەستی وریوژاند، بەباوکی گوت:

-پێشتر کەس سەردانی ئەوێی کردوە؟ ئەو خاکە، ناوی چییە؟

باوکە گوتی:

-کوڕی خۆم.. ڕێگا بۆ ئەوێ هەروا ئاسان نییە، وەک بزانم کەس بەوێ نەگەیشتووە، تەنها دەریاوانێک نەبێت، وەلێ کە گەڕایەوە عەقڵی لەدەستدا، کەس نییە ئەو بەختەوەرییەی ببینێت و هۆشی بەسەرەوە مابێت..

تۆلاف بە پەرۆشییەوە گوتی:

-باوکە دەڵێی چی بۆی بچین، تۆ ناڵێی کەشتییەکەی ئێمە تۆدین دەیپارێزێت؟ تۆ ئەو دەریاوانە نیت کە مەزنترین کەسیت و دەریات بڕیوە؟ من ئەو تەنیا کوڕەت نیم کە لەدایکبووم، هەر بەمنداڵی تووڕت دامە ناو دەریا، تا ڕابێم؟.

باوکە بەسەر پشتی کەشتییەکەوە ڕاستەوەبوو، کەوتە هامشۆ کردن، بە پێڵاوەکەی لە داری کەشتییەکەی دەدا، (تۆلاف)یش بە دوو چاوی کراوەوە

لێی دەڕوانی، بینی باوکی دەستی بە پەرژینی کەشتییەکەوە گرت و ما لە دەریاکە بڕوانێت، دواتر لای لەکوڕەکەی کردەوەو گوتی:

-تۆ ئەوەندە دڵسۆز بیت، کوڕی خۆم دەگەین، خواوەند ئۆدین بمانپارێزێت.

ئۆلاف بەدەم بزەخەنەوە گوتی:

-ئۆدینی خواوەند بمانپارێزێت.

باوکە قیبلەنۆماکەی لەکەشتییەکە دەرهێنا و لەسەر مێزێکی گەورەی دانا، کە نەخشەی جیهانی بەسەرەوە بوو، ما هەندێ خوێندنەوە بۆ هێڵەکان بکات، تا هاتە قسەو گوتی.. یەکەم بنەما بۆ دەریاوانی ڕوو بە ڕووبوونەوەی (با)ی باکوورە، فێر بین ئەم قیبلەنۆمایە فڕێ بدەین، لەوێ ئەم قیبلۆنمایە وەک شتی بەسەرچوو وایە.

*　　　　*　　　　*

فڕۆکەیەکی بچووکی جۆری (فۆکەر) بەسەر ئاسمانی جەمسەری باکوورەوە بوێرانە دەفڕی، ئەدمێراڵ و فڕۆکەوانەکەی تێدابوون، ئەدمێراڵ لە شووشەی پێشەوەی فڕۆکەکە تەماشای خاکی سپی بە بەفر داپۆشراوی دەکرد، بە فڕۆکەوانە هاوڵەکەی گوت:

-بینت.. باسی پشکنینی سەرەتایی پێوەرەکانی بەردەمی خۆتم بۆ بکە، وا دەچینە مەودای جەمسەرەوە.

بینیت گوتی:

-هەموو پێوەرەکان کێشەیان نییە، وەلێ پێدەچێت بەئاستەم لەسووتەمەنییەکە لیک بکات، گەورەم پێمباشە بگەڕێینەوە و ئەو لیک کردنەی چاک بکەینەوەو دواتر بگەڕێینەوە، ئاخر لیککردنی سووتەمەنی لە فڕۆکەی فۆکەر مەترسیدارە.

ئەدمیراڵ چاوێکی بە پێوەرەکانی فڕۆکەکە خشاند، بەتووڕەییەوە گوتی:

-گەڕانەوە لەبیر خۆتی بەرەوە، ئەو لیکە کەمەش هیچ نییە، گەڕانەوەشمان هەر ئەو برە سووتەمەنییەی لێ دەچێت، گرنگ ورەیە.

لەوێوە قیبلەنۆماکە تێکچوو، بینیت بەدەم تەماشاکردنەوە نەفرەتی لەقیلۆنماکە کرد، ئەدمێڕال گوێی پێنەدا، بینیت گوتی:

-گەورەم ئەگەر قیبلنۆماکەمان ونکرد، ئەی چۆن...

ئەدمێڕاڵ قسەکەی پێبڕی:

-ئێمە بەسەرەوەی بازنەی جەمسەری موگناتیسەوەین، شێتبوونی قیبلنۆماکەش پێتی ڕادەگەێنێت ئێمە لە ئاراستەی ڕاستداین، لەم خاڵەوە چووینە جەمسەری باکوور، هەر لەم خاڵەشەوە فێردەبین قیبلەنۆماکەمان لەبیر خۆمان بەرینەوە، وەک ئەوەی هەر پێمان نەبێت.

بینیت گوتی:

-بەرێز ئەدمێڕاڵ کام بازنەی موگناتیسی؟ تکایە پێمبڵێ چۆن دەتەوێت لەشوێنێکی وا ئاراستەکان بزانیت، تەماشای خوارەوە بکە سپێتی بەفر هەموو ئاراستەکانی وەرشاردووەتەوە.

ئەدمیڕاڵ تەماشای ئەو خاکە سپییەی کرد و گوتی:

-لەلێواری گۆی زەوی بازنەیەکی موگناتیسی بە دەور جەمسەرەوەیە، ئەو بازنەیە باکووری مەگناتیسە، کە قیبلەنۆماکە بەردەوام لە هەموو جیهان ئیشارەتی بۆ دەکات، هەرچی باکووری ڕاستەقینەیە وا بەسەری گۆکەوە، بۆیە ئەگەر هەر کەسێک ئەو بازنەیەی بوارد، وەک ئەوەی ئێمە دەیکەین، قیبلەنۆماکە ئیشارەتی باشوور دەکات، لەبەر ئەوەی بازنەکە کەوتە دواوەمان. هەر بەڕاست قیبلەنۆماکە جێگیر بوو، بەرەو باشووری دەخوێندەوە، کارێکی سەیرە، تەنها لەم جەمسەرە ئەوە ڕوودەدات، ما قیبلەنۆماکە هێدی هێدی لەئاراستەی باشووریش لای دەدا، وەک ئەوەی لەسەرخۆ پێچەوانەی میلی کاتژمێر بخولێتەوە.

بینیت بە دڵەڕاوکێوە گوتی:

-بەڕێز ئەدمیڕاڵ.. هەوڵمدا هۆشم ئەمدیو و ئەودیو بکەم، مامەڵە لەتەک باشووردا و باکوور بکەم، وەلێ قیبلەنۆماکە هەر ناجێگیرە.

ئەدمیڕاڵ گوتی:

-ئا لێرە ئەفسانەی باکوور دێتە دی، گۆی زەوی کە بە بەردەوامی بەدەور خۆیدا دەخوولێتەوە، کەواتە بازنەی موگناتیسییەکەی باکوور جێگیر نییە، لەگەڵ خولانەوەی گۆی زەوی ئەویش دەخوولێتەوە، بۆیە قیبلەنۆماکە بەردەوام بۆ هەمان شوێن ئیشارەت ناکات، دەگۆڕدرێت، بۆیە پێمگوتی

قیبلەنۆماکە وەلا بنێ، سوودی نییە، من ڕێگایەکی تری بێ قیبلەنۆمام داهێناوە، لێرەوە تەنها پێوەرەکان بنووسە.

بینیت تەماشای خوارەوەی کرد و دەمی داچەقا و گوتی:

-کاپتن...

ئەدمێراڵ تەماشای خوارەوەی کرد، ما بێدەنگی فەرشی سپی هەڵداتەوە، تەنها شتێک نەبوو، شتگەلێک بوو، چیاکان سپییان دەکردەوە، چون ئەوەی لەدڵی دەریاوە هەڵقوولابێت، چیاگەلێک ترووپکیان وەک ترووپکی چیا پێچاو پێچەکان نەبوو.

ئەدمێراڵ دەسکی فڕۆکەکەی بەرز کردەوە تا فڕۆکەکە بەرزتر بکاتەوە، ئەدمێراڵ هاواری لە بینیت کرد:

-ئەم دەسکە نەفرەتییە بۆ فڕۆکەکە بەرز ناکاتەوە؟

بینیت چاوی لەو چیانە بڕی کە لێیان نزیک دەبوونەوە، ئەوجا تەماشای پێوەرەکانی کرد:

-ئەدمێراڵ سووتەمەنی، پێمگوتی گرفتمان لە سووتەمەنی دەبێت، ئەوەتا بەرزەوە نابێت.

فڕۆکەکە نەیدەویست بەرزەوە بێت، لەوەدا بوون گرێۆڵکەکان لەباوشیان بگرن.

* * *

بایەکی سەرد بەسەر دەریاوە هەڵیکرد، کەشتییەکیش بوێرانە نزیک دەبووەوە، خەڵکی باکوور دەڵێن: ئەگەر بای باکوور هەڵیکرد، ئەوا نابێت بەسەر پشتی دەریاوە بیت، لەبەر ئەوەی ڕەحمت پێناکات.

باوکە لەهەوڵی ئەوەدا بوو بە بان کەشتییەکەوە خۆی جێگیر بکات، دەستی بە ئاسنێکەوە گرت، (ئۆلاف)یش هەوڵیدەدا چارۆگەکە بەو ئاراستیە ببات کە پێویستە، هەستی بەگەمژەیی خۆی کرد، کە دەیزانی باوکی وابەستەی ئەفسانەکانە، هەڵبەت نووکە هەست دەکات جەنگاوەرێکە لەسووپای ئۆدین، وەلێ ئەم کەشتییە بەرامبەر (با)ی باکوور بەرگەی چەند کاتژمێرێکی تر ناگرێت، ئەوە گەمژەترین بیرۆکە بوو هات بەمێشکی هەرزەکارییەکەی، پێدەچێت باوکیشی لەو هەرزەکارتر بێت.

ئاسمان کەوتە گرمە گرم، چون ئەوەی تووڕەبووبێت، یا وا هەست دەکەیت شەیتان هاواری وێرانکردن دەدات، با سەردەکەش دەیماڵی بەدەم و چاوی ئۆلاف و ملی پێ لار دەکردەوە، برووسکەش لێرەو لەوێی دەدا، لەنێو ئەو هەموو نەهامەتییە باوکە گۆرانی هەست جووڵێنی نوردییەی دەگوتەوە، بەدەر لەوەی باوکە پیاوێکی گەمژە بوو، وەلێ دەریاوانێکی بلیمەتیش بوو، بەو ئاراستەیە کەشتییەکەی ئاراستە کردبوو، بەپێی باکە، بۆیە کەشتییەکەی بەرەو ئەو شوێنە ڕادا کە مەبەستی بوو، نەک مەبەستی (با)کە.

بەڵام (با)ی باکوور دەنگێکی هەیە چون ئاوازێکی بڵند، بۆیە دەریاش بڕیاریدا تووڕە بێت، (ئۆلاف)ی بچووک دڵی گووشرا، کاتێک بینی شەپۆڵەکان

بەرزەوەبوون، تا بە پەرژینی کەشتییەکە دەگەیشتن، ئا لەوێ باوکە لە سترانبێژی خۆی کەوت و هاواری کرد:

-تۆلاف.. ئەو تەشتە بێنە، ئامادەبە بۆ دەرکردنی ئەو ئاوەی دێتە ناو کەشتییەکە.

تۆلاف بەڕاکردن بەرەو تەشتەکە ڕۆیشت، ئامادەگی خۆی بۆ دەریا دەرخست، ئاوی شەپۆڵەکانی بهاوێتەوە ناو دەریا، لەپڕ هاوارێکی قەتیس ماوی ناخی دەربڕی، کە بینی شەپۆڵەکان زیاتر بەرزەوە دەبوون، ئەوەش لە دەستووری دەریاوانیدا یانی کۆتایی، وەلێ باوکی شتگەلی سەیری بە کەشتییەکە دەکرد، ڕوو بە ڕووی شەپۆڵەکانی لە لاوە نەدەکرد، بەڵکو ڕوو بە ڕووی دەبووەوە، بۆیە شەپۆڵەکان بەرەو دوا پاڵیان پێوە دەنا، تۆلاف بەتەشتەکەی ئاوەکەی دەردەدا.

ما شەپۆڵەکان ڕوو بە ڕووی کەشتییەکە ببنەوە و بەرەو دوا پاڵی پێوە بنێن، تا بەرە بەیان ئەوە بەسەرهاتیان بوو، بەرەبەیان دەریا ئارام بووەوە، تۆلاف بەوای ماندووبوونیەوە پاڵی دایە پەرژینی کەشتییەکە، باوکیشی گوتی:

-تۆدین هەر خۆی نەبوو ئەم سەرکەوتنەمان بەدەست هێنا، ئەوە (تۆر)ی خواوەندیش بوو.

تۆلاف بزەیەکی هات، بەدەنگێکی زۆر نزم گوتی:

-باوکە پێدەچێت تۆ (تۆر) بیت.

باوکە گوتی:

-کورِم ئەوە چی دەڵێی؟

تۆلاف گوتی:

-دەمگوت نووکە ئێمە لەکوێین.

باوکە بەدەم سبیلەکەیەوە گوتی:

-ئەوجا هەلی ئێمەیە بەرەو باکوور بەڕێبکەوین، دەریا ئارامە، تەنها چارۆگەکان بەرەو ئەو ئاراستەیە بەرە کە بەرەو باکوور دەمانبات.

تۆلاف بەدەم ماندووبوونەوە چارۆگەکانی خستە بەر با، تا لای نیوەڕۆ بەڕێوەبوون، دواتر باوکی بە دەنگێکی بەرز هاواری لە کوڕەکەی کرد:

-تۆلاف بڕوانە، ئەوە دیوارەکانی باکوورن.

تۆلاف ما دیقەتی ئەو دیوارانە بدات کە چاوی بنیادەم نەیبینیوون، بە پشتییەوە خۆر لە ئاوابووندا بوو، تۆلاف بەدەم سەربڵندکردنیەوە بۆ بەرزی دیوارەکە، گوتی:

-باوکە.. چۆن لەو شتە ئاودیو دەبین؟

باوکە گوتی:

-بەنێو پێچاو پێچی چیاکان، لەکەلێنێک دەگەڕێین کەشتییەکەی پیا ڕەت بێت، چارۆگەکان دادەدەینەوە و تەنها مەکینەکە بەکار دەهێنین، وەلێ لەم چیا سپییانە یەک گرفتێکمان دەبێت.

تۆلاف چاوەڕوانی پرسیارێکبوو، باوکە پێشی کەوت و گوتی:

-لەم چیا بەفرینانە ڕێژەی دارمانی ناوەوە زۆر گەورە دەبێت، ئەگەر چوینە ناوی دوور نییە بەسەرمانا دارمێت، ڕەنگە تووشی دارمانیش نەبین.

*　　　　*　　　　*

بە ئەزموونی فڕۆکەوانێکی کۆن ئەدمیڕاڵ دەسکی فڕۆکەکەی تا ئەوپەڕی لای چەپ برد، فڕۆکەکە ئاراستەی بۆ لای چەپ وەرچەرخا، سکی فڕۆکەکە بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوەی چیاکان بەرزەوەبوو، تا لەلووتکەی چیایەک دوور کەوتەوە، ئەوەندەی نەمابوو خۆی بە لووتکەکە بکێشێت، ئەدمیڕاڵ توانی دیواری ترس ببڕێت و بەوردی لەخوارەوەی خۆی بڕوانێت، ئەفسانەگەلێک دەربارەی ئەو دیوارە هەن، پێدەچێت یەکەمین ئەفسانە ڕاستی بێت، بە بەرچاویەوە بینی.

چرکەساتێک هەیە وا مەزەندە دەکەیت کە گەیشتوویتەتە لێواری زەوی، ئا لەوێوە ئەدمیڕاڵ و هاوڵەکەی ئەوەیان بەرچاو کەوت، شتێک چون ئەوەی کەس ناوێکی لەویٚ نەنابێت، نزیکترین وەسپ بۆی، هەورێکی خۆڵەپەتانە بەری ئاسۆی گرتبێت، ئەوەی گرفت بوو، ئەو هەورە نزیک دەبووەوە، ئەدمێڕاڵ گوتی:

-بەنەفرەت بێت، ئەوە زریانێکی خۆڵاوییە، کە (نانسن)ی گەڕۆک باسی لێوە کردووە، ئەودەم نەفرەتی لەو ساتە کرد کە ئەوەی بینی، بۆیە بڕیاریدا بگەڕێتەوە، بینیت.. ئەو هەورە شکس...

بینیت بەوریاییەوە گوتی:

-ئەوەی بیری لێ دەکەمەوە، ئەم هەموو خۆڵەپەتانەیە لەکوێی جەمسەری باکوورەوە دێت؟

ئەدمێراڵ بەدەم دیقەتدانی هەورەکەوە گوتی:

-بینیت.. کە ئەو شتەمان بوارد، پێتیدەڵێم.

هەورەکە زۆر بەرز بوو، تەنانەت فڕۆکەکە پێی نەدەگەیشت بگاتە سەری، ئەدمێراڵ بێرد شتێکی زۆر سەیری کرد، بە فڕۆکەکە بەرەو زەوی دابەزی، بەنزمییەوە بەسەر زەوییەکە دەفڕی، لەشوێنێکی زەویەکە نیشتەوە، گوتی:

-ئەگەر فڕۆکەکەمان بەر ئەو زریانە بکەوی تەواومان دەکات، هەموو ئامێرەکان لەکار دەکەون، لەناو فڕۆکەکە لەپاڵ ئەم بەشەی چیاکە دەمێنینەوە، تا لێدەکاتەوە.

بینیت وەک ئەوەی بیرۆکەیەکی بۆ هاتبێت گوتی:

-گەورەم زریانێک بەم قەبارەیە تەواو دەبێت؟

ئەدمێراڵ گوتی:

-بینیت.. زریانی خۆڵەپەتانە بەردەوام نابێت، ئەوەی لەهزری مندایە ڕاست دەربچێت، کەواتە سەرچاوەی ئەم خۆڵەپەتانەیە زەوییە نەک سەهۆڵبەندان.

بینیت پرسیارئاسا گوتی:

-مەبەستت ئەوەییە لەڕووسیاوە هاتووە؟ دەزانم جەمسەری باکوور دەکەوێتە نێوان کەنەدا و ڕووسیا.

ئەدمێراڵ لێوی خۆی گەزی و گوتی:

-ڕووسیا زۆر لەوە دوورترە لەوێوە هاتبێت، هەموو شتێک تێدەگەیت هەر کاتێک ئەم خۆڵەپەتانەیە دامرکایەوە.

بینیت گوتی:

-بەمەزەندەی تۆ چەند لێرە دەمێنینەوە؟

لە چاوەکانی ئەدمێراڵەوە ورەی خۆ بەدەست نەدانەوە دیاربوو، گوتی:

-لێرە دەمێنمەوە ئەگەر مانگێکیش بێت.

* * *

ئۆلاف بەردەوام دەیگوت کە باوکی دڵێکی وەک بەردی هەیە، ئەوەتا کەشتییەکە چووە نێو کەلێنێکی نێوان دوو چیای سەهۆڵبەندان و شەویان بەسەردا هات و گوێیان لە وژەی بای باکووربوو لەنیو چیاکان هاڕەی داڕمانی شتێک دەهات، باوکیشی بە بان پشتی کەشتییەکەوە قومی لە سبیلەکەی دەدا و بە کاوەخۆوە تەماشای لووتکەی چیاکەی دەکرد، کەشتییەکە بەتەنیشت چیاکەوە تێپەڕی و کاپتن بە سەرسوڕمانەوە دەستی لێدەدا، لەڕاستیدا دیمەنی چیا کەڵەکە کراوەکان بەسەر سەریانەوە شکۆیەکی سەیریان هەبوو، دەتگوت دارستوونی کریستاڵین و یەک بەتەنیشت یەکەوە پاڵیان داوەتەوە، ڕووناکی مانگەشەوەکەش لووتکەکانیانی ڕووناک کردبووەوە.

بەوای زریانەکەوە ئاو بەسەر کەشتییەکەوە مابوو، دەبوو ئۆلاف ئەو ئاوە بەتەشتەکە دەربهێنێت، وەلێ ماندوێتی و توێنێتی زۆری بۆ هێنابوو، پێش

کەمێک زانیبووی ئاوی خواردنەوەیان بەدەستەوە نەماوە، بەرەوپیری باوکی ڕۆیشت، ئەو باوکەی خەیاڵ بەو جیهانەوە سەرقاڵی کردبوو، پێیگوت:

-باوکە ئاومان نەماوە، دڵۆپێک ئاو چییە نیمانە.

شتێک لەچاوانی باوکییەوە دەرکەوت، دواتر بەدیقەتدانێکی بەخۆوە گوتی:

-کوڕم ئازا بە، خواوەند ئۆدین بۆ خۆی خواوەندی ئاوە، ئەو هامکاری ئازاکانە.

بەدەم ئاە هەڵکێشانەوە ڕووی وەرچەرخاند، ئای لەم خوداوەندەی خاوەن هەموو شتێکە، بە نائۆمێدییەوە بەرەو ئاوی ناو کەشتییەکە ڕۆیشت، ما خۆی بە ئاو دەردانەوە سەرقاڵ بکات، تا توێنێتی لەبیر خۆی بباتەوە، ئاوەکە زۆر سەرد بوو، دەستی لە ئاوەکە وەردا، ویستی شڵپێک ئاو بە دەموچاویدا بدات، بەڵکو لەم نائومێدییە بە ئاگا بێتەوە، وەلێ دەستەکانی بە دەموچاویەوە بەستی، سووک سووک دەستی داگرت، سەیری پێهات، باوەڕی نەکرد، بلەز شڵپێکی تری ئاوی لە...

باوکی بەدەم بەرەنسکی کوڕەکەی بە سەرسوڕمانەوە لای لێکردەوە، بینی ڕوخساری داماوی گەشەوە بوو، بە پێکەنینەوە چون ئەوەی باوەڕ نەکات، بەباوکی گوت:

-باوکە.. ئەم ئاوە ئاوی ئۆقیانووسە، سازگارە!

باوکیشی سەروسیمای خۆشبەختی تێکەوت و سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو گوتی:

-کوڕی خۆم نەمگوت خواوەندەکان لەتەکمانان، ئەو پەرجوەی نێو دەستیان ئاسایی نییە.

تۆلاف سەری بۆ ئاسمان بەرزەوە کرد، هەر بەڕاستی چاوی لە (تۆدین)ی خواوەند گڕ دەدا، بەلای باوەکەوەش ئەوە پەرجوو بوو، ما هەموو شتەکان لەئاو پڕ بکەن، باوکە پێدەچوو گێلۆکە بێت، کە هەوڵی دەدا بەفری چیا بەفرینەکە تام بکات، تا بزانێت سازگارە یا ناسازە، تۆلاف خۆی بۆ نەگیراو دای لەقاقای پێکەنین: ئای ئاسمان، خۆزگە هەموو کەس وەک باوکم بوایە.

کەشتییەکە بە سڵامەتی بە ژێر دارستوونە کریستاڵەکاندا تێپەڕی، وەک ئەوەی بووبن بە بەربەست بۆ ئەو زریانە تووشەی دەرەوە، تا لەودیوی دیوارەکەوە ئاسمانیان بە پان و پۆڕی لێیانەوە دەرکەوت، بە پەرۆشییەوە بۆ بەردەمی کەشتییەکە ڕۆیشتن بەو ئاوایەی لەم دەستبەسەری سپییە دەرچن، تا زیاتر نزیک دەبوونەوە زیاتر ئامانیان لێ دەردەکەوت، تۆلاف دەمی داچەقابوو، تەماشای شتێکی دەکرد لە ئاسۆوە لێی دەرکەوت، تا ئەو تەمەنەی شتی وای بەخۆیەوە نەبینیوە.

شەبەنگێکی مەزنی ڕەنگاو ڕەنگ هەموو ئاسمانی بڕیوە، ئەو ڕەنگە سوور و سەوز و وەنەوشەییە سەریانی پێ سوڕ کرد، زۆر لەسەر خۆ دەجووڵایەوە، باوکە بەدەم سبیلەکەیەوە گوتی:

-کوڕی خۆم.. ئەوە زەردەپەڕی بەیانە، ئەو دیمەنە لەهیچ شوێنێک نابینیت تەنها لە وڵاتی جەمسەرەکان نەبێت.

کەشتییەکە لە چیاکان ئاودیو بوو، بەو ڕەنگانە چون ئەوەی خولوەند پاداشتیانی کردبێت، بەرامبەر بەو خۆ ڕاگرییەیان سەرفرازبوون، تەنانەت بای سەرد و بەستەڵەکیش نەبوو، جیهانێکبوو لە جوانی.

کات بەدووی کاتدا تێدەپەڕی، تا تاریکی شەو پەرت و بڵاوەوە بوو، لەئاسۆوە خۆر سەری دەرهێنا، ئەو خۆرە زۆر سەرنجیانی ڕاکێشا، ئەوان ڕاهاتبوون لە دەریادا خۆر ببینن، دەیانزانی چۆن هەڵدێت، وەلێ ئەوە یەکەمجاریانە خۆر هەڵدێت و هەورێلێک دەوریان داوە، وەک ئەوەی لە گرکانەوە هەڵاتبێت.

* * *

بەیانیان و ئێوارانی ئەو دەڤەرە لەیەک دەچوون، ئەوانیش لەناو فڕۆکەکەدا دانیشتوون و تەماشای ئاسمان دەکەن، بەوای خۆڵەپەتانەکەوە شەو و ڕۆژیان بۆ دەسنیشان نەدەکرا، نە ڕووناکی هەبوو نەیش تاریکی، تەنها ڕەنگی خۆڵەکەوەیی هەموو شوێنێکی گرتبووەوە، (بینیت) ئەوەندە نووستبوو، لەخەویش وەڕس بووبوو، زوو زوو ئامۆژگاری گەڕانەوەی دەکرد، وەلێ ئەدمێراڵ هەر سوور بوو لەسەر مانەوە، ئەوەی لەمێشکی خۆی بردبووەوە بگەڕێتەوە ئەگەر گیانیشی لەدەست داوە، جارەو جار کە سەرما بینی دەگرد بە کۆکە کۆک خۆی بەفڕۆکەکەدا دەکردەوە، هەر کە چوو ناو فڕۆکەکە گوتی:

-بینیت.. دەی گورج بەرەوە لێرە دەڕۆین، خۆڵەپەتانەکە کەمی کردووەو بۆ هەڵفڕین دەست دەدات.

بینیت هەستەکانی گوڕیان سەند و ما گوڕ بە فڕۆکەکە بدات، فڕۆکەکە بەرزەوە بوو، ئەوجا دەستی لێداگرت تا بە تیژترین تیژی وەک تیر بە ئاسمانا چوو، بەو ئاوایەی لە خۆڵەپەتانەکە دەربچێت، دواتر بینیان شەوە، وەلێ بەرزتر بوونەوە، ترسیان هەر لەوەبوو خۆیان بەشتێکدا بدەن.

ئەدمێراڵ سۆسەی کۆتایی خۆڵەپەتانەکەی دەکرد، لەهەمان کاتدا تەماشای پێوەری سووتەمەنی فڕۆکەکەی دەکرد، هێشتا سێ لەسەر چواری تانکییەکەی بەنزینی تێدایە، مەودایەکی باش بەئاسمانەوە فڕین، تا دەهات خۆڵەپەتانەکەش کەم دەبووەوە، تا بەتەواوی نەما و ئاسمان ڕوونەوە بوو، ئەدمێراڵ نەخشەکەی دەرهێنا و لادانی قیبلەنۆماکەشی سەح کردەوە و بە (بینیت)ی گوت:

-ئەو ژمارانەم بدەرێ کە داوام لێکردی بیاننووسیت.

بینیت.. ژمارەکانی دایە دەستی، ما ئەدمێراڵ لەتەک کاغزەکانی خۆی بەراوردی بکات، ئەوجا بە گرنگی پێدانەوە لەئاسمانی ڕوانی، ڕێک بۆ لای ئەستێرەی جەمسەری باکوور کە بەسەر سەرەوە بوو لای کردەوە، ئەدمێراڵ پلەی ئاراستەکردنی بەو شێوەیەی خۆی مەبەستی بوو، بەرەو ئەو ئاراستەیە بانزینی بۆ شێلا و فڕۆکەکە تیژتر بەڕێکەوت.

کاتێک ئەدمێراڵ نووشتابووەوە سەر کاغزەکان، بینیت.. بانگی لێوە کرد:

-ئەدمێراڵ.. بڕوانە ئەوێ.

ئەدمێراڵ لە پەنجەرەکەوە دیقەتی ئاسۆگەکەی دا، بینی ئاسۆگەکە بە پەردەپۆشی سوور و سەوز و شین هەریەکەو بەوی ترەوە خۆی ڕەنگ دەکرد، چون ئەوەی یەکیان خۆش بوێت، بە ئاسمانەوە وەک جووڵەی هەور دەگەڕان، مانگیش دەیویست ڕووناکی خۆی بخاتە دیمەنەکەوە، ئەوجا دیمەنێکی دڵڕفێن داهات، ئەدمێراڵ کاغزەکانی بەردەمی وەلانا و بە (بینیت)ی گوت دەستبەجێ فڕۆکەکە داگرێتە خوارەوەو لەپاین چیاکە بنیشێتەوە.

ئەدمێراڵ و هاوڵکەی لە فڕۆکەکە دابەزین و تەماشای ئاسمانیان کرد، ئەدمێراڵ پاڵی بە فڕۆکەکەوە دابوو گوتی:

-دەبارێت، یا بڵێم بەفر دێتە خوارەوە.

بینیت.. ما لەئاسمان ڕابمێنێت و هەست بەو هەورانە بکات کە لەبەفر باریندان، چون ئەوەی ئاسمانیش درکی پێکردبن، ئەوەندەی ماتەڵ نەکردن و کلوە بەفر هێدی هێدی هاتە خوارەوە، ئەو بەفر بارینە سپی ڕەنگ نەبوو، هەندێکی سوور و هەندێکی تری زەرد و هەندێکی تریشی ڕەش، بینیت.. بەدەم دەست بەرز کردنەوە گوتی:

-ئەمە جەمسەری باکوورە؟ ئەوەی لەسەختی کەش و باکەی خۆی بۆ ڕابگیرێت، شتگەلی سەیری تیا دەبینێت، ئەدمێراڵ بۆ خوا پێم بڵێ ئەمە چییە؟

ئەدمێراڵ بەدەم تێڕوانینی بۆ هەندێ پارچە بەفری سەر زەویەکە گوتی:

-بینیت.. ئەم کلوە بەفرانە لەتەک هەندێ ماددەی کاریۆنی ئاوێتە بوونە، کە لە گڕکانەکانەوە هەڵقوولاون، ئەو ڕەنگانەیان داهێناوە.

بینیت.. برۆکانی بەرز کردەوەو گوتی:

-گڕکانی چی بەڕێز ئەدمێراڵ؟ لەم شوێنە گڕکان نییە، ئێمە لەجەمسەری باکووردایین.

ئەدمێراڵ بزەیەکی بۆ کرد، وەلێ هیچی نەگوت، لێ (بینیت) لێی نزیکەوە بوو گوتی:

-بەڕێز ئەدمێراڵ.. بۆ زانیاریت من فڕۆکەوانێکی بە ئەزموونم، لەنێو سەدان فڕۆکەوان هەر بۆ خۆتیش بۆ ئەم گەشتە منت هەڵبژارد، خێرە وابچووکم دەکەیتەوە؟

ئەدمێراڵ بەدەم گوێگرتنەوە لەئاسمانی دەڕوانی، ئەو دیمەنە جوانەی (بینیت) بە نیازە بە گەمژەیی خۆی بیشێوێنێت، ئەدمێراڵ لای لێکردەوەو گوتی:

-بینیت گیان.. هەندێ شت هەن دەربارەی ئەم جەمسەرە کە دەیزانم، هیچ بوونەوەرێک نایزانێت، هەموو شتێکیشت لە ئان و ساتی خۆیدا بۆتی ڕوون دەکەمەوە.

بینیت چون نارەزاییەک گوتی:

-بەڕێزم نووکە وادەیەتی.

ئەدمێراڵ گوتی:

-جارێ نا، بڕوام پێبکە ئەوەی بۆتی ڕوون دەکەمەوە، شایانی چاوەڕوانییە، ئێمە لەجیهانێکداین مرۆڤ مەزەندەشی ناکات کە هەبێت، وەلێ کاتی ئەوە هاتووە بیزانن.

بینیت گوتی:

-جیهان؟

ئەدمێراڵ بە بەڵێ سەری بۆ ڕاوەشاند، بینیت.. لێی ڕاما، بینی بەسەری ئیشارەت بۆ شوێنێکی دیاری کراو دەکات، لای لەو شوێنە کردەوە، بە دووری چەند میترێک لەو لایانەوەو بە ژێر تیشکی بەربەیانەوە گیانەوەرێک دەڕۆیشت، مەحاڵبوو گیانەوەری وا لەم شوێنەدا هەبێت، نەک لەبەر ئەوەی جەمسەری باکووریی نییە، بەڵکو ئەو گیانەوەرە بەر لە ملیۆنان ساڵ لەناوچوون، وەک لە قوتابخانەکان ئەوەمان خوێدووەتەوە، گیانەوەرێکی فرە زەبەلاح و هەموو جەستەی بەموو داپۆشراو و دوو کەڵبەی زۆر درێژ بەقەد درێژی جەستەی خۆی، لمۆزی چون لمۆزی فیلی هەبوو.

هەردووکیان لە واقوڕمانەکەیان بە ئاگا هاتنەوە، ئەو دەمەی گیانەوەرەکە بە چوار پێوە و لمۆزیشی بەرزەوە کرد و هاوارێکی لێ بەرزەوە بوو، ما پاشەو پاش بکشێنەوە، بینیت.. بەرەو لای فڕۆکەکە غاری دا، ئەدمێراڵ بە وریاییەوە بەرەو شوێنێکی تر ملی نا و شتێکی بەدی کرد، گوتی:

-بەنەفرەت بێت، ئەوە دانەیەکی ترە.

ئەدمێراڵ بەرەو فرۆکەکە ڕووی وەرچەرخاند کە (بینیت) خستبوویە ئیشکردن، بلەز بەرزەوەبوون، بینیت.. دەستی بەسەر سوکانەکەوە دەلەرزی و گوتی:

-گەورەم.. پێمبڵێ خۆ من وانەی بایۆلۆژیم بیرچووەتەوە، ئەو شتانە چۆن هاتوونەتە ئێرە؟

ئەدمێراڵ بەدەم ڕوانینیەوە بۆ گیانەوەرەکان، گوتی:

-ئەی خودایە.. ئەوە (ماموس)ە، ئەو بوونەوەرە زۆر دڕندەیە، زاناکان لێرە لەم جەمسەری باکوورە چاڵیان دۆزیوەتەوە، یا وایان مەزەندە کردووە کە چاڵ بێت، وەلێ پێناچێت ئەوە چاڵی گیانەوەری زۆر کۆن بن، بەقەد ئەوەی چاڵی گیانەوەری ئاساییـن، بینیت.. دەزانیت ئەگەر دڕکیان پێمان بکردایە، ئەوە کۆتاییمان دەبوو، زیاتر لە یەکێکم بینی، بڕوانە خوارەوە...

بینیت تەماشای لای خوارەوەی کرد، ڕەوێک لەو (ماموس)ەی بینی گەورەو بچووک لە پانتاییەکی فراوان، بینیت.. پێیان سەرسام بوو، دواتر تەماشای قیبلەنوماکەی کرد، هێشتا هەر دانەساکابوو، ئەدمێراڵ پێیگوت:

-بۆ ئەو خاڵە لا بکەرەوە بە ئاراستەی کاتژمێر یانزە.

بینیت.. بەرەو ئەو ئاراستەی ئەدمێراڵ پێیگوت بەڕێکەوت و چاویشی لەخوارەوە نەدەبڕی، هەستی کرد ڕێیان لێ ون بووە و (ئەدمێراڵ)یش بەهەڵەدا چووە، بەو ئاوایەی ئەو زەوییەی لەبەرامبەریەتی خاکێکی ئاساییە و بەفری پێوە نییە، ما دار و گۆمی ئاوەکان وردە وردە دەرکەون، لێرەو

لەوێش گورگ و ڕێوی و باڵندەکان دەرکەوتن، دووکەڵ دەوری خۆری دابوو، تەنانەت ڕووناکییەکەشی وەک ڕووناکی ڕۆژ نەبوو، زیاتر لە ڕووناکی خۆرئاوابوون دەچوو، بینیت.. دانی بەخۆیدا نەگرت و گوتی:

-بە داوای لێبووردنەوە گەورەم پێدەچێت ڕێگامان ون کردبێت، ئاخر قیبلەنۆماکەش لەکار کەوتووە، وا مەزەندە دەکەم بەرەو کەنەدا بڕۆین، نەک جەمسەر، بەهەرحاڵ بڕوانە پلەی گەرما 23 پلەیە، ئەدی کوا جەمسەری باکوور؟

ئەدمیڕاڵ زۆر لەسەر خۆی گوتی:

-بینیت.. ئێمە بەسەر زەوییەوە نین!

بینیت.. لای لە ئەدمیڕاڵ کردەوەو گوتی:

-گەورەم.. داوای لێبووردنت لێدەکەم، کاتی گاڵتە...

ئەدمیڕاڵ قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

-ئێمە لەناوجەرگەی ژێر زەویداین، نەک سەر زەوی.

بینیت.. بۆ ماوەیەک دیقەتی دا و هیچی نەگوت، پێدەچوو گومانی لەعەقڵی ئەدمیڕاڵ هەبووبێت، ئەدمیڕاڵ بەو چاوەوە سەیری (بینیت)ی کرد چون ئەوەی بزانێت بەرامبەر قسەکانی چی لەدڵدایە، گوتی:

-بینیت.. لەو چیرۆکە گەمژانە گەڕێ، کە لە ئەفسانەکاندا دەربارەی ناوەوەی بۆشایی زەوی بیستووتە، کە گوایە بوونەوەر و شەیتانەکان

لەمەملەکەتی ژێر زەویدا دەژێن، ئەو قسە پڕوپووچانە لەمێشکی خۆت دەریکە، ناوەوەی زەوی شتێکی ترە، دوورە لە بیرکردنەوەی مرۆڤەکان.

بینیت.. چاوی لە ئەدمێراڵ نەدەبڕی، ما ئەدمێراڵ زیاتری بۆ ڕوون بکاتەوە و گوتی:

-گۆی زەوی کە بەسەریەوە دەژێین، لای ژێرییەوە چین چینە، زۆربەی زاناکان وای بۆ دەچن ئەو بۆشاییە بەوای تاوێرەکانی ژێر زەوییەوەن، کە گرکانەکان دروستیان کردووە، لەڕاستیدا بەو شێوەیەی ئەوان نەخشەیان بۆ کێشاوە وا نییە، لەسەنتەری ئەو ژێر زەوییە ئاگرێک هەیە، وەلێ ئەو ماوەیەی نێوان ئاورەکەو توێکڵی زەوی بۆشاییەکی گەورەیە.

بینیت.. لەچاوەکانیەوە نارەزایی لەسەر قسەکانی ئەدمێراڵ هەبوو، بەر لەوەی بیدرکێنێت ئەدمێرال پێشی کەوت و گوتی:

-ئەو ئاورە کە لەناو سەنتەری ژێر زەوییەوەیە ئەوە خۆری ئەو بۆشاییەیە، بۆشاییەکەش وەک ڕۆپۆشی ئەو سەنتەرەیە، خاکی ژێرەوە ڕێک وا بەژێر توێکڵی زەوییەوە و...

بینیت.. چون توورەبوونێک گوتی:

-بەداوای لێبووردنەوە ئەم قسە پڕوپووچەت لەکوێوە هانیوە؟

ئەدمێراڵ ئیشارەتی بۆ ئاسمان کرد و گوتی:

-ئەوە.

بینیت.. تەماشای ئەدمیراڵی کرد، کە پەنجەی بۆ ئەو خۆرە نامۆیە درێژ کرد کە بەئاسمانەوەیە، گوتی:

-خەڵکی وامەزەندە دەکەن چاڵێک یا ئەشکەوتێکی ئاسایی هەیە دەتوانن لێوەی بچنە ناو بۆشایی ناوەوەی زەوی، لەڕاستیدا ڕێک لەجەمسەری باکووردا بۆشاییەکی فرە گەورە هەیە، بەقەبارەی نیۆیۆرک دەبێت، ئەو بۆشاییە دەچێتە ناو بۆشایی زەوییەوە، بەوای ئەوەی زۆر گەورەیە، ئەوەی دەچێتە ناوی هەست بەجیاوازی ناکات، وادەزانێت هەر بەسەر زەوییەوەیە، لەڕاستیشدا ئەو چووەتە ناو ئەو بۆشاییە و لەناو ناوی زەوی دەگەڕێت، هەر کە دەچێتە ناوی ئەم خۆرەی بەرامبەر دەبێتەوە، وەلێ ئەوە خۆر نییە، ئەوە ئاورە لەناو جەگەی زەویدا، ئەم زەویەش کە بەدەورماندایە خاکی ئێمە نییە، مەبەستم سەر زەوی نییە، ئەوە خاکی بۆشاییەکەیە، یانی ناوکی زەوی.

بینیت.. بە زمانێکی هیشک گوتی:

-گەورەم بەڵگەت بۆ ئەوە چییە؟

ئەدمیراڵ گوتی:

-ئەدمۆنت هالی ئەوەی ئەستێرە کلکدارە بەناوبانگەکەی دۆزیەوە، ئەو بوو لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کرد، بەو ئاوایەی زەوی لەناوەوە بۆشە، ئەو بۆشاییە لەهەندێک شوێن هۆکارە لە نەخوێندنەوەی قیبلەنوما، گوتیشی ئەو چینانەی ژێر زەوی ڕنگە بوونەوەری زیندووی تیا بژێت، دواتر زانایانی تر هاتن و

گوتیان لەو بۆشاییەی ناو زەوی خۆرێکی ناوەوە هەیە، ئاویش یەک لەسەر چواری زەوییەکەی ناوەوەی تیایە، ئەودوای هەموو زەوییە.

بینیت.. بەدەم تەماشاکردنی زەوی سەوزایی خوارەوە گوتی:

-بەڕێز ئەدمێراڵ تۆ پێتوایە لەڕاستیدا ئێمە هاین لەناو بۆشایی زەوی، یانی بە پێچەوانەوە سەرمان بۆ لای خوارەوەیە؟

ئەدمێراڵ گوتی:

-لە پانتایی زۆر گەورە وەک هەسارە و بەوای کێشکردنەوە ئەو کەسە درک بەوە ناکات سەری بۆ لای خوارەوەیە، خەڵک لە نیوەی باشووری گۆی زەوی سەریان بۆ لای خوارەوەیە، بەوپانتایی گۆی زەوی بەوای کێشکردنەوە هەست بەوە ناکەن سەریان بۆ لای خوارەوەیە.

بینیت بەتەواوی بێدەنگ بوو، ما سۆسەی خۆر و هەورەکان بکات، کە دیمەنێکی جوانی بەو ناوەوە بەخشیبوو، یەکسەری تەماشاکردنی خۆرەکە ئاسایی بوو، وەک خۆری سەرزەوی نییە کە ناتوانیت ڕاستەوخۆ دیقەتی بدەیت.

* * *

تۆلاف بۆ دواجار تەماشای خۆرە دوکەڵاویەکەی کرد و گوتی:

-باوکە ئەوەی لێرەیە وەک ئەوە نییە کە پێی ڕاهاتووین.

باوکە بە ژێری خۆی پێیگوت:

-کوڕی خۆم ئەوە خۆر نییە، ئەوە هەسارەیەکە لە هەسارەکان، دیارە زۆر لێوەی نزیکبووینەتەوە .

باوکە بڕیاریدا لەتەک کوڕەکەی لە کەشتییەکە بێنە خوارەوە بۆ سەرە زەوییە تازەکە، بەو بەیانییەی کە ئاسمانی جوان کردووە و ئەو خۆرەش کە گومانی لێدەکرێت، چەند کاتژمێرێک ڕۆیشتن، بینیان خۆرەکە وەک خۆرەکەی لای خۆیان لەکاتی خۆیدا ئاوا نابێت، زیاتر بە ئاسمانەوە مایەوە، زانیمان ئەوە خۆر نییە، تەنانەت ئاوابوونەکەشی وەک خۆری لای خۆیان نەبوو، بەرەو زەوی ئاوا نەدەبوو، بەڵکو ئەو خۆرە بۆ ئاسمانەوە بەرزتر دەبووەوە، هەموو شتێک لێرە سەرەو خوارە، کاتیان ئەوەندە بەدەستەوە نەبوو زیاتر لێی بکۆڵنەوە، پێنج مانگە لەدەریادان، خۆراکیشیان بەدەستەوە نەمابوو، برسێتی زۆری بۆ هێنابوون.

خۆرە دوکەڵاوییەکە بە ئاسمانەوە دەرکەوت، چون ئاگادارکردنەوەیەک بۆ نیشتنەوەی بەیانی، ما لەو خاکە بەرێبکەون کە هیچ پەیوەندییەکی بە باکووری زەوییەوە نەبوو، چیا سەوزەکان دەرکەوتن، دەشتاییەک تا چاو بڕ بکات دارستانە، ڕووبارێکی گەورە، بە پەرۆشەوە بەرەو دارستانەکان ڕۆیشتن، بەدووی شتێک دەگەڕان بخورێت، چاویان بە ڕەزی ترێ کەوت، وەلێ لەدەنکە ترێکەی لای خۆیان زۆر گەورەتربوو، تامی ترێکەیان کرد، شیرین ڕوحی دەبووژاندەوە .

خەریکی خواردن بوون، گوێیان لەدەنگێک بوو، وەک ستران، بەترسەوە لایان لەشوێنی دەنگەکە کردەوە، گۆرانییەکە ئاوازێکیشی لەتەکا بوو، دەنگەکە تا دەهات بەرزتر دەبووەوە، یا نزیکتر دەبووەوە، زانییان ئاراستەی دەنگەکە لەکوێوە دێت، تەماشای لای ڕووبارەکەیان کرد، سەرچاوەی گۆرانییەکەیان بینی، ترس ئامبازیان بوو.

* * *

بینیت تەماشای پێوەرەکانی دەکرد، دیاربوو لەدڵی خۆیدا حەساوکردنێکی هەبوویێت، تا ڕووی دەمی لە ئەدمیراڵ کرد و گوتی:

-گەورەم.. زیاتر لەنیو تانکی سووتەمەنیمان سەرف کردووە، بەو پێیە بێت ئەو ماوەیەی کە بڕیومانە، بۆ گەڕانەوە پێویستمان بە زیاتر لەنیو تانکییە تا بگەینەوە وڵاتی خۆمان.

ئەدمێراڵ ویستی وەڵامی بداتەوە، وەلێ بە بان کورسییەکەی خۆیەوە وشکهەڵات کە بەسەرسوڕماوییەوە لەپێوەرەکانی ڕوانی، بینیت.. کاتێک بێ هیچ هۆکارێک بۆ حاڵیبوون سامێک دایگرت، هەموو پیوەرەکانی سەر شاشەکە لەکار کەوتن، تەنها و تەنها مەکینەکە کاری دەکرد، تەنانەت باڵەکانیشی ئاراستەیان بۆ نەدەگۆڕا، تا لا بکاتەوە، تەنانەت بۆ نیشتنەوەش کار لەکار ترازابوو.

لەپڕ ڕادیۆی فڕۆکەکە کەوتەوە کار، وەلێ ژاوە ژاوێکی زۆری بەسەرەوە بوو، لەنێو ئەو ژاوە ژاوەوە دەنگی کەسێک بیسترا، وەلێ ڕوون نەبوو، قسەکانی

ڕستەی کورت بوون و چون ئەوەی پرسیار بکات، هەر ئەو قسە ناڕوونە دووبارە دەبووەوە، ئەدمێراڵ وەختەبوو بە ڕادیۆکەدا بکێشێت، دەنگەکەی بۆ ساف نەدەکرا، تا (بینیت) بە دەنگێکی خنکاوەوە گوتی:

-ئەدمێراڵ.. تۆ دڵنیایت ئێمە وا لەناوکی زەویداین؟

-بەڵێ، لێمگەڕێ تەنها ئەم ڕادیۆ نەفرەتییە ڕێکبخەم.

بینیت چون ئاگادارییەک گوتی:

-ئەدمێراڵ...

ئەدمێراڵ لەپەنجەرەکەوە دیقەتی دەرەوەی دەدا، سەیری پێهات، ئەوەی بەدەور فڕۆکەکەوەیە لەهەر چوار لاوە، شتگەلێکن مەحاڵە لەناو جەرگەی زەویدا یا لەسەر زەویدا هەبن، شتگەلێکی بەسام.

* * *

گۆرانییەک ئەو ناوەی هەڵگرتبوو، دەنگەکە لە کەشتییەکی زۆر زەبەلاح لە ئاسۆوە دەهات، لە ڕووبارە گەورەکەوە لەسەرخۆ بە ڕوونی دەهات، بەبان کەشتییەکەوە پیاوگەلێکی درێژی قژ سوور، کاتێ تەماشای تۆلاف و باوکی تۆلافیان کرد، سەریان سوڕما، بەدەست ئیشارەتیان دەکرد و لەتەک یەکا قسانیان دەکرد، لەپڕ لەژێرەوەی کەشتییەکە دەرگایەک کرایەوە، بەلەمێکی لێوە دەرچوو، شەش زەلامی بەهێزی تیا بوو، باوکە گوتی:

-پێدەچێت ئێمە بۆ وڵاتێکی تازە گەشتمان کردبێت!

شەش زەلامە درێژەکە هاتن و بەزمانێک قسەیان لەتەکیان کرد، نە تۆلاف و نەیش باوکی لێیان حاڵی نەبوون، پێنەدەچوو بەوای ڕفتارەکانیانەوە هێمن و خۆشەویست بن، زۆر بە تووڕەییەوە لەتەک یەکا قسەیان دەکرد، دۆزینەوەی تۆلاف و باوکی بەلایانەوە شتێکی سەیر بوو، بەو شێوانە ڕانەهاتبوون، ئەمان لەچاو خۆیانەوە زۆر کورتە باڵابوون، ڕوخساریشیان جیاواز بوو، یەکێکیان دەستی درێژ کرد تا قیبلەنۆماکە لەدەست باوکەکە وەرگرێت، بەسەیرەوە لەقیبلەنۆماکەی دەڕوانی، هاوڕێکانی لێی گردبوونەوە، بەو قیبلەنۆمایە سەرقاڵبوون، وەک لەشتیتر، تۆلاف لەباوکی ڕوانی بەو ئاوایەی(چی بکەین؟)، باوکەش بە ئیشارەت پێیگوت چاوەڕێ دەکەین، پیاوەکان ئاوڕیان لێ دانەوە، دیاربوو لە ئیشارەتەکەیان حاڵی بووبن، یەکێکیان هەر بە ئیشارەت دەستی بۆ کەشتییەکە درێژکرد، وەک ئەوەی بڵێت ئەگەر دەتانەوێ فەرموون سەر کەشتییەکە بکەون، تۆلاف و باوکە چون پرسیار دیقەتی یەکیاندا، تۆلاف گوتی:

-باوکە.. پێناچێت خراپەکار بن، ئەگەرچی باڵایان درێژە وەلێ ڕفتاریان خەراپ نییە.

لەڕاستیدا کورتە باڵاترینیان درێژییەکەی لە دوو میتر کەمتر نەبوو، هەر هەموویشیان ڕیشێکی مام ناوەندیان هەبوو، تەنانەت ڕەنگی ڕیشیشیان جیاواز بوو، ڕوخسارێکی جوانیان هەبوو، بەدوویاندا بۆ ناو کەشتییەکە ڕۆیشتن، کۆمەڵە خەڵکێک بەسەرسوڕماوییەوە لە تۆلاف و باوکەکەیان دەڕوانی،

ژنەکانیان بە پێکەنینەوە سیقەتیانیان دەدان، پێدەچوو ئەو خەڵکە هیچ غەوارەیەک نەهاتبێتە ناویان، ئاخر خەڵکی لەکوێوە بێن، کە ئەوان لە پشتی (با)ی باکوورەوەن؟ ئەوە بوو تۆلاف بیری لێ دەکردەوە، دیاریوو پیاوان و ژنان ململانێیان بوو بۆ ڕەزامەندی تۆلاف و باوکەکە. چون ئەوەی بەچکە پشیلەیەکت دۆزیبێتەوە بتەوێت گەمەی لەگەڵ بکەیت.

جل و بەرگیان هەر هەمووی ئاورپیشم بوو، کەوشەکانیان بە ئاڵتوون نەخشێنرابوو، تۆلاف و باوکە سەرنجیان بۆ لای کەوشەکان چوو، ئەوان ئاڵتوونیان دەناسییەوە، ئەو قەومەش ئاڵتوونیان لەژێر پێ داناوە، باوکە بەدەم ئیشارەتکردن بۆ لای ئاسۆوە، گوتی:

-کوڕی خۆم ئێمە واین لەلای ئەو قەومەی باو باپیرانم بۆی گێڕاوەمەتەوە، ئەوان وان لەژێر زەویدا.

تۆلاف بە ترسەوە بۆ ئەو شوێنەی ڕوانی کە باوکی ئیشارەتی بۆ کرد، شارستانییەتێکی بینی لە عەقڵا نەبوو، خەڵکەکە سیقەتی سەرسامی تۆلاف و باوکەکەیان دەدا، یەکێکیان باوشی لە تۆلاف داو بۆ حەوا بەرزی کردەوەو شتێکی ناحاڵی گوت، دیاریوو کە (تۆلاف)ی بەرز کردەوە تا جوانتر بیبینێت، لەڕاستیدا ئەو جۆرە بیناکردنانە پێشتر مرۆڤ نەیبینیوە.

تۆلاف و باوکە لە کەشتییەکە هاتنە خوارەوە، ما بەشارەکەدا بگەڕێن، خەڵکیش چون ئەوەی سەیریان پێ هاتبێت لێیان گرد دەبوونەوە، وەلێ ئەمان چاویان هەر لەئاڵتوونەکان بوو، هەموو شتێکیان لە ئاڵتوون درووست

کرابوو، مێز، کورسی، دەسکی دەرگاکان، تەنانەت ئەو شتانەی لەشەقامەکانیشدا بوون ئاڵتوون بوون، گومەتی بیناکانیش هەر لە ئاڵتوون دروست کرابوون، مێوەیان بۆ هێنان، وەلێ مێوەکانیان لە مێوەی ئاسایی سەر زەوی گەورەتر بوو، بڕیاریاندا تۆلاف و باوکە بۆ لای کەسێک کە ناوی (گول)ەیە بیانبەن، تا لە لای گول و هاوسەرەکەی گرنگیان وێدەن و فێری زمانیشیان بکەن.

❊ ❊ ❊

شەش دەفری بازنەیی چوار دەوری فڕۆکەکەیاندا، ئەدمێرال تا هێزی تیا بوو هاواری لە ڕادیۆکەوە کرد، پەنجەشی بەسەر دوگمەی شەپۆڵ گۆڕینەوە لەوە دەگەڕا دەنگەکە ڕوونتر بکات، ئەدمێراڵ گوتی:

-ئێرە ئەدمێراڵ (ریتشارد بێرد)ە، ئێمە نەهاتووین بۆ گێچەڵ کردن، وەلێ وا پێدەچێت ڕێگامان ون کردبێت.

دەنگێک بە شێوەزارێکی ئەڵمانی سەیر هات و گوتی:

-بەخێربێی ئەدمێراڵ بۆ نیشتمانمان، تۆ لەشوێنێکی ترست نەبێت، نەکەی فڕۆکەکەت بە لادا بەریت، نووکە لەژێر دەسەڵاتێکی دەرەکیدایت، کەمێکی تر دەتاننشێنینەوە .

بینیت و ئەدمێراڵ بێدەنگیان هەڵبژارد، دەنگەکە دڵنەوایی پێدان، بەڵام دڵیان بەوای سەرسوڕمانەوە وەختەبوو بەرگەی ئەو دیمەنە نەگرێت، کە لەپەنجەرەکەوە دیقەتی ئەو جیهانە ڕازاوەیان دەدا، دواتر بەئاگا هاتنەوە،

بینیان فڕۆکەکەیان بە ئەستوونی دەنیشتەوە، وایانزانی دەکەون، دواتر دەرکەوت دەسەڵاتێکی دەرەوە فڕۆکەکەی کۆنترۆڵ کردووە و وەک گەمییەک لەو شارە دەینشێننەوە.

پیاوانگەلێک قژ سوور لە دەفرکان کە چواردەوری فڕۆکەکەیان دابوو، دەرکەوتن، یەکێکیان بەدەست ئیشارەتی بۆ ئەدمیڕاڵ کرد بێتە خوارەوە، ئەدمیڕاڵ دەستی بەرز کردەوەو (بینیت)یش هەر کە چاوی بە دەفرکان کەوت بە تەنیشتیەوە لەرز دایگرتبوو، وەلێ ئەدمیڕاڵ تەماشای ئەو شارە ڕازاوەی دەکرد، بیناکان چون ئەوەی لەکریستاڵ بنیاتنرابن، بەشێوازێک لای ئەندازیارەکانی سەر زەویش بەو دیزاینە نەگەیشتوون، تەنها فرانک شتێکی لەو باەبەتە درووست کردبوو، بیناکان بازنەیی وەک ئەڵقە چووبوونە یەک.

پێدەچوو ئەو شوێنەی تیا نیشتنەوە مۆڵگای سەربازی بێت، سەربازێکی زۆر لەئامادەباشیدا وەستابوون، پیاوەکان بەرەو بینایەکی کریستاڵی دایاننە پێش خۆیان، بە ڕاڕەوەکاندا ڕۆیشتن، وەک ئەوەی ڕووناکی مەیلەو سوور ئەو ناوەی ڕووناک کردبێتەوە، یەکێکیان هەستی بە ترس و دڵەڕاوکێیانی کرد، گوتی:

-ئەدمیڕاڵ دوودڵ مەبە، پاش کەمێکی تر لەحزووری ماستەردا دەبن.

بێدەنگی دایگرتبوون، دڵیشیان زۆرتر لێیدەدا...

* * *

ئۆلاف و باوکی لای ئەو قەومە زیاتر لەساڵێک مانەوە و فێری زمانەکەیان بوون و شتگەلێکی سەیریشیان بینی، زمانیان وەک هیچ زمانێکی سەر زەوی

نەبوو، وەلێ پیچێک لە زمانی سەنسەکریتییەوە نزیکبوو، ئەو شارەی تیا دابەزین ناوی (جیهۆ) بوو، تەنها شارێکە لە مەملەکەتێکی گەورە دەکەوێتە ژێر زەوی، ئەو مەملەکەتەش ناوی ( ئاگارتا)یە، ئەو قەومە خوانەناس بوون، خۆرە دوکەڵاوییەکەیان دەپەرست، کە بەسەرچاوەی ئەو بوونەیان دەزانی، تەمەنیان وەک تەمەنی بنیادەمەکان نەبوو، ناوەندی تەمنیان هەزارساڵبوو، یانی لەسەرەتای دروستبوونی زەوییەوە دە نەوە زیاتریان نەبووە، کچ و کوڕیان لێرە لەتەمەنی سەد ساڵیدا هاوسەرگیری دەکەن، زانستێکی باڵایان هەیە، ئامێرگەلێکیان هەیە مرۆڤی سەر زەوی پێشتر درکی پێ نەکردوون، گرنگی بە میوزیک دەدەن، لەهەموو شوێنێک بەدەورتەوەن، منداڵەکانیان لەتەمەنی بیست ساڵیدا دەچنە قوتابخانە، تا سی ساڵ دەخوێنن، هەموو شتێک فێر دەبن، تەنانەت میوزیک و جوتیاریش.

کاری زۆربەیان جوتیارییە، هەندێجاریش خەسڵەتی تووڕەبوونیان هەیە، وەلێ شەڕانگێز نین، جیهانی خوارەوەیان لەتەک زەویدا دەسووڕێتەوە، وەلێ خۆر هەر لەشوێنی خۆیەتی و ناسووڕێتەوە، کە شەویان بەسەردا دێت، هەور بەری خۆر دەگرێت، ئاسمان سوور هەڵدەگەڕێت، بریسکە بریسکی نێو هەورەکانیش وەک ئەستێرە دەردەکەون، وەلێ بە قەبارەی گەورەتر.

دوای ئەوەی کوڕە و باوکە فێری زمانیان بوون، لەشارەوە نوێنەرێک هات و گوتی قەشەی مەزن دەیەوێت چاوی پێتان بکەوێت، نوێنەرەکە دایانیە پێش بۆ ناو کەشتییەکی تایبەت، تیژڕەو بە تیژڕەوی شەمەندەفەر، کە

ڕووبارەکەیان بڕی و دوای چەند ڕۆژێک گەیشتنە جیهۆ و دابەزین، باوکە تەماشای ئاسمانی کرد، بەگاڵتەجاڕییەوە گوتی:

-بەم شێوەیە ئێمە واین لە ژێرەوەی لەندن یا ئۆسکۆتلەندە.

ئۆلاف بزیەکی بۆ باوکی کرد، وەک ئەوەی بڵێت ڕاستە ئێرە جیهانێکی جوانە وەلێ ناگاتە پێدەشتێکی ئۆسکۆتلەندە، تەنانەت ئەو گیانەوەرانەی ئێرەش ئەوەندە ڕوح سوک نین وەک پشیلەکانی لای خۆمان تا گەمەیان لەتەکا بکەین، زۆربەیان وشترن و بۆ بارو بۆ خواردن نەبێت بۆ هیچ ناشێن. ئۆلاف هوڵی ئەو چاوپێکەوتنەی لەتەک قەشەی مەزن لێ هاتبوو، ئاواتەخوازبوو بە زووترین کات ڕێیان بدات بگەڕێنەوە. ئۆلاف دیقەتی باوکی دا، بینی لەتەک کەسێکی ئەو قەومە بە پەرۆشییەوە قسە دەکات و گاڵتەی لەتەکا دەکات، پێدەچێت باوکی ئێرەی پێخۆش بێت.

لەدەربارێکی گەورەی نەخشێنراو بە ئاڵتوون و یاقووت کوڕە و باوکە چوونە ناو کۆشکێکی هەرە مەزن، شایانی ئەوەیە کۆشکی فەرمانڕەوایی ئاگارتا بێت، بە پەرۆشی بینینی پاشاوە بوون، کە هاتە دەرەوە بینیان پیاوێکی پیری چرچەڵەیە، جل و بەرگی بەهاداری لەبەردابوو، قەشە بە دەنگێکی پڕ لە ڕێزی گوتی:

-چەندین سەدەیە کەسێک لە ئێوە نەهاتوونەتە لامان، ڕەنگە نەیاندۆزیبێنەوە، حەزم کرد پرسیارتان لێ بکەم: ئەم خاکەی ئێمەتان بە لاوە چۆنە؟ دەتانەوێ ئەودوای تەمەنتان لێرە بمێننەوە؟

باوکە بە متمانەوە گوتی:

-شەرەفێکی گەورەیە بۆ ئێمە سەردانی شارەکەتان بکەین و چاومان بە بینا و هەونەر و خو و ڕەوشتان بکەوێت، بەڵام ئەم کوڕەم تاقانەیە و دایکی چاوەڕوانی گەڕانەوەیەتی.

قەشەی مەزن بێدەنگ بوو، دواتر گوتی:

-ئاخر ڕێگای گەڕانەوە خەتەرە، وەلێ ئێمە نەمانزانی ئێوە چۆن هاتوون.

باوکە گوتی:

-هەرچۆنێک بوو بەو کەشتییە بچووکەمان قەدەر بە ئێرەی گەیاندین.

قەشەی مەزن تەماشای (تۆلاف)ی کرد و گوتی:

-ئەی کوڕی جوان دەتەوێت بڕۆییتەوە یا مەملەکەتەکەمانت بەدڵە؟

پرسیارەکە زۆر وا نەبوو، وەلێ تۆلاف گوتی:

-گەورەم هەدووکیان، سەرسام بووم بە مەملەکەتەکەتان، دەشمەوێ بگەڕێمەوە بۆ لای دایکم وساڵی دواتر بێمەوە سەردانیتان.

قەشەی مەزن چاوی لەزوییەکە بڕی و گوتی،

-تۆ منداڵێکی ژیریت، کوڕی خۆم.

دواتر لای لەباوکە کردەوەو گوتی:

-بەر لەڕۆیشتنتان داواتان لێدەکەم نەخشەی جیهانی خۆتانم بۆ وێنە بکێشن و ئێمەش نەخشەی خۆمانتان پێدەدەین.

باوکە بە ڕەزامەندییەوە سەری بۆ ڕاوەشاند و گوتی:

-بەڵێ گەورەم، بۆ خۆم دەریاوانێکی کۆنم و لە کەشتییەکەمدا نەخشەکەم پێیە، بۆتانی کۆپی دەکەم.

باوکە بەڵێنەکەی بردەسەر و کۆپی نەخشەکەی پێدا، شەش خاک و دەریای بەسەرەوە بوو، کوڕەو باوکە سواری کەشتییەکەی خۆیان بوون، خەڵکی ئاگارتاش بەڕێیان خستن، ئیدی گەشتی گەڕانەوە دەستی پێکرد.

❊ ❊ ❊

ئەدمیڕاڵ چووە ژوورێک ڕەنگ و ڕووناکییەکەی بەوای کریستاڵەکانەوە بەیەکا دەچوون، خولەکێکی نەبرد لەچاوەڕوانی پیاوێکی بەساڵا چوو بەخێرهاتنی کرد و گوتی:

-ئەدمیڕاڵ بەخێر بێی بۆ وڵاتی (ئاریانی) کە من خاوەنی ئەم خاکەم.

کابرا بەدەم بەخێرهاتنەوە ئیشارەتی بۆ کرد لەسەر کورسییەکی مێزێکی گەورە دانیشێت، کابراش بەرامبەری دانیشت، ئەدمیڕاڵ کەمێک ناڕەحەت بوو، کابرا ڕوو بە ڕوو پێیگوت:

-تۆ لەجیهانی ناوەوەی زەویدای، ئێمە کارەکەت دوا ناخەین، دەشدگەڕێنینەوە سەر زەوی، وەلێ لێمگەڕێ پێتبڵێم بۆچی تۆمان بۆ ئێرە هێناوە، پەرۆشیمان بۆ ئێوە لەو ساتەوەیە کە هاوڕەگەزەکانت بۆمبی ئەتۆمی گرتە هیرۆشیما و ناکازاکی لە ژاپۆن، ئەوە کارێکی نامرۆڤانە بوو، دواتر دەفر فڕیوەکانمان نارد، کە پێیدەڵێین فلاگەردس تا بزانین هاوڕەگەزەکانتان چییان کردووە.

ئەدمێراڵ گوتی:

-بەداوی لێبووردنەوە بەڕێزم، کاری ئێمە بەسەر ئەوانەوە چییە؟

ماستەر (خاوەن خاک) وەڵامی دایەوەو گوتی:

-من دەزانم ئەوە پەیوەندی بە تۆوە نییە، بەڵام با قسەکەت بۆ تەواو بکەم.

ئەدمێراڵ بێدەنگبوو، بۆ ئەوەی بەجوانی گوێی لێبگرێت، ماستەر گوتی:

-ئێمە هیچ کارێکمان بەسەر ئەو شەڕانەوە نییە، قەومەکەی تۆ دژ بەیەک دەیگێڕن، وەلێ ئەو سەردەمە هاتووە بێینە دەنگ، چونکە ئێوە فێری بەکارهێنانی وزەی زۆر گەورە بوونە، قابیلی قبووڵ نییە بۆ گۆی زەوی، ئێمە نامەمان بۆ هێزە زەبەلاحەکانتان نارد، گوێیان پێ نەدا، ئەوا تۆش بە ڕێکەوت هاتووی، تۆ پیاوچاک دیاری، بۆیە بۆ ئەم چالاکییە تۆم هەڵبژارد جیهانی سەرەوە ئاگادار بکەیتەوە.

ئەدمێراڵ گوتی:

-ئەوەی ڕاستی بێت جیهان هیچ زانیارییەکیان بە بوونی ئێوەوە نییە، گەورەم چەندین سەدەیە ئەو گرفتە هەبووە، بۆچی ئێستا بیرتان لەوە کردووەتەوە لەڕێی منەوە جیهان ئاگادار بکەنەوە؟

ماستەر قووڵ دیقەتی دا چون ئەوەی ڕوخساری بخوێنێتەوە، دواتر گوتی:

-هاو ڕەگەزەکانت گەیشتوونەتە خاڵێک گەڕانەوەی بۆ نییە، چونکە هەر لەنێو خۆتاندا هەوڵی وێران کردنی گۆی زەوی دەدەن. بەر لە پەنجا ساڵی ساڵەکانی ئێوە هەوڵی پەیوەندیکردنمان لەتەکتانا داوە، وەلێ دەستڕێژتان

لیمان کرد، به فرۆکه جەنگییەکانتان دوومان کەوتن، بۆیه پشت به تۆ دەبەستم، به قەومەکەت بڵێ تووڕەبوونێکی ڕەش بەڕێوەیەو چەندین ساڵ درێژەی دەبات و چەکەکانیشتان هیچ کاریگەرییەکی نابێت، تەنانەت زانستەکانیشتان نەگەیشتووەتە ئەو ڕادەیە بتوانن داهێنانی زۆر پێشکەوتووتر بکەن، ئاگرێک بەردەبێتەوە دوایین گوڵیشتان دەسووتێت، گێرەشێوێنی دەکەوێتە ناوتانەوە، ئەو جەنگانەی پێشووترتان تەنها جەنگی سەرەتایی بوون، زاناکانمان ئەو پێشبینییانەیان کردووە، تۆ پێچەوانەکەی دەبینیت؟

ئەدمێراڵ گوتی:

-من باوەڕم بەوە هەیە، هەر بەڕاست سەردەمی تاریکستانیمان بەسەرا هات، پێنجسەد ساڵی خایاند، ئەویش لەسەردەمی ناوەندیدا بوو.

ماستەر گوتی:

-بەڵێ کوڕی خۆم، سەردەمی تاریکی دادێتەوەو زەوی وەک چارشێوێکی ڕەش دادەپۆشێت، بەڵام وا مەزەندە دەکەم برێکتان لەو سەردەمە دەمێننەوە، ئەوەش دەبینم دوای ئەو وێرانکارییە جیهانێکی تازەتر دادێتەوە، سوود لەگەنجینە ونبووەکان دەبینن، کە لێرە لە (ئاگارتا)دا دەبێت، کوڕی خۆم لای ئێمە نافەوتێ، کە ئەو سەردەمە هات، سەردەکەوینە سەر زەوی، تا هاوکاریتان بکەین بۆ خۆ ڕێکخستنەوە، ئەوسا زانست و ڕۆشنبیریتان پێدەدەین، ڕەنگە ئێوەش ئەودەم لەناشرینی جەنگ تێدەگەن، تۆش کوڕی خۆم ئەم نامەیە بگەێنە جیهانی سەرەوە، تا بەخۆیانا بچنەوە.

پێدەچوو ئەو قسانەی کۆتایی مانەوەی تەواوبوونی دیدارەکە بوو، ئەدمێراڵ کەمێک وەستاو دواتر وەک رێزێک داچەمییەوە، دوو پیاوەکە لەچاوەڕوانیدا بوون، بە ڕاڕەوەکاندا گەڕانەوە. گوتیان:

-ئەدمێراڵ فەرموو لێرەوە، بەرێزم دەبێت پەلە بکەین، ماستەر بە پەلەیە هەواڵەکە بگەێنیت.

ئەدمێراڵ چاوی بە (بینیت) کەوت، کە دڵەڕاوکێ ورەی لێ بڕیبوو، کاتێک چاوی بە ئەدمێراڵ کەوت، ویستی لێی بپرسێت، ئەدمێراڵ دەستی خستە سەر شانی (بینیت) و گوتی:

-هیچ نییە، بینیت هیچ نییە.

* * *

تۆلاف و باوکی سەرکەوتنە سەر کەشتییەکەیان، لەو ئان و ساتەی سەرکەوتنیاندا بۆ سەر کەشتییەکە سۆزی ماڵ و نیشتمان هێزی پێ بەخشین، سۆز بۆ مرۆڤ بوونیان بۆ کەس و کارو هاورێکانیان بە هەموو ناشرینییەکانیشیانەوە مایەی دڵخۆشییان بوو، هیچ بەرامبەر ئەو هەستەیان نابێت ئەگەر کۆشکی پڕ بەختەوەریشیان هەبێت، باوکە دەستی بە کەشتییەکەدا هێنا، بۆنی دارەکانی کرد، تۆلاف گوتی:

-باوکە لەجیهاندا مەزنترین پشکنەر دەبین، ئێمە بەسەر بای باکووردا زاڵ بووین، ئەو خاکەشمان دۆزییەوە کە خواوەندەکان مژدەیان پێدابووین.

باوکە بەشێوەیەک تەماشای (تۆلاف)ی کرد، وەک نارەحەت بیت و گوتی:

-کوڕی خۆم کێ باوەڕمان پێدەکات؟ دوور نییە ئەگەر ئەو نهێنییەمان ئاشکرا کرد، شتێکمان بەسەر بێنن، ئەو دەریاوانە هەژارە و کوڕەکەی کێن ئەو شکۆمەندییەیان پێبدرێت.

تۆلاف سووربوو گوتی:

-ئاخر باوکە ئەو قەومە دەس و دیاری زۆریان پێداین، ئەوە باشترین بەڵگەیە بۆ گەشتکردنەکەمان، ئەی نەخشەکەی پێیان داین.

باوکە گوتی:

-ئاواتخوازم جیهان بەوە بزانێت کە دۆزیومانەتەوە، ئەوە ئەگەر بە سلامەتی گەڕاینەوە.

بەگاڵتەوە دواپین ڕستەی گوت، (تۆلاف)یش بیری ئەو ترسەی کردەوە کە لەباکوور تووشیان بوو، کەواتە دەبێت بەو ترسەدا بگەڕێنەوە. چەندین ڕۆژ بەڕێوەبوون خاک سپیاتی خۆی دەردەخست، کەش و با سەرمای خۆی دەربڕی، بەستەڵەکەکان قیت بوونەوە، ئەوە ئەو خاکە بوو کە دەیانناسییەوە، بەو کەشە نالەبارەش دڵیان کرایەوە، ئاخر سۆزی غەریبیان لەخۆیان داتەکاند، بەتایبەت ئەو خۆرەی سیحرێکی ئاڵتوونی هەبوو، هەموو شتێکی دەگرتەوەو گەرمی دەکردنەوە، ئەودەم بیری ئەو خورەی ژێر زەوییان کردەوە. لەگەڵ هاتنە خوارەوەی تارای شەو گەیشتنە قوچەکە سەهۆڵ بەندانەکان، بە کەشتییەکە چوونە ناوچە خەتەرناکەکەی نێوان دوو چیای بەرز، پێدەچوو چیاکان هەستیان بە گەڕانەوەیان کردبێت، گوێیان لەدەنگێک بوو، دواتر

دەنگی جووڵانەوەی تاوێرە بەفر کە بەسەر سەریانەوە بوو، ئەوەش مانای هەرەسهێنانی بەفر بوو.

بەر لەوەی هیچ کارێک بکەن، یا بەر لەوەی لەشوێنی خۆیان بجووڵێنەوە، هەرەسهێنانەکە وەستا، بە چاوی ترسەوە لە بەرزاییەکیان ڕوانی، بڕیاردان لەو کاتەدا سەختبوو، بگەڕێنەوە یا بەرەو بۆشایی ژێر زەمین بگەڕێنەوە، یا مل بەو ڕێگایەدا بنێن کە ئەگەری هەرسهێنانی هەیە؟ بڕیاری باوکە درێژە دان بە گەڕانەوە بۆ نیشتمان بوو، پشت بە خواوەند ئۆدین لەبیریان ناکات.

چەندین کاتژمێر کەشتییەکەیان بەڕێوە بوو، تا گەیشتنە تەڵەی سەهۆڵبەندانەکەی نێوان چیا بەفرینەکان، دیمەنی چیا بەفرینە کریستاڵەکان و ئاسمانی نێو تروپکی چیاکان باوکەی بردبووەوە دوعا کردن بەو ئاوایەی فریایان کەوێت، لەچرکە ساتێکدا تاوێرە بەفرێکی زەبەلاح لە بەرزاییەکانەوە بەرەو ئاراستەی کەشتییەکەیان بەرەوە بوو.

هەر کە گوێان لەکەوتنە خوارەوەی بوو کەوتنە خۆیان، وەلێ تاوێرە بەفرە زەبەلاحەکە کەوت بەسەر بەردەمی کەشتییەکە و بەرەو خواری برد، باوکە هاواری لە ئۆلاف کرد:

-کوڕی خۆم دان بەخۆتا بگرە.

تاوێرە بەفرە زەبەلاحەکە بە ژێر ئاوەوە خۆی نەگرت و بەرزەوە بوو، خۆی بە کەشتییەکەدا کێشا، ئەو خۆ پێاکێشانە (ئۆلاف)ی بەرەو دەریاکە هەڵدا،

بەمەلەوانی خۆی گەیاندە قەراخ چیا بەفەرەکەو پیا هەڵگژا تا گەیشتە ترۆپکی چیا بەفرەکە، ئەوجا هاواری لە باوکە کرد:

-باوکە، هۆ باوکە.

هیچ وەڵامێکی لە باوکیەوە نەبیست، هەستی کرد ژیان مانای خۆی لەدەست دەدات، ناچار هاواری لە باوکی کرد:

-باوکە گیان های لەکوێ.

باوکە دیسانەوە وەڵامی نەبوو. ما بەدەور چیاکەدا بسووڕێتەوە، چون ئەوەی لە پەرتەوازەیی کەشتییەکە بگەڕێت، فرمێسک بەچاوەکانیەوە بەستبووی، سەرماو سۆڵە بەزەیی پیا نەهاتەوە.

تۆلاف زۆر بەدوای باوکیدا گەڕا، سوودی نەبوو، باوکی نەدۆزییەوە، پشتی بە چیاکەوە دا، قسەی باوکی هاتەوە بیر کەدان بەخۆیدا بگرێت، دەشبوو ئەو پاڵەوانێتییەی باوکی بەدونیادا جاڕ بدات، کە مەزنترین دۆزەرەوەی دۆزیوەتەوە، کاتێک خەڵکی سەر زەوی ئەو هەواڵە پشت ڕاستدەکەنەوە، خەڵکانی بواری مێژوو دەڵێن: جارێکیان ئا لێرەدا پیاوێکی مەزن گەشتی هات و نەهاتی کرد، بۆ دۆزینەوەی جیهانێکی تر، ئەو پیاوە مەزنە ناوی یانسن بوو.

* * *

بەر لەوەی فڕۆکەکە بخەنە گەڕ، ئەدمێراڵ بێرد و (بینیت)ی هاوڵی بەسەرسوڕمانیەوە بۆ شارەکەیان ڕوانی، شارێک دڵی دەبرد، فڕۆکەکە

لەخۆیەوە بەرزەوەبوو، چون ئەوەی دەستێکی سیحری بەرزی کردبێتەوە، دیقەتیاندا شەش دەفری فڕیو لە هەموو لایەکەوە فڕۆکەکەیانی بەرز کردەوە، زۆریش بە تیژڕەوی لەو خاکەیان دوورخستەوە، ئێدی لە پەنجەرەکەوە دیمەنی دارو دارستان و چیاو ئاوەدانییەوە گوڕا بە بەفر و گردۆڵکەی بەفر، دواتر لە رادیۆکەوە دەنگێکیان بیست:

-ئەدمێراڵ ئێمە دەگەڕێینەوە، ئێستا دەتوانن فڕۆکەکەتان کۆنترۆڵ بکەن، تەنها ویستمان سووتەمەنی فڕۆکەکەتان بەشی گەڕانەوەتان بکات.

ئەدمێراڵ بزەیەک گرتی چون ئەوەی دڵنیا بێت دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی، هەر لە رادیۆکەوە گوتی:

-هەواڵی سووپاسگوزاریمان بە ماستەر بگەیێنن، بەدڵنیاییەوە نامەکەی بە جیهان دەگەیێنین.

فڕۆکە (فۆکەر)ەکە بە هەواڵێکی گەورەوە کە جیهان تووشی شۆک دەکات، تا هەواڵی ئاکانجییەکانی ناو بۆشایە زەوی بە دونیا ڕابگەیێنێت، بەرەو ئەمریکا بەڕێ کەوت.

*　　　　*　　　　*

ما جوولەکەکە وەک جرجێک لەرز دایبگرێت، دوای ئەوەی سەربردە سەرنج ڕاکێشەکەی بۆ مشتومڕ گێڕایەوە، ئیمەش هەر هەموومان بەرامبەر کورسییەکەی شارلۆتان و دارە بچووکەکەی دانیشتبووین، وەک ئەوەی لەزیندانێکی دەروونیدا دەستبەسەر بین، گوێم لە کۆکە ڕەشەیەکبوو، کەسێک

چون ئەوەی ڕوحی بێتە دەرەوە کۆکەی بۆ کرد، لام لەکابرای کۆکەڕەشەکە کردەوە، کە بەسەر پشتا لەسەر زەویەکە ڕاکشابوو، کە پێشتر پێم نەزانیبوو. لیزا کارمەندی پێشوازی، کە مەزەندەی ئەوەم لێدەکرد لەم شانۆگەرییە ئەویش لەتەکیاندا بێت، دواتر بۆم دەرکەوت ئەویش لێل ئێمەیە، دیاربوو ئەو نەخۆش بوو، دەموچاوی زەرد هەڵگەڕا، لەناخەوە هەڵچووم، هەستامە سەرپێ و هاوارم لەشەیتان کرد:

-ئەم ئافرەتە لێرە دوور بخەرەوە، ئەمە فشاری خوێنی زۆر بەرزەوەبووە، ئاخر ئەم پێشتریش بۆی باسکردووم، ئەی شەیتان دەری کەرە دەرەوە، کە خۆت واپیشان دەدەیت مرۆڤایەتیت...

هەستم بە ئازارێکی زۆر کرد و لەسەر گازەرەی پشت کەوتم و تەماشای بازنگە نەفرەتەکەی دەستمم کرد، (شارلۆتان)یش بەسەر کورسییەکەیەوە گوتی:

-وەک دەبینیت جیهان لەگەڵ ئەم بازنگە سەلامەتترە، تەنانەت لەگەڵ هەڵچوونی شەڕانگێزی خۆیشیدا خەڵکی دەپارێزێت، یا شێخ تووڕەبوون مێشک دەشێوێنێت.

زمانی خۆم گەزی تا خۆم هێور بکەمەوە، لە تەماشاکردنی شەیتانەکەی بەرامبەریشم نەکەوتم، بەرەو لای جوولەکەکە ڕۆیشت، کە لەسەر چۆک دانیشتبوو، ترس تەواو بڕشتی لێ بڕیبوو، شارلۆتان بە دارەکەی دەستی سووک سووک دەیکێشا بەسەریدا و گوتی:

-خاکێکی ژێر زەوی لەناو بۆشایی ناو هەسارە خەڵکانێک تێیدا دەژین، ئەی جوولەکە وا پێدەچێت لێپرسینەوەت سەخت دەبێت، دەزانیت بوونەوەرەکانی ژێر زەوی هەمیشە شوێن میراتی گەلان دەکەون؟ لەشارستانییە کۆنەکاندا خاکی نەفرەتلێکراوە، تەنها درندە ئەفسانەییەکانی تێدا دەژێت، کەچی لەسەردەمی مۆدێرندا بنیادەمی تێدا دەژێت و دەفری فڕینیشیان هەیەو تەکنەلۆژیایان زۆر سەیرە، ئەی جوولەکە لەمەبەستم تێدەگەیت؟

کابرای جوولەکە بە حەسرەتەوە چاوی نووقاند، بیری لە چارەنووسی خۆی دەکردەوە بەدەست ئەو شەیتانە نەفرەتییە، شارلۆتان پێیگوت:

-بەدەر لە هەر هەموو ئەوانە، هەموو سەردەمەکان کۆکبوون لەگەیشتن بەو خاکە مەترسیدارە کە کارێکی مەحاڵبوو، هیدس.. لای یۆنانییەکان خاکی ژێر زەوییە، بوونەوەری ترسناک پاسی دەکەن، بەناوی (گۆرگۆن)ەکان و ماری هایدرا و (ئەرتیک)یش خاکی ژێر زەمینە، وەلێ دەبێت بە کۆمەڵێک تاقیکردنەوەی سەختدا تێپەڕیت تا پێی بگەیت، وەک تێپەڕبوون لەنێوان دوو چیادا کە بەریەک دەکەوتن، یا مەلە کردن لە دەریای خوێن، کە پڕە لە درندە، لەم سەردەمی مۆدێرنەش ئەو ترسناکییە بووەتە ڕاستی، وەک شاخی زەبەلاحی بەستەڵەک کە ڕێگرن لە ڕێڕەوی کەشتییەکان، ئەو زریانە خۆلاویەی فڕۆکە تێک و پێک دەشکێنێت.

-جوولەکەکە بەدوو دڵیەوە گوتی:

-بەڵام گەورەم ئەو خاکی ژێر زەمینە لەشارستانییە کۆنەکاندا زیاتر خاکێکە مردووانی بۆ دەڕوات و لەوێ دادگایی دەکرێن، وەک ئەم سەردەمەی ئێمە نییە، خاکێک بنیادەمی پێشکەوتوو تێیدا دەژێن.

شارلۆتان دارەکەی نایە سەر نێوچەوانی کابرای جوو، پێیگوت:

-ئەی جوولەکە ئەمە شتێکت وەبیر ناهێنێتەوە؟ بۆرگاتۆریۆمی ناو مەسیحییەت ، ئەو خاکەی هەموو کەسێکی گوناهکار لە دونیادا خۆی تیا پاک دەکاتەوە تا ببێتە کەسێکی چاک.

کە دیقەتی هەموویانم دا بە ڕوخساریانەوە گاڵتەجارپم بینی، کاتێک لەمانای بۆرگاتۆریۆم حاڵی بوون، شارلۆتان ڕووی لە کابرای جوولەکە کرد و گوتی:

-ئەی جوولەکە بەدەر لەو هەمووە پێمبڵێ، لای ئێوەی جوولەکە خاکی ژێر زەمین هەیە، کە لێپرسینەوە لەگوناهبارەکان بکات.

جوولەکەکە مەڵاشووی هیشک بوو، گوتی:

-بەڵێ گەورەم، پێیدەڵێین شێول، هەموو ڕوحی ئەو مردووە گوناهکارانەی بۆ دەڕوات، دواتر کە خودا دەیانێرێت، دەچنە جەهنا بۆ ئەشکەنجەدان.

شارلۆتان برۆکانی بەرزەوە کرد و لای لەمن کردەوە و گوتی:

-یاشێخ.. وشەی (جەهنا) هیچت بیر دێنێتەوە؟

بە ڕقەوە پێمگوت:

-بەڵێ.. دۆزەخم بیر دەخاتەوە، پەناگەی گوناهباران.

شارلۆتان گوتی:

-یاشیخ ئێوەش خاکی ژێر زەمینتان هەیە؟

دانم بەخۆمدا گرت و گوتم:

-بەڵێ.. وەلێ نە لەژێرەوەیە نەیش لەسەرەوە، ئەوێ ئەو دونیایەیە دوای مردن بنیادەمەکان لێپرسینەوەیان لەتەکا دەکرێت، ئەوەی بەهەشتییە بۆ بەهەشت و ئەوەشی دۆزەخییە بۆ دۆزەخ.

شارلۆتان سەری بادا، دیاربوو گرنگی بە قسەکەی دابم: گوتی:

-یاشێخ.. پێمبڵێ ڕات بەرامبەر قسەکانی جوولەکەکە چییە؟ لای ئێوەش خەڵکانێک هەن لە ژێر زەویدا بژێن؟

هەناسەیکم بۆ هەڵمژی چون ئەوەی قسەکانم ڕێکبخەم و گوتم:

-وابزانم یاجووج و ماجووج لەوێ دەژێن، قسەیەکی (کوڕی عەباس)مان هەیە دەڵێت زەوی حەوت پارچەیە، شەشی یاجووج و ماجووجە و پارچەیەکیشی ئەودوای خەڵکە، مەحاڵە ئەوەش وابێت، مەگەر ئەو شەش پارچەیە لە ژێر زەمین بن، ئەمڕۆ مرۆڤ هەموو گۆی زەوی بە گشت پارچەکانیەوە دۆزیوەتەوە.

شارلۆتان گوتی:

-ئەی ئەوە چییە جوولەکەکە دەیڵێت، گوایە ئەو خاکە دارستان و ڕووباری تیایە؟

پێمگوت:

-بەڵێ ئەوە دەبێت وابێت، فەرموودەیەکی پێغەمبەرمان هەیە دەڵێت: یاجووج و ماجووج ژنیان هەن، چۆنیشیان بوێت وا لەتەکیاندا جووت دەبن، کەسیان لێ نامرێت تا هەزار بە بانەوە وەچە نەنێنەوە. فەرموودەیەکی تری خەڵکی ناو ئاوەر هەن، لەنێو هەر هەزارێک لەوان یەک پیاو هەیەو ئەودوای یاجووج و ماجووجە، یانی هەزار جار لە بنیادەم زیاترن، ئەگەر ئێمە شەش بلیۆن بین، ئەوان شەش تریلۆنن، شەش تریلۆن لەکوێ دەژێن ئەگەر ناو بۆشایی زەوی نەبێت؟

شارلۆتان بە چاوێکی پرسیار ئامێزەوە لێی ڕوانیم و دواتر گوتی:

-باشە شێوەو ڕوخساری ئەو یاجووج و ماجووجە چۆنە؟ بوونەوەری تۆقێنەرن، یا درندەی ئەفسانەیین، یان چی؟

پێمگوت:

-ئەوانیش وەک ئێمە بنیادەمن و لە (ئادەم)ن، ڕێک لە منداڵەکانی (یافت)ی کوڕی (نوح)ن وەک لەفەرموودەیەکی پێغەمبەر هاتووە، ئەوەان درندە نین، وەک پێغەمبەر وەسپی کردوون، چاویان بچووکە و دەموچاویان پانەو سوورەن، وەلێ (زولقەرنەین) بەستێکی بەسەریانەوە درووست کردووە، دەرچوونیان بۆ ناو خەڵکی لێ یاساغ کردوون، قسەیەک گوایە یەکێک سەردانیانی کردبێت ئەوە ئەفسانەیە.

شارلۆتان گوێی وێنەدام و لای لە جوولەکەکە کردەوەو گوتی:

-ئەی جوولەکە.. لەمەڕ بابەتەکەتەوە ڕاستە ئەفسانیە، ئەو بنەما زانستییەی پشتت پێ بەستووە ڕاستە، بۆشایی ناو زەوی چاڵ نییە بوونەوەری ئەفسانەیی تیا بێت، بەڵکو ئەوە درێژەدانی ناوەوەی زەوییە، ئەوەشی دەچێتە ناوی هەست بەجیاوازییەکی گەورە ناکات، وا دەزانێت هەر وا بەسەر زەوییەوەیە، لەڕاستیدا لەناو ئەو بۆشاییە سەربەرەو خوار دەڕوات، هەست بەوە ناکات، چونکە کێشکردن هەر هەیە، ئەو خۆرەی دەیبینێت خۆر نییە، بەڵکو ئاگرە، ئەو وادەزانێت خۆرە، لەڕووی زانستیشەوە درووستە ئاو و دار و بنیادەمیشی تیا بێت، گشت ئەوانە جوانن و ڕێکن لەڕووی زانستەوە، وەلێ ئەی جوولەکە تۆ درۆزنیت.

جوولەکەکە داچڵەکی و ترس ئامبازی بوو، پاشەو پاش کشایەوە، شارلۆتان لێی نزیکەوە بوو، گوتی:

-کاکی جوولەکە.. تۆ دەڵێیت چیرۆکی تۆلاف و باوکی بۆ یەکەمجار لە جیهاندا بڵاوبووەوە، ئەوە لەکتێبێک بوو نووسەرەکەی ئاماژەی بەڕاستی چیرۆکەکە دابوو، ئەوەشی گێڕابووەوە کە چۆن تۆلاف لەناو کەشتییەکە دەستبەسەری دەکەن و دواتریش بۆ شێتخانەی دەگوێزنەوە، کە 28 ساڵی تیا بەسەر برد، کە دەرچوو بوو بەڕاوچی و بە ڕێکەوت لەتەک ئەو نووسەرە چاویان بەیەک دەکەوێت و چیرۆکەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش بە ناونیشانی ( خواوەندی دوکەڵ) وەک سەربردەیەکی ڕاستەقینە ڕوویدابێت،

نووسیەوە، تۆ دەتەوێت پێمان بڵێیت پشتت بە قسەی ئەو کابرایە بەستووە کە لەشێتخانە بەڵگەیەکی زانستییە.

کابرای جوو ئارەقە بەنیوچەوانیەوە هاتە خوارەوە، ترسیش ڕوخساری شێواند و گوتی:

-نا.. هەرگیز، بەڵام چیرۆکەکە لەگەڵ چیرۆکی ئەدمێراڵ بێرد لەیەکچوونیان هەیە.

شارلۆتان دارکەی بە زەویدا کێشا و بە زمانێکی تووڕەوە گوتی:

-لەوەشا درۆت لەسەر ئەدمێراڵ کرد، ئەو هیچ بیرەوەرییەکی خۆی بڵاو نەکردووەتەوە بەو شێوەی تۆ باست لێوە کردووە، درۆیەکی تریشت بەدەمیەوە هەڵبەست، ئەوەی ئەدمێراڵ باسی لێوە کردووە، قسەگەلێکی خواستراوە لەمەڕ جەمسەری باکوور، وەک ئەو خاکە نادیارەی تەواو بوونی بۆ نییە، چەندین دەربڕینی تر کە تۆ بە پێی خواستی خۆت بڵاوت کردەوە، کە خاکێکی شاراوەی لەناو بۆشایی زەمیدا دۆزیوەتەوە.

بەترسەوە کابرای جوولەکە گوتی:

-بم.. بمبوورە، ڕەنگە بابەتەکەم لێ تێکەڵاو بووبێت.

چاوەکانی شارلۆتان بەسام دەرکەوتن و گوتی:

-ئەی چی دەربارەی ئەو نەوە کەمئەندامانەی هزر دەڵێیت، کە باوەڕیان بە کتێبەکەت هێناو سواری مێشکی خۆیان بوون بۆ گەشتکردن بۆ دۆزینەوەی بۆشایی ژێر زەمین؟

جووەکە ئارەقەکەی نێو چەوانی سڕی و بە بزەخەنەیەکی تکاکارانەوە گوتی:

-گەورەم کێشە نییە، تۆ بۆ خۆت گوتت بۆشایی ناو زەوی ڕەنگە ڕاستییەکی زانستانە بێت، ئێدی چ خەتەرەناکییەک بەسەر هزری خەڵکیەوە هەیە، کە من وام مەزەندە کردووە ئەو گەشتە بۆ ناو بۆشایی زەمین وا بێت؟

شارلۆتان گوتی:

-خەتەرناکی لەوەدایە تۆ درۆزنیت و درۆش بڵاودەکەیتەوە، ئێمەش لەهەموو شتێک خۆش دەبین تەنها درۆ نەبێت.

شارلۆتان چەقەنەیەکی بۆ ڕووسییەکە لێدا، بەو ئاوایەی بیبات، کابرای ڕووسیش لەگرێ ملی جوولەکەکەی گرت و دایە پێش خۆی، جوولەکەکەش وەک گایەک بۆ کوشتارگا ببەن دەیبۆڕاند، شارلۆتان گوتی:

-ئەی جوولەکە ژیانی خۆت کردە قوربانی لەتووسینەوەی بۆشایی ژێر زەمین، کاتی ئەوە هاتووە بتبەین بۆ ناو ژێرزەمینی ڕاستەقینە، تا بەچاوی خۆت هەموو شتێک ببینیت، گۆڕێکمان بۆ ئامادە کردووی، هەر بەزیندوویی دەتنێژین، ڕەنگە لەوێ دۆستانێکی ئەو ئاگارتایە پێت شاد بنەوە.

بەدەر لەڕق و کینەم بەرامبەر بەو جوولەکەیەی ڕووسیەکە وەک بەرخ پەلکێشی سەر زەویەکەی کرد و ئەویش هاوارو باوکەڕۆی بوو، تا لەدەرگاکەش ئاودیوکرا، ما گوێ لەهاواری بگرین، تا هێدی هێدی هاوارەکەی وەک هاوارێکی خنکاو دەهات، چون ئەوەی لە گۆڕی بنێن، ئێدی بەتەواوی

دەنگی نەما. ترس ڕوخساری هەمووانی گرتەوە، (شارلۆتان)یش بە کەیفەوە دیقەتی دەداین و دواتر گوتی:

-ئاخۆ کێ دەبێتە حیکایەتخوانی سەربردەی داهاتوومان؟ لێگەڕێن ببینین. تەماشایەکی یەک بەیەکی کردین و دواتر دارەکەی بەرز کردەوەو سووک کێشای بەسەر ئەو لەڕو لاوازە بێئومیدەی ناویم نەدەزانی، ئەویش بە حەسرەتەوە چاوی نووقاند و خۆی بەسەر کورسییەکەوە ڕێکخست چون ئامادەباشییەک، ئەوجا دەستی بە گێڕانەوەی سەربردەی حەوتەم کرد...

7

# بەسەرهاتی گرگرتنی خود

## میکائیل هاریسۆن دەیگێڕێتەوە

(( خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن ، کە سووتەمەنییەکەی خەڵکی و بەردی گۆگردە، کە بۆ کافران ئامادەکراوە))

(سوورەتی بەقەرە ئایەتی 24)

قەلەڕەشێک بێ هودا دەنووکی لەزەوی دەگرت، کاتێک درکی بەنزیکبوونەوەی من کرد، بەترسەوە تەماشای کردم و بەرەو ئەو لای من ڕۆیشت، وەک ئەوەی لووتبەرزییەکەی بشارێتەوە، ئەی قەلەڕەش ئەگەر دەزانیت تۆ خۆمم بیر دەخەیتەوە! تاکە یەکەی ڕەشی نێو ڕەنگەکان، ئەوەی جیاوازییە بەم دواییە هەموو چاوەکان ئارەزووی قسەکانم دەکەن، کەچی سەرقاڵ نابم پێیان و بێ ئومێدانە دەنووک لەزەوی دەگرم، ئەی قەلەڕەش چەندین ساڵە بەناویانگم، بووم بە نووسەری ڕۆمانەکانم و سۆزیان بەدڵەکاندا دەبەخشی، مەحاڵە قەلەڕەش بیت و ناوبانگت هەبێت.

تەماشای ئەو خانووەی بەرامبەرم کرد، بیرم کەوتەوە بۆیە لێرەم تا چاوم بە هاوڕێیەکی لەمێژینەم بکەوێ، کە چەندین ساڵە نەمبینیوە، بەردەوام سەرقاڵی بابەتگەلێکی بچووکم و بابەتە گەورەکانم بیرناکەویتەوە، ڕەنگە ئەوەش هەڵاتن بێت لەبابەتە گەورەکان. لەگردبوونەوەیەکی دۆستانە مرۆڤ

بیر لەوە دەکاتەوە چۆن سەربردەی ژیانی خۆی بگێڕێتەوە، بەو شێوەیەی بڕوای پێبکەن، ئەوەی من بیرم لێ دەکردەوە، چۆن هەڵێم کاتێک ئەو دیدارە دوا بەدوای یەکەوەیە، ئەو پزیشکێکی بەساڵاچووە و تاقی تەنیایە، دووریش نییە بە هەلێکی بزانێت کە من نووسەرێکی ناودارم، بێشک بەسەرهاتی زۆریشم هەن.

خانوویەکی دوو قاتی لەدار دروستکراو، لەناوچەی کۆدرسبۆرت لە بەنسلڤانیا، بەڕاستی ناوچەیەکی ناوازەیە، سێ جار لەدەرگاکەمدا و چاوەڕێم کرد، دواتر پاڵم بەدەرگاکەوە نا، وەک چۆن لەتەلەفۆنەکەوە پێی ڕاگەیاندبووم، ئەو بەوای شکانی حەوزی سمتیەوە زۆر لەسەرخۆ دەجووڵایەوە.

لەناوەندی هۆڵەکە بەسەر دارشەقێکەوە وەستابوو، تەمەن سەرکەوتوو نەبوو بریقەی دووچاوە خۆڵەکەوەییەکەی بشارێتەوە، هەستم کرد بەزەییم پیا هاتەوە، د.ئێرڤینج نەشتەرگەرێکی یاخی. ئەو دانیشتنە شێتانەی قومارم لەتەک هاوڕێکانمان بیر کەوتەوە، گرفتەکە زیاتر پەیوەستە بە حاڵەتەکەوە وەک لەوەی بە کەسەکەوە بێت. بانگی لێکردم و گوتی:

-مۆریس.. هەی ڕێوی وا پێدەچێت سوورەتر بویتە، بە قژتەوە دیارە.

ئەو ناوە دەمێکە گوێم لێ نەبووە، ئاخر دوای ناوبانگ دەرکردنم ناوم بوو بە میکائیل و لەسەری ڕاهاتم، ئێرڤینج فەرمووی دانیشتنی لێکردم، پێدەچوو تاقی تەنیا بێت، ئاخر تۆز و خۆڵ بەبان هەموو شتەکانەوە بوو، تەماشای

دارشەقەکانیم کرد، بیرم لەوە دەکردەوە کێ ئاوێ شەریەتێ مێوەیەکمان بۆ دێنێت، ئاخر دانیشتەنەکەمان درێژەی هەبوو، دووریش نییە قسەکەی خۆی ببڕێت و داوام لێبکات لەساردکەرەوەکە بچم هەندێک شت بێنم، ما گوێ لە زۆر بڵێکەی بگرم، تا لەپڕا بەتووندی لەدەرگا درا.

کەسێک بە توندی پاڵی بەدەرگاکەوە نا چون ئەوەی هێرشمان بەسەرا بکات، بە دڵەڕاوکێوە ما دیقەت بدەم، گوێم لەئێرڤینج بوو لەدوامەوە بەخێرهاتنی کەسێکی کرد، تەماشای دەموچاوی هاتووەکەم کرد، پێدەچوو بیناسمەوە، چاوانی خەڵکی ناگۆڕدرێن، ئەو بزەخەنە ناشرینەش، ئای خودایە! ئەوە (جۆرج مووت)ە، بەسەرسوڕمانەوە سڵاوم لە جۆرج کرد، ئەو پیاوە زۆر نامۆ بوو، ڕوخساری بە ددانەکانیەوە دەتگوت بەردەوام بزەیەکی ناشرینی هەیە، تەنانەت لەتووڕەبوونیشدا، بە شەیتان ناوزەدیان دەکرد، وەلێ ئێمە دەمانزانی پیاوێکی دڵ نەرمە.

هەر بەڕاستی گردبوونەوەیەکی سەرکەوتوو بوو، قسەی زۆرمان کرد، جۆرج بەخۆی هەستاو بەرەو ساردکەرەوەکە ڕۆیشت و شووشەیەک مەی (شاردۆنیا)ی گرانبەهای هێنا، پایپەکەی خۆمم گردا، پرسیارێکم لێکردن، پەیوەست بێت بەشتێک، تا بینووسمەوە، لەپڕ گوتم:

-نووکە پێم بڵێن، لەگەڵ مردنا ڕاتان چییە؟ کەسێکتان ڕۆژێ لەڕۆژان لێی نزیکبووەتەوە.

له دانشتنێکی وادا پرسیارەکە سەیر بوو، ئەوانیشم بینی بێدەنگ بوون، دواتر د. ئێرڤینج گوتی:

-مۆریس.. من زۆرترین کەسێکم مردنم بە سەر جێوبانی نەخۆشخانەوە بینیوە، سییەکانم هەڵدەدڕین و دەستم تێ وەردەدا تا ئەو کەسە ڕزگار بکەم، ئەویش تەنها تەڵەموویەک لە مەردنەوە دووربوو، هەندێکیان لەو تاڵە مووەش دەستبەرداری ژیان نەدەبوون، هەندێکیشیان وایان لێدەکردم بێئومێد بم و دەست لەڕزگاربوونیان هەڵگرم.

جۆرج مووت قسەی کرد و گۆشەی بزەخەنەی ددانەکانی دەرکەوتن، نەتدەزانی بزەخەنەیەتی یا نا، گوتی:

-وەک دەزانن من کارمەندی ئاگرکوژێنەوەم، ئاگر ئەوەی هەموو خەڵکی لێی تۆقیوە، وەلێ من هەست بەسۆزی دەکەم، چون ئەوەی دەستەمۆم کردبێت، هەر وەک چۆن شێرێکی دڕندە دەستەمۆ دەکەیت و دواتریش کە ونبوو، حەز بەچاوپێکەوتنی دەکەیت، ئەگەر دوو هەفتە لەئاورەوە دوور بم، هەست بەخەمۆکی دەکەم، جاروباریش لەناو باخچەیماڵەوەم ئاگر دەکەمەوە، تا بۆن و بەرامەی ئاگرەکە هەڵمژم.

بە بیرێلاوی دیقەتمدا، چون ئەوەی لە ژێی هزرمی دابێت، ژێیەکی زۆر هەستیار، هەر کاتێکیش کەسێک لەو ژێیە دەدات، وێنەی ئەو کەسەی قسەم لەتەکا دەکات کاڵ دەبێتەوە، یا بڵێین خۆمی لێ دەدزمەوە، وەک ئەوەی هەر قسەم بۆ نەکات، جۆرج شانێکی پیا کێشام، تا ئاگاداربیمەوە،

پرسیارێکی دووبارە کردەوە وەک ئەوەی گوێم لێ نەبووبێت، دەستی برد و پاکەتێک دەنکە شقارتەی سەیری دەرهێنا و گوتی:

- ئا ئەمەیە، تاقی بکەرەوە، مۆریس ئەوە لەنهێنییەکانی هەسارەکەمانەوەیە، دەنکە شقارتەگەلێک داتگیرساند ئێدی ناکوژێتەوە، دەشتوانین سەد کەرەتیتریش دایگیرسێنیتەوە.

پاکەتەکەم لەدەستی وەرگرت و ما ئەمدیو و ئەودیوی بکەم، چون ئەوەی بمەوێ لێی حاڵی بم، دەنکە شقارتەیەکبوو لەژیانمدا چەندین شقارتەم بەکار هێناوە، وەک ئەوەم نەبینیوە، بەسەر پاکەتەکەشەوە نووسرابوو (Infernals) دەنکێکم لێ دەرهێنا و جوان سەحم کردەوە، دامگیرساند و سەیرم پیا هات، دارەکەی نەدەسووتا، وەک ئەوەی گوێ بە ئاگرەکە نەدات، کوژاندمەوەو هەڵمکردەوە، جارێکی تریش و جارێکی تریش، سەرم سوڕما، لەوەوە لەمانای نەمری حاڵی بووم، ئەو کە دەچێتە ئاگرەوە ڕانێت لەتەکیدا، جۆرج گوتی:

-ئەوە دوو پاکەتی کۆتان، ئەوەش لە کاری ڕێکخراوی بەرگری شارستانییە، بەڵام ئاشکرا نەکراوە، لە (جۆرجی مووت)ەوە بۆ تۆ دیاری بێت.

پاکەتێکیانی دایە دێرڤینج، کە بەخەنینەوەوە سەرقاڵی شتێکبوو، ما بە بیربڵاوی دیقەتیان بدەم.

* * *

ئاگر بەدەورمەوە بەربووەوە، بڵێسەی ئاور هەموو شتێکی لووش دەدا، منداڵێکبووم چەند مانگێکبوو بوویووم بە دەساڵ، بەدەم کشانەوە دیقەتی ئەو ترسەم دەدا ئەو دیمەنەی هەموو شتێکی لەژیانم گۆڕی، ئاگر بەدەم سەماکردنەوە سەرکەوتنی خۆی دەردەبڕی، دوای ئەوەی لەژوورێکی بچووک دەستبەسەری کردم، هەر کە ئاگرەکە شتێکی دەگرت خۆمم لێ دوور دەخستەوە، وەک ئەوەی شەیتان لەناو ئاگرەکەدا بێت، دووریش نەبوو خودی شەیتان بووبێت، خۆ ئەگەر هەلێکی بۆ بڕەخسێت ئەوا هەرچی بێتە بەردەمی لووشی دەدات، تەماشای لاشەی دایکمم کرد، کە ئاگرەکە بوونی کوێر کردبووەوە و لەجووڵەی خستبوو، دوایین قسەی کە بیستم، گوتی (مۆریس ئەگە...) دایکە بۆ تەواوی ناکەیت، قسەیەک بێت کە دەمرم بیری بکەم؟ چاوەکانی فرمێسکی گەرمیان دەردا، گەرمتر لەبڵێسەی ئاگرەکە، لەوەش تێر نەبوو، بە ژوورە ڕەنگاو ڕەنگەکەمدا بەرەو لام هێدی هێدی دەهات، دەیزانی ڕێگای دەربازبوونم لێ گیراوە.

تەنها پەنجەرەیەک کە بە پشتمەوەبوو، دایکم لەترسی دز و جەردە تەلبەندی کردبوو، دایکە من تێناگەم سوودی تەلبەند کردن چییە، کە ئێمە لەسەر سەرەوەی شوقەکان بین، پشتم لەپەنجەرەکەبوو، دیقەتی ئاگرەکەمدا، ژوورەکە وەک تەنووری لێهاتبوو، ئاگرەکەش وەک مار پیچی خواردبووەوە بۆ شاڵاوبردنم، هەر وەک ماریش دەیفیشکاند، هەستم کرد ئەو ئاگرەش

بوونەوەرێکی زیندووە و لەنێوماندا دەژێت و دەبیستێت و هەستیشمان پێ دەکات.

لەپشتمەوە گوێم لەدەنگێکبوو، لام لێ کردەوە، بینیم پیاوێک جلێکی ڕەشی لەبەرەو کڵاوێکی ئاسنی زەردیشی بەسەرەوەیە، هاواری لەشتێک دەکرد، بەوای بڵێسەی ئاگرەکە گوێم لە قسەکانی نەدەبوو، ما خەریکی تەلبەندەکە بێت، تا لەچوارچێوەکەیەوە دەریهێنا، ورەی ئومێدم بۆ گەڕایەوە، گوێم لەواژو وژی ئاگرەکەبوو بەدوامەوە، پیاوەکە دەستی بۆ درێژکردم و...

پژمیم، خۆم بەسەر جێوبانێکی فێنک بینییەوە، هەرچی جەستەم بوو لەترسا دەیزریکاند و دەلەرزی، ئەو دیمەنە هەر لەوساوە لەخەونمدا جیانەبووەتەوە، تەنانەت خەونەکانیشم وەک بنیادەم نەبوو، وەک مەسجێک وابوون، ما بیر لەو حاڵەتەم بکەمەوە، تەماشای پەرداخە ئاوەکەی تەنیشتیشم دەکرد، کە پاکەتێک شقارتەی بەتەنیشتەوەبوو، لێی نووسرابوو(Infernals) لەئاوەکەم خواردەوە بەو ئاوایەی دەروونم دامرکێنێتەوە، لەپاکەتە شقارتەکەشم دەڕوانی، دواتر ئەو دەنگەی ڕقم لێبوو، بە ئاگای هێنامەوە...

ئەو تەلیفۆنەی سووربوون دەنگەکەی بەو ناڕەحەتییە بێت، گوێبیستەکەیم لەدەست گرت و گوێم لەدوایین شتێکبوو کە بێت بە خەیاڵما.

دەنگی جۆرج مووت بوو، بە زمانێکی تۆقێنراو گوتی:

- مۆریس.. هەر بەپەلە وەرە بۆ کودرسپۆرت، (د. ئێرڤینج)ی هاوڕێمان سووتاوە، هیچی پێوە نەماوە.

❊ ❊ ❊

پێم لێ هەڵبڕی و بە غاردان کوڵانەکانی کودرسپۆرتم دەبڕی، تا دوێنێ د. ئێرڤینج ئەوەندە دڵخۆش بوو لەخەنینەوە نەدەکەوت، وا ئەمڕۆش سووتاوە، فریشتەی ڕوح کێشان تەنها بەسەر نەخۆش و خەمۆکییەکاندا ناگەڕێت، سەردانی ئەوانەش دەکات کە لەپێکەنین ناکەون، یا منداڵان، بەزەیی بەکەسا نایەتەوە، تا ئەوساش ئەو مۆتەکەی ئاورەم لێ نابێتەوە، ئەو مەسجەی پێمگەیشتبوو، خەمباری کردم، ئاخر دوای کەمێکیتر چاوم بەخانوویەکی سووتاو دەکەوێت، کە بۆ خۆم ئەو سووتانەم بینیوە، گەیشتمە خانووەکەی د. ئێرڤینج و بە سەرسوڕمانەوە لێی وێستام.

خانووەکە وەک خۆیەتی، پەنجەرەکانیش، هیچ ڕەشاییەک بەدیوارەکانەوە نە لەدەرەوە نەیش لەناوەوە نییە، بەدەر لەوەش زیاتر لەسەد کەس نێوەیان پیاوانی لێکۆڵینەوەو ئاگرکوژێنەوە و پۆلیسن و شریتێکیشیان بۆ بەربەست لە نزیکبوونەوەی خەڵکی داکوتیبوو، ئەوداوی خەڵکەکە دەرو دراوسێ و خەڵکانێک هەرگیز گەڕەکەکەیان چەندین سەدەیە شتی وایان بەخۆیانەوە نەبینیوە، (جۆرۆج مووت)م بینی لەخانووەکە هاتە دەرەوەو جلێکی ئاگرکوژێنەوەی لەبەردابوو، لەتەک کەسێک بە جیددی قسەی دەکرد، کێشەکە ئەوەیە دەم بە بزەخەنە بوو، ددانەکانی بەدەرەوە بوون، ئەو ڕوخسارەی ئاماژە بوو بۆ کێشەی زۆر، لەناخۆشترین کارەساتدا وەک شەیتان دەردەکەوت، هەر کە چاوی پێکەوتم، هاواری لێکردم، بە پاسەوانەکان

گوتبووی رێی پێبدەن بێتە ژوورەوە، بە دووچاوی پەشۆکاو و ددانە پێکەنیناوییەکەی گوتی:

-مۆریس بچۆرە سەرەوە، چاوەڕوانی شایەتحاڵیتن، ناتوانم دیمەنەکەت بۆ وەسپ بکەم، بۆ خۆت ببینە.

سەرکەوتمەسەرەوە بۆ نێو لێکۆڵەرەوەکان، بەوای کارەساتەکەوە دۆش دامابوون، لە ڕاڕەوەکەوە بەرەو گەرماوەکە بردمیان، لەوێ کات وێستا، بیستن وێستا، تەنها چاوەکانم لەدیقەتداندا بوون، هەستەوەرەکانم چون ئەوەی لەکار کەوتبن، ئەوەی بەرچاوم کەوت مەحاڵبوو...

هەرچی لەناو گەرماوەکەدا بوو وەک خۆی مابوو، هیچیان بەسەر نەهاتبوو، وەلێ شتێک لەناوەندی گەرماوەکە سەری پێ سوڕکردم، لاقی د. ئێرڤینج بە پێڵاوە بەهادارەکەیەوە، تەنها و تەنها هەر لاق، بەتەنیشت لاقەکەشەوە کۆمەڵێک خۆڵەمێش پێدەچوو پاشماوەی جەستەی بێت، دارشەقەکەشی بەسەر ئەو هەمووەدا کەوتبوو، هیچی بەسەر نەهاتبوو، نەسووتابوو، هەرچی هەبوو ئاگرەکە نەیسووتاندبوو، تەنها جەستەی (ئێرڤینج)ی لەناوبردبوو.

گوێم لەهەندێک قسەو باس بوو، پیاوێکی لەش پڕ و ترساو شایەتحاڵی خۆی بەترسەوە دەربڕی و گوتی:

-گەورەم.. من کرێکاری کۆمپانیای گازم، هەموو مانگێک بۆ خوێندنەوەی پێوەری گازەکە بۆ ئێرە دێم، د.ئێرڤینج کلیلی دەرگای ژێرزەمینەکەی ناو باخچەکەی پێدلوم، تا ماندووی نەکەم و بۆ خۆم بچمە خوارەوەو پێوەرەکان

بخوێنمەوەو بینووسم، ئاخر بۆ ئەو ماوەیەکی دەوێت یاپشە یاپشە بێت و دەرگاکەم بۆ بکاتەوە، ئەم بەیانییە چوومە خوارەوە بۆ ژێر زەمینەکە، وەک چۆن هەموو مانگێک ئەوەم دەکرد، بەڵام چاوم بە کۆمەڵێک خۆڵەمێش کەوت، بۆنی سووتاویان دەهات، نازانم چۆن بوو سەرم بەرزکردەوە نەوەک بنمیچەکە گڕی گرتبێت، سەیرم بەو دیمەنە هات، کە بینیم بنمیچەکە کونە، دیاربوو لەسەرەوە ئەو خۆڵەمێشە کەوتبێتە خوارەوە، هاوارم لە د. ئیرڤینج کرد، دەنگ هەر نەبوو، ناچار سەرکەوتمە سەرەوە، بینیم کونەکە لە زەوی گەرماوەکەوەیە، ئەو کۆمەڵە خۆڵەمێشەش لاشەی د. ئێرڤینج بوو.

تەماشای تەنیشتی خۆڵەمێشەکەم کرد، کە لەگەرماوەکەدا بوو، چاڵێکی لاکێشەیی، سەرەتا درکم پێنەکرد، بۆنێکی زۆر ناخۆشیش ئەو ناوەی گرتبووەوە، چون بۆن و بەرامەی نەفرەتی بێت، ئەوەی بەلامەوە زۆر سەیر بوو، هەموو شتێکی ناو گەرماوەکە وەک خۆی وابوو، تەنانەت زەوییەکەش، وەک ئەوەی ستوونێکی دۆزەخ لەخوارەوەی زەوی هاتبێتە دەرەوەو (ئێرڤینج)ی لووش کردبێت، لەپشتمەوە گوێم لەدەنگی جۆرج بوو، قسەی بۆ کەسێک دەکرد:

-بەڕێز لێکۆڵەر.. ئەوە حاڵەتێکی خود سووتانە، لەو حاڵەتانەمان زۆر بیستووە، جەستە بێ هیچ کارێگەری دەرەکی بۆ خۆی دەسووتێت، بێ ئەوەی هیچ شتێکی دەوروبەری خۆیشی بسووتێنێت، وەک نەفرەتییەک بێت

لەخوداوە، مێژوو سەدان حاڵەتی وای تۆمار کردووە، خەڵکیش دڵنیابوون خودی خۆیان سووتابوون.

کەگوێم لەو قسانەبوو، دەستبەجێ هزریشم ئەو زاراوەیەی بیر هاتەوە، خود سووتان (Spontaneous human combustion) لە ڕابردوو لەو بارەوە زۆرم خوێندبووەوە، پێناچێت کەس بەو کێشەیە گەیشتبێت، لێی حاڵی بووبێت، پیاوە لەش پڕەکە تفەکەی قووت داو نەخشەی خاچێکی بەسەر سنگی خۆیەوە نەخشاند، هەر ئەو ئەوەی نەکرد، لێکۆڵەرەوەکەیش ئەو خاچەی بەسەر سنگی خۆیەوە درووستکرد، ما تەماشای ددانە زەردەخەنەکەی جۆرج بدەم، تا لێکۆڵەرەوەکە لای لێ کردمەوەو گوتی:

- شایەتحاڵییەکەی تۆ چییە؟

*　　　　*　　　　*

بە سەیرو سەمەرییەکەی ئەو حاڵەتە سەرقاڵی کۆچی ئێرڤینج بووین، تووشی شۆک بووبووین، ئەو پیاوە دڵنەرمە، کە هەر هەموومانی کۆ دەکردوە، هەر بە خەمبارییەوە لەتەک جۆرج ئەوێمان جێهێشت، پێمگوت:

-هەبێ و نەبێت ئێرڤینج پایپەکەی نەکوژاندبێتەوەو بیری ڕۆیشتبێت، ئەو بەردەوام خەیاڵ دەیبردەوە، چەندینجار بینیومانە کراسەکەی بەوای پایپەکەیەوە کون کون بووە.

جۆرج کڵاوزرێکەی سەری داکەند و گوتی:

-مۆریس.. پاپیەکەیمان لەژووری نووستن دۆزییەوە، تەنانەت تووتنیشی تیا نەبوو، دواتر پیاوەکە لەگەرماوەکە سووتاوە.

عەقڵم هەر باوەڕی نەدەکرد لەخۆیەوە سووتابێت، گوتم:

-ڕەنگە شاردۆنییەی زۆر خواردبێتەوە، دەگێڕنەوە ئەوانەی ژیانیان هەر بەخواردنەوەی (فیتکدس) بردووەتە سەر ئەوا ئاور کەوتنەوە لەناو سکیاندا سووتانیان ئاسان دەکات.

جۆرج هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

-قسەی هیچ، ئەگەر پارچە گۆشتێک لە مەی هەڵبکێشیت و ئاگری بدەیت، هەر ناسووتێت، شرۆڤەی زۆر نزیک بە پێی دکتۆرەکان ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە، ئەوا لەشیان بڕێکی زۆر تەنی (کیتۆن) دەردەدات، کە لەشێوەی ئەسیتۆن لەڕێی میزکردنەوە دەردەچێت، تەنانەت هەناسەشیان بۆنی ئەسیتۆنی لێ دێت، ئەویش گازێکە زۆر زوو دەسووتێت، بەڵام ئێرڤینج نەخۆشی شەکرەشی نەبوو، لەناو گەرماوەکەش وەک بینیت هیچ سەرچاوەیەک نەبوو بۆ سووتان، سەدان حاڵەتی سووتانی خود کە مێژوو دەیگێڕێتەوە نەخۆشی شەکرەیان نەبووە.

تەماشای زەوییەکەم کرد، ئاخر ئەو دیمەنە کاری تێکردبووم، ئەو ئاگرە، ئەو بوونەوەرە ڕقاوییەی لەتەکمانا دەژێت، بێ هیچ شرۆڤەیەک خەڵکی دەخوات، ئەو پشکۆیەم بینی پێی (ئێرڤینج)ی دەخوارد، پێدەچێت ئەم جۆرە سووتانە بەئازارتر بێت چونکە وردە وردە دەسووتێ، ڕوحیش لەسەرخۆ بە ئازارەوە

دێته دەرەوە، ئاگرەکەش بە ئارەزووەوە دەمی تێدەژەنێ، ئەوە چ نەفرەتییەکە، شتێکم بیر هاتەوە ، لەپڕ گوتم:

-جۆرج بیرت لەوە نەکردووەتەوە خۆکوژی بێت، دەیان حاڵەتی قوربانی خۆکوژی بە ئاگر کراوە.

جۆرج گوتی:

-ئەگەر بەدبەخت خۆی سووتاندبێت، ئەوا ئاگرەکە هەموو چواردەوری دەسووتاند، ئەوەی لێرە ڕوویداوە، تەنها خۆی سووتاوەو دەوروبەرەکەشی هیچ زیانێکی پێنەگەیشتووە، تەنها هەر خۆی فەنا بووە، چون ئەوەی هەر نەبووبێت.

هەموو ناخم گڕی گرت، زمانم لەخۆم بڕی قسەی تیا بکەم، بە بێدەنگی خواحافیزیم لە جۆرج کرد، بەرەو ماڵەوە بە پیادە گەڕامەوە.

* * *

پایزێکی دڵتەنگ، گەڵادارەکان بەسەر ڕێگا قیرتاوەکەوە وەریون، بەمبەرو ئەوبەری ڕێگاکەوە دارگەلێکی ڕووتەن هەر وەک ڕوحی من چون ئەوەی لەسەوزایی کەوتبێت، لەوشوێنە نزیکبوومەوە، شەلاڵی ئارەقە ببووم، هیچ هۆکارێک نییە بۆ ئەو ئارەقەیەم، تەنها یەک لافیتە بەسەر ڕێگاکەوە چون ئەوەی کەس گوێی پێنەدابێت، لەسەری نووسرابوو (Purdis Farm) کێڵگەی پۆردیس، ناوەکە کاڵەوە ببوو، هەر ئەوەش مانای ئەوەبوو کەس گوێی بەو کێڵگەیە نەداوە، جەستەم تا دەهات گەرم دەبوو.

نزرگە لەخەوی کردم و بەئاگا هاتمەوە، نێوچەوانم بەدڵۆپەی ئارەقەوە ئاونگی گرتبوو، بەترسەوە سۆسەی جەستەی خۆمم کرد، وەک تەنوور دەسووتام، نازانم چۆن بوو تەماشای بەفرەکەی دەرەوەم کرد، تۆ بڵێی نەخۆش بم؟ یا ئەمە...

زۆر بە زەحمەت بیرم دەکردەوە، ئەم خود سووتانە نەفرەتییە وەک مێردەزمە سواری کۆڵم بووە، تا دوودڵی کردم، لەڕاستیدا ئەگەر (تشارلز دیکنز) نەبوایە کەس گوێی لەم خود سووتانە نەدەبوو، ئەوبوو لە رۆمانەکەیدا (ماڵێکی دڵتەنگ) گوتبووی بەڕێز (کرۆک)ی بازرگانی سەرمەست تووشی خود سووتان بووە، دیکنز ئەو حاڵەتەی بە هەقیقەتێکی زانستی چواندبوو، خەڵکانێک هەن بێ هیچ هۆکارێک دەسووتێن، ئاگر تەنها جەستەیان دەخوات، بێ ئەوەی دەورووبەرەکەی هیچ زیانێکی پێبگات، چون ئەوەی لەخواوە بێت، ئەو مشتومڕە ئەوەندەی تر ناوبانگی دەرکرد، ما مێشکم بۆ ئەو دیمەنە بڕوات، کە لەخەونمدا بینیم، ئەوە چ کێڵگەیەکبوو کە بینیم، پێوەی سەرقاڵ بووم تا خەو بردمیەوە.

پایزێکی سیسەوەبوو، هەر وەک ڕوحی سیسەوەبووم، ڕێگایەکی تەنگەبەر و دارستان و تابلۆی کێڵگەیەک، زۆر بەوریاییەوە دەڕۆیشتم، تام لێ هات، ئەویش بەرەو سیسەوەبوون دەچوو، لەتاو ئازارا وێستام، ئازارێکی ڕاستەقینە بەوای جەستەمەوە، نزیکبوونەوە لەکێڵگەکە (تا)کەی زیاتر کردم، پشتیشم

ئازاری پیا هات، چون ئەوەی ئاوری سەندبێت، لەتاو ئازار وێستام و داچەمیمەوە، بەسەر ئەژنۆکانمدا کەوتم، هاوارم کرد.

هەر هەمان جێوبان و بنمیچ و نزرگە، وەلێ ئەمجارە ئازارێکی زۆر بە پشتمەوە وەک ئەوەی کەسێک پێستی پشتم داماڵێت، لەجێوبانەکە بەرزەوە بووم، دەستم بە هاتوچۆ کرد، لەرز دایگرتم، خۆم بۆ ڕانەدەگیرا، بەرامبەر ئاوێنەکە وێستام، ئەو دەموچاوە دڵتەنگەی هەمبوو زیاتر ئارەقەی پێکردم، پشتم لەئاوێنەکە کرد و دوگمەکانی کراسەکەم کردنەوە، تەماشای پشتی خۆمم کرد، ترس دایگرتم، ئەوەی بینیم مەحاڵە ڕاستی بێت.

وەک پشتێنێکی ئەستووری سوور بەناوشانمەوە بوو، پشتێنێک لەپێستی گرگرتوو، ترس بەتەواوی دایگرتم، چاوەکانم بەتەواوی لەو ڕاستییە حاڵیان کردم.

* * *

بەبان سەرمەوە ڕووناکی مانگەشەوەکە سەرتۆپی دارەکانی ڕووناک کردبووەوە، گەڵا وشکەوەبووە وەریوەکان بە ژێر پێوە قرچە قرچیان دەهات، سەریانی خانووگەلێک لەدوورەوە دەرکەوت چون ئەوەی ئاوایی بێت، بۆ ناسینی شوێنەکە ئاوڕێکم لەدووی خۆم دایەوە، بینیم ڕێگایەکی تەنگەبەر و دارستانێک و لافیتەی کێڵگەیەک، لام لەلای خانووەکان کردەوە بەو ئاوایەی لەشتێک حاڵی بم، ئەوەتا چوومەتە پانتایی کێڵگەکە، بلەز کەوتمە ڕۆیشتن، کۆمەڵێک جوتیار کۆ ببوونەوە، بەوای (با)کەوە دەنگەکەیان دەگەیشتە لام،

زیاتر چوومە پێشەوە، گوێم بۆ هەڵخستن، دەنگەکەیان (بەڕێز گرانهام وڵاخەکان بەدەست شەیتانەوە شێتتر بوونە).

لەناوەندیاندا وێستام و ما لەڕوانینی ئەوان بڕوانم، ئەو قسانەی دەیانگوت ڕوونتر بوون ( وڵاخەکانی بەڕێز گرانهام شێت و هار بوونە) گوێم لەبۆڕەبۆڕی وڵاخەکان بوو، چاوم گێڕا، بینیم وڵاخێکی زۆر ڕایان دەکرد و بە دەور خۆیانەوە دەسووڕانەوە، شتێکی سەیر بوو، هەرچی سەوزایی بوو وێرانیان کرد، چون ئەوەی شەیتان دەستی لێ وەشاندبن، جوتیارەکانیش قسە و باسەکانیان ئاسایی نەبوو، بۆ یەکەمجارمە تێبینی جل و بەرگەکانیانم کرد، دەتگوت پۆشاکی سەردەمێکی زۆر کۆنە، تەنانەت بیرکردنەوەکانیشیان هی ئەم سەردەمە نەبوون.

ئەو پیاوەی ناوی (گرانهام)بوو بە داماوییەوە دەستی نابووە سەر پەرژینی کێڵگەکەی، جوتیارەکانیش بەدەم ناوهێنانی شەیتانەوە ناولەپی دەستیان بەیەکا دەکێشا، لەپڕ وڵاخەکان کەوتنە بۆڕاندن و بەسەر پشتا کەوتن، هێدی هێدی بۆڕاندنەکانیان کزتر دەبوو، دەست و پێشیان بەحەواوە لەقەفرکێیان بوو، تا بەتەواوی لەجووڵەو هاوار کەوتن و ڕوحیان دەرچوو، ئەو هەموو وڵاخە لە ساتێکدا هەر هەمووی مردن.

ئەوە چ خەونێکی نەفرەتییە؟! لەنێوان ژاوە ژاوی خەڵکەکەو حەسرەتی بەڕێز گرانهام دا پیاوێک دەرکەوت، پێدەچوو لەچاوانی خەڵکەکەوە سامی هەبێت، پاڵتۆیەکی درێژی لەبەردا، ڕوخساری لای منەوە ڕوون نەبوو، هەر هەموو

بێدەنگ بوون، تا گوێی لێ بگرن، پێدەچوو قسەکانی شرۆڤەی هەموو شتێکی تیا بێت، بەر لەوەی دەست بە قسان بکات، هەموو وێنەکان کاڵ بوونەوە، وێنەیەکی تر دەرکەوت، برێ ئافرەت گەمەیان دەکرد، ئەو خەونە ڕێک نەبوو، خەونەکانم بە پچڕ پچڕی دەڕسکان، ئافرەتێکبوو، ڕوخسارێکی ڕەنگ زەرد و چاوەکانیشی کل کرابوون، بە دەستەخووشکانی گوت:

-وریابن ئاگرەکە گوێی لێتانە، نەکەن هەموو قسەیەک بکەن، ئاگر هیچی لەبیر ناچێت.

کۆکەیەکی توند لەخەونەکە بێداری کردمەوە، ئازاری پشتم هەموو جەستەمی گڕ دابوو، لەپەنجەرەکەوە بەرەبەیان ڕووناکی خۆی دەبەشاندەوە، هەستام و دەم و چاوم شوشت، کەمێک گوڕم بەخۆمدا، لەماڵەوە دەرچووم، ڕێک.. ئەو هەرزەکارەی ڕۆژنامەکانی بەماڵان دەگەیاند، بەبان پاسکیلەکەیەوەبوو، ئەوەش کارێکی تەوەزوڵانەیە، کە پارە دەدیت تا ڕۆژنامەکانت بۆ تووڕ بداتە بەر دەرگا، ڕۆژنامەکەم هەڵگرت، هەواڵی سووتانی د. ئێرڤینج لەمانشێتی لاپەڕەی یەکەم بڵاو کرابووەوە، ئەو لاپەڕەی یەکەمە هەواڵی زۆر سەیری تیا بڵاو دەکەنەوە، تا زۆرترین فرۆشتنی هەبێت، خەریکی خوێندنەوەی بووم:

( لەنێو دوکەڵێکی بۆن ناخۆشدا، پزیشکی نەشتەرگەری بووبوو بە کۆمەڵێک خۆڵەمێش، خەڵکی بەقسەو باسێکی زۆر سەرقاڵ کردبوو، چون ئەوەی مەتەڵ بێت و خەڵکی هەولێ ئەوە بدەن هەڵیبێنن، هیچ سەرچاوەیەکی ئاگر نەبینراوە، لێکۆڵەر گۆرنێل وای شرۆڤە کردبوو، تەنانەت قوربانییەکە لە

گیرفانی ڕۆبەکەی پاکتێک شقارتەی پێبووە، ئاوری پێنەگەیشتووە، ئەمە مەتەڵەکەی ئاڵۆز کردبوو).

نیگایەکم لە خانووەکەم بڕی، شتێک بە خەیاڵما هات و بۆی دەرپەڕیم، چوومە ژوورەکەم لە نهۆمی دووەم و ئەو پاکەتە شقارتەیەم بینی، ئەوی لەسەری نووسرابوو (ئەنفێراڵ)، پاکەتەکەم لەدەست گرت و ئەمدیو و ئەودیوم کرد، بەدەر لەو هزرەی هەمە و باوەڕم بە قسەی پڕوپووچ نییە، بێ دوودڵی پاکەتە شقارتەکەم لە پەنجەرەکەوە تووڕدایە ناو تەنەگەی خۆڵەکەی خوارەوە، هەندێ بیرۆکەی نابەجێم بۆ هات، بەو ئاوایەی ئەو پاکەتە شقارتەیە جارێکی تر دەگەڕێتەوە، وەلێ گاڵتەم بە عەقڵی خۆم هات، پەنجەرەکەم داخست، وەک ئەوەی مێشکم لەوە زیاتر نەباتە بای خەیاڵ.

*　　　　　*　　　　　*

کتێبخانەی گشتی کۆدرسپۆرت، بینایەکی سادەی چون خانوویەکی گەورەی یەک نهۆمی، لەبەشی جوگرافیا بەدووی کێڵگەیەک بەناوی (بۆردیس)ەوە دەگەڕام، دوور نییە لەکتێبێکدا نووسرابێت، ماوەیەکی زۆر بەنێو کتێبەکاندا گەڕام، ئەوەی پاڵی پێوەدەنام باوەڕ بەو نامانەی کە لەخەوندامدا دەرسکا، هەڵبەت شتێک لەو کێڵگەیە هەیە، شتێکی کارەساتبار، پێویستە وریای بکەمەوە، یا بەدەمیەوە بچم، لەنێو لاپەڕەی کتێبێک دۆزیمەوە: کێڵگەی بۆردیس لە شارۆچکەی (ئەپسۆیتش) لە ئینگلتەرا، ئەو پرسیارەی مێشکی

هەراسان کردبووم، بۆچی شتگەلێک لەشوێنێکدا و لەوبەری تۆقیانووسەوە دەبینم.
بەرەو ژووری کۆمپیوتەرەکە ڕۆیشتم، شاشەی ڕەشی کۆمپیوتەرەکە هەندێ هێڵی کاڵی سپی بەسەرەوەبوو، گریمان ئەم کۆمپیوتەرە لەدۆسێی کتێبخانەکەی تێدایە، بیرت بێت ئێمە لە هەشتاکاندابین، هیچمان دەربارەی شتێک نەزانیوە پێی دەگوترێت ئەنتەرنێت، چەند پیتێک بەسەر شاشەکەوە، ناوی ئەبۆیتش بەسەر شاشەکەوە دەرکەوت، وشەی (بۆردیس) لەتەنیشتەوەبوو، دەستم بەدوگمەی کارا کردن هێنا و چاوەڕوان بووم.
بابەتگەلێکم دۆزیەوە، بەنیویدا گەڕام و بێئومێدی دایگرتم، ئاخر بابەتەکان پڕوپووچەو گیرۆدەی بوومە، ناچار بەدووی (گرانهام)دا گەڕام، لەوەش تەنها یەک بابەتم دۆزیەوە، وەلێ وێنەی زۆری بەسەرەوە بوو، ئارەقەی نائومێدی نیوچەوانم سڕییەوە، ئەوەی باسی لێوە دەکات، دەریدەخات خەونەکانم شتێکی جودان، شتێک زۆر وردتر لەدۆسێکانی ئەم کتێبخانەیە.
نووسەری بابەتەکە دەڵێت:
( بەڕێز کرانهام خەڵکی ئاواییەکەی کۆ کردەوەو ڕاوێژی پێکردن، یەکێکیان قسەیەکی زۆر ژیرانەی کرد.. هیچ دەردێک بەسەر ئەم خاکەوە نییە وا لەوڵاخەکان بکات، بەڵکو ئەوە کەسێکی ناحەز بەخۆتە و کێشەت بۆ دەنێتەوە، سیحری خۆی بەسەر وڵاخەکاندا کردووە و هەر هەمووشی کوشتن، تەنها یەک ڕێگاش هەیە بۆ ئەوەی بزانیت ئەو جادووکەرە کێیە، یەک لەو

وڵاخانە بێنیت کە زیندووە و ئاگری تێبەربدەیت، ئەودەم کەسە جادووکەرەکەت بۆ دەردەکەوێت، ئەگەر دەریش نەکەوت، ئەوا بەر لەوەی خۆر هەڵبێت، لەهەرشوێنێک بێت بۆ خۆی دەسووتێت)

قسەکان بەزمانی کۆن نووسرابوون، چونکە کارەساتەکە لە شەستەکان ڕوویدابوو، پێدەچێت کارەساتێکی گەورە بووبێت بۆیە ناوبانگی دەرکردبوو، ئەودوای قسە نووسراوەکەم تەواو کرد و...

( خەڵکی ئاوایییەکە چوارپەلی مانگایەکیان بەستەوە، باوەڕیان وابوو کە سیحری لێکراوە، بەڵام هێشتا ڕوحی تیا مابوو، ئاگرێکی گەورەیان کردەوەو مانگاکەیان هەر بەزیندوویەتی تێ هاویشت، بۆڕە بۆڕی ئەو ناوەی هەڵگرت، هیچ نیشانەیەک لەنێو ئاپۆرای خەڵکەکە دەرنەکەوت، وەلێ ئەو شەوە شتێک ڕوویدا، نەمانزانیبوو کە شتی وا لەهیچ شوێنێکدا ڕوویدابێت).

بەسەر شاشەکەوە نیشانەیەیەک هەڵبوو، بۆ ئەوەی دەست بەدوگمەی کاراکردنی بنێم، منیش دەستبەجێ پەنجەم بە دوگمەکەوە نا، گواستمیەوە لاپەڕەیەکی تر و بەم شێوەیە لێی نووسرابوو.

(گریس.. ئافرەتێکی تەمەن شەست ساڵێک دەبێت، لە (ئیپسویتش) دەژیا، خۆی و کچەکەی بە بۆنەی هاتنەوەی کچی دووەمی لە (جەبەل تاریق) ئاهەنگیان گێڕا، تەواوی ڕۆژەکەیان بە خواردن و خواردنەوە و خۆشی بردەسەر، دواتر بەوای ماندووبوونیانەوە نووستن، تەنها گریس ئەو شەوە لەجێوبانەکەی هەستاو بە شەمێک بە قادرمەکەدا هاتە خوارەوە، کراسێکی

تەنكی نووستنی لەبەردابوو، بەرامبەر بە ئاگردانەكە وەستا، ئاگری تیا نەكرابووەوە.

ڕۆژی دواتر كچەكەی هاتە خوارەوە، دیمەنێكی زۆر ترسناكی بینی، چون ئەوەی پاشماوەی دایكی بێت و لەتەنیشت ئاگردانەكە ببوو بە زوغاڵ، ئاگر هێشتا بە زوغاڵەكەدا بریسكەی دەدا، بەڵام بڵێسەی نەبوو، هەر زوو كچە دوو دۆلكە ئاوی بەسەر لاشەكەدا كرد، دووكەڵێكی چڕی بۆن ناخۆشی لێوە بەرزەوە بوو، دیمەنەكە تۆقێنەر بوو، هەموو شتێك لەدایكیدا سووتابوو، تەنها هەردوو دەست و قاچی نەبێت.

ئاگردانەكە ئاگری تیا نەبوو، مۆمەكەیش كوژابووەو دوور لەلاشە سووتاوەكە كەوتبوو، ئەو شتانەی دەوروبەری لەفەرش و كاغز تەنانەت داری زەویەكەشی هیچی بەسەر نەهاتبوو، تەنانەت نەڕووشابوو، قسە كەوتە ناو ئاواییەكە، خەڵكەكە لەلایماڵی گریس كۆبوونەوە، هەر ئەو ڕۆژەبوو كە مانگاكەیان تیا سووتاند، بینیان گریس سووتاوە، تەنها دەست و پێیەكانی مابوونەوە، مانگاكەش هەروەها تەنها هەر چوارپەلەكەی مابووەوە.

بەناوبانگترین خودسووتانبوو، لەبەر ئەوەی خەڵكی بەدەردەكەو دەواكەیان زانی، دەردەكە سیحربوو، دەواكەش سووتاندنی ئەو شتەی سیحری لێكرابوو، ئەودەم دەتوانیت خۆت و خۆشەویستەكانت بپارێزیت و...).

لەجێی خۆم خۆمم تەكاند، خەونەكان، خودسووتان، ئیپسۆیتش، جادووگەر، شتگەلێكی زۆر، لەهزرمدا وەك شریتێك دەهاتن و دەچوون، جۆرج مووت،

بەرگری شارستانی، مۆریس.. ئەوانە لە نهێنییەکانی گەردوونمانن، شقارتەگەلێک هەرگیز ناکوژێنەوە، ئینفیراڵ، گیرفانی ئێرڤینج شقارتەی تێدا بوو، نەسووتابوو، ئەو بلێسەیەی پشتی گرتمەوە، دواپین دوو دەنکە شقارتە، ئەو دەنکە شقارتانە نەسووتان...

وەلێ.. سووتێنەرن.

بەپەلە بەنێو سەردانیکەرانی کتێبخانەکەدا ڕۆیشتم، کە سەرسام بوون بەو گێلەی بێدەنگییەکەی شڵەقاند، لەبیناکە دەرچووم، هەنگاوەکانم پەلەتر کردن، چون ئەوەی هەڵیم، ئەو پاکەتە شقارتەیە بێ گوناه نییە، ئەو شتە لەسیحری ڕەشەوەیە، تەنها دەرد و دەوا شرۆڤەیە، دەردەکە سیحرەو دەواکەش سووتاندنی سیحرلێکراوە، بەنەفرەت بێت، پاکەتەکەم توورِ دایە ناو تەنەکەی خۆڵەکە.

وەک ئەوەی شتێک پێوەی دابم غارم دەدا، تا بە سندوقی خۆڵەکە گەیشتم، لەوێ نۆش دامام و دەستم بەسەرمەوە گرت، سندوقەکەیان بەتاڵ کردبوو، ما بەملاو ئەولادا ڕاکەم، قەد بە بیرم نەدەهات ڕۆژێک بێت بەدوای ئۆتۆمبێلی خۆڵەکەدا بگەڕێم.

تا لەبەردەم بینایەک بینیمەوە، خەریکی بەتاڵ کردنی سندوقی خۆڵەکە بوون، چاوم بەچاوی شۆفێرەکە کەوت، کابرا ترس دایگرت، بینیمی وەک کەسێکی مارانگەز بۆ لای غارم دەدا، ما وەک شێت کیسەکان سەح بکەمەوە، ئەو ناوەم لەوتاند، ئەوانیش باڵیان گرتم و دەیانوویست دوورم بخەنەوە، هاواریان

بەسەرما دەکرد، وەلێ گوێم لێیان نەبوو، گرنگیم وێنەدان، کیسەیەکم بەدەستەوە بوو، کە ڕایانکێشام بەسەر پشتا کەوتم، تێروپڕیان کوتیم، دژوێن نەما پێمی نەدەن، وەلێ بە ئاواتی خۆم گەیشتم، دەستم لەناو کیسەکە وەردا، پاکەتە شقارتەکەم دەرهێنا.

لەماڵەوە ئاگردانەکەم گڕدا، پاکەتە شقارتەکەم تووڕ دایە ناوی، ما دیقەتی بدەم، دیقەتی ئەو پیتانەش کە دەدرەوشانەوە (Infernals) وەک خۆیان مابوون، چەند خوولەکێک بەدیاریەوە بووم، ئەو پاکەتە گڕی نەدەگرت، ئاگرەکەم کوژاندەوە، پاکەتەکەم دەرهێنا، هیچی بەسەر نەهاتبوو.

* * *

لەسەرخۆ لام لەخاڵێکی ناو ئاشپەزخانەکە کردەوە، چاوم بە مایکرۆڤەکە کەوت، بەخۆمم گوت ئەگەر ئەم شتە ئاگر نایسووتێنێت، ئەوا ڕەنگە شەپۆڵەکانی تیشکی مایکرۆڤەکە بیسووتێنێت، پاکەتە شقارتەکەم هاویشتە ناو مایکرۆڤەکەو پەنجەم نایە سەر دوگمەی ئیشکردنی، مایکرۆڤەکە ڕووناک بووەوە، پاکەتەکەش لەناوەڕاستیدا دەخوولایەوە، ئەوجا چرقە چرقێکی لێوە بەرز بووەوە، بریسکەی زەردباوی لێ پەیدابوو، کشامەوە نەوەک بتەقێتەوە، قرچە قرچەکەی زیاتر بوو، دەتگوت برێشکەیە، بریسکەکەش زیاتر بوو، لەدوورەوە دیقەتم دەدا، ماوەی مایکرۆڤۆنەکە تەواو بوو، کوژایەوە، لێی نزیکەوەبووم، تەماشای ناو مایکرۆکەم کرد، دووکەڵێکی شین و بۆنێکی زۆر

ناخۆشی هەبوو، دەرگای مایکرۆنەکەم کردەوە، پاکەتەکە ببو بە سووتوو، بە ماشەیەک گرتم و هاویشتمە ناو ئاگردانەکە.

ئاگرەکە زەرد زەرد هەڵگەڕا، بڵێسەی ئاگرەکە هوژەیەکی کرد، دواتر دامرکایەوە و گەڕایەوە ڕەنگی ئاسایی خۆی، ئاگردانەکەم کوژاندەوەو بەوریاییەوە دیقەتی ناو مایکرۆکەمدا، پاکەتەکە ببوو بە سووتوو، وەک سەرکەوتنێک بەسەر جیوبانەکەم پاڵکەوتم، هێدی هێدی ئارام بوومەوە، خەوێکی قووڵ بردمیەوە.

بەیانی بە ئاسوودەییەوە چاوم کردەوە، شەوێ هیچ خەونێکم نەبینی، ترس ئامبازم نەبوو، بە دڵخۆشییەوە دەستم درێژ کرد و تەلەفۆنەکەم هەڵگرت، تا پەیوەندی بە (جۆرج)ەوە بکەم، ئەو گەمژەیە پێدەچوو بە چیرۆکی فریاکەوتنی شارستانییەوە درۆی لەتەکا کردبین، هەڵبەتە ئەوەی ئەو دوو پاکەتە شقارتەیەی پێداوە، مرۆڤێکی شەیتان ئاسا بووە، کە هیچ لە (ئیلیستەر کراولی) کەمتر نییە لە شەڕانگێزیدا، وەلێ دەمێکە ئەو دوو پاکەتەی لایە؟ چۆن هەستی بە خەتەرناکییەکەی نەکردووە؟ پێدەچێت ئێمە یەکەم کەسبووبین ئەو دیاریانەی وێداوبین.

جۆرج مووت وەڵامی نەدایەوە، بڕیارمدا بچمەماڵەکەی و ئاگاداری بکەمەوە، هاوڕێیەکم لەدەستچوو، نامەوێ ئەویترم لەدەست بچێت...

لەبەردم ماڵی جۆرج مووت قەرەباڵغییەک، کچەکەی لەسەر ئەژنۆ بەرامبەر دەرگاکە دەگریا، پێدەچوو کارەساتێک بێت، دووکەڵێکی زۆر لەپەنجەرەی

ماڵەکەوە دەردەچوو، پیاوانێک لە بەرگری شارستانی کۆ ببوونەوە، لەنێو هەر هەموو ئەو خەڵکە من چوومە پێشەوە، بێ چاو پروکان بەرەو ناوەوەی خانووەکە ڕۆیشتم، ئەو دیمەنە دەناسمەوە و دەشزانم من بەسەر دیمەنێکی تردا ڕوو بە ڕوو دەبمەوە، تەنیا یەک هەنگاو بۆ ژوورەوە لەهەموو شتێکی دڵنیا کردم، هەر بەسەر جیوبانەکەوە ئاگر (جۆرج موت)ی گڕ دابوو، ببوو بە کۆمەڵێک خۆڵەمێش، تەنها کەمێک لە کەللەی و دەموچاوی و ئەو زەردەخەنەیەی مابوونەوە .

یەکێک ڕایوەشاندم و پرسیاری ناسنامەکەی لێکردم، دەموچاوی کەسم بەڕوونی نەدەبینی، تەنها و تەنها وێنەی دوایین بزەخەنەی (جۆرج موت)م بەڕوونی دەبینی، شریتی یادەوەرییەکان گەڕاندمیەوە یەکەمین دیدارم لەتەک جۆرج دا، تا ئەو دوایین شەوەی کە دوو پاکەتە شقارتەکەی پێدابن، تەماشای ڕوخساریم کرد، تەنیا یەک شت هزرمی خستبووە مۆلەق:

( ئەو کەسە ڕقی لێتەو خراپەی بۆت دەوێت، سیحری بەو وڵاخانەدا کرد و کوشتنی، تەنها یەک ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی ئەو ساحیرە بدۆزیتەوە، یەک لەو وڵاخانە بێنیت کە سیحری لێکراوەو بە زیندوویی بیسووتێنیت، ئەودەم ئەوەی سیحرەکەی کردووە دەردەکەوێت، خۆ ئەگەر دەریش نەکەوت، بەر لەوەی ڕۆژ ببێتەوە لەکوێ بێت بۆ خۆی دەسووتێت).

شارلۆتان بەسەر کورسییەکەیەوە پاڵی لێ دایەوەو جگەرەیەکی بەهاداری پێکرد، ئەوجا ڕاستەوەبوو، ڕووی لە مۆریس یا میکائیل کرد و چاوەکانی وەک نووماڕ دەیانفیشکاند و گوتی:

-میکائیل هاریسۆن لە دەزگای هەواڵگری ئینگلیزی کاری دەکرد، دواتر ڕۆمانی لەسەر شارلۆک هۆڵمز نووسی، حەزی بە لێکۆڵینەوەی هەموو شتێک بوو، وەلێ لەمەڕ خود سووتانەوە پیاوێکی گەمژەبوو، باوەڕی بە ئەفسانەکان بوو.

ترس لەچاوەکانی (مۆریس)ەوە دەرکەوت و گوتی:

-گەورەم.. من چیرۆکەکەم وەک چۆن لەتەکما ڕوویداوە وام گێڕاوەتەوە، حوکمیشم لەسەر هیچ نەداوە.

شارلۆتان لێوی خۆی بەئاستەم گەزی و گوتی:

-تۆ دەتەوێ پێمان بڵێیت گشت ئەو قسە پڕوپووچانەت گوایە لە پاکەتێک شقارتەی دژ بە ئاگر سیحری ڕەش بووە، کە بنیادەمی سووتاندووە، کە تۆش بە ڕێگایەکی تر پاکەتەکەت سووتاندووە، سیحرەکە هەڵگەڕاوەتەوەو ساحیرەکەی سووتاندوە، ساحیرەکەش جۆرج مووت بووە.

مۆریس بەدەم دان بەخۆدا گرتنەوە گوتی:

-سیحری ڕەش ڕاستییە، بۆ خۆم لەبەسەرهاتێکی تردا تاقیم کردووەتەوە، خود سووتان نەفرەتییە و هیچ شرۆڤەیەکی ژیرانەی بۆ نییە...

شارلۆتان قسەکەی پێبڕی و بە توندی گوتی:

-ئەوەش ڕوحی شارلۆک هۆڵمز کە لەناخی تەنگیدایە، ما بەدوویدا بە نەزانی خۆت بۆی بگەڕێیت.

ئەوجا دووکەڵی جگەرەکەی بەسەروچاوی (مۆریس)دا کرد و گوتی:

-خۆ ئەگەر وەک لێکۆڵەرێکی وردبین بۆ بابەتەکە بچوویتایە، دەتزانی هەندێ پارچەی جلەکەی هاوڕێکەت ئێرڤینج سووتابوو، کوێر بە کوێری خۆیشی دەیزانی دوای ئەوەی خەوی لێکەوت، جگەرەکەی دەستی نەکوژاندبووەوە، داچڵەکیبوو لەتاو ئاگرەکە بەرەو گەرماوەکە ڕایکردبوو تا ئاورەکە بکوژێنێتەوە، وەلێ بەوای جەستەی قورسیەوە لەخۆی چووبوو، ئاورەکە لەگەرماوەکە سووتاندبووی، بۆ خۆت گوتت ئێرڤینج بەناوبانگ بوو بەوای جگەرەوە جلو بەرگەکانی بسووتێنێت.

مۆریس بەرپەرچی دایەوەو گوتی:

-ئەگەر ئاگرێکی ئاسایی بوایە دارشەقەکەی دەسووتا، کە بێ ئەو دارشەقە نەیدەتوانی بگەڕێت.

شارلۆتان سووتووی جگەرەکەی پرژاندە سەر کەللەی مۆریس وەک سوکایەتی پێکردنی و گوتی:

-ئاگرەکە تەختەی زەوییەکەی سووتاند، تۆش باسی دارشەقم بۆ دەکەیت، با لە ئێرڤینج گەڕێین، تیبینیم کرد کاتێک باسی (گریس)ی ساحیرت کرد، بیرت چوو یا بە ئەنقەست نەتویست باسی ئەوە بکەیت، گریس بە شەو دابەزییە لای ئاگردانەکە پایپەکەی بکێشیت، کچەکەی ئەوەی درکاند،

دووریش نییە لەکاتی پایپ کێشانەکەی لەهۆش خۆی چووبێت، یا خەوی لێکەوتبێت و پایپەکەی جلەکانی سووتاندبێت.

مۆریس سەری نەوی کردبوو، بەناڕەزاییەوە گوتی:

-گەورم زەوی و شت و مەکەکان هیچیان بەسەر نەهاتبوو، ئەوە چە ئاگرکەوتنەوەیەکە ئەوە دەکات؟!

شارلۆتان بەزمانێکی ناشرین گوتی:

-ئەو ئاگرەی جەستەتی پێ دەسووتێنم، ئەوە درووست دەکات، واشتلێدەکەم بەچاوی خۆت ببینیت کە چۆن دەسووتێیت.

مۆریس بە دڵەڕاوکێوە لەدەوروبەری خۆی ڕوانی، دیاریبوو لە دەربازگەیەک دەگەڕا، شارلۆتان لێی نزیکەوە بوو، گوتی:

-شارلۆک هۆڵمز خودسووتان بەوای سیحری ڕەشەوە نابێت، بەڵکو بەشێوازێک ڕوودەدات پێی دەڵێن پڵیتەی شەم (Wick Effect)، کارەکە زۆر سادەیە، ئاگر لەکراسەکە بەردەبێت، بەهۆی جگەرەوە ئەوە بۆ نموونە، ئاگرەکە دەگاتە سەر پێستی درەوەی جەستە و دەیسووتێنێت، ئەوجا چەوری ژێر پێست بەوای گەرمییەوە دەردەچێت، جلکەکان دەیمژن، چەوریش زووتر دەسووتێت، وەک سیستەمی شەممەکەی وایە، چینی دەرەوەی جلەکان جەستەی شەممەکەیە، کەچی چینی ناوەوە چەورییەکەیە کە پڵیتەی شەممەکەیە، کە ئاور دەگرێت، چەورییەکە هەر ئەوەندەی گڕی گرت، ماوەیەکی زۆر بەگڕی دەمێنێتەوە، بابەتی سووتانەکە نزیکەی تۆ

کاتژمێری دەوێت تا بەتەواوی جەستە بسووتێت، لەوحاڵەتە تەنها چەورییەکە دەسووتێت و جل و بەرگەکە وەک خۆیەتی، هەر وەک سووتانی شەممەکە کە پلیتەکە دەسووتێت و دواتر جەستەکە دەتوێتەوە.

دواتر بەشێوەیەکی ناشرین شارلۆتان بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

-مۆریس.. ئەم جگەرەیە دەبینیت؟

مۆریس دیقەتی جگەرەکەی دا، کە شارلۆتان بۆ تۆقاندنی لەجلی مۆریس نزیکی دەکردەوە، دواتر بێ ئەوەی کەس هەست بکات، پیاوە ڕووسییە لاوازەکە لەجێی خۆی ڕاستەوەبوو، دەرزییەکی لە گرێ ملی دۆریس چەقاند، دەستبەجێ چاوەکانی ئەبڵەق بوون و وەک لەدەست و پێ کەوتبێت، قاچ و باڵەکانی کەوتنە لەقەفرکێ و کەوتە سەر زەوی، ما بەسکەخشکێ لەسەرخۆ بڕوات، شارلۆتان تەماشای کرد و گوتی:

-هەموو قوربانیانی خودسووتان لەبەساڵاچووەکانن، ئەوانەی ورگیان زلە و بە ئاسانی ناتوانن بجوولێنەوە، کاتێک ئاوریان تێبەردەبێت ناتوانن خۆیان ڕزگار بکەن، زۆربەی زۆریشیان مەیخۆرەکانن، ئەوانەی عەقڵیان لای خۆیان نابێت، هەر هەمووشیان جگەرەکێشن، زۆرجاریش دەمرن یا بەجگەرەکەوە خەو دەیانباتەوە، ئەودەم جگەرەکە لە پەنجەیان بەردەبێتەوەو سینارۆی پلیتەی شەمەکە دادێت.

شارلۆتان جگەرە داگیرساوەکەی تووڕ دایە سەر مۆریس، کە بەوای جووڵەی قورسیەوە وەک ئەوەی هەست بەهیچ نەکات، کەوتبووە وڕینە کردن، جلەکەی

بەری وردە وردە بەوای جگەرەکەوە گڕی دەگرت. خۆم پێنەگیرا، لەجێی خۆم ڕاستەوەبووم و هەوڵمدا بگەم بەمۆریس تا ئاگرەکەی بکوژێنمەوە، وەلێ ئەو بازنگە نەفرەتییە مەچەکمی گوەشی و بەپشتا بەری دامەوە، تا هێزم تیابوو هاوارم کرد، خۆ ئەگەر زیاتر مەچەکمی بگوشیبایە وردو خاشی دەکرد، بەدەم ئازاری مەچکمەوە لە (مۆریس)م ڕوانی، لەپڕ جلەکەی گڕی گرت، بۆ خۆیشی سەرەگێژەی بوو، وڕینەی دەکرد، ئەوەی زیاتر ئازاری دام، چاوم بەو فرمێسکانەی کەوت، دیاربوو هەستی بە سووتانی خۆی دەکرد، بەجووڵەیەکی لا بەلا ویستی سکەخشکێی بۆ بکات.

بەوای ئازارمەوە ناچار چاوم داخست، دواتر گوێم لەقەفەسێک بوو بەسەر زەوییەکەوە ڕادەکێشرا، چاوم کردەوە، بینیم ئەو ڕووسیە پاڵ بە قەفەسێکی بەتاڵەوە دەنێت، لەبەرامبەر مۆریس ڕایگرت، بەزۆرەملێ لەقەفەسەکەی نا، ئەوجا کابرای ڕووسی دەرگای قەفەسەکەی کڵۆم دا، گوریسێک هاتە خوارەوە، قەفەسەکەی پێ گرێدرا، ئەوجا قەفەسەکە بەرزەوە بوو، تا بە بنمیچەکە گەیشت، مۆریس بە بەرچاومانەوە لەناو قەفەسەکە دەسووتا. شارلۆتان دیقەتی داین و گوتی:

-چەند خۆشە بیرۆکەی پاداشت لەڕەگەزی کارەوە، وەلێ شەوەکەمان کۆتایی هات، بۆیە پێویستە ئێوەش باش بنوون تا بۆ سبەی ئامادە بن، کۆنفرانسەکە هەر بەردەوامە، هەڵبەتە ئەو دوای سەربوردەکان دەبێ ببیستین،

شارلۆتان بەدەم دەرچوونیەوە لە هۆڵەکە دارەکەی دەستی با دەدا، کابرای ڕووسیش دووی کەوت، دەرگاکەی لەسەر داخستین، لێل ئەو دیمەنەجێیهێشتین، سووتانی کەسێک بە بەرچاوەوە دیمەنێکی قێزەون بوو، تا حەوت کاتژمێر...

* * *

هاژەو هوژی ئاگرەکە گوێی کاس کردین، هەر هەموو ئەوانەی دەورروبەرم بینی ڕوحیان بە ئازارەوە بوو، ڕوخساریان چون ئەوەی ئاور جەستەیان بخوات، بە پەلە بۆ لای خاتوونی پێشوازیکەرەکە ڕۆیشتم، کە لەسەر پشت کەوتبوو، چون ئەوەی دوایین ڕۆژەکانی بێت، نازانم چۆن بوو بۆ ئاو بەدەوری خۆمدا کنەم کرد، چ شوێنێکی نەفرەتییە ئێرە؟ ئەمە کۆگایەو پاشکۆی ئوتێلەکەیە؟ دەنگی شەمشەمەکوێرە خوێنمژەکان خوێنی ئافرەتە هندییەکەیان دەمژن، شوێنەکە زۆر بەسام بوو، توێیە لەسەر گازەرەی پشت کەوتبوو، لەرز دایگرتبوو، وەک ئەوەی جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت، ئەو ئافرەتە سەرپۆش بەسەرەش خۆی گرمۆڵە کردبوو، لەگریان نەدەکەوت، ئەو ئەمریکییە ڕەگەزپەرستە لەزەویەکە ڕاستەوەبوو، چاوی بە هەموو کونج و کەلەبەرێک گێڕەدا، لەڕێگایەک دەگەڕا دەربچێت، لام لەخاتوونی پێشوازیکەرەکە کردەوە، منگە منگی بوو، لێی حاڵی نەبووم، پێمگوت:

-خاتوون.. تۆ باشی؟

بە لاوازی دەستی بەرز کردەوە، نیشانەبوو بۆ ئەوەی ڕاستەوەبێت، بەرزم کردەوەو دامنیشاند، پێیگوتم:

-کەستان ڕقتان لێم نییە، منیش وەک ئێوە کە لەوڵاتانی خۆتان هاتوون، هاتووم، ئەو پیاوە کارێکی پێشنیار کردم و ڕەزامەندیم نواند، هیچم دەربارەی نیازی نەدەزانی.

پێمگوت:

-گوێی مەدەرێ، ڕێگای دەربازبوون دەزانیت؟

بەدەم سەح کردنەوەی دەوروبەری گوتی:

-ئەمە یەکەمجارمە ئێرە ببینم.

نائومێدانە لەزەویەکەم ڕوانی، دواتر بەوای نالّە نالّی (توێبە)وە لام لەدوای خۆم کردەوە، چاوەکانی کردبوونەوە، تەماشای ئاگری ناو قەفەسەکەی دەکرد و لەرز دایگرتبوو، خۆم پێکەیاند و لەباوەشم گرت، دەستم بەسەریدا هێنا، فرمێسک لەچاوەکانی نەدەبڕا:

-یاشێخ.. بمبوورە ئەگەر قسەیەکم بەرامبەرت کردبێت و ئازارم دابیت، تکایە لێم ببوورە.

هەستمکرد چاوەکانم پڕ بوون لەفرمێسک، گوتم:

-توێبە قسەکانت ناخی هەژاندم، لەهیچ مەترسە، ڕێگایەک بۆ دەربازبوون هەر دەدۆزمەوە، پەنا بەخوا لێرە نامریت.

چاوم لەقەفەسی ئاگرەکە هەڵبڕی، بۆچ ئەو ئاگرە نەکوژێنینەوە و ڕەحم بەو پیاوە نەکەین کە ڕوح لەجەستەیدایە؟ تەماشای لاشەکەیم کرد، کە ڕادەستی ئاگر ببوو، ئەوەش مانای ئەوەیە ڕوحی بەرەو لای خەڵقەندەکەی هەڵکشاوە.
لەپڕ دەرگاکە کرایەوەو ترس وەک دڕندە هاتە ناومانەوە، ئەو کەچەڵە گوتبووی لێمان دەگەڕێت بنووێین، چی دووبارە هێنایەوە؟ گەنجێکمان بینی بە زۆرەملێ لەدەرگاکەوە پاڵی پێوە نرا و بەسەر پشتا کەوت، بەزمانی ئەمریکی دژوێنی دەدا، پیاوە ڕووسییەکەیش بەدوویەوە، ئەوجا دەرگاکەی لەسەر داخستینەوە، گەنجە ئەمریکییەکە تەماشایەکی ژوورەکەی کرد و بەترسەوە وەک ئەوەی لەتەک خۆیدا قسان بکات، گوتی:

-ئای مەسیح، چ نەفرەتییەک لێرە دابەزیوە؟

تەماشای منی کرد و دواتر دیقەتی ئافرەتە سەرپۆش بەسەرەکەو بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

-ئێوە تیرۆریستن؟

بەتووڕەییەوە گوتم:

-کوێری نابینیت، لەو تیرۆریستتر هەیە، بڕوانە چی لەوانە کردووە.

گەنجەکە تەماشای ئافرەتە هیندییەکەی کرد، کە شەمشەمەکوێرە خوێنی دەمژن، ئەوجا لای لەو داماوە کردەوە ئاگر دەیسووتاند، ئێمەشی بینی بەسەر زەویەکەوە لەرزمان لێ هاتبوو، گوتی:

-داوای لێبووردنتان لێ دەکەم، ئێوە لە کۆنفرانسەکەن، کەواتە ئێوە قوربانین.

ئەو ئەمریکییەی لەتەکمان بوو گوتی:

-تۆ کێی؟

گەنجەکە گوتی:

-من (ئەندرۆ کارلسن)م، بە بانگهێشتنامەی مەکۆی باڵای زانستی میتافیزیک هاتووم، وەلێ بەوای کەشی ناهەموارەوە دواکەوتم، هەر کە گەیشتمە ئوتێلەکە ئەم بازنگەیان لەمەچەکم نا، ئەو کەچەڵە نابووتە چاوپێکەوتنی لەتەکما کرد، قسەکانی ژاراوی بوون، دەمار گرتمی، ئەو هەتیوە ڕووسیە پەلی گرتم و بۆ ئێرەی هێنام.

پێمگوت:

-ئەو سەر ڕووتاوە لێرە کۆی کردینەتەوە تا لێپرسینەوەمان لەتکا بکات، لەسەر ئەو حیکایەتانەی دەیگێڕینەوە، چون ئەوەی لەناوگۆڕدابین و هەق و حیسابمان لەتەکا بکرێت.

کارلسن دوایین نیگای لەشوێنەکە بڕی، ئەوجا دیقەتی بازنگەکەی دەستی خۆیدا و بەتووڕەییەوە گوتی:

-واپێدەچێت پەشیمان دەبێتەوە لەبانگهێشتکردنم بۆ کۆنفرانسەکە، ئەم بازنگانە چاک دەناسم، لەو شوێنەی لێوەی هاتووم لەم جۆرە بازنگانەی زۆر لێیە، فێڵی پووچەڵکردنەوەشی دەزانم.

ئەمریکییەکە پێیگوت:

-ئەوە چ فێڵێکە؟ ئەو شوێنە کوێیە لێوەی هاتوویت؟

کارلسن تەماشایەکی کرد و گوتی:

-دواتر پێت دەڵێم لەکوێوە هاتووم، ئەوە چیرۆکێکی درێژە، ئێستا داواتان لێدەکەم لەم شوێنە پەرپووتە بەدوای شتێک بگەڕێن بەقەد تۆپێکی تێنس بێت، بەرد بێت یا هەر پارچە ئاسنێک، ئەگەر ئەوەمان دۆزیەوە ئەوا لەم دۆزەخە ڕزگاربوونمان مسۆگەرە.

لەگەڵ ئەمریکییەکە کەوتینە گەڕان بەدوای ئەو شتەی ئەو گوتی، ئومێدمان بۆ گەڕایەوە، چەند خولەکێکی نەبرد ئەمریکییەکە دەنگی لێوە بەرزەوەبوو، گوتی:

-دۆزیمەوە!

پارچە ئاسنێکی خڕی لە یەکێک لە ئامێرە کۆنەکان کردەوەو دایە دەست کارلسن، ئەویش بە سەرسوڕمانەوە لێی ڕوانی، ئوجا بۆ ساتێک لەدەرگاکەی ڕوانی و گوتی:

-ئەم شتە خڕە ئەگەر یەکێکمان نایە بن هەنگڵیەوەو بەهێز فشاری خستە سەری، ئەوا هاتوچۆی خوێن ڕادەگرێت، بەو شێوەیە بازنگەکە کار ناکات، چونکە بیرۆکەکە بەوای هەستکردنەوەیە بۆ ترپەی دڵ.

ئومێدمان بۆ گەڕایەوە، گوتی:

-ئەم فێڵە لەو شوێنەی هاتووم زۆر بەکار دەهێنرێت و سەرکەوتووە، وەلێ دەبێ چاوەڕوان بین تا یەکێک دەرگاکە دەکاتەوە، ئەودەم یەکێکمان ئەم شتە خڕە دەنێتە بن باڵی و لەکاری دەخات.

ئەمریکییەکە گوتی:

-زۆر باشە، دواتریش دەتوانین ڕاستەوخۆ دەربچین.

کارلسن بەدەم تەماشاکردنی ئەودوامانەوە، گوتی:

-ناتوانین بەو شێوەیەی کە دەیبینم دربچین، ئەوانەی بارزنگیان بەدەستەوەیە و دەترسێن ئەگەر لەتەکمانا بن دەگیرێین، بۆیە دەبێت لێرە جێیان بهێڵین.

بەتووڕەییەوە پێمگوت:

-کەس لێرە دەرناچێتە دەرەوە تا هەر هەموو لەتەکمانا نەبن.

بەرسڤی دامەوەو گوتی:

-مەحاڵە، نا.

بەتووندی قسەکەیم بڕی و گوتم:

-کەواتە دووان لە ئێمە دەردەچێتە دەرەوەو پۆلیس ئاگادار دەکەنەوە، لەتەک پۆلیسەکانیش دێین تا ڕزگاریان بکەین.

ئەمریکییەکە گوتی:

-زۆر باشە، من و کارلسن دەردەچین، یاشێخ تۆش بەدیاریانەوە بە.

لێرەوە خاتوونی پێشوازی هاتە دەنگ و گوتی:

-پیاوە عارەبەکە دەڕوات، ئەو لەهەمووتان زیاتر لەهۆڵی ئێمەدایە، ئەگەر ئێوە ڕۆیشتن ڕەنگە نەیەنەوە، هەرچی ئەوە دوو برای تری موسوڵمانی لێرەیە، بۆیە دەڵێم دێتەوە.

کارلسن دیقەتی توێیە و ئافرەتە سەرپۆش بەسەرەکەی دا و هەناسەیکی هەڵکێشا و گوتی:

-زۆر باشە، کەواتە لەتەک شێخ دەڕۆم و ئەمریکییەکەش با ئاگادارتان بێت.

ئەمریکییەکە لەوەدا بوو نارەزایی بنوێنێت، وەلێ گوێمان لەدەرگاکە بوو بۆ کرانەوە، کارلسن شتە خرەکەی نایە بن باڵییەوەو ئامادە بوو، پیاوە ڕووسییەکە هاتە ژوورەوەو کیسەیەک خواردنی بەدەستەوەبوو، داچەمییەوە خواردنەکە لەسەر زەوی دابنێت، بەر لەوەی سەر بەرز بکاتەوە، کارلسن خۆی پیا کێشا، پیاوە ڕووسییەکە خوێن بەباڵایا فیچقەی کرد، جووڵەی لێ بڕا، کارلسن بەسەری ئامازەی بۆکردم دووی کەوم، لام لە ئەمریکییەکە کردەوەو بەچرپە دڵنیام کرد دەگەڕێمەوە.

-لەبەر ئێوە دەگەڕێمەوە، ئاگاداریان بە، وەک چۆن ئاگاداری خۆت دەبیت.

لەجێی خۆم جووڵام و ڕێگام نەدا نارەزایی دەربڕێت، لەتەک کارلسن دەرچووومە دەرەوە، ئەو شوێنەم بۆ دەرکەوت بینایەکی کۆن بوو، هیچ پەیوەندییەکی بە ئوتێلەوە نەبوو، کە زۆر لەو شوێنە دوور بوو کە تیا دەحەسانەوە، بە پەلە بۆی دەرچووین، لەوێ دوور کەوتینەوە، هەستم بە

ئازادی کرد، ئاورێکم لەو شوێنە دایەوە کە ئەو بەستەزمانانەی تیا دەستبەسەر بوونە، بڕیارمدا ئازادیان بکەم، ئەوان برای منن...

لەپڕ مەچەکمان بەتووندی گووشرا، بەهاوارەوە کەوتینە سەر زەوییەکە، دەتگوت ڕوحمان لە دەممانەوە دەردەچێت، ئەو مەچەک گووشینەم وەک ئەوانی پێشووتر نەبوو، بەردەوام بوو، هەستمکرد مەچکم خەریکە وردو خاش دەبێت، تەماشای (کارلسن)م کرد، ئەویش بەسەر زەوییەکەوە سکەخشکێی بوو، بەدەم هاوارەوە دەیگوت:

-هێڵەکەمان بڕی، ئەوەی کۆنترۆڵ کرابوو، بگەڕێوە، دەمرین...

تێگەیشتم ئەو بازنگانە پرۆگرام کراون، هەرکاتێک لەو ماوەیەی بۆی دیاری کراوە تێپەڕی کاردانەوەی خراپ دەبێت، هەنگاوێک بۆ دواوە کشامەوە، بەوای ئازارەوە دەستم دەلەرزی، هەنگاوێکی تر کشامەوە، بازنگەکە لە ئازاردانی توندم کەوت، دەستبەجێ دەستم بۆ کارلسن درێژ کرد و ڕامکێشا، ئارام بووەوە، لەسەر پشت ڕاکشاین، لەو ئازارەدا بووین چاوم بە سەر ڕووتاوەکە کەوت لێمان نزیک دەبووەوە، لەهۆش خۆم چووم.

* * *

قەفەسگەلێکی ژەنگاوی، وەک ژەنگگرتووی ڕوحمان، بۆن و بەرامەیەکی زۆر ناخۆش، دەنگی دڵۆپە دەکەوتە سەر سیناوێ...

لەدووسندوقی بەرامبەر یەک دانرابووین، سەرڕووتاوە لەسندوقەکانی نابووین و بەنێو سندوقەکاندا هاموشۆی دەکرد و بە دارە کورتەکەی دەستی لە

قەفەسەکانی دەدا، وەک ئەوەی ئێمی ئاژەڵ بین، بۆ ساتێک هەستمکرد مامەڵەی مشکی تاقیکردنەوەمان لەتەکا دەکات، هیچ شتێکی ترسناک نەبوو، تەنها پیاوێک عەقڵی لەدەست دابوو. شارلۆتان لە هاموشۆ کەوت و گوتی:

-بنیادەمەکان سەرقاڵی کردنەوەی کۆتەکانن، ڕوحی خۆیان دەکەن بە قوربان بۆ ئەوەی ئازاد بن، ئەوان نازانن کۆتی گەورە وا لەمێشکیاندا، ژیانیان بۆ هیچ ون کردووە.

دواتر لەقەفەسەکەی من نزیکەوە بوو، گوتی:

-ئەو ئاژەڵانەی لەتەکمانا لەسەر زەوی دەژین، خۆ ئەگەر لەکۆتی هزری ئاژەڵییان ڕزگار بوونایە، ئەوا دونیایان دەگرت و بستێک خاکیان بۆ جێ نەدەهێشتین.

هەستم بە دڵگوشین کرد، ئا ئەم پیاوەیە گوێ لە بیرۆکەکان دەگرێت؟ لای لێمکردەوە چون ئەوەی گوێی لەقسەکەم بووبێت، ئەوجا کەوتەوە گڕخواردن و بەرامبەر قەفەسی ئەمریکییەکە وەستا گوتی:

-یاشێخ هەڵەتان کرد ئەم پیاوەتان هەڵبژارد، هەر کە ئێوە هەڵاتن، ئەویش دەستبەرداری ئەوان بوو هەڵات و لێکەڕا ئەوانیش هەڵێن، کە هاتمە ئێرە کەسم نەبینی، وەلێ ئەو داماوانە بەوای ئازاری مەچەکیانەوە ناڵە ناڵیان بوو، نەیانزانی ڕوحی (بۆرگاتۆریم)یان بڕیوە.

بەداماوییەوە لەزەوییەکەم دەڕوانی و دەستم بە مەچەکما دەهێنا، شارلۆتان بەرامبەر قەفەسەکەی ئەندرۆ وەستاو گوتی:

-ئەندرۆ کارلسن.. خاوەن شیکارەی ناوازە، کێ لەتۆ باشترە بەسەرهاتی داهاتوومان بۆ بگێڕێتەوە؟ دەبێ پەلە بکەیت، دڵم ئۆقرەی بۆ نییە بۆ لەناوبردنت.

سێجاران بە دارەکەی دەستی کێشای بەقەفەسەکەی ئەندرۆ، لەتاوا داچڵەکی و ڕاستەوەبوو، ترس تەواو ئامبازی ببوو، ما دان بەخۆیدا بگرێت تا دەست بەگێڕانەوە بکات، هەر بەڕاستی تووشی سەرسوڕمان بووم، کە یەکەمین دیمەنی گێڕانەوەکەیم بیست، بۆم دەرکەوت لەکوێوە هاتووە.

8

# گەشتکردن بەنێو کاتدا

ئەندرۆ کارلسن دەیگێڕێتەوە

(بەدەر لەو ئامێرانەی کات لەفیلمەکاندا بینیومانە، ئێمە وەک زانای فیزکی بیرمان کردووەتەوە دەکرێت بەیاسای سرووشت توونێلێک لەنێو کاتدا بکەینەوە، بۆمان دەرکەوت بۆنا.. دەکرێت)

زانای فیزیکی بەناوبانگ ستیڤن هۆکنج

ستوونێک لە ڕووناکی لەشوێنێکی سەر زەوییەوەو بەلای ڕاست و چەپدا ئاسمانی پەی دەکرد، چون ئیشارەتێک بۆ دانیشتوانی شاری (ماساشۆسیتیس)ی ئەمریکی بۆ ئاشکرابوونی وردی شوێنی ڕووناکییەکە، بەو ئاوایەی کارەساتێک لای ڕووناکییەکەوە ڕوویداوە، ئاهەنگێک لەسەر زەوی تەنها یەکجار لەمێژوویدا ڕوودەدات، بانگهێشتێکی ڕوون و ئاشکرا لە زانکۆی (ماساشۆسیتیس)ەوە بۆ هەر گەشتکەرێکی نێو کات، بەڕێکەوت لە ئەمریکا حاڵی حازر دەرکەوت و خۆی دەخاتە ڕوو، کۆمەڵگاش بەرامبەر هەموو جیهان خەڵاتی دەکەن، ئاهەنگێکی فراوان لە سەری ساڵی 2005 بەهاوکاری کۆمپانیا گەورەکان و ئاژانسەکانی ڕاگەیاندن دەبێت.

قەرەباڵغییەکەی ناو زانکۆ لەوەدا نەبوو، دەرزیت هەڵدابا نەدەکەوتە سەر زەوی، ئاهەنگەکە بە تیپی (ڕۆک) دەستی پێکرد، هەرلو زەنایەکی ولیان

نایەوە، تەنانەت لەهەسارە نزیکەکانیشەوە گوێیان لێ بێت، پەیامنێرانی کەناڵەکان بەنێو ئاپورای خەڵکەکە کەوتبوونە پەخشکردن و دیداری سەردانیکەران و کەسایەتییە بەناوبانگەکان کە ئامادەی ئاهەنگەکە بوون.

یەک لەپەیامنێرەکان کە ئافرەتبوو، خۆی ڕێکخست و مایکەکەی لەیەک لەئامادەبووان نزیکەوە کرد، ئەویش بە پەرۆشییەوە گوتی:

-بەڕاشکاوانە زۆربەی خەڵکەکەی ئێرە مەزەندەی ئامادەبوونی (جۆن تیتۆر) دەکەن، کە بەناوبانگترین گەشتکەری نێو (کات)ە کە بیستوومانە، لەوبڕوایەدام ئامادەبێت، هاتنیشی ئاسایی نابێت، بەڵکو بە هەڵاوێژراوی دەبێت.

لای ئۆتۆمبێلێکی تەنداری ڕاستەقینەی بەناو بانگ کە لەفیلمی ( Back To The Future) دووپیاو هەبوون، یەکێکیان مۆبایلی بەدەستەوەبوو، پێدەچوو لەو سەردەمە زۆر نوێ بوو‌بێت، وێنەی هاوڕێکەی دەگرت کە لەبەردەم ئۆتۆمبێلەکە وەستابوو، هاوڕێکەی پێیگوت:

-ئەگەر کەسێک ئەو ئامێرە بەدەستەوە ببینێت، کە وێنەی پێدەگریت، کارلسن بۆت دەبێت بە کێشە و وازت لێ ناهێنن.

کارلسن گەنجێکی جوان و باڵا بەرز بوو، پێیگوت:

-مرۆڤ گەمژەترە لەوەی تێبینی ئەم شتە بکات، تەنانەت لەم شوێنەش (جی تی) بڕوام پێبکە.

دوایین قسەی بە گاڵتەجارییەوە گوت، دواتر گوێی لەهاتوهاوارێکی خەڵکەکەبوو، دەستی بۆ تیمەکە بەرز کردەوە، کە وەک ڕێزێک بۆ ئامادەبووان تەواوی تیمەکە داچەمینەوە و بڵاوەیان لێکرد، ئەوجا پیاوێک بە جلوبەرگێکی پۆشتەو چاوێلکەیەکەوە چووە سەر سەکۆکە، ئەوەی سەیر بوو، کاتێک پیاوەکە چووە سەر ستێجەکە خەڵکەکە هاواریان لێ هەستا، زۆر لەهەراو زەنای بۆ تیمەکە کردیان، کارلسن چون پەندێکی گاڵتەجارانە گوتی:

-کاتێک خەڵکی چەپڵە بۆ زاناکان لێدەدن، وەک چۆن چەپڵە بۆ هونەرمەندان دەکوتن، ئەو کۆمەڵگایە لەرێگادان شۆڕش بۆ شارستانییەت بکەن.

هاوڕێکەی بەدەم لێو گەستنیەوە گوتی:

-بەڵێ، شۆڕشێکی دزراوی شارستانیەتی بێزارکەر دێتە ئاراوە.

خەڵکەکە بێدەنگبوون تا گوێ لەو پیاوە بگرن کە پێدەچێت زانایەکی گەورەی فیزیکی بەناوبانگ بێت، پیاوەکە خۆی قیتەوەکرد و گوتی:

-وەک زانا بیرمان کردووەتەوە گەشت بەنێو (کات)دا بکرێت، وەلێ هەندێکمان بەرپەرچیان داینەوە، گوتیان مەحاڵە گەشت بەنێو (کات)دا بکرێت، خۆ ئەگەر ئەگەری وا هەبێت و ڕاستی بێت، دەبوو لەم سەردەمەی ئێمەدا گەشتیار لەبانەڕۆژدا بهاتبان و لێرە هاموشۆیان بکردایە، ئەمەش حەتمەن ناکرێت و نەکراوە، کەسێک نەهات و بڵێت من گەشتیاری بانەڕۆژم و بەڵگەی ئەو ڕاستییەی پێبێت، ئەوەش دیوێکی تری هەیە، خۆ ئەگەر ئەو

گەشتیارانەی نێو کات هاتبن، ڕەنگە نەیانتوانیبێت خۆیان ئاشکرا بکەن، تا تووشی کێشەو گرفت نەبن.

کارلسن تەماشای هاوڕێکەی کرد و جووڵەیەکی پێکەناوی بۆ کرد، ئەوجا پیاوەکە قسەکەی تەواوکرد و گوتی:

-دواتر ناڕەزاییەکی تریان خستەڕوو، کە گەشتکردن بەنیو (کات)دا مەحاڵە، گوتیان ئەگەر گەڕایتەوە بۆ سەردەمی باپیرت و کوشتت، ئەوە مانای ئەوەیە باوکت لەدایک نابێت، کەواتە تۆش لەدایک نابیت، ئەوەتا تۆ هەیت و بەنێو (کات)دا گەشت دەکەیت، ئەگەرچی باپیریشت کوشتووە، ئەوە کێشەیە و بیرۆکەی گەشتکردنەکە ڕەت دەکاتەوە، وەڵامی ئەوەشمان دایەوە کە جیهانێکی بێشومار هەن، هەر هەمووشیان هەمان مرۆڤ تێیدا لەسەردەمی خۆی دەژێت، هەموو جیهانێکیش جیاوازە لە جیهانێکی تری مرۆڤەکان، ئەگەر گەڕایتەوە سەردەمی باپیرت و کوشتت، کەچی لە جیهانەکانی تر زیندووە، بۆ ئەوەی تەواو لەناوی بەریت، کەواتە لەهەموو سەردەمەکان بیکوژیت کە تێیدا زیندووە، ئەوەش هەر زۆر مەحاڵە.

کارلسن هەستاو دەستی بەرزەوە کرد تا قسە بکات، کابرا بە سەرسوڕمانەوە دیقەتی دا و ئیشارەتی بۆ کرد قسە بکات، گوتی:

-بابەتی کۆتا نەهاتووی جیهانەکان شتێکی پڕوپووچە، دکتۆر بەداوای لێبووردنەوە، بابەتەکە وەک ئەوە وایە لەکێشەیەکی مەحاڵ هەڵێیت و

چارەسەرێکی مەحاڵتری بۆ دابهێنیت، تا بەسەر کێشە مەحاڵییەکە زاڵ بیت.

برێک بە دزییەوە خەنینەوە، پیاوەکە گوتی:

-چارەسەرێکی ترت هەن؟

کارلسن بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

-هەڵبەتە، با یاسایەک دانهێنین و ناوی لێ بنێین یاسای پاشەکەوت کردنی کات و...

هاورێکەی دەستی ڕاکێشا تا بێدەنگ بێت، کارلسن تەماشای کرد و ما قسەکەی تەواو بکات، گوتی:

-یاسای پاشەکەوت کردنی کات، یانی ئەگەر ویستت بۆ ڕابردوو بگەڕێیتەوە و هەوڵتدا هەر گۆڕانکارییەک بکەیت، لەکۆتاییدا بۆت دەردەکەوێت تۆ هاوکاری ئەو ڕووداوەت کردووە کە تۆ دەتەوێ لێی دوور بکەویتەوە.

کابرا دەمێک بێدەنگ بوو، چاویشی لە کارلسن نەبڕی، دواتر ڕوو بە ڕووی کارلسن گوتی:

-بەڵێ، قسەی ئەو هاوڕێمان مەنتقییە، بیرۆکەیەکی هاوشێوەم لەهەشتاکاندا خستە ڕوو، ئەگەر واماندانا کەسێک گەڕایەوە ڕابردوو، تا شتێک بگۆڕێت، بینی ئەو کەسە لە مێژووی ڕابردوودا نووسراوە، یانی نووسراوە کەسێک لە بانەڕۆژدا هاتووە وئەوە و ئەوەی گۆڕیوە، بەو یاسایە ئەگەر گەڕایتەوە باپیرت بکوژیت، تۆ بەهەموو ڕێگایەک شکست دێنیت،

ئەگەر باپیرت مرد تۆش لەدایک نابیت، بۆیە ناگەڕێیتەوە ڕابردوو تا باپیرت بکوژیت، لەبەر ئەوەی لەبنەڕەتدا تۆ بوونت هەر نییە.

کارلسن چاوەکانی لێ کز کردن، چون ئەوەی هەست بە خەتەرناکی بکات، گوتی:

-کێشەیەکتان پێ ڕادەگەیێنم، باوەریش ناکەم کەس چارەسەری بۆ هەبێت، دکتۆر ئەگەر کاغزێکی زانستییانەی (ئینیشتاین)ت بەدڵ بێت بۆ چاپەکەی، ئەگەر بردت و گەشتی ڕابردووت کرد تا بەدیداری ئینیشتاین بگەیت و بیدەیتێ بەر لەوەی بینووسێت، لەوێ دەزگایەک نییە بۆ ئەو کاغزە، ئەگەر وامان دانا تۆ سەرچاوەکە بوویت، دەتزانی نووسینی (ئینیشتاین)ە، کەچی هەر خۆت وێتدابوو، لە ئینیشتاین گەڕێ، وادانێ کەسێک گەشتی بەنیو کاتدا کرد و پارچەیەک میوزیکی بتهۆڤنی ژەنی هەر لەو سەردەمی بتهۆڤن، بەر لەوەی بتهۆڤن بیژەنێت، ئەو دەم سەرچاوەی ئەو پارچە میوزیکە چییە؟

خەڵکەکە دەنگیان لێ هەڵبڕی و کەوتنە مشتومڕ، زۆرێکیش دەستی بەرز کردبووەوە تا قسە بکات، لەڕاستیدا قسەکردنەکان دەوڵەمەندی مشتومڕەکەیان ئەوەندەی تر زیاتر کرد، دوای کۆتایی خەڵکەکە ما لە (کارلسن) بگەڕێن، کە ئەو مشتومڕەکەی دامەزراند، بەتایبەت پەیامنێرەکان زیاتر بەدوویدا دەگەڕان، وەلێ کەس کارلسنی بەرچاو نەکەوت، تەنانەت (جی تی) هاوڕێکەشی دیار نەما.

* * *

وولیستیرت.. خاکی گورگە پیرۆزەکان، خاکی پشک و سەنەدەکان، گشت ئەو چەمکانەی کە کەس تێیناگات تەنها خاوەنەکانیان نەبێت، بینایەکی گەورەی بەهادار، تەنها یەک نهۆمەو ژێرەوەشی گۆڕەپانێکە پڕە لە شاشەکان، کە تەنها نووسینەکان و ژمارەکان بەڕەنگی سەوز و سوور دەردەخات، گۆڕەپانێک هەزار کەس بەسەریەوە وەستاون، هەر یەکەو ئامێرێکی تایبەتی بەدەستەوەیە، هەر وێنەیەک لێرە بگریت، وەک تابلۆی سەردەمی ناوەندی دەردەکەوێت، هەر یەکەو شتێک دەکات، بەسەر ڕوخساریشیانەوە گوزارشتی جیاواز، هەڵچوونەکان لێرەدا ناوازەن، لەنیوان خۆشبەختی و هەڵبەزینەوەو چاکەت داکەندن و تووڕدانیان بەحەواوە، لێو گەستن و چنگ لەقژ گیرکردن و تووڕدانی چاکەت بەسەر زەویدا و هەڵبەزینەوە بەوای تووڕەبوونەوە.

لەنێو هەر هەموو ئەوە گەنجێک بە جل و بەرگێکی شیکەوە هات و پێدەچوو گوێی بەهیچ نەدەدا، سترانێکی بە فیکەی دەم دەگووتەوە، کەس لەو سەردەمە گوێی لێ نەبووە، ئەو گەنجە ئەندرۆ کارلسن بوو، کە دوای چەند ڕۆژێک دونیا دەهەژێنێت، بە شێوەیەکی نارێک ویستی بەشداری لەو بازاڕە بکات، بەرپرسەکە بێ ئەوەی تەماشای بکات بلەز داوای زانیاری لێکرد، لێرە لەم گۆڕەپانە کەس گوێ بەکەس نادات، خەڵکی ڕاهاتوون هەموو جۆرە هەڵچوونێکی بنیادەمەکان ببینن، کارلسن لای بەرپرسەکە دوور کەوتەوەو ئەو ئامێرەشی بەدەستەوە بوو، کە وەک ئەوەی بەو تەکنەلۆژیایە ڕازی نەبێت، کە پێی دروستکراوە، ئەوجا لەشوێنێک دانیشت و ما لەشاشە بەدارەوە

کراوەکان بڕوانێت. هەندێک کەس بە جل و بەرگی پۆشتەو پەرداخ و قژ داهێنراوەوە هاتنە لای تا خزمەتگوزارییەکانی خۆیانی بۆ بخەنە ڕوو، هەندێکیان لەکۆمپانیای خوراک دەزانێت و ئەویتر لە نەوت بەو جۆرە، کارلسن داوای لێبووردنی لێ کردن، خەریکی کارەکەی خۆی بوو بەسەر ئامێرەکەوە، ما لەنێوان خۆیاندا بچرپێننە گوێی یەکتر بەشتێک لە گاڵتەجاڕی.

کارلسن نزیکەی نیو کاتژمێر لەو شوێنە مایەوەو دواتر ئامێرەکەی ڕادەست کردەوە و دەرچوو، ئەو پیاوەی ئامێرەکەی لێ وەرگرت سەرو سیمای سەرسوڕمانی پێوە دیاربوو، چاوی بە شاشەی ئامێرەکە گێڕا، بینی کارلسن نۆ کرداری خەتەری ئەنجامداوە و هەر هەمووشی بردووەتەوە، ئەو 800 دۆلارەی کە دەستی پێکرد، لەپڕ بوو بە دووسەد و پەنجا هەزار دۆلار، شتێکی خەتەر بوو هەر زوو لەناو گورگەکان گواسترایەوە، ما هەر هەموو لە کارلسن بڕوانن، کە گۆڕەپانەکەی بەجێدەهێشت و گوتی:

-گورگەکانی وولیستریت سبەیش دەگەڕێمەوە.

سبەی کارلسن هاتە ناو قەومێک، وەلێ وەک پێشتر تەماشایان نەکرد، پێشتر ئەوانەی خزمەتگوزرای خۆیان خستبووە بەردەستی، لێی نزیکەوەبوون، تا لەئامێرەکەی بڕوانن، وەلێ بە وریاییەوە لای لێ کردنەوە، گاڵتەجاڕانە دیقەتی دان، کەسێک لەپێشوازی بیناکەدابوو، خۆی لە کابرای تەنیشتییەوە نزیک کردەوەو گوتی:

-ئەوە جۆیەتی، زۆر بەباشی چاودێری بکە، بۆ چرکەیەکیش لەبەر چاوت ون نەبێت، ئەو فێڵبازە گەمەی قێزەونی خۆی هەر دەکات.

دوای نزیکەی سێ کاتژمێر کارلسن هات بۆ ڕادەستکردنی ئامێرەکەی، بەدەم بنێشت جاوینەوە گوتی:

-تا چەندێکی تر چاوەڕێ بم بۆ گواستنەوەی ئەو پارەیە بۆ حسابی تایبەتی بانکیم؟

کابرا بەدەم تەماشاکردنی ئامێرەکەوە، گوتی:

-ئەوە وەستاوەتە سەر...

کابرا بێدەنگبوو، ئەو ژمارانەی کە لەبەرامبەریدا بوو بەرزەوە بوو بۆ یەک ملیۆن دۆلار، تەماشای (کارلسن)ی کرد و گوتی:

-گەورەم پێدەچێت پیاوێکی بەختەوەر بیت، ببوورە، بەڵێ، گوتم ئەوە وەستاوەتە سەر بانک.

کاتێک کارلسن ڕۆیشت، پیاوانی بەرپرسیاران کۆبوونەوەو تەماشای ژمارەکانیان کرد، 16 کرداری سەرکەوتوو بەجێ گەیاندبوو، هەر کردارێکیشی بە ڕێکی و لەکاتی خۆی ئەنجام داوە، وەک ئەوەی بزانێت کەینێ پشکەکە سەردەکەوێت و کەی دادەبەزێت، تەنها جارێکیش نەدۆڕاوە، ئەوە مەحاڵە لەنەریتی گەمەکە، هەر هیچ نەبێت دەبوو لەهەر سێ جار کردارەکەدا کەڕەتێک بدۆڕابایە، دەستبەجێ نیشانەیەکیان لەسەر ناوی ئەندرۆ کارلسن دانا، چون ئاگادارییەک بۆ چاودێری کردنی حیسابەکەی لە کرداری داهاتوودا.

کارلسن هەموو ڕۆژێک دەهات و چاوانی چاودێرانیش بەدوویەوەبوون، ئەوەی ئەو دەیکرد بەهەموو پێوەرەکان مەحاڵبوو، ئەژمێری بانکییەکەی لە یەک هەفتەدا گەیشتبووە 100 ملیۆن دۆلار، ئەوەش قابیلی قبووڵ نەبوو، دەسەڵاتی لێ ئاگادار کرایەوە، پۆلیس کەوتە گەڕان بەدوای ناسنامەی کارلسن و مێژووەکەی، وەختەبوو هەفتەی دووەمیش کۆتا بێت، ئەژمێری کارلسن بۆ 350 ملیۆن دۆلار بەرزەوەبوو، ئەوەش بوو بەهۆی شێواندنی بازاڕی پشک و دەنگۆکەشی گەیشت بەو دەهەنگانەی کۆنترۆڵی ئابووری وڵاتیان دەکرد.

لەناوەندی بازاڕی وولیستریت کە کارلسن وەستابوو، دەیان کەس دەورەیان دابوو پرسیاریان لێ دەکرد، یا دەیانوویست لێوەی فێر بن یانەخۆ گێچەڵیان پێدەکرد، تا هێزی سەربازی هاتە ناو گۆڕەپانەکەو بێ هیچ قسەیەک (کارلسن)یان باڵبەست کرد و کۆتیان لە مەچەکەکانی کرد و دایانە پێش خۆیان، خەڵکەکە تەماشایان دەکرد، هەموو پارەکانیان لێ سەند، هەموو کردارەکانیان پێ پێچەوانە کرد، پارەکانیان بۆ گەڕایەوەو ئەویشیان خستە زیندانێکی تایبەتەوە تا لێکۆڵینەوەی لەتەکا بکەن، بە بیانووی ئەوەی زانیاری ناوخۆی کۆمپانیا گەورەکانی چۆن دەست کەوتووەو چۆنیش توانیویەتی ئەو هەموو پارەیە بێ دۆڕاندن بباتەوە.

*                    *                    *

لەزیندان دووان چوونە لای، یەکێکیان ئەمریکییەکی ڕەشپێست کە پێدەچوو لێکۆڵەر بێت. لێکۆڵەرەکە پێیگوت:

-ئەندرۆ کارلسن.. وەک لە ناسنامەکەتدا دەرکەوت، ئەوەش دوای پشکنین بۆمان دەرکەوت چەند مانگێکە دەرتهێناوە، پێشتر هیچ بەڵگەیەکی ترت نەبووە، تەنانەت بەڵگەنامەی زایندەییشت ڕۆژێک پێش ناسنامەکەت دەرتهێناوە، ئەندرۆ کارلسن.. تۆ کێیت؟

کارلسن دیقەتی داو ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی:

-سەرەتا پێمبڵێ تاوانەکەم چییە و سزاکەشی چییەو چۆنیش لێرە دەردەچم، بێزاربووم.

لێکۆڵەرەکە بەهێمنی پێیگوت:

-تاوانەکەت دزینی زانیاری ناوخۆی کۆمپانیا زەبەلاحەکانە و بەکاریشیت هێناون بۆ بردنەوە، بۆرسەکەت شێواند و کێشەی ڕاستەقینەت ...

کارلسن قسەکەی پێ قاچی:

-بڕوام پێبکە دەمویست شتەکە ڕاستی بێت، جارێک براوە بم و جارێکیش دۆڕاو، بەڵام حەز فریوی دام، ئارەزووم زیاتر بوو، تۆ ئەو هەستەت تاقی نەکردووەتەوە، داوای لێبووردنت لێ دەکەم قسەکەم پێ بڕی، چیت گوت؟

لێکۆڵەر چاوی لێ نەبڕی، گوتی:

-دەڵێم سزای ئەو کارەت کواستنەوەتە بۆ دوورگەی ڕایکرز، پێشتر ئەوەت بیستووە؟

کارلسن کەمێک شڵەژا، لێکۆڵەر هەستی بەسەرکەوتن کرد، چاوەڕێ بوو بڵێت گشت ئەوە بەخت بوو، هیچ زانیارییەکی نەدزیوە، وەلێ کارلسن قسەیەکی

کرد، لێکۆڵەری تووشی شۆک کرد، تەنانەت یاریدەدەرەکەشی کە لەسیلەیاندا وەستابوو، کارلسن هەڵیداو گوتی:

-گەورەم لەڕاستیدا بۆیە بردمەوە چونکە هەموو زانیارییەکانم دەزانی، وەلێ نەمدزیبوون، چونکە ئەوە مەحاڵە، 126 کرداری سەرکەوتووم لە 10 کۆمپانیای زەبەلاحدا کرد، کێن ئەوانەی زانیاری 10 کۆمپانیا بزانێت؟ باوەڕ ناکەم دەزگای هەواڵگریش ئەو توانایەی هەبێت، خۆ ئەگەر بمخەنەوە بۆرسە 126 کرداری تری سەرکەوتوو بەدەست دێنم، من ئەو زانیارییانە دەزانم چونکە زانیاری کۆنن، بەڕێزان من گەشتکەری ڕووباری زەمەنم، لە زەمەنی ئێوەدا نیشتوومەتەوە، زەمەنی من دوای زەمەنی ئێوەیە بە دووسەد ساڵ.

هەر هەموو بێدەنگ بوون، لێکۆڵەریش لەهاوڕێکەی ڕوانی و دواتریش لە کارلسن و ئەوجا تەماشای بەرپێی خۆی کرد، دواجار خۆی بۆ نەگیراو دای لەپێکەنین، هاوڕێکەشی دەستی بە خەنینەوە کرد، کارلسن بە پەرۆشیەوە بزەی هات و ئەویش تەماشای بەرپێی خۆی کرد و گوتی:

-لە زەمانی من دۆسێی هەموو ئەو بۆرسانەی ناو مێژوو هەن، بۆ خۆیشم کێشەی پشکەکانم دەزانی، بەتایبەت لەم ساڵەدا، بۆی گەڕامەوە تا هەندێ پارەی تیا بەدەست بێنم.

لێکۆڵەر بەدەم چاو هەڵگلۆفینەوەی دوای پێکەنینەکەی گوتی:

-تۆ پێمبڵێ ناسنامەی زەمەنی خۆت کوانێ؟ پیشانمی بدە.

کارلسن بە دڵنیاییەوە گوتی:

-لەسەردەمی من ناسنامە نییە، ئەوە ڕۆی و ڕابوورد، لەسەردەمی من ناسنامەکەت پەنجەمۆرەکەتە، کە لە هەموو کەسێک جیاوازە، ئەو پەنجەمۆرە هەموو شتێکی تیا نووسراوە، وەک ناسنامەیەکی ئەلیکترۆنییە، مۆڵەتی شۆفێریت ئەژمێری بانکیت.

لێکۆڵەرەکە سەرسوڕمان بەری نەدابوو، گوتی:

-تۆ بە ئامێری زەمەن بۆ ئێرە هاتوییت، باشە ئامێرەکەت کوا؟

کارلسن هەر زوو بەرسڤی دایەوەو گوتی:

-ناتوانم ئەوە بڵێم، ئەو تەکنەلۆژیایە ئەگەر کەوتە دەستانێکی هەڵەوە کارەسات ڕوو دەدات، ویژدانم ئەوە قبووڵ ناکات.

لێکۆڵەرەکە لێوی خۆی گەست و گوتی:

-هیچ قسەیەکی ترت هەیە، جیاواز لە بابەتی گەشتکرن بەنێو کاتدا؟

کارلسن کەمێک بێدەنگبوو، دواتر گوتی:

-نەخێر گەورەم، هیچ بیانوویەکی ترم نییە.

لێکۆڵەرەکە لەسەر کورسییەکەی ڕاستەوەبوو، بە هاوڕێکەی گوت:

-با وابێت، کارلسن یا هەچ ناوێکی تر دوور لە گاڵتەکردنێک، ئێمەش کار لەسەر بێدەنگیت دەکەین، فرێت دەدەینە زیندانی دوورگەی ڕایکرز بۆ نێو کۆمەڵێک هیچ و پووچ لە بنیادەم، تا بۆگەن دەکەیت، وەلێ هەچ کاتێک ڕات گۆڕی ویستت شتێکمان پێ بڵێیت دوور لەو قسانەی کردوونت، بە پەرۆشەوە ئامادەین بۆ گوێگرتن.

لێکۆڵەرەکە بێ هیچ قسەیەکی تر ئەوێی جێهێشت، (کارلسن)یش بۆ ناخۆشترین زیندان لە دەزیندانەکانی ئەمریکا گوێزرایەوە.

جل و بەرگێکی قاوایی لەبەر هەموویاندا، ڕوخسارگەلێک جیهان ڕقیان لێ دەبووەوە و ڕقی خۆشیان بۆ جیهان دەردەبڕی، دز و پیاوکوژ و بەدکار، هەر هەموو لێرە گردبوونەتەوە، چون ئەوەی کۆبوونەوەکەیان چاکسازییان پێ بکات، کارلسن یەکێکبوو لەوان و بە حەسرەتەوە تەماشای ڕوخسارییانی دەکرد و بەدڵتەنگیشەوە لەشوێنەکەی دەڕوانی، حکومەت دەستەبەری یەک ملیۆن دۆلاری لەسەر دانابوو تا لەزیندان دەربکرێت، تا ئەو کاتەی دادگا بڕیاری کۆتایی خۆی دەدات، تەنانەت ئەو پارەیەی لەئەژمێری بانکیدا بوو دەستی بەسەرا گیرابوو، تێگەیشت گەمژەییەکەی وایلێکردبوو گرنگترین یاسا ببوارێت لەو گەشتەی بەنێو کاتدا.. وامەکە چاوان سۆسەت بکەن، خەڵکی وا لێت دەڕوانن کە شێتی، عەقڵیان نەگەیشتووە بەوەی ئەو بیرۆکەی گەشتکردنە بەنێو کاتدا قبووڵ بکەن، ئەگەرچی هەموو ئەو ڕۆمانانەی خوێندوویانەتەوەو ئەو فیلمانەش کە بینیویانە، وەلێ عەقڵی هەناوییان ئەو ڕاستییەیان قبووڵ نەبوو، تەنها کەسانێکی زۆر کەم نەبێت.

دوو پیاو بەوای نزیکبوونەوە لێی هەودای بیرکردنەوەیان پساند، لەچاوانیانەوە تاوانکاری دیاربوو، ما نەفرەت لەگەمژەیی خۆی بکات، کە بەم دۆخەی گەیاند، هەردوو پیاوەکە بەرامبەری وەستان، یەکیان ڕیشی خۆی دەخووراند و بە دیقەتدانێکی ناڕەحەت لێی ورد بووەوە و گوتی:

-تۆ کاریسۆنی یا کارسۆن ئەو شێتەی لەبانەڕۆژەوە هاتووە، وایە؟

کارلسن دیقەتی دا و وەڵامی نەدایەوە، پیاوانگەلێک بەدەوەی تاوانبارەکە گربووبوونەوە، ئەوانیش تاوانکاری لەچاویانەوە هیچی لەو کەمتر نەبوون، بەگاڵتەجارییەوە تاوانبارەکە گوتی:

-شێتە پێبڵێ، لە سەردەمی ئێوە ژن هەس؟ یانی...

بەدەستەکانی شێوەی ئافرەتی کێشا، هاوڕێکانی دایان لە قاقای پێکەنین، کارلسن گوتی:

-بەڵێ ژنمان هەس، ئەوان لە پیاوان زۆرترن.

یەک لەپیاوەکان فیکەیەکی کێشاو بەدەم لێو گەستنەوە گوتی:

-وادیارە سەردەمی خۆشگوزەرانی پیاوانە، تۆ چ هیچوپووچێکی بەختەوەریت.

ئەوتاوانبارەی گەورەی ناویانە گوتی:

-لەسەردەمی ئێمە زیندانی چۆن دەبینی؟ لەزیندانییەکانی سەردەمی ئێوە دەچێت، یا لەسەردەمی ئێوە پاسەوانەکان ژنن؟

کارلسن گوتی:

-لەسەردەمی ئێمە زیندان هەر نییە، ئەوە بیرۆکەیەکی گەمژانە بوو، بنیادەم دایهێنا، وەلێ دوای ئەوەی بازنگی پێ داهات، وازیان لەزیندانی هێنا.

پیاوەکە سەری سوڕما و بە جیددی لێی پرسی:

-ئەو بازنگە نەفرەتییە چییە؟

کارلسن گوتی:

- لەسەردەمی من هەر تاوانبارێک دادگایی بکرێت و حوکم بدرێت، ئەو بازنگە دەکەنە پێی، ئازادانە لەناو شار دەسووڕێتەوە، کەس کێشەی لەتەکیا نابێت، لەبەر ئەوەی دیار نییەو بە ژێر پانتۆڵەکەیەوەیە، ئەو بازنگە زۆر هەستیارە بەرامبەر هەندێ ماددە کە جەستە دەریدەدات لەکاتی تووندو تیژیدا، ئەگەر جەستە ئەو ماددەیەی دەردا، بازنگەکە لاقی بەتووندی دەگووشێت، لەتاو ئازار خۆی بە پێوە ناگرێ، بۆیە ماوەی سزاکەی بەو بازنگەوە ناتوانێت تووندو تیژی و شەڕانگێز بێت.

پیاوەکان لەیەکیان ڕوانی و گەورەکەی ناویان گوتی:

-کەواتە ئەو ژیانە بێزارکەرە، زیندان زۆر باشترە، یانی کە من شێتێکی وەک تۆم تووش دەبێت، دەمار دەمگرێت حەزدەکەم شاپێکت پیا بکێشم، دەتەوێ لەوەشم بکەن؟

پیاوەکە دەستی بەرز کردەوە بە بناگوێی کارلسن بکێشێت، لەپڕ داچەمییەوە، ئازارێک لاقی گووشی، گوتی:

-ئای خودایە! لاقم ئازاری پێگەیشت، ناتوانم لەم شێتە بدەم، ئەو ژیانە وەک دۆزەخ وایە، کەواتە خۆم دەکوژم.

پیاوەکان دایان لە قاقای پێکەنین بەو نمایشەی گەورەکەیان کردی، کارلسن گوتی:

-خۆ ئەگەر بتەوێت خۆتیش بکوژیت، بازنگەکە زیاتر گووشار دەخاتە سەر لاقت، چونکە خۆ کووشتنیش نیشانەیەکە لەتووندو تیژی.
پیاوەکە گوتی:
-نەفرەت لەخۆت و سەردەمەکەت.
دەستی بەرزەوە کرد و شەپازللەیەکی بەهێزی بە (کارلسن)دا کێشا، کارلسن بەرەو دوا بەسەر پشتا کەوت، ئەوجا پیاوەکان لێی گردبوونەوە و وەک گەمییەک گەمەیان لەتەکیدا دەکرد.

☼ ☼ ☼

بە ڕوخسارێکی نائومێدانەوە کە شوێن لێدانی پێوە دیارە، کارلسن لەپشت پەنجەرەی کابینەکەوە تەماشای پیاوێکی قژ سپی کرد خەریکی ڕێکخستنی چاوێلکەکەی چاوی بوو، لەپشتی کابراشەوە پێنج کەس لە (کارلسن)یان دەڕوانی، وەک ئەوەی بوونەوەرێکی ئاسمانەوانی بن، کابرای سەر سپی گوتی:
-گەورەم ئەگەر دەزانیت ئێمە چەند هۆگری تۆین و ناکرێت مشوورت نەخۆین، وەلێ دەستەبەری دەرکردنت پارەیەکی زۆر زۆرە، بۆ خۆشت دەزانیت ئێمە هەوادارین لە زانکۆی (ماساشوسیتس)، هەر ئێمەش بووین ئەو کۆنفرانسەمان سازدا، بەو ئاواتەی کەسێک گەشتەوانی نێو کات بێت و ئامادەی ناومان بێت، بۆخۆم ئامادەبوونتم بیرە، تەنانەت ئەو گفتوگۆ مەزنەشت مایەی شانازییە، خۆزیا بتگوتایە کە تۆ گەشتەوانی نێو کاتی، ئەودەم لێت کۆدەبووینەوەو نەماندەهێشت گفتوگۆکەشت لەنێو زینداندا بێت.

کارلسن بەدەم تەماشاکردنی دەموچاوەکانەوە کە سۆسەیان دەکرد، گوتی:

-باوەڕم پێبکە دوایین شتێک لەماوەی گەشتکردن بەنێو کاتدا بابەتگەلی ڕۆژنامەگەری بێت، ئێمە ئەو گەشتە بۆ هەوەس ناکەین، بەڵکو بۆ چالاکی کردنی دیاری کراوە، ئەو گەشتەش بەسەرپەرشتی حکومەتەوە دەبێت.

کابرا سەرسوڕمانێک بەڕوخساریەوە دەرکەوت، گوتی:

-زۆر باشە، ئەوە وەک (جۆن تیتۆر)ە، ئەو گەنجەی بەسەر ئەنتەرنێتەوە دەرکەوت و گوتبووی کە گەشتکەری نێو کات بووە، کارەکەشی گەڕان بووە لەئامێری کۆمپیوتەری کۆنستایلی (IBM 5100) لەبەر ئەوەی لەسەردەمی بانەڕۆژیدا گرفتێکی تەکنیکی گەورەی هەبووە، چارەسەریشی دەستکەوتنی یەک لەو کۆمپیوتەرە کۆنەیە، تا کۆدە ئاڵۆزەکانی بکاتەوە، بەوای گەڕانمانەوە گەورەم زانیمان جۆن تیتۆر ڕاستەقینەیە، لەبەر ئەوەی زانیاری ئەو ئامێرە کۆنە دەتوانێت کۆدەکان بکاتەوە، ئەوەش زانیارییەکە کەس نایزانێت، مەگەر کەسێک بێت لەکۆمپانیای (IBM) کاری کردبێت، ئەویش بەوای ئەوەی تایبەتمەندییەکە پێشکەوتووان لەو ئامێریان ناوەو هەرگیز بە ئاشکراش بەکار نەهاتووە.

کاتێک کارلسن گوێی لەناوی جۆن تیتۆر بوو خەنییەوە و هیچی نەگوت، دواتر هەڵیداو گوتی:

-ئێوە بۆچی لێرەن؟

پیاوەکە لە شووشەی پەنجەرەکە نزیکبووەوە، بەوریاییشەوە لەدەوروبەری خۆی ڕوانی و گوتی:

-تکایە گەورەم، سوێندت دەدەم بە خۆشەویستانت پێمان بڵێ، چۆن توانیتان ئەو گەشەتەی نێو کات بکەن؟ ئەو ڕێگایە چییە؟ شتێکمان هەر پێبڵێ، لەڕاگەیاندنەکان بڵاوی ناکەینەوە.

کارلسن گوتی:

-ئێوە لەسەردەمێکدان زانا فیزیکییەکانتان بەجۆرێک بیر دەکەنەوە، بۆخۆم زانایەکی بەناوبانگی فیزیکم، ئەگەر باس لەگەشتی نێو کات بکەم بەشێتم ناودەبەن، ئەم ماوەیەش پاشەکشە دەکات و فیزیکییەکان زۆر بە ڕاشکاوانە باس لەگەشتی نێو کات دەکەن، کە بەپێی زانست هیچ شتێک مەحاڵ نییە.

پیاوەکە گوتی:

-چۆن، تکایە پێمان بڵێ.

ئەوانەی پشتیشەوە بەوای پەرۆشیانەوە بۆ گوێگرتن لەکارلسن نزیکبوونەوە، کارلسن گوتی:

-سەردەمێک دێت، زاناکان مەزەندەی ئەوە دەکەن گەشت بۆ ڕابردوو دەکرێت، وەلێ گەشتکردن بۆ دواڕۆژ مەحاڵە، دواتر بۆیان دەردەکەوێت گەشت بەرەو بانەڕۆژ زۆر ئاسانترە، یەکەم شت دەبێت بۆ ئەنجامدانی.

پیاوەکە کاغز و پێنووسێکی دەرهێنا و گوتی:

-گەورەم هەرچیت هەیە بیڵێ، بەڵێنیش بێت وشەیەکی بڵاو نەکەمەوە.

کارلسن گوتی:

-ئەگەر دوو ئۆتۆمبێل لەیەک شوێن وەستابوون، گوتم لەئۆتۆمبیلێکیەوە ڕاکە بۆ ئەویتر، ئەو ماوەیە لەکاتێکی دیاری کراودا بە پێی خێراییەکەت دەیبڕیت، بەڵام ئەگەر گوتم هەردوو ئۆتۆمبێلەکە بەهەمان خێرایی بکەونە گەڕ و هاوشانی یەکتر بڕۆن، داوام لەتۆش کرد بەهەمان خێراییەکەت لە ئۆتۆمبێلی یەکەمەوە بۆ ئەویتر بڕۆیت، کە بەردەوامن لەڕۆیشتن، ئەوا گەیشتنت بۆ ئۆتۆمبێلی دووەم بەماوەیەکی درێژتر دەگەیت، ئەگەرچی ماوەی نێوان هەردوو ئۆتۆمبێلەکە هەمان ماوەیەو خێراییەکەی تۆش نەگۆڕاوە، وەلێ لەڕاستیدا کاتەکە درێژتربوو، کەواتە ماوەیەکی زیاترت بڕی بۆ گەیشتن بە ئۆتۆمبێلی دووەم.

کابرا سەری بەحاڵی تێگەیشتن بۆ کارلسن دانواند و گوتی:

-بەڵێ گەورەم ئێمە ئەوە دەزانین، تاقیکردنەوەیەکیشمان بۆ ئەو مەبەستە کردووە، کاتژمێرێکی (لم)مان خستە گەڕۆکێک بەدەور زەوییەوە، کە هاتەوە بەراوردمان کرد لەتەک کاتژمێرێکی (لم)ی سەرزەوی، بینیمان ئەوەی ناو گەڕۆکەکە دواکەوتووتربوو، یانی هێواشتر کاری دەکرد وەک لەوەی سەرزەوی، جووڵە کات لەسەرخۆتر دەکات.

کارلسن گوتی:

-تەنها هەر جووڵە نییە کارێگەری بەسەر کاتەوە، تەنی گەڕۆکەکەش، کات وەک ڕووبار وایە، لەهەندێک شوێن خێراتر دەڕوات و لەهەندێ شوێنی تر

لەسەرخۆ، هۆکاری ئەوەی خێراییەکەی کەمتر دەکات، تەنی زەوییە، یانی هەرکاتێک تەنەکە گەورەتر بوو، ئەوا خێرایی ڕووبارەکە کەمتر دەبێت، هەر وەک چۆن گابەردێکی ناو ڕووبارەکە خێرایی ئاوەکە کەمتر دەکات، بەو شێوەیە کات لە بۆشایی ئاسماندا خێراترە.

کابرا بەدەم نووسینەوەی زانیارییەکان گوتی:

-گەورەم قسەکانت ئاڵتوونن!

کارلسن گوتی:

-لەوە گەڕێ، تەنها ڕێگا بۆ داهێنانی ئامێری کات، بەزووترین کات و بەخێرایی تیشکی ڕووناکی بۆی بکەویتە گەڕ، ئەگەر ئەوەتکرد بەرەو بانەڕۆژت دەبات.

گەنجەکە گوتی:

- چۆن بەرەو بانەڕۆژت دەبات؟

کارلسن بەگەنجەکەی گوت:

-وادابنێ شەمەندەفەرێک بە خێرایی 99% بەخێرایی ڕووناکی دەڕوات، واشدابنێ ئەو شەمەندەفەرە بۆ ماوەی 100 ساڵ بەدەور زەوییەوە خولایەوە، دەزانیت سەرنشینەکانی ناو شەمەندەفەرەکە تەنها یەک هەفتەیان بەسەرا تێپەڕیوە، لەبەر ئەوەی کات لەناو شەمەندەفەرەکە زۆر لەسەر خۆ بووە، ئەویش بەوای ئەو خێراییەی بەرامبەر خێرایی تیشکەکەوەبووە؟ یانی سەدەی داهاتوو دەگەنەوە زەوی، ئەمە گەشت نییە بەنیو کاتدا؟

هەر هەموویان بەسەرسوڕمانەوە لێیان ڕوانی، بەتەمەنەکەیان گوتی:

-ئایا شتێکی واتان درووست کردووە بگات بەو خێراییە؟

کارلسن گوتی:

-بەڵێ درووستمان کردووە، بەڵام هێشتا بەکارمان نەهێناوە بۆ گواستنەوە بۆ بانەڕۆژ، بەدەر لەو پەرۆشییەی لەچاوەکانتانایە، خۆ ئەگەر بەیەکێکتانم ڕاگەیاند، کە سواری ئەو ئامێرە بوو بۆ ماوەی یەک هەفتە، کە دەگەڕێتەوە دەبینێت هەموو ئەوانەی خۆشیویستوون، مردوون، ئەوەش بوو بە مێژوویەک کەس خۆبەخشی ئەو گەشتە ناکات.

یەک لەگەنجەکان گوتی:

-یانی دەتوانێت بۆ نموونە گەشتی بیست ساڵ بکات نەک سەد ساڵ.

کارلسن پێکەنی وگوتی:

-بڕوام پێبکە ئەگەر تەنها ساڵێک لەم خاکە دوورکەوتیتەوە، خەڵکی تۆیان بیر نامێنێت، دواتر کێ دەڵێت کە بۆساڵێک گەشتی بانەڕۆژت کرد، هەموو شتێک وەک خۆی دەبینیتەوە؟ کارەکەت، ماڵەکەت، ئەو کچەی خۆشت دەوێت.

پیاوەکە پێیگوت:

-کەواتە گەشتکردن بۆ بانەڕۆژ دەکرێ بکرێت، وەلێ چۆن بۆ ڕابردوو گەشتت کرد، ئەوە مەحاڵە، ڕابردوو ڕووداوی جێگیرە، ناتوانرێت دەستکاری لەو حاڵەدا بکرێت.

کارلسن بەهێمنییەوە گوتی:

-تۆ بەئاسانی دەزانیت ئەو شوێنکاتەی کە ئینیشتاین وەسپی کردووە؟ لەناو شوێنکات شتێک هەیە بەناوی کونی کرمۆکە (Wormhole)، زۆر زۆر بچووکە، لەگەردیش بچووکترە، ئەو کونە کرمۆکەیە دەکەوێتە نێوان دوو کات یا دوو شوێنەوە، کونێکی زۆر سەیرە، دەکەوێتە نێوان دوو سەردەم یا دوو شوێنەوە، دەبینیت ئەلیکترۆن کە چووە ناویەوە لەشوێنێکی ترەوە و لەهەمان کاتدا دەردەچێت، یانی ئەلیکترۆنەکە لەهەمان ساتدا و لەدوو شوێن دەرکەوت، یا جاری وا هەیە پیا ڕەت دەبێت تا لەساتێکی تردا دەردەکەوێت، کەواتە ئەلیکترۆنەکە لەدوو کاتدا و لەهەمان ساتدا هەیە.

کابرا چون ئەوەی پێشی لێبگرێت گوتی:

-گەورەم ئەو کونە کرمۆکەیە باسیان لێوە کردووە، بەڵام زۆر بچووکە، تەنها لەگەرد بچووکتر پیا ڕەت دەبێت، نەک بنیادەم، تەنانەت لەجیهانی تەنۆچکەکانیشدا شتێکی جێگیر نییە، یانی لەهەمان کاتدا دەردەکەوێت و ون دەبێت.

کارلسن دایە قاقای پێکەنین و گوتی:

-بەڕێز لەسەردەمی ئێمە زاناکان توانییان ئەو کونە گەورە بکەنەوە، بۆ بلیۆنان جار تا مرۆڤ پیا ڕەت بێت، تەنانەت کەشتی حەواییشی پیا ڕەت بێت، هۆکاری جێگیربوونیشیان بۆ سازاند، ئەوە شۆڕشی تەکنەلۆژیا بوو، وای لەمرۆڤ کرد بتوانێت بەساتپەڕینەوەدا لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر

بگەڕێت، تا بەکارهێنانی ئامرازی گواستنەوەش بوو بەڕابردوو، وایکرد مرۆڤ بتوانێت گەشت بۆ ڕابردوو بکات، تەنانەت بۆ بانەڕۆژیش بۆ ـ اتە وەخت.

* * *

لەدەروازەی زیندانی (ڕایکەرز) ئەو گەنجەی لەکۆنفرانسەکە لەتەک کارلسن هاتە ژوورەوە، پاڵتۆیەکی لەبەردا بوو، چاوێلکەیەکی بەرهەتاویشی بە چاوەوە بوو، تا ڕوخساری خۆی پێ بشارێتەوە، کاتێک چووە ناو کابینەی سەردانیکەران، بینی گەنجەکان لای (کارلسن)ەوە دەردەچوون، گوێی پێ نەدان، ئەوانیش بەڕێی خۆیاندا ڕۆیشتن، ئەوەی لەو زیندانە دەردەچێت، ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان دەبێت، تا پاسێک یا ئۆتۆمبیلێکی کرێ ڕەت دەبێت، بەدەم چاوەڕوانییەوە بە پەرۆشیەوە قسانیان دەکرد، یەک لەو گەنجانە لەپڕ هەڵچوو، وەک ئەوەی جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت، بەدەم تەماشاکردنی مۆبایلە ستایلە کۆنەکەیەوە گوتی:

-ئەوە مەحاڵە، بەهەچ ڕێگایەکی سەرزەوی بێت مەحاڵە، مەحاڵە!

چاویان لەوە بڕی کە گەنجەکەی سەرسام کرد، هەواڵێکبوو لەیاهوەوە، کە ئەندرۆ کارلسن دەستەبژێرییەکەی دراوەو هەنووکەش ئازادە، بەو ئاوایەی دوای مانگێک لەدادگا ئامادە بێت، مامۆستاکەیان کە چاوێلکەکەی ڕێکدەخست گوتی:

-ڕێک ئەو هەواڵە کەییە؟

گەنجەکە گوتی:

-کاتژمێرێک لەمەوپێش.

گەنجەکە دەستی بەیەکا کێشا، ئاخر بەر لەکاتژمێرێک لەسەردانیکردنی کارلسن بووبوونەوە، کەی ئەوە ڕاستە بەر لەکاتژمێرێک ئازاد کرابێت؟ یەکێکیان دیقەتیانی داو گوتی:

-ئای ئاسمان، ئەی نەیگوت ئەلیکترۆن لەدوو شوێندا و لەهەمان کاتدا و لەدوو کاتیشدا و لەهەمان ساتدا دەبێت، ئەگەر کونە کرمۆکەی تیا بەکارهات، زاناکانی سەردەمی ئەو.. بەنەفرەت بێت تۆ بڵێی...

لەشوێنێکی دوور ئەندرۆ کارلسن لەتەک (جی تی) هاوڕێی لەدارستانی (بلاک ریفەر) لە نیۆیۆرک دەڕۆیشتن بەرێوە، پێیگوت:

-تیتۆر زۆر دواکەوتی، توخوا خەریکی چی بوویت؟ لە ئەنتەرنێت قسەت لەتەک خەڵکدا دەکرد؟ ڕۆژگارێکی زۆر سەختم بەسەر برد، باوەڕ ناکەیت چەند سەخت بوو.

جۆن تیتۆر بە هاوڕێکەی گوت:

-لەبەر ئەوەی تۆ زۆر گەمژەیت، زانیاری بڵاو دەکەیتەوە، سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆت ڕادەکێشیت، پێویست ناکات خۆت دەربخەیت.

جۆن تیتۆر لە گیرفانیەوە ئامێرێکی دەرکرد، خەڵکی سەر زەوی شتی وایان نەبینیبوو، تەنها یەک دوگمەی لێدا، گوتی:

-کارلسن خەڵکی هەروا بەگەمژەیی دەمێننەوە، پێیان سەیرە یا ناچێتە عەقڵیانەوە ئامێرێکی کات هەبێت پریشکی خولگەیی دەرکات و خەڵکی

لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر بگوێزێتەوە، تا هۆشیان دەبێتەوە، کە گواستنەوە بەنێو کاتدا زۆر ئاسایی دەبێت.

لەپڕ بە حەواوە شتێک وەک کەلێنێک دروستبوو، هەر لەکەلێنی دیوارێک دەچوو وەلێ دیواری با، دواتر گەورەتر بووەوە، تا وەک دەمی ئەشکەوتێک لێهات، ناو ڕەش، تیتۆر بەرەو پیری ڕۆیشت، (کارلسن) بەدوویەوە، کارلسن گوتی:

-گرەو دەکەم هەستی خۆیان لەوێ دادەهێنن، بەپێی قسەکەی تۆ ئەگەر دەستەبەرییەکەت نەدابایە، تۆیان نەدەخستە ژوورەوەو لێلمدا دایاننەدەنیشاندی، ئەگەر تۆیان لەتەکما دانەنایە، نەتدەتوانی ئەو ئامێرە لەناو زیندانەکە دەربهێنیت و لەچاوپروکانیکدا لەوێوە بۆ ئێرە بمانگوێزێتەوە، لەڕاستیدا من پەرۆشی ئەو زەمەنەم بە هەموو گەمژەییەکمەوە.

* * *

شارلۆتان لەجێی خۆی ڕاستەوەبوو، لەسەرخۆ بەرەو پیرم هات، دڵم کەوتە غایەلە، گوتی:

-من لەمل ئەم بێ مێشکە نادەم، تا گوێ لەحوکمی ئێوە نەگرم، ڕەنگە قسەی ئێوە فریای کەوێت، شێخ خالید باوەر بەوە دەکەیت گەشت بەنێو کاتدا بکرێت، کە ئەم پیاوە لەقسەکانیدا ڕاستگۆبووە.

دڵم خورپەیەکی کرد، تەماشای (کارلسن)م کرد، ئەویش بەچاوی پاڕانەوە سەیری دام، نەمزانی چی بڵێم، وەلێ دارکوتانەکەی شارلۆتان بە قەفەسەکەمدا ناچاری کردم قسە بکەم، گوتم:

-ئەوەی لە ئایندا هاتووە، رێک باسی ئەو گەشتە نەکراوە، بەڵام بەشێوەیەکی تر، گەشت دژ بە نەبینراوییە کە غەیبە، خودا نەبێت کەس غەیب نازانێت، ئاخر چۆن بڵێین کەسێک گەشت بۆ بانەڕۆژ دەکات، تا بەهەواڵێک بگەڕێتەوە، ئەوە کوفرە.

شارلۆتان وەک حاڵیبوونێک لێوی خۆی گەست و گوتی:

-ئەندرۆ پێدەچێت یەکەم دەنگدانی نیگەتیفت وەرگرتبێت.

ئەوجا بەرەو قەفەسی توێبە بەڕێکەوت، کەمێک لای قەفەسەکەی توێبە وەستا، توێبە دەتگوت لەترسا زمانی لەگۆ کەوتووە، شارلۆتان گوتی:

-ئەی (یەمەنی) قسە بکە، دەنا هەر لێرە لەبری ئەو لەسێدارەت دەدەم.

توێبە بە زمانێکی ترساوەوە گوتی:

-من وای دەبینم گەشت بەنێو کاتدا ئەگەری هەبێت، لە قورئاندا هاتووە خودا وای لە زەلامێک کردووە بەرەو بانەڕۆژ گەشت بکات: (( وەک ئەوەی بەلای شارێکدا تێپەڕی، کە چۆڵ و وێرانەبوو، وتی چۆن خودای مەزن ئەمە زیندوو دەکاتەوە لەدوای مردن، ئەوجا خودا بۆ سەدساڵ مراندی و پاشان زیندووی کردەوە، فەرمووی چەندێک مایتەوە، گوتی ڕۆژێک یان تاقێک لەڕۆژ

ماومەتەوە، گوتی بەڵکو سەدساڵ ماویتەتەوە)) (سورەتی ئەلبەقەرە، ئایەتی 259).

خۆم بۆ ئامادە کرد تا پێی ڕابگەیێنم ئەوە بە پشتیوانی خوداوە بووە، شارلۆتان نیگای ئاگادارکردنەوەی تێبڕیم، بێدەنگی کردم، سەری بۆ توێیە ڕاوەشاند و دواتر لەبەرامبەر قەفەسی ئەمریکییەکە وەستا، هەر زوو ئەمریکییەکە گوتی:

-هەر بەڕاست گەشت بەنێو کاتدا هەبووە، ئێمە کاتێک لە ئەستێرەکان دەڕوانین، ئەوا لە ڕابردوو دەڕوانین، ئەو ئەستێرانە تەقینەوەو ونبوون، ئێمەش کەتەماشای دەکەین، ئەوە وێنەی ڕابردووە، ئێستا پێمان دەگات، ئەگەر تەلسکۆبێکی زۆر پێشکەوتوومان هەبێت، ئەوا دەمانتوانی ڕووداوەکانی ڕابردووی ئەستێرەکان ببینین، کە بۆ خۆمان لە ئێستادایین.

شارلۆتان برۆکانی بە ئەدای ڕازیبوون بەرز کردەوە، تەماشای قەفەسەکەی تری کرد، کە کارمەندی پێشوازی تێدابوو، لەهۆش خۆی چووبوو، گوێی پێنەداو چووە لای قەفەسی سەرپۆش بەسەرەکەوە، کە چوار مشقی لەسەر زەوییەکە دانیشتبوو، چون ئەوەی گوێ بەهیچ نەدات، شارلۆتان پێیگوت:

-تۆ ئەی چینی، چی دەربارەی ئەوەی بیستت دەڵێیت؟

ئافرەتە چینییەکە ئامادەی هیچ وەڵامێکی نەبوو، وەک ئەوەی گوێی لەوە نەبێت چی بەسەر دێنێت، شارلۆتان یەک دوو داری بە قەفەسەکەدا کێشا،

نقەی نەکرد و جووڵەشی بۆ نەکرد، وەک ئەوەی پەیکەرێک بێت، شارلۆتان پێیگوت:

-قسەکە قسەی تۆ ڕەنگە ببێتە هۆی ڕزگارکردنی کەسێک، قسەبکە، باوەڕت بەگەشتی نێو کاتدا هەیە؟

ئافرەتە چینییەکە لەسەرخۆ لای لە شارلۆتان کردەوە، دواتر بە نا سەری بۆ ڕاوەشاند، سەری داخستەوە، شارلۆتان گوتی:

-زۆر باشە دوو دەنگی نەخێرت بۆ بوو، دوو دەنگی تری بەڵێشت هەن، تەنها دەنگی منت ماوە.

بەرامبەر قەفەسەکەی ئەندرۆ وەستا و چاوی زەق زەق لێ کردەوەو گوتی:

-کاتێک خەڵکی دوای جۆن تیتۆر دەکەوێت کە لەبەسەرهاتەکەتدا باست کرد، بۆیان دەرکەوت کۆمپانیایەک هەیە بەناوی( The Gohn Titor Foundatin) خاوەنەکەشی یارێزەرەو لەگەڵ کۆمپانیای بەرهەمهێنانی زۆر گەورە وەک (دیزنی) کاردەکات، بۆشیان دەرکەوت برایەکی هەیە ناوی (جۆن)ە و زانایەکی کۆمپیوتەرە، هەر خودی ئەو جۆن تیتۆرە و درۆی زۆری بۆ خەڵک کرد، وەک کات بەسەر بردن، گوتبووشی گەشتی بەنێو کاتدا کردووە، ئەوەی ئەو تیا سەرکەوتوو بووە، بەوای ئەوەوە بووە کە زانیارییەکی زۆری لەسەر کۆمپانیای (IBM) هەبووە.

ئەندرۆ بەوای ترسێیەوە چاوەکانی زەق بوونەوە، وەک ئەوەی چاوەڕوانی سەربڕین بێت، شارلۆتان درێژەی بەقسەکەی دا و گوتی:

-هەرچی تۆی ئەندرۆ کارلسن.. ئەگەرچی چیرۆکەکەت لەهەواڵە جیهانییەکان وەک تایمز و گاردیان و یاهوو بڵاوبووەتەوە، دوای گەڕان و پشکنین دەرکەوت هەموو ڕاگەیاندنەکان چیرۆکەکەیان لەیەک سەرچاوەوە وەرگرتووە، ئەویش (Weekly World News) ڕۆژنامەی زەردە، ڕۆژنامەیەکی ئاسایی نییە، ڕۆژنامەیەکە لە هەموو تێبینییەکی بچووکیشدا و لەهەر ژمارەیەکدا دان بەوەدا دەنێت کە هەواڵەکەی هەڵبەستووە، بۆ کات بەسەربردنی خەڵک، دەتەوێت هەندێک لەو مانشێتانەی ڕۆژنامەکەت بۆ بخوێنمەوە، هەی درۆزن؟

کارلسن هەوڵیدا پارێزگاری لەخۆی بکات، وەلێ شارلۆتان زۆر بە توندی بەقەفەسەکەیدا کێشای و گوتی:

-دە ڕێگا هەن بۆ ئەوەی بزانیت هاوڕێکەت بوونەوەری ئاسمانین یا بنیادەمی ئاسایین، هەڵهاتنی تواوەیەک لە زیندان، بوونەوەرە ئاسمانییەکان کە لەداروپەردووی یۆفۆ نۆزرانەوە کاری ناباویان دەکرد، دەستبەسەرداگرتنی ئیبلیس لە عێراق و سووتاندنی ئەمەش وێنەکانێتی، ئەژدیهای زەبەلاح هورووژم بۆ فڕۆکە ئەمریکییەکان دەبەن، هیترت بۆ بخوێنمەوە، یا تێگەیشتی هیچ و پووچ؟

ئەندرۆ بلەز گوتی:

-گەورەم.. ئەو ئاژانسە جیهانیانە مەحاڵە چیرۆکێک لەڕۆژنامەی زەرد وەربگرن، کە دەزانن ڕۆژنامەیەکی درۆزنە، یا بەدرۆ ناوبانگیان دەرکردووە، هەموو ئەو سایتانە لەسەر چیرۆکەکەم نووسیان، چونکە ڕاستی بوو.

شارلۆتان گوتی:

-دەستەی دراو و بۆرسەی ئەمریکی (SEC) ئەندرۆ کارلسن لەسایتی خۆیان درۆی چیرۆکەکەتیان بڵاو کردەوە، گوتیان گوێان لەکەسێک نەبووە بەو ناوە، تەنانەت فەرمانی دەستگیر کردنیشی بۆ دەرنەچووە، کە فێڵی لەبۆرسە کردبێت بەو شێوەیەش، گوتیان ئەوە قسەی هیچ و پووچە.

ئەندرۆ بەرپەرچی دایەوەو گوتی:

-دەبێ هەر وا بڵێن، ئەو دەستەیە بۆ بەرژەوەندی گەورە پیاوان و بازرگانان کاریان دەکرد، ئەو ماوەیە عەرشیان شێوا.

لەپڕ ئەندرۆ داچڵەکی و بەرزەوە بوو، وەک ئەوەی برووسکە لێدابێت، دواتر بەسەر پشتا کەوت و ئازاری زۆری بوو، دیاربوو شارلۆتان پەنجەی بەسەری دارەکەی دەستیەوە نابوو، گوتی:

-کارلسن بیرت چوو لەچیرۆکە خەیاڵئامێزەکەت بڵێیت ئەم بازنگانە بۆ سەرکوتکردنی تووندوتیژی تاوانبارانە، کاتێک پێویست بکات دەتوانیت وەک ئامرازێکیش بۆ لەسێدارەدان بەکاری بهێنیت.

شارلۆتان دووبارە دەستی بە دوگمەی دارەکەیدا هێنا، کارلسنی هەڵپەڕاند، وەک ئەوەی بازنگەکەی کارەبای تێدا بێت، لیک بەدەموپلیدا هاتە خوارەوە، شارلۆتان گوتی:

-درۆ دەکەن و خەڵکیش باوەڕتان پێ دەکات، بەو ئاوایە نەوەیەکی گەمژە دادەهێنن، هیچ چارەسەرێکتان بۆ نییە، تا بێدەنگ بکرێن، تەنها کوشتنتان نەبێت.

بۆ جاری سێیەم پەنجەی بەدوگمەکەدا هێنا، ئەندرۆ هاوارێکی لێ بەرزەوەبوو، دوایین هاواری بوو، دواتر گیانی دەرچوو، بەسەر دەما کەوت و بوو بەلاشەیەکی بێ گیان، جووڵەی لێ بڕا، شارلۆتان بە تووڕەییەوە لەئەمریکییەکەی ڕوانی، بەدەم نزیکبوونەوەی لەقەفەسی ئەمریکییەکە گوتی:

-با بزانین ئەی ئەمریکی ڕەگەزپەرست چی لەهەمانەکەی تۆدا هەیە.

ما ئەمریکییەکە بین بخواتەوە، تا خۆی گردکردەوە و چاوی نووقاند و دەستی بەگێڕانەوە کرد، هەموومان بەوای قسەکانیەوە تووشی شۆک بووین.

# 9

# چیرۆکی گۆشتی مرۆڤخۆرەکان

## جۆزیف لیستەر دەیگێڕێتەوە

( بە چەقۆ و چەتاڵ گۆشتی مرۆڤە مردووەکان دەخۆن، بەو بەروانکانەی بە سەر سینەوەیانە، ئەو بزەخەنانەش کە بەسەر لێویانەوەیە)

نازانم چۆن چیرۆکێکی وا بگێڕمەوە، چەندم حەز دەکرد لەشوێنێکی تر نەک لەم شوێنە نەفرەتییە بیگێڕمەوە، بەڵام ئەوەتا ناچارم بەگێڕانەوەی، ئەوا منیش دەینێمە بەر دەستتان ئەمە خوایە لەدۆزەخ بیری بکەنەوە.

هەموو نەفرەتییەکانی سەر ئەم گۆی زەمینە لەکەللەی پیاوێکی بێزراوەوە دەرچوو کە ناوی (تشارلز لۆسیانۆ)یە، یا وەک بە لۆسیانۆی بەختەوەر ناوزەدیان دەکرد، یەک لەتاوانبارە بلیمەتەکانە، کە پۆلیس بۆ ماوەیەکی زۆر بەدوویدا دەگەڕا، تا سەرئەنجام لەزیندانی نیۆیۆرک زیندانی کرا. لۆسیانۆ ئەو پیاوەی باوکی ڕوحی مافیای ئەمریکی بوو، نازناوی بلیمەتی تاوانباریان بەسەرا سەپاند.

نازناوی لۆسیانۆی بەختەوەری کە لێنرا، ئەویش لەڕووداوێکی بەناوبانگەوە بوو، کە لەگەنجیدا ڕوویداوە، سێ پیاوی بەهێز دەیگرن و دەیخەنە ناو ئۆتۆمبێلێکی لیمۆزین و تەقەی لێ دەکەن، یەکێکیان خەنجەرێکی پێبووەو کێشاویەتی بەدەموچاویدا، بەدەر لەو هەمووەش لۆسیانۆ توانیویەتی

لەدەستیان هەڵبێت و نەمرێت، بەڵام شوێنی خەنجەرەکە تا ئەمڕۆش بەدەموچاویەوە دیارە، لەو ڕۆژەوە لەنێو تاوانباران و باندەکان بە لۆسیانۆی بەختەوەر ناوەزەد دەکرا.

لۆسیانۆی ڕق هەڵگرتوو ئەوبوو خاوەنی بیرۆکەی تاوانباری تۆقێنەر، کە ساڵی 1950 جێبەجێکاری ئەو بیرۆکەیەبوو، قازانجی مافیا دوو ئەوەندەی تر زیادی کرد، بیرۆکەیەکی نەفرەتی بوو مافیای ئەمریکی داهێنا، هەر بەڕاست تا ئەمڕۆش خەڵکی بەو تاوانکارییە نازانن، ڕەنگە تا دونیا دونیا بێت هەر وا بێت.

وەک ئەوەی لای خەڵکی زانراوە یا نەزانراوە مافیای ئەمریکی سەر بەهەموو شتێکا دەکات، ڕێکخراوێکی باڵادەستە بەتایبەت لەقومارکردن، لە بازرگانی کردنی ماددە هۆشبەرەکان، بازرگانی کردنی چەک، ڕابواردن، تەنانەت لە چێشتخانەی گۆشتی مرۆڤ خۆرەکانیشدا.

هەر وەک ئەوەی گوێتان لێبوو، گۆشتی مرۆڤەکان، بیرۆکەیەکی تاوانکاری تازەیە، کە تشارلز لۆسیانۆ دایهێنا و سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا، سەرکەوتنێک بۆ خۆیشی باوەڕی نەدەکرد بەو جۆرە سەربکەوێت، نازانم چۆن ئەو بیرۆکەیە شرۆڤە بکەم، وەلێ لێمگەڕێن وەک عەقڵی لۆسیانۆی تاوانبار بۆتانی بگێڕمەوە.

کێشی گوێرەکە لە سەدەوە بۆ سەدوپەنجا کیلۆ دەبێت، گامێش و مانگاش هەروەسا، مەڕ لەوانەیە تا پەنجا کیلۆ بڕوات، کڕینی ئەو ئاژەڵانە پارەیەکی

زۆری دەوێت، ڕاگرتنیشی پارەی زۆری تێدەچێت، تەنانەت ئالیکیش پارەی زۆری دەوێت، وەلێ بوونەوەرێکی تر هەیە هیچی تێ ناچێت، کێشی گۆشتەکەی لەگۆشتی مەڕومالآت کەمتر نییە، نەک هەر ئەوە، گۆشتەکەی تامێکی زۆر بەلەززەتی هەیە، ئەویش بنیادەمە.

لۆسیانۆ بەشێوەیەکی جیاوازتر بیری کردەوە، ڕێژەی کوشتن لەمانگێکدا بەدەست کردەوەی مافیاکانەوە لە یەک ویلایەتی ویلایەتەکانی ئەمریکا دەگەیشتە سەد تا دووسەد کەس، مافیا هیچ گرفتێکی لەشاردنەوەی لاشەکاندا نەبوو، زۆرجار لاشەکەی بەجێ دەهێشت و دوور دەکەوتەوە، وەلێ دەبوو پارەیەکی زۆر وەک بەرتیل بە پۆلیس و دادگاو لێکۆڵەرەوەکان بدەن، هەرچی لۆسیانۆ بوو، لاشەکانی دەبرد و هەر ئەو لاشانەی دەکرد بە پارە، مەبەستم گۆشتی لاشەکانە.

من کێم؟ من پزیشکێکی ئەمریکیم، ناوم جۆزیف لیستەرە، پسپۆڕم لەنەخۆشییەکانی خوێن، لەژێر فەرمانی مافیا کاردەکەم، ڕێک لەژێر فەرمانی لۆسیانۆی بەختەوەر، لەکوێ کار دەکەم؟ دەتوانیت بڵێیت لەکوشتارگە کاردەکەم، کوشتارگەیەکی پێشکەوتوو لەناوجەرگەی نیۆیۆرک، کوشتارگەیەک لەو کوشتارگە گەورانەی هەن، کە وایکرد بیرۆکەی لۆسیانۆ بگۆڕدرێت بۆ ڕاستی واقیعەکە، کوشتارگەی گۆشتی مرۆڤەکان.

ئەو کوشتارگەیەی کاری تێدا دەکەم، ها لەناو یانەیەکی گەورەو مافیا بەڕێوەی دەبات، بریتییە لەبینایەکی ئاسایی لەناوەندی یانەکە، وەلێ کەس

بۆی نییە بچێتە ژوورەوە تەنها ئەوانەی ڕێپێدراون، کەسیش نازانێت کێن ئەوانەی ڕێیان پێدراوە.

هەموو بەیانییەک لەناو کیسەی ڕەشدا کۆمەڵێک لاشەم بۆ دێت، من و کۆمەڵێک پزیشکیتر پسپۆر لە بواری شیکاریدا دەبێت لاشەکە زۆر بەباشی بپشکنین، هەموو شیکارەکانی بۆ دەکەین و ئەوجا بڕیار دەدەین لاشەکە بچێتە نێو کوشتارگەکە یا نا، خۆ ئەگەر مردووەکە بە نەخۆشییەک نەخۆش بووبوو، ئەوا لاشەکە ڕەتدەکرێتەوە، خۆ ئەگەر هیچ دەردێکی نەبوو، ئەوا بۆ قۆناغی دووەم بەڕێدەکرێت، گرنگترین کردار لەم دۆخەدا ، کەوڵکردنە.

لەکەوڵکردن بەشێوازێکی ئەزموونداری و بەبەکارهێنانی باشترین ڕێگا پێستەکەی کەوڵ دەکرێت، ئەوجا لاشەکە بەرەو ژووری توێکاری بەڕێدەکرێت، لەوێ بە تەور پارچە پارچە دەکرێت و ناوسکەکەشی فڕێ دەدرێت، ڕێک وەک ئاژەڵ، ئەوجا دەبرێتە بەر پارچە کردنی وردتر، دواتر بەرەو ساردکەرەوەکان دەبردرێ، گشت ئەو قۆناغانە بە سەرپەرشتی من بوو، گوێم لەناختانە دوو پرسیارتان لێم هەیە: چۆن سوود لەو گۆشتە بەرهەمهێنە وەردەگرن؟ بۆچی کەس بەو چالاکییە قێزەونەی نەزانیوە؟ وەڵامی پرسیاری یەکەم کەمێک دوادەخەم، پرسیاری دووەم وەڵام دەدەمەوە:

هەموو کرێکارەکانی ئەو کوشتارگایەو ئەوانەیش هاوشێوەن لەهەرێمەکانی ئەمریکا مووچەیەک وەردەگرن، کە هیچ کەسێک لەسەر گۆی زەوی ئەو مووچەیەی پێ نادرێت، بۆیە کەس بیر لە خیانەت ناکاتەوە، هەر کرێکارێکیش

کە وەردەگیرێت، خوێندنەوەیەکی وردی بۆ دەکرا، تەنانەت پێیان گوترلوە هەر نهێنییەک بیانەوێ ئاشکرای بکەن، ئەوا بەخاو خێزانەوە لەناو دەبرێن.

گۆشتی مرۆڤەکان لەهەموو چێشتخانەکان هاوتای نییە، تەنانەت زۆر بەچێژترە لە گۆشتی ماسی و دەریاییەکان، ئەمەش دەمانباتەوە لای ئەو پرسیارەی کە دوامانخست، بەڵام لۆسیانۆ چۆن سوود لەو گۆشتە بەلەززەتە وەردەگرێت.

سەرەتای پرۆژەکە گۆشتەکان بۆ چێشتخانە ناوازەکان دەنێردران، کە مافیا لەئەمریکا سەرپەرشتی دەکرد، دواتر کار گەیشتە ئەوەی بۆ ئوتێلە گرانبەهاکان بنێردرێن، هیچ لایەنێکیش لەو لایەنانەی گۆشتەکەی بۆ ڕەوانە دەکرا، نەیاندەزانی گۆشتەکە گۆشتی بنیادەمە، ئەوان لەبەناوبانگترین کێڵگەی مەڕومالاتی ئەمریکا دەکڕدرا، ئەوەش کەس پێی نەدەزانی هەر مافیا بەڕێوەی دەبردن.

سەردانیکەرانی ئەو کێڵگانە بۆ خۆشیان شکیان لەو کیسە ڕەشانەی گۆشتە سوورەکان نییە، کە لەسەریان نووسراوە (تایبەت)، هەر هەموو فێڵیان لێدەکرێت، چونکە کەسێک نییە گومانی لەو گۆشتی مرۆڤ هەبێت، ئاخر نەکراوەو ناکرێت ئەو کێڵگە تایبەتانە کاری وا بکەن، لۆسیانۆ هەر بەوەشەوە دانەنیشت، دوورتر دەیڕوانی، ئەوەی مەبەستی بوو بەزیادەوە کردی.

لۆسیانۆ تەماحی زیاتری هەبوو، بۆ ڕەوانە کردنی گۆشت بۆ چوار ناوی بەناوبانگ، هەر ناوێکیش بریتییە لەزنجیرەیەک چێشتخانە (Fast Food)ی

ئەمریکی بەناوبانگ، کە لقیان لێبووەوەو زۆربەی شارەکانی دونیایان گرتەوە، ئەوەش مانای ئەوەبوو قازانجی زۆر گەورە بێتە دەست، بەدیوێکی تر ئەوە مانای زیادکردنی تاوانی کوشتن بوو، دەبوو زۆرتر بکرێت، بەلای سەرۆکی مافیای ئەمریکییەکەوە گرفت نەبوو، لەکوشتنی خەڵکی ئاسانتر نەبوو.

دوای ماوەیەک لەکارکردن لۆسیانۆ توانی بەخەونەکەی بگات، گۆشتی مرۆڤەکانی گەیاندە چوار ناوی بەناوبانگەکان، ئەمڕۆ گەورەترین زنجیرەی چێشتخانەکانی جیهانین، نەک هەر ئەوە بگرە ئەو چوار ناوە بەناوبانگەکەی چێشتخانەکان لە کێڵگەی لۆسیانۆ نەبێت گۆشتیان لەهیچ کێڵگەیەکی تر نەدەکڕین، تێبینی ئەوەیان کردبوو گۆشتەکەی لۆسیانۆ بەتامترە، بەو بۆنەیەوە کڕیارەکان تا دەهات زیاتر دەبوون، تا بەدونیادا بڵاوبووەوە، هەر کەسێک لەو گۆشتەی دەخوارد، هەستی بەجیاوازی لەگەڵ گۆشتەکانی تر دەکرد، ئەویش سیحری دەستی لۆسیانۆ بوو، تشارلز لۆسیانۆ.

بەڕێزان من گاڵتە ناکەم، کەسمان نییە لانی کەم لەمانگێکدا سەری بەو چێشتخانانە نەکردبێت، ئەوە قسەی منەو لاریم لەقسەکانم نییە، ئێمە لێمان خوارد، لەڕاستیدا هەر هەمووومان مرۆڤخۆرین، من لێرەم تا موچیارتان بکەمەوە، بەر لەوەی ئەو گاڵتەجاڕییە زۆرتر بێت و کوشتنیش بەوای ئەوەوە زۆرتر بێت.

لەو کارە نزیکەی دەساڵ کارم تێداکرد، تا ئەو ڕۆژە هات و ئێدی بەرگەی هیچی ترم نەدەگرت، تاوانی کوشتن زۆر زۆربوو، نابێت بێدەنگ بین، وەلێ

وەک دەزانین مافیا بەردەوام دەمەکان بێدەنگ دەکات، بەرتیلی بەهەموو ئەو کەسانە دەدا کارەکەیان ئاسان بکەن و بێدەنگی هەڵبژێرن، لۆسیانۆ تاوانەکەی هێند گەورەتر کردبوو، کەس لێی حاڵی نەدەبوو، زۆر بەوردی کارەکانی ئەنجام دەدا، توانام بەدەستیەوە نەما، دەبوو ئەو نهێنیە ئاشکرا بکەم، باری قورس کردبووم.

رۆژێک دوای ئەوەی لەکوشتارگەکە تەواو بووم، بە ئۆتۆمبیلەکەم بە پەلە بەرەو پۆلیسی فیدراڵی (FBI) لەنیۆیۆرک بەرێکەوتم، چوومە ژوورەوەی پۆلیسخانەکە، داوامکرد چاوم بە بەڕێوەبەری پۆلیسخانەکە بکەوێت، بەو ئاوایەی هەواڵێکی گرنگم پێیە و نابێت دوابخرێت، بابەتێک باس لەفێڵکردنە لەخەڵکی، پێویستە بەزووترین کات دەستی بەسەرا بگیرێت، ما چاوەڕوانی چوونە لای بەڕێوەبەر بم، خودی بەڕێوەبەری پۆلیسی فیدراڵی.

پیاوەکە زۆر سەرسام بوو بە قسەکانم، گوێی لەوشە بەوشەی قسەکانم گرت، دواتر بۆ نیو کاتژمێر جێیهێشتم، کە گەڕایەوە پێیگوتم دەبێت لەتەکیدا بۆ کوشتارگەکە برۆم، گوتیشی لەژێر چاودێری پۆلیسی فیدراڵیدا دەبم، تەلەفۆنێکی کرد، تا تیمی پۆلیسی فیدراڵی لە ئامادەباشیدا بن بۆ دەرچوون بەرەو ئەو کوشتارگەیەی کارم لێدەکرد، بەرەو کوشتارگەکە بەرێکەوتین، پێکەوە چووینە ناو کوشتارگەکەوە، ئەوجا خودی بەڕێوەبەری پۆلیسی فیدراڵی لەتەکما بوو تا چووینە ژوورەکەم لەکوشتارگەکە.

دەمێک چاوەڕوان بووین، چاوەڕێی چی دەکەین؟ نازانم، گوتی پیلانێکی هەیە، فەرمانی بە پۆلیسەکانیدا تا لۆسیانۆ بەسەر تاوانەکەوە بگرن، زیاتر لەکاتژمێرێک تێپەڕی، گویم لەهەراو هوریایەک بوو لەدەرەوە، لەپڕ دەرگاکە کرایەوە کۆمەڵێک مرۆڤ هاتنە ژوورەوە، باوەڕم نەدەکرد بەو شێوەیە بێت.

خێزانەکەم، هاوسەرەکەم، مۆریای کچە بچووکەکەم، سەرمسوڕما لەو حاڵەتە حاڵی نەبووم، وەلێ دواتر هەموو شتێکم زانی.

دەستیان کۆت کرابوو، دەمییان داخرابوو، بەواقوڕماوییەوە تەماشای بەڕێوەبەرەکەم کرد، چون ئەوەی گاڵتەم پێبکات بزەخەنەیەکی دوور و درێژی بۆ کردم، ئەوجا بەدڕندانەوە دیقەتی دام، لەباڵی گرتم، بردمییە دەرەوە، بردمی تا گەیشتینە ناوەندی هۆڵی پێشوازی، ئەوجا بەسەر پشتا بەریدامەوە، کریکارەکان بەسەرسوڕماوییەوە لێم گردببوونەوە، پیاوانی مافیاش خاوخێزانەکەمیان پاڵپێوە نا لەسیلەمدا بوەستن.

کەس سەرزەنشتیم نەکات، قەت لەو بڕوایەدا نەبووم یەکەم پیاوی دەسەڵاتی ئاسایش لە نیۆیۆرک سەر بەمافیا بێت، مافیا لەبابەتی وادا گەمە ناکات، هەرگیز ناچێتە دۆخی گەمەوە، تەنها بەکوشتنی من ڕازی نابن، هەر هەموو خانوادەکەمیش لەناو دەبەن، زۆر گریام، خۆ من هیچم لای خێزانەکەم نەدرکاندووە، بەڵام کێ گوێت لێ دەگرێت؟ لۆسیانۆ تاوانبارە، تاوانبارێکی زۆر خەتەرناک.

وابزانم قابیلی ئەوەم، هەر لەو ڕۆژەی ڕازیبووم بەو کارە تاوانکارییە، هەقی خۆیەتی لەباتی جارێک هەزار جار بمرم.

دوای چەند خولەکێک دوایین پیاو کە حەزم دەکرد ببینم، هاتە ژوورەوە، بەو نیگا تاوانکارییەی و بەو نیشانەیەی لاجانگی تشارلز سیلڤانۆر لۆسیانۆ بەدەم جگەرەی تۆسکانیللۆدا بەساردییەکەوە گوتی:

-لیستەر ئەی ئازیز، لە ژەمە خواردنێکی شایەستە دەگەڕام خوانێکی گەورە لەهۆڵی کۆبوونەوەی سەرکرایەتی مافیادا بڕازێنمەوە، پێدەچێت گۆشتەکەی جۆرێکی زۆر تایبەت دەبێت.

بەدەم تێڕوانینیەوە بۆ خێزانەکەم دوایین ڕستەی درکاند و دواتر لێم نزیکەوەبوو، کادووی جگەرەکەی بەسەروچاوما کرد و گوتی:

-خوانێک جۆزیف لیستەر و هاوسەرکەی و کچە منداڵکەی و دایکیشی لەسەرە، ئەو پزیشکە گەمژەیەی ئەو مووچە نازدارەی لەدەستدا، کە گەورەتیرین پزیشک خەونی پێوە دەبینی، هەر لەبەر ئەوەی ویژدانی ڕاستەوەبوو.

بەتووندی قژی گرتم و گوتی:

-بەزمەکە ئەوەندە خۆش دەبێت بەدەم جۆزیف لیستەر خواردنەوە یەک دوو پێک هەڵدەیت و بدەی لەقاقای پێکەنین، بەڵام دەزانیت کێشەکە چییە؟

لەدەموچاوم نزیکبووەوەو گوتی:

-تێکەڵە سیحراوییەکەی چێژی گۆشتەکانمان جۆزیف لیستەرە، دەیان ساڵە لەسەرەتای دامەزراندنی ئەم کوشتارگەیە بۆ خۆت سەرپەرشتی هەر پارچە گۆشتێکت دەکرد و لەجۆرەکەی دڵنیات دەکردین، ئەوەندەش گەمژە نیم ئەو تێکەڵە نهێنیە خاینە بکوژم.

دواتر زمانی تووندوتیژی خستە ڕوو و گوتی:

-بەڵام وادەکەم گۆشتی مۆریای کچە بچووکت بخۆن، دەزانم زۆر بەتام و لەززەت دەبێت.

لەوێوە شتێکم داهێنا ناچاربووم وابکەم، کەوتمە سەر پێڵاوەکەی و ماچی کەوشەکەیم کرد و گوتم:

-گەورەم سەری من ببڕە ئەگەر دەتەوێت تۆڵەم لێ بکەیتەوە، ئەگەر مۆریا یا یەک لەخێزانەکەم بکوژیت، ئەوا لەخەفەتا منیش دەمرم، ئەو تێکەڵە نهێنییە ون دەکەیت.

لۆسیانۆ پشتی تێکردم و گوتی:

-لیستەر با وابێت، بەڵام حەز ناکەم دۆستەکانم لە ژەمێکی نایاب بێ بەش بکەم، هەندێک پارچەت لێدەکەینەوە، تا بشبێت بەگوارەو لەگوێی بکەیت، ئەگەر گەمژەییەکی ترت کرد، واتلێدەکەم جگەری مۆریای کچت بە زیندوویتی بخۆیت.

لۆسیانۆ لێمگەڕا و ڕۆیشت، دەستیان بۆ خێزانەکەم نەبرد، وەلێ لاقێک و باڵێکیان لێکردمەوە، چەند ئاواتخوازبووم دەنگم بگەیشتایە بەجیهان، تا بزانن

هەر من نیم بەسەر خوانیانەوە دەخورێم، خەڵکانێکی زۆر بەسەر خوانەکانیانەوە دەخورێن.

تا هەنووکەش لۆسیانۆ زیندووە، وەلێ لەزیندانی نیۆیۆرکدایە، هەزار تاوانی بەسەرەوە بوو دەستبەسەربکرێت، وەلێ کەس بە کوشارگە تایبەتەکەی نازانێت.

گۆڤاری تایمزی ئەمریکی ناوی تشارلز لۆسیانۆی لەنێو بیست کەسایەتی تاوانبار داناوە کە ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕی، کاری تاواکاری تری زۆرە، پەیوەست بە گۆشتی مرۆڤەوە نییە، لۆسیانۆ لە زۆربەی فیلمی مافیاکاندا دەبینن، لە ئەنتەرنێتیش شتی لەسەر دەخوێننەوە، وەلێ کەس باسی نهێنییە تایبەتەکەی ناکات، نهێنی گۆشتی مرۆڤەکان.

لەپڕ کەللەی جۆزیف لیستەر تەقییەوە، وەک فوارە خوێن فیچقەی کرد، جەستەی بەسەر شیشی قەفەسەکەوە کەوت، بە چاوە تۆقیوەکانمانەوە دیقەتی دەمانچەکەی دەستی شارلۆتانمان دا، هێشتا دووکەڵ لەلوولەی دەمانچەکەیەوە دەردەچوو، ئەوجا ڕووی دەمانچەکەی تێکردین و گوتی:

-ئەگەر درۆزن بوایە بەوای درۆکەی و ڕەگەزپەرستییەکەی دەمانکوشت، خۆ ئەگەر ڕاستگۆ بوایە هەزار جاری تر لەسێدارەمان بدایە دڵمان ئاوی نەدەخواردەوە.

هەستم بەتەنگەنەفەسییەک کرد، ئەو هەتیوە لیستەر قسەکانی هەموو ڕاستبوون، دەیزانی ئەگەر درۆ بکات، دەکوژرێت، کێشەکە ئەوەیە من لەو

چێشتخانانەی ئەو باسی لێکرد خواردنم خواردووە، نووکە دڵم تێکهەڵئەچێت، دەمەوێ ئەوەی خواردوومە هەڵیبێنمەوە، خۆ ئەگەر ڕاست بێت ئەوا منیش مرۆڤخۆر بوومە، هەرهەمووومان مرۆڤخۆر بووین، بەوای قسەکانی شارلۆتانەوە بیرۆکەکەم برا، گوتی:

-تشارلز لۆسیانۆ سەرکردەی مافیا بوو، هەرگیز لەو باوەڕەدا نیم دووبارە ببێتەوە، وەلێ چیرۆکی گۆشتی مرۆڤەکان کەس نەینایە پاڵی، تەنها ئەم گەمژەیە نەبێت.

شارلۆتان تەماشای قەفەسی فەرمانبەری پێشوازی کرد، ئەو ئافرەتە داماوە بەسەر زەویەکەوە کەوتبوو، چون ئەوەی لەگیانەڵاندا بێت، وەلێ شارلۆتان بەدارەکەی دەستی فشاری خستە سەر سەری، بڵاچەیەک لە بازنگەکەیەوە دەرچوو، بەوای ئازارەوە بە ئاگا هاتەوە، شارلۆتان بزەیەکی بۆ کرد، ئەوجا بەرەو لای قەفەسی سەرپۆش بەسەرەکە ڕۆیشت و گوتی:

-تۆ کوێرەوەرییەکانی خۆت بۆ جیهان گێڕایەوە، هیچ کەسێک لە برا موسوڵمانەکانی ئاینەکەت هەوڵیان نەدا فریات بکەون؟

هەر کە گوێم لەو قسانەی شارلۆتان بوو، دڵم کەوتە ترپە لێدانی بەرز، تەماشایەکی ئەو سەرپۆش بەسەرە چینییەم کرد، هەوڵمدا بیرم بکەوێتەوە لەکوێ بینیومە.

ئای خودایە، ئەو ئافرەتە سەرپۆش بەسەرە ئەوە...

10

# چیرۆکی شازادەخاتوون ئۆیگۆر

## میهرگوڵ تورسۆن دەیگێڕێتەوە

( نەفرەت لەسانتا کلۆز، هەموو گەمییە یارییەکانی لەچین دروستکران، ئای نازانێت چۆن بەخوێنی گەلەکەم ئەم یارییانەیان دروست کردووە)

من موسوڵمانێکی لەچکبەسەرم ئەویش هەروەسا موسوڵمانەو سەرپۆشبەسەرە ...

رووپۆشەکەم وەک شاڵ بەسەر شانمەوەیەو پرچیشم لەنێو سەرنشینەکانی ناو فرۆکەکە بەدەرەوەیە، ئەویش رووپۆشەکەی بەسەریەوە تەواو پرچی شاردووەتەوە، نیگای لێ زیت کردمەوەو بەو شێوەیەی بڕوانێتە سەرنشینەکەی بەرامبەری، چاوی بە سێ منداڵەکەی تەنیشتم گرِدا، ئەوجا لەسەرپۆشەکەی ڕوانیم کە دابوومە سەرشانم، بزەیەک لەڕوخساە چینییەکەی چون دۆستانە تێبریم و گوتی:

-تۆ کوێندەریت؟

نیگام لەسەر ڕوخساری شاردەوە، نازانم شەرم بوو یا چی، گوتم:

- تشینگ یانگ، لە ئۆیگۆرەکانم.

چون پێوەدانی کولاژدمێک بە ڕوویەوە دەرکەوت، وەلێ هەرزوو شاردیەوە، ئەوەندەی نەبرد لەجێی خۆی هەستاو شت ومەکەکانی کۆکردنەوە، بینیم لەتەک خانەخوێی فرۆکەکە قسەی کرد، لەشوێنێکی دوور لەمن دانیشاند.

فڕۆکەکە لەفڕۆکەخانەی چین نیشتەوە، بەمنداڵەکانمەوە بەڕێی خۆمدا ڕۆیشتم، ئەی خودای مەزن، ئەوە ڕاستە لەمیسر دەبێت سەرپۆش بەسەر بم و کاتێکیش دەگەمە چین وڵاتەکەی خۆم، ناچارم لەبەرامبەر خەڵکی سەرپۆشەکەم داکەنم؟ ئەو ئافرەتە چینییە موسوڵمانەی تەنیشتم، بۆچی هەقی خۆیەتی بیکاتە سەری؟ منیش وەک ئەو چینی نیم؟ ئەی خودایە لەچین نەفرەت لەڕەگەزی تۆیگور کراوە؟ تا هەنووکەش نیگاکانی کە تێبڕیبووم بیرم ناچێتەوە، کە لەسیلەشمدا دوور کەوتەوە، چون ئەوەی تووشی گەڕی بووبم.

لەپڕ ئەفسەرێک ڕایگرتم، بڕێ ئەستێرە بەسەر شانیەوە لەژماردن نەدەهاتن، یەک وشەی پێگوتم:

-تۆیگور؟

دڵم بەرەوەبوو، سەرم بە بەڵێ بۆ ڕاوەشاند، پێیگوتم:

-شت و مەکەکانت لێرە دانێ و دووم بکەوە.

ترس دڵیگرتم، تەنانەت نەمتوانی قسەیەکیش بکەم، ویستم منداڵەکانم گرد بکەمەوە، بەزمانێکی فەرمان ئاسا گوتی:

-منداڵەکانیشت لێرە جێ بهێڵە، پۆلیس ئاگای لێیان دەبێت.

دوودڵی گرتمی، لێ ئەفسەرێکی تر بەتۆپزی عارەبانەی منداڵەکانی لێ سەندم، پەلکێشیان کردم، بەترسەوە ئاوڕم لەمنداڵەکانم دەدایەوە، زۆرێک لەخەڵکی بەگومانەوە لێیان دەڕوانیم، ئەو ئافرەتە ڕووپۆشەی ناو فڕۆکەکە بەدەم عارەبانە پاڵنانەوە دیقەتی دەدام، دواتر ڕووی لێ وەرگێڕام.

* * *

( ڕووپۆشکردنی دڵ لە ڕووپۆشکردنی قژ پێشترە)

*　　　　*　　　　*

چوار کاتژمێری تاریکستان پرسیاریان لەهەموو شتێک لێکردم، لەماوە پرسیارەکانیاندا هەستم نەکرد گەشتکردن بۆ میسر تاوانە، پرسیارەکانیان لەمڕ گەشت و هۆکاری گەشتەکەم و کێت لەوێ بینیوە، پێمراگەیاندن چەند بە پەرۆشی زمانی ئینگلیزییەوە بوومە، تا ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا لەزانکۆی بریتانی لەمیسر ئەو هەلەم قۆستەوە، لەوێش بەدیداری مێردە چینییەکەم گەیشتم، هەر لەوێ هاوسەرگیریم کرد و منداڵیشم بوون، نووکە وام لە چین بۆ سەردانیکردنی کەسوکارەکەم، وەلێ بە وەڵامەکانم ڕازی نەبوون، بەگوێی خۆم گوێم لەزرنگانەوەی کۆتەکان بوو نزیک دەبووەوە، کەسێک کۆتەکانی ئامادەکرد و دەستیان گرتم و کۆتیان کردم، بێ هیچ پێشەکییەکیش کیسەیەکی ڕەشیان لەسەرم کرد، ئیدی هیچم نەدەبینی.

نارەزایی چووە خوێنمەوە، بەشێوەیەکی توند خۆم لەکۆتەکان ڕاپسکاند، دەمویست کۆتەکان بپسێنم، بۆ یەکەمجارم بوو لەئازاری کۆتەکان بگەم، چەند بە ئازارن، پۆلیسەکە توند گرتمی، هاوارم کرد، گوتیان دەستبەسەر دەبیت، تا لەڕاستی زانیارییەکانت دەگەین، من لەهۆڵی منداڵەکانمدا بووم، گوتیان چاودێریان دەکەین، بەسەر کیسەکەشەوە شتێکیان نایە سەر دەمم، بەشێک لەخۆمدا هەستی بەوەکرد تاوانبارم، یا نەفرەتلێکراوم، دواتر دەرگایان کردەوە و بەرەو دەرەوە ڕاپێچیان کردم.

لەپڕ کیسەکەی سەرمیان لابرد، بینیم دەرگایەک لەبەرامبەرمدا کرایەوە، پاڵیان نامە ژوورەوە، ژوورێکی فرە گەورە، پڕە لەژنان، ئەوەی بە پێوە

وەستاوەو ئەوەی دانیشتووەو ئەوەی پاڵی داوەتەوە، جێوبانێکی زۆریش بەسەر یەکەوە ڕێک و پێک دانراوە، هەنگاوێکم بەرەو پێشەوە نا، وەلێ وەک ئەوەی هەنگاوەکانم ئێرە ڕەتکەنەوە کە لەنێو ئەو بنیادەمگەلەی دەستبەسەرن، کەسێکیان پاڵی پێوە نام بۆ ژوورەوەو دەرگاکەی داخست، مۆبایلەکەیان لێ سەندم، تەنانەت نەیانهێشت بۆ تەنها جارێکیش پەیوەندی پێوە بکەم، تا بەمێردەکەم ڕابگەیێنم چیمان بەسەر هاتووە، ما لەلای دەرگاکەوە بوەستم، چون ئەوەی بەو شوێنەی لای دەرگاکە ڕازی بم بەردەوام لەو شوێنەدا بم.

❊ ❊ ❊

( چون ئەوەی ڕاوەستان بەتەنیشت دەرگاکەوە شتێک لە بابەتەکە دەگۆڕێت)

❊ ❊ ❊

هەفتەیەک و دووان تێپەڕی کەس نەهات پرسیارم بکات، هەر پرسیارێکم بەخەیاڵدا دەهات، هەستم دەکرد وەڵامم بۆی نییە، لەنێو وتو وێژی ژنە دەستبەسەرەکاندا ئەوەم لێیان قۆستەوە شتێک دژ بە تۆیگورەکان هەیە، شتێکی خەراپ، وەلێ کەس نەیدەزانی چییە و بۆچی، بەمنداڵی گوێم لێبووە گوتوویانە کە ئێمە مێژوومان نییە، وەک ڕەسەنایەتیش دەگەڕاینەوە ئەو کەمینەیەی لەچین نیشتەجێبوونە، ڕەگەزی (ئیلهان)ی چینی لەخانەوادەکانن، کە منداڵبووم لەقوتابخانە گوێم لەهەر هەموو ئەوانە دەبوو، دڵم باوەڕی نەدەکرد، هەڵبەتە ڕەگەزی منیش ڕەگەزی ڕەسەنەم هەیە، ڕەسەنێکی مەزنیشە، وەلێ نەمدەزانی چییە.

سەرتاپای ژیانیان گۆڕیم، هەڵبەت مێردەکەم و کەسوکارەکەم شێتبوونە، تۆ بڵێی بەدەستبەسەریم بزانن؟ ئەی منداڵەکانم چیان بەسەرهات؟ ڕادەستی کەسوکارمیان کردووە، یا لەدایانگا دایاننناون؟ یەکێکیان شیری من نەبێت هیچ شیرێک وەرناگرێت، سەری کڕنووشم بۆ خودا برد، دان بەخۆمدا بگرم، تا ئەو ڕۆژە هات.

دوای سێ هەفتە لەدەستبەسەری، پیاوێک هاتە ژوورەوەو هاواری کرد (ئارزوو قۆلکان) ئەو دەم پاڵم بەدیوارەکەوە دابوو، لەحەسرەتی خۆمدا وێڵ ببووم، کاتێک گوێم لەناوی خۆم بوو، ڕاستەوەبووم و خۆم تەکاند، بەرەو دەرەوەی بردم، پێیگوتم:

-لەدەرەوە پێویستیان پێتە.

بەترسەوە لێم ڕوانی و گوتم:

-ئەوانە کێن؟

بەنەرمییەکەوە گوتی:

-منداڵەکانت.

دڵم لەخۆشیدا وەختەبوو لەسینەم دەربچێت، کردمیانە نێو ئۆتۆمبیلێک و بەڕێکەوتین، گوێم بە بینینی شەقامەکان نەدا، بەو خەڵکەش کە ئازادانە هاموشۆیان دەکرد، خەمی گەورەم منداڵەکانم بوو، هەستم بەدڵتەنگییەک کرد، چون ئەوەی ڕوحم دەربچێت، ئۆتۆمبێلەکە لەبەردەم بینایەک وەستا، وایکرد ڕوخسارم هەرەس بهێنێت، چون ئەوەی لەتاو خەمەکانم بتوێتەوە، نەخۆشخانە، پیاوەکە بردمیە ژوورەوە، وەک ئەوەی بۆ سەر کارەساتێکم بەرێت، لەپڕ وێستام و کارەساتەکەم بەچاوی خۆم بینی، لەناو ژووری

چاودێری چڕدا منداڵێک کۆمەڵێک سۆندەی بۆ هەڵواسرابوو، کوڕە کۆرپەکەم (نوور) لەنیوان مەرگ و ژیاندابوو.

* * *

(کۆرپە پاژێکە لە بەهەشت، ئەگەر کوشتت ئەوا گەڕاوەتەوە بەهەشت)

* * *

شەو بەڕێوەیە و ڕوحم لەهاوارکردن ناکەوێت، لەسەر زەوییەکە دانیشتووم و پشتم بەدیواری ژووری چاودێری چڕەوەیە، دوو منداڵەکەی ترم بەتەنیشتمەوەن، دیقەتیان نەدەم، وەک ئەوەی پرسیاری ئەو ڕۆژانەیان لێ بکەم کە لێمەوە دووربوون، گوێم لەدەنگی ئامێرێکە دەمەوێت ڕوحم دڵنیا بکاتەوە، بەیانی هات، تیمی پزیشکەکان چوونە ژووری کوڕەکەمەوە، دیقەتی چاویانمدا، هیچ جیاوازییەکیان دەگەڵ سارد و سڕی ئامێرەکاندا نەبوو، ما لەپەنجەرەکەوە بڕوانم، دادەچەمینەوەو دەستیان بە دوگمە گەڵێکەوە دەنا، تەماشای کوڕەکەم کرد لەنێویاندا، دەمی کراویەو سەریشی بۆ لای پشتەوە خواربووەتەوە، سۆندەیەک بە گەروویدا ڕۆ دەکرد.

یەکێکیان لای لێکردمەوە، هەر زوو ڕووی لێم وەرگێڕا، بەو شرۆڤەیە دڵم داکەوت، لەپشت پەنجەرکەوە ما لێیان وردبمەوە، سەرقاڵبوون، یا خۆیان سەرقاڵ دەکرد، دواتر یەکێک لەئافرەتەکان لێیان جیا بووەوەو هاتە دەرەوە بۆ لام، بەسەر لێویەوە لەرزێک، چاویشی لێ دەشاردمەوە، تا خۆی گرت و گوتی:

-خاتوون، نەمانتوانی کورەکەت ڕزگار بکەین، مرد.

وەک ئەوەی بەخۆم نەزانم و بێ دوودڵی پێمدەگوت درۆزنیت:

-ئەوە تۆ چی دەڵێیت؟ ڕاست پێمبڵێ کوڕەکەم چییەتی.

چاوی بۆ سەر زەوییەکە شۆڕ کردەوەو گوتی:

-زۆر داوای لێبووردنت لێ دەکەم.

نیگام بۆ ئەو دیوی پەنجەرەک گواستەوە، یەک لەپزیشکەکان بەخەمبارییەوە سەری بۆ ڕاوەشاندم، ئێدی دونیام لەپێش چاو کەوت، نەمزانی چی بکەم، بۆ کوێ مل بنێم، وەک ئەوەی بمەوێ هەڵبێم، دووبارە گەڕامەوە لای پەنجەرەکەو دیقەتی کوڕەکەمم دا، شین هەڵگەڕابوو، ژیانەوە بەڕوخساریدا نەمابوو.

بەدەم وەستانمەوە لای کێلی گۆڕی (نوور)ی کۆرپەکەم پشتم کوڕ ببوو، تەنانەت قەدەر بواری ئەوەشی پێنەدام گوێم لەوشەی دایکەی نەبوو، نوور گوێم لێت نەبوو، گریام ڕوحم تۆی دەوێت، هیچ شتێک لەناخمدا نییە پاژێک لەخۆم جێبهێشتم، زۆر بە ماندوویێتی بەڕێکەوتم، لەسەر لیستی قەدەغەکراوەکان نامیانە گەشتەکان، لەژێر چاودێری، بەڵام کوڕی خۆم نوور هیچ شتێک بەسەر ئەرزەوە بەلامەوە گرنگ نییە.

* * *

(ئەگەر منداڵێکی کۆرپەت مرد، هەموو بەدبەختییەکانی دونیا لەدڵتدا بچووکتر دەبنەوە، تا لەهەموویان بچووکتر بیت)

*　　　　　*　　　　　*

دوای ساڵێکیتر لەخەم و پەژارە، لەناکاو بێ ئەوەی کەس پێمبزانێت، چوومە ئەو تاکە شوێنەی ڕوحم تیا ئۆقرەی دەگرت، دایانگای ( ئەبی وەقاس)، بە جلوبەرگی ڕەش و چاوێلکەیەکی ڕەش چوومە ئەو مزگەوتە کەورەیەی چین ( هوای تشینگ) تەنانەت سەبووریم بەناوەکەش دەهاتەوە، گۆڕی (سەعدی کوڕی وەقاس)ی تیایە، ئەو پیاوەی سێیەم کەسبوو هاتە نێو ئاینی ئیسلامەوە، دەستم بەنەخش و نیگاری مەرقەدەکەدا هێنا، بانگم لە (سەعد) کرد، ئەی سەعد خاڵۆی پێغەمبەر، کەسم نەماوە هانای بۆ بەرم تۆ نەبیت، هاتوومەتە چین نزام لای خودا بۆ بکەیت، پاشای چین ئەم مزگەوتەی بۆت بنیات نا، من موسوڵمانم، بەدزییەوە هاتوومەتە لات، تا کەس نەمناسێتەوە، لای خودا نزام بۆ بکە.

لەگەڵ دەرچوونم لەمزگەوتەکە فشارێک سینەمی گرتەوە، کاتێک سەرم هەڵبڕی چرای ئۆتۆمبیلی پۆلیسم بینی، دوور کەوتمەوە، وەلێ دەستێک شانی گرتم، بەترسەوە ئاوڕم لێ دایەوە، بڕێ ئەفسەربوون، لەچاویانەوە شەرم بینی، ئاخر حکومەت مزگەوتی لێ قەدەغە کردوین، دوای ئەوەی ڕووپۆشیشیان لێ یاساغ کردین، کەس بەو ڕفتارەیانی نەدەزانی، ئەوان ئێمەیان بەتیرۆریست لەقەڵەم دەدا، یا پڕۆژەیک بین بۆ تیرۆر، گوێم لەزرنگانەوەی کۆتەکانی دەستیان بوو، بەچ تاوانێک دەمبەن؟ سەردانی

کردنی مزگەوت تاوانە؟ خۆم بۆ ڕانەگیرا، بەرەوەبووم، چاویلکەکەم شکا، گوێم لەشتێک بوو بەژێر پێمەوە وردوخاش دەبوو، دواتر لەهۆش خۆم چووم. بەسەر ناشرنترین دیمەن بە ئاگا هاتمەوە، ژوورێک بەقەد دووکانێکی تەنگ دەیان ئافرەت بە پێوە وەستاون، هەندێکیشیان بەشێوەیەکی نارەحەت کەوتبوون، وەک ئەوەی لەهۆش خۆیان چووبن، بە بنمیچەکەوە کامێرای چاودێری تەنها بە کونێکی بۆ ئاڵوگۆڕی با تێدابوو، منیش لەنێویاندا وەستاوم، دەستی یەکێکیان ناوشانی کونکردبووم، لەدەمەوەڕی خۆی نەدەکەوت، بەتەواوی بە ئاگا نەهاتبوومەوە، نەمدەزانی فلْتەفلْتی چییەتی.

* * *

( هەست بە لێقەومان ناکەیت تەنها لەناوەندیدا نەبێت)

* * *

بە پێوە وەستابووین، قەدەغەبوو پاڵ بەدیوارەکەشەوە بدەین، کات هەر دەڕۆیشت و منیش هێدی هێدی برشتم لەدەست دەدا، وەختەبوو بەدەم خەوەوە بەرەوە بم، شەپازلەیەک بە ئاگای هێنامەوە، وەک سەرخۆشم لێ هاتبوو، هەستم بەخۆم نەدەکرد، ئەوە هەر بەڕاست ئەوەمان بەسەر هاتووە؟ ڕۆژێک تێپەڕی من هەر بەو دۆخەوەبووم، بە پێوە وەستاوم و خەویشم لێ حەرامە، قاچەکانم بەتەواوی هەڵیان نەدەگرتم، لێرە سەرئاویش نییە، هەر لەجێی خۆت دەبێت خۆت خاڵی بکەیتەوە، بۆن بۆنی کەلاکی لێ دەهات،

کەوتبوومە وڕێنەکردن، بە شەپازڵە خەبەریان دەکردمەوە، جلوبەرگەکەم تەڕبوون، هەستم بە بوونی خۆم نەدەکرد.

لەپڕ هەموو شتێک هەرەسی هێنا، کەوتمە ژێر پێیانەوە، ناو پیسابییەکانیان، بینیم دەستێک بۆ لام درێژ بوو، کەمێک لەدەستەکە وردبوومەوە، دواتر ڕوحم بەخۆی نەزانی، جیهانێک چون خەون، دەستێک لێم نزیک دەبووەوە، دەستی ئافرەتێکی فرە جوان و نەرم، بزەکەی ڕوحی بە ئاگا هێنامەوە، هۆڵێک پڕ لەشتومەکی ئەنتیکات، وەک ئەوەی لەکۆشکێکدا بم، بەدووچاوی سەرسامەوە گوتم:

-تۆ کێی؟

بە ڕوویەکی خۆشەوە پێیگوتم:

-تۆ ئویگۆری نیت؟

پێمگوت:

-بەڵێ، من لە (شیرشن)م.

پێیگوتم:

-وەرە شتێکت پیشان دەدەم.

لەتەکیا چوومە هۆڵێکی گەورە، یەک لەخزمەتکارەکانی ڕێزی بۆ نوواندین و گوتی:

-تۆ نازانیت ئەوە کێیە، ئەوە (بیگیا)یە شاباتوی ئویگور، ژنی شای شایانی چینە.

بەسەرسوڕماوییەوە لێم ڕوانی، لەڕەگەزی ئێمە شابانۆ هەن؟ ژنی شای شایانی چین؟

خانمی یەکەمی چین بردینیە لای ئیمپراتۆری چین، ڕێک بە پۆشاکی ڕەشی بە ئاڵتوون چنراو.

خزمەتکارەکە چرپاندییە گوێم و گوتی:

-شانشینی ئۆیگۆر ئەم ئیمپراتۆرە چینییەی ناچار کرد مانگانە پارەی شاهانە بدات لەبەرامبەر پاراستنی و هێرش نەکردنە سەری و لێرەش هاوسەرگیری لەگەڵ شازادەکەیان کرد، بۆ ئەوەی ڕەزامەندییان بکڕێت.

بە سەرسامییەکی ڕاستەقینەوە دیقەتمدا و گوتم:

-شانشینی ئویگۆر؟ ئەوە خەونە؟ خەونەو پێمڕادەبوێریت؟

* * *

شازادە بە سۆزەوە تەماشای کردم و گوتی:

-ئێمە خەون نین، ئێمە ڕاستین و شانشینی ئویگور ئەمڕۆ دوو ئەوەندەی شانشینی چینە.

چاوم زەقتر کردەوەو گوتم:

-ئەمڕۆ؟ ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟

شازادە خاتوون دەستی بۆ درێژ کردم و پێیگوتم:

-ئارزوو وەرە، تۆ پێویستت بە خەوە، تا بزانیت ئێمە خەون نین.

لەژوورەکەی ئیمپراتۆر بردمیە ژوورێکی تر، لەوێشەوە بردمیە ژێر زەمینێک و لەسەر جێوبانێک دانیام تا بخەوم، داوای لەخزمەتکارەکەی کرد چاودێریم بکات، سەریان نامە سەر سەرین و بەدیارمەوە بوون تا خەو بردمیەوە.

چاوم بۆ نەدەکرایەوە، ڕوحم بەرەو شوێنێکی ئاسایی دەچوو، چون ئەوەی ئەو شوێنە بناسم، گوێم لەپێی ژنانی تر بوو، بەدەورمەوە گردبوونەوە، تەماشای سەرەوەم کرد، هەستم کرد لەژووری زیندانەکەم بەئاگا هاتمەوە، چواردەویشم هەموو ژنانی ئویگۆری دەستبەسەر بوون، یەکێکیان چون ئەوەی سەرزەنشتی خۆی بۆ خۆی بکات و دەیگوت:

خزم و ناسیار و هاوڕێ خۆشەویستەکانم لەفەی سامسا و برنجی بیلافیان لەزەماوەندی هاوسەرگیریمدا دەبەشاندنەوە، مۆزیکمان هەڵنەدەکرد، پێمان وابوو حەرامە، ئەو شەوەمان بەتەواوی نەبردە سەر و دایان بەسەرمانا، وەک کەمتیار تێمان بەربوون، هەر کەسێک مۆزیک ڕەتکاتەوە بەلاڕێدا ڕۆیشتووەو دەستبەسەری دەکەن.

من هاتبوومەوە هۆشی خۆم، بەوای ئازارەوە دەستم بەسەرمەوە گرت، گوێم لەو ئافرەتە بوو، پێدەچوو خەوم بینیبێت، ژنێکی تر بە دەنگێکی نزم بەو ژنەی گوت:

ئافرەت، میللەتی ئویگۆر مۆزیک لەناو خوێنیاندایە، بۆچ حەرامتان کرد؟ ئەوەتا ئەو دوای تەمەنت لەزیندان بەسەر دەبەیت.

ژنەکە بە زمانێکی تاڵەوە گوتی:

-میللەتی ئویگور ئەمە دوا ڕۆژیانە، ئێمە لەناو دەبەن.

ئەویتر گوتی:

-خۆزگە ئویگور نەبووینایە.

یکێکیان پێیگوتم:

-تۆ، بەخەبەر بوویتەوە، وەرە لەجێی یەکێکمان بوەستە.

گورِم دایە خۆم تا بوەستم.

❊ ❊ ❊

(( ئەی گورگە بۆر تۆ لەکوێی؟ ئاسمان ڕەشداگەڕاوە، جیهان ڕەش، هەموو کەسوکار و هاوڕێیان دڵیان ڕەشبووە، تۆ های لەکوێ گورگەبۆر؟))

گۆرانییەکی میللی ئویگورەکانە.

❊ ❊ ❊

تۆ بڵێی لێرە بمرم؟ هەست بەو چنگ لێگیرکردنە دەکەم کە بەر لەهەر موسیبەتێک ڕوودەدات، چ موسیبەتێک لەمە گەورەترە کە تیا هەم! ئەمجارە کەس نازانێت هام لەکوێ، لەزیندانێکی بۆگەن وەستاوم، کەس گوێی لەدەنگم نییە، هەست بەتەنگە نەفەسی دەکەم، لەچاوەکانمەوە فرمێسکی گڕگرتوو دەهاتنە دەرەوە، هاوارێکی بێدەنگ لەناخمدا دەنگی دەدایەوە، نەمزانی مانای چیبوو، هاوارێکی تر بەدوایدا هات، کەمێک بەدەنگتر، ما ئافرەتەکان بەسەرسامییەوە لێم بڕوانن، وەلێ هاواری سێیەمم زۆر بەرز بوو، چاویان ئەبڵەق بوو، دەرگای زیندانەکە کرایەوە، پیاوان گەلێکی خوێڕی و هیچ و

پووچ هاتنه ژوورەوەو بەربوونە گیانم، ئەوەندەیان کوتیم هەموو جەستەمیان شل و کوت کرد، خوێن ئەو ناوەی هەڵگرت.

جارێکی تر ئەو شاژنەم بینییەوە، لەنێو بیابانێک بوو، نەک کۆشک، بیابانێکی ڕووتەن، پرچی بەدەم باوە دەفڕی، تەماشای ڕوخساریم کرد، پیرەژنبوو، لۆچ هەموو دەموچاوی گرتبووەوە، بزەیەکی خەمبارانەی بۆ کردم، گوتی ئیمپراتۆری چین خیانەتی لێکردین و هاوپەیمانێتی لەتەک هاوسێی تۆیگۆردا بەست و ڕووخاندنی، لێی نزیکەوەبووم، نەمدەزانی مەبەست لەوە چییە، ئەگەر خەونە خۆ من شرۆڤەی خەون نازانم، ئەگەریش ڕاستییە، چۆن؟تەماشای شاژنە پیرەکەم کرد، بە بزەخەنەیەک جوانییەکەی لەدەست نەدابوو، گوتی:

-وەلێ دوودڵ مەبە، مەملەکەتی دووەمی ئویگۆرمان درووست کردەوە، ناومان بوو بە مەملەکەتی کۆشۆ، لەجاران بەهێزترین.

لەیاخەکەیم گرت و هاوارم بەسەریا کرد.

چاوم کردەوە یەک لەئافرەتە دەستبەسەرەکان یاخەی ژنێکی گرتبوو، ڕایدەوەشاند و دەگریا، دەیگوت:

-تۆ، باشیت؟

هەموو ئافرەتانی دەوروبەرم لەدۆخێکی سەیردابوون، چاویان لەیەک ئاراستە بڕیبوو، دیقەتی ئەو شوێنەی ئەوانم دا، ئافرەتێک کەوتبوو، ڕایاندەوەشاند،

وەڵامی نەبوو، چون ئەوەی مردبێت، ناسیمەوە، ئەو ئافرەتە بوو کە لەخۆشییەکەیدا بردبوویان، مرد، یەک لەژنەکان گوتی:

-ئەمڕۆ گوێم لەپرخەی بەرزی نەبوو، یەک دووجار ڕاموەشاند، زانیم بۆچ بێدەنگە، ئەوە یەکەم مێینەی ناومان بوو مرد.

خرۆشانی خەم و پەژارە دایگرتین.

❊ ❊ ❊

( (هەندێک لەبەهەشتدا خۆشی خۆیان تەواو دەکەن))

❊ ❊ ❊

ترس لەدڵمانا خۆی نەگرت و ئاڵکایە ڕوحمان، دوای ئەوەی پاسەوانەکان هاتنە ناو زیندانەکانمان بۆ خەبەردارکردنەوەمان، بە هەراوزەنایەکی زۆرەوە هاتن و هەریەکەو لیستێکی بەدەستەوە، هەر کەسێک لەڕاستەوەبوون دوا بکەوتایە، بەر لیسیان دەدا، دەبوو لەدوو خولەکدا هەستابان و بەتانییەکانیشمان کۆ بکردایەتەوە، ئەگەر نا هەر هەموومانیان دارکاری دەکرد، ئەو ئافرەتەی دڵخۆش بوو، لەجێی خۆی هەڵنەستا، دایانە بەر لیس، یەکێکیان نووکە شەقێکی لە کەللەی دا، هەر زوو دەستم بەڕووی خۆمەوە گرت.

نەمتوانی دان بەخۆما بگرم، دڵ و دەروونم نەیاندەهێشت ئۆقرە بگرم، ناچار بەرم لەڕوحی خۆم گرت، یەک لەپاسەوانەکان وەک مارێک نیچەرەکەی دۆزیبێتەوە، بەرەو پیرم هات، لیسی بەدەستەوە نەبوو، وەلێ دەرزییەکی

دەرهێنا، پاسەوانەکانی تر دەست و پێمیان گرت، ئەویش دەرزییەکەی بە چەند جارێک کردە ناو دەماری خوێنمەوە، ئەوە دۆزەخێکبوو لەپڕ تێیکەوتین، ما بیرم بڕوات و هێزم لەبەر ببڕێت، بەسەر چۆکا بەرەوەبووم، دواتر بەسەر دەموچاوما بەرەوەبووم، هەستم بە شوکرانە کرد بەرامبەریان، کەمێک لەهۆشیان بردم.

تەم بە ئاسۆوە دەرکەوت، سارایەکی نەبڕاوە، کوا شاژنی پیرەژن؟ کەمێک ڕۆیشتم، بەکێلی گۆڕێکدا تەقیمەوە، خۆڵ دایپۆشیبوو، لەسەر کێلەکە نووسرابوو: شاژن بیجا ڕوحی شاد بێت، شاژنی تۆیکۆر، ئەو شتەم پێڕادەگەیێنێت کە هەموو ڕەگەزی ئێمە دەمرن؟ شتێکم لەپشت گۆڕەکەیەوە بەدیکرد، دەبریقایەوە، بەڵکو دوو شت بوون، ڕێک دوو چاوبوون، لێی نزیکەوەبووم، ڕوخساری ڕوونتر دەبووەوە، کیژۆڵەیەک جلوبەرگی شاهانەی لەبەردا، لەپشت گۆڕەکەوە دیقەتی دەدام، پێمگوت:

-ئەی کچۆڵەی جوان تۆ کێی؟

وەڵامی نەدامەوە، وەلێ بلەز بۆ لام هات و باوەشی پیاکردم، لەباوەشم گرت و لەدەوروبەری خۆم ڕوانی.

*　　　　*　　　　*

(خەون پەنجەرەیە، لێوەی دەڕوانیتە ڕابردوو و بانەڕۆژ)

*　　　　*　　　　*

شتێک بەدەموچاوما دەکێشێت و خەونەکانم دەلەرێنێتەوە، ئەوە ئەو پاسەوانانەی دەوروبەرم بوو، پاشیان لێدەدام تا بەئاگا بێمەوە، وەلێ دیمەنەکەی بەردەمم هەر تەمەکەبوو، ئەو منداڵە چاو نۆیگۆرە هەر بەباوشمەوەبوو، دوور نییە گوزارشت لە مەملەکەتی نۆیگۆری تازە بکات، کە پیرەژنەکە پێیراگەیاندم، دوور نییە نۆیگۆر فەنا نەبن، هەوڵمدا ڕاستەوەبم و لەو تەم و مژە ڕزگارم بێت، دیمەنەکە هێشتا هەر دەلەرێتەوە، تا لەدوورەوە چاوم بە شوێنێکی ڕوون کەوت، بۆی ڕۆیشتم.

لەرینەوەی دیمەنەکە زیاتر دەبوو، هاوار و جنێودانی پاسەوانەکان هاتنە نێو خەونەکەم، وەلێ بێدار نەبوومەوە، قسەم بۆ کچۆڵەکە دەکرد، پاسەوانەکان وایاندەزانی وڕینە دەکەم، بەوای لێدانەوە خوێن لەدەممەوە دەردەچوو، لەنێو خەونەکەم خوێنەکە بوو بەگۆشەی سووری دەور دیمەنەکە، دواجار بەئاگاهاتمەوە، هەستم کرد جەستەم بەسەر زەویەکەوە پەلکێش دەکرێت، گوێم لێیانبوو بەیەکیان دەگوت:

-دەری بکەنەوە دی شانگ، دەی، شوێنی ئێرە نییە.

بەدەم پەلکێشکردنم بەسەر زەویەکەو خستنە ناو عارەبانەو بۆ سەر سەدییەکە هەر بیرم لەمانای دی شانگ دەکردەوە، بۆن و بەرامەی ماددەی کیمیایی بە لووتما هات، بەئاگای هێنامەوە بینیم لەشوێنێکی ترم، نەخۆشخانەی دی شانگ، لەنەخۆشخانەی دەروونیدام، بەتەواوی چاوم کردەوە، دکتۆر و سستەر و دەنگی ئامێرگەلێک هەستم کرد بەو شێوەیە

دەیانەوێ ئەشکەنجەم بدەن، تا بەتەواوی شێتم دەکەن، پیاوێک بەسۆزەوە لێی دەڕوانیم، پێیگوتم:

-گوێت لێمە؟

بێ هیچ وتەیەک دیقەتمدا، ئەوجا پەنام بۆ برد و گوتم:

-منداڵەکانم، منداڵەکانیان لێ دوور خستمەوە، منداڵە کۆرپەکەشیان کوشتم.

سۆزی چاوەکانی بڕێ ئومێدیان وێدام، گوتی:

-دەتگەڕێنمەوە ماڵ و منداڵەکانت، تەنها وەڵامم بدەرەوە، من دکتۆر (ما-هۆ)م.

بە نیگاکردنێکی جودا لێمڕوانی و پێمگوت:

-ناوت (ما؟) تۆ؟

سەری بە بەڵێ بۆ ڕاوەشاندم، ئەو دکتۆرە لەڕەگەزی (هۆی)یە، هەر هەموویان ناوی گوزارشتیان هەس، ناوی (ما) لای ئەوان یانی محەمەد، ناوی (هۆ)یانی حوسێن، پێیگوتم:

-خاتوون هەست بەچی دەکەیت؟

ئەوەی لەخەونا بینیم بۆم گێڕایەوە، شاژنی تۆیگۆر و منداڵەکەی کە بینیمن، ما بیر بکاتەوە، چون ئەوەی شتێکی بۆ ئاشکرا بوویێت، بزەیەک گرتی و گوتی:

-تۆ عەقڵت لەدەست نەداوە تا بۆ ئێرەت بهێنن، ئەوان بۆ خۆیان عەقڵیان لەدەست داوە، ئەوان تاوانبارن، ئەوەی لەتەک تۆدا کردوویانە لەتەک هەر

کەسێکی تر بیکەن دەکەوێتە وڕێنە کردن، ئەوەی بینیم وڕێنە نییە، ئەوە خەونەو لای خوداوە بۆت هاتووە، من لەخەون تێدەگەم، ئەو خەونەشت لەمێژووی تۆیگۆرەوەیە، خاتوون دەمەوێت شتێکت پێ ڕابگەێنم، من موسوڵمانم، ئەوەت پێدەڵێم تا دڵنیا بیت، مێژووت خوێندووەتەوە؟ بزانە ئەگەر ئەو مەغۆلە تاوانبارانە نەبوونایە، میللەتی تۆیگۆر موسوڵمان نەدەبوون.

لەناو خەمەکانمەوە لێمڕوانی و هیچم نەگوت، پزیشکەکە هەستاو ڕۆیشت، ما لەتەک خۆما قسە بکەم.

-منداڵەکانم، منداڵەکانم بۆ بێنن.

* * *

(( شکستی ئیسلام جگە لەسەرکەوتن هیچی تر نییە))

* * *

چۆکەکانم گرد کردنەوەو بەدەستەکانم باوشم لێدان، تەماشای نەخۆشەکانی دەوروبەری خۆم کرد، کە ئاوەزیان لەدەست دابوو، بینیم بەوای لەدەستدانی هۆشیانەوە ئارام ئارام بوون، چین هۆشی کردبووین بەدۆزەخ، ما بیریکەمەوە، ئەوەتا پیاوچاکانی (هەوی) موسوڵمانانی چین کاری پزیشکی دەکەن و لەمزگەوتەکانیش نوێژی خۆیان دەکەن، زانکۆی ئیسلامی گەورەشیان هەیە، ئەڵقەی دابەستنی ئەزبەرکردنی قورئانیشیان هەیە، ڕووپۆش دەکەن و قوربانی خۆشیان دەکەن و حەجیش دەکەن، هەرچی ئێمەین تۆیگۆر چین

ئێمەیان گرتە خۆیان خاکیان داگیر کردین، ناسنامەیان پێداین، دواتر هەموو شتێکیان لێ قەدەغەیان کردین، ئەگەر بە ڕۆژووانی بمانبینن، دەستبەسەرمان دەکەن، خۆ ئەگەر پێ بنێینە مزگەوت بۆ نوێژکردن، وەک چۆن منیان گرت، سۆسەی هەموو تۆیگوریێک دەکەن بچێت بۆ نوێژکردن.

لەچین ئێمە دە ملیۆن تۆیگوری موسوڵمانین، ئاخۆ دەیانەوێ ڕقمان لەئاینەکەی خۆمان ببێتەوە؟ تۆ بڵێی ئەوەش بەوای زۆری دانیشتوانمانەوە بێت؟ وەلێ ئەوە مەنتیق نییە، ئەوان زۆر لە (هەوی)یەکان ناکەن کە ژمارەیان دە ملیۆن کەس دەبێت، دکتۆر بیرکردنەوەکەی قاچیم کە بە بزەخەنەوە هاتە ژوورەوە، کەمێک خۆی وەلا خست، جوانترین خەڵقەندەی خودا لەپشتیەوە دەرکەوت، ئەو ڕوخسارەی کە دەمبینی دڵی دەکردمەوە، هەستم کرد دۆخەکە بەرەو باشتر دەچێت، بەهێز باوشم لێدا، بۆن و بەرامەی ئارامی پێ بەخشیم، لەمنداڵییەوە ئەو بۆنە خۆشەم کردووە.

زانیم ئەو دکتۆرە لەتەک باوکمدا فێڵێکیان ئەنجامدا، بۆ ئەوەی حکومەت لەم ئەشکەنجەو ئازارە دەرمبکات و بگەڕێمەوە ماڵەوە، بەنیگایەکی سوپاسگوزارانە دیقەتمدا، باوکیشم دڵنیای کردمەوە منداڵەکانم باشن و لەماڵەوە چاوەڕوانمن، هەستمکرد دۆزەخ پەتووی گراوی خۆی بەسەر پشتمەوە بەکێشکردەوە، ئای خودایە! گشت ئەو نەهامەتییە لەبەر ئەوەی سەردانی وڵاتێکی ئیسلامیم کرد، دواتریش زیارەتی گۆڕی (ئەبی وەقاس)م کرد، شتێک هەیە زۆر لەوە گەورەترە لێی تێناگەم، بە پەرۆشییەوە چوومە

ماڵەوە، خوێنم بەستی، لەوێ لەناوەندی ماڵەوەم، دوو کەسم بینی، ژنێک و پیاوێک، لەخۆمان نەبوون.

* * *

(( تا خاکی ئۆیگۆر نەوت و ئاڵتوونی تیا بێت، چین بەزەیی بەخەڵکەکەیدا نایەتەوە))

* * *

باوکم چرپاندییە گوێم:

-کچی خۆم، ئەوانە نێردراوی حکومەتن، ماوەی مانگێکە لەگەڵماندا دەژێن.

بەخەمبارییەوە لەماڵەوەم ڕوانی، هەرچی شتێک بۆن و بەرامەی ئیسلامی بوو لەماڵەکە ون بووبوو، وێنەی کەعبە کە بەدیوارەوە بوو هەڵگیرابوو، لەبری وێنە سەرۆکی چین دانرابوو، بەرماڵەکان شاردرابوونەوە، تەنانەت ئەو دەسوڕیارییەی لە حیجازەوە بۆمان هاتبوو، هەڵگیرابوون و لەبریان پەیکەری (کۆنفۆشیوس) دانرابوو، دایکم بەسەر ڕووتی بەرامبەر بەوان وەستابوو، منداڵەکانم بە بێدەنگی دیقەتیان دەدام، هەستم کرد لێرە عەقڵ لەدەست دەدەم.

بەدوودڵییەوە چەند هەنگاوێک لەناو ماڵەوە ڕۆیشتم، پیاوە چینییەکە گوتی:

-مەپەشۆکێ، ئێمە نێردراوی حکومەتین و تەنها بۆ پاراستنی ئاسایش لەمەڕ هەر شتێک زەرەری یەکێتی نیشتمانەکەمان تێدا بێت لێرە ماوینەتەوە.

ئەوجا ئافرەتەکە هەڵیداو گوتی:

-ژوورەکەت هەندێک گۆڕانکاری تێدا کراوە، هەندێ جل و بەرگ و وێنەی لادیوار لابراون، تا دوور بن لە لادەری.

دواتر دەستی بۆ سەری بردو پێیگوتم:

-ڕووپۆش قەدەغەیە.

دایبابم سەریان نەوی کردبوو، چون ئەوەی تەماشای زەوی بکەن، منیش سەیری زەوییەکەم کرد، ئەوەی لەزیندانەکە بەسەرما هاتبوو بیرم کەوتەوە، چاوەکانم نووچقاند، ئەوان زەلیلمان دەکەن، ئەگەر بەرپەرچیان بدەینەوە دەستبەسەرمان دەکەن.

هەوەڵ ڕۆژەکان دانم بەخۆمدا گرت، وەلێ لەگریان نەدەکەوتم، لەوە ناخۆشتر نییە لەخانوویەکی داگیرکراودا بژێیت، پیاوێکی نامۆش سۆسەی هاموشۆت بکات، چاوە پیسەکانی لەتێڕوانینی جەستەت نەکەوێت، پێیانڕاگەیاندم دەرچوونە دەرەوەم قەدەغەیە، ئەوە فەرمانی حکومەتە، چوون بۆ مۆڵ و شوێنە گشتییەکان قەدەغەیە، ئەوە چەند مانگێک دەخایەنێت تا ڕاپۆرتی خۆیان بەرز دەکەنەوە، کە لە لادەری کەوتووینە و ناسنامەکەشمان گۆڕیوە، کە ئێمە کافرین.

* * *

(( گورگی ناوماڵ خەتەرترن)).

* * *

شەوێکی بێ دەنگ چون گۆڕێکی فەرامۆش کراو، لەژوورەکەم بەبان جیوبانەکەمەوە بەدووی هەودایەکی خەو دەگەڕام کەمێک لەم جیهانە دوورم بخاتەوە، گوێم لەهیچ نەبوو، تەنها ئەو ژن و پیاوەی لەهۆڵەکە دەنگیان دەهات، ئەمدیو و ئەودیوم کرد، تا خەواڵوو فریام کەوت و بردمییەوە نێو خەو، خەونم بینی، لەنێو کەشی خەونەکەدا دەتگوت بەڵا یەک بەڕێوەیە، ئەو کچۆڵە چاو شینەی تۆیگۆرم بینی غاری دەدا، بینیم لام لێ دەکاتەوەو لەغاردانیش ناکەوێت، بەدوویدا غارمدا، چووە بازاڕێکی قەرەباڵغ، خەڵکانێک و سەکۆی دارین و بەمبەر و ئەوبەریشەوە خانوو، لەخاکی تۆیگۆردا بووین، ئەو دەمەی مەملەکەتی مەغۆلی موسوڵمان بەڕێوەی دەبرد، لەناو بازاڕەکە هەر بەدوویەوە بووم، لەپڕ وەستاو هاوارێکی کرد، هەقی خۆی بوو هاوا ریکات.

بڕێ زەلام ئافرەتێکیان لەناو مۆڵێک پەلکێشی دەرەوەیان کرد، ما بیکوتن و جلوبەرگەکەی لەبەردا بدڕن، هەرچی لەوێ بوو زاتی نزیکبوونەوەیان نەبوو، تەنها یەکێک هەنگاوێک بەرەو پیریان ڕۆیشت، هەر زوو بەربوونە گیانی ئەویش، یەک لەپیاوەکان پرچی ئافرەتەکەی گرت، ئەویتر کراسەکەی هەڵماڵی، دایان بەزەویدا و یەکێکیتر خۆی هاویشتە سەری ئەتکی بکات، ژنانی دەوروبەر هاواریان لێ هەستا، مێردەکەی بەتەنیشتیەوە نێوچەوانی نابووە سەر زەوییەکەو دەگریا، بەو دیمەنە شۆک بووم.

پیاوە تاوانبارەکان خۆیان ڕێکخست و جوێنیان بە میردی ژنەکە دا، بیریان خستەوە ئەو باجەی لەسەرێتی بیدات، تا بۆ جاری ئایندە کچەکەشی ئەتک نەکەن، مەملەکەتی (زونگار)ی مەزن ئەمجارە توندو تیژ نابێت، لاقەی کچەکەیان نەکرد، مۆڵەکەشیان بەتاڵان نەبرد، وەلێ لەوە زیاتر سەبریان نابێت، دەبێت ئەوەیان لەبیر بێت (زونگار)ییەکان ئاغای ئەوانن، تا هەتایە وا دەمێننەوە، تفیان لێکرد و بڵاوەیان لێکرد، منیش کچۆڵەکەم لەباوش گرت و دەستم بەنیوچەوانیدا هێنا، تا خوێنی ئەتککردنەکە نەبینێت، کچۆڵەکە دەلەرزی، بۆ نزیکترین خانوو بردم، چووینە ژوورەوەو دەرگامان لەسەر خۆمان داخست.

* * *

((تەنها گورگ لەهەق گورگ دێت)).

* * *

لەئامێزم گرتبوو، بەدەم لەرزیەوە لەرزم گرتبوو، گوێمان لەهەراو هۆریایەک بوو لەدەرەوە، توندتر باوشم لێدا، جەنجاڵییەکەی دەرەوە بەرزتر بوو، چەند هەنگاوێک لەپەنجەرەکە نزیک بوومەوە، لەوێ دڵم گووشرا، ئەویش ترس دایگرت، چاومان بە کۆمەڵێک لەبنەماڵەی تشینگ کەوت، بەسەرباز کرابوون، بەوای ئاڵا سەوزەکەیانەوە ناسیمنەوە، ئەوەی ئەژدیهایەکی شینی بەسەرەوەیە، دابەزینە ناو بازاڕەکەو ئەو (زونگار)انەی ئەتکیان دەکرد،

کەوتنە وێزەیان و پارچە پارچەیان کردن، ئێدی خەڵکەکەش کەوتنە گیان هەر ڕەنگارێک بەردەستیان دەکەوت، خوێن ئەو ناوە هەڵگرت.

چاوی منداڵەکەم گرت، تا ئەو کوشتارە نەبینێت، چاوم سوور بوو، دەمزانی ئەوە خەونە، وەلێ نەمدەتوانی لەو خەونە بێدار ببمەوە، نەمدەزانی خەون ئەو شتانە چین دێنە نێو هزری ناوەوەم، ئەو ماوەیەم دەزانی، کاتی داگیرکردنی ڕەنگارییەکان بوو بۆ مەملەکەتی مەغۆلی موسوڵمان، دواتر بنەماڵەی تشینگ هاتنە مەیدان و ڕەنگارییەکانیان لەناوبرد، ئەوە گەورەترین کوشتاربوو لەخۆرهەڵات و ڕزگارکردنی ئۆیگورەکان، خرانە سەر چین و هەر هەمووشیانیان لەدەفەری تشینگ یانگ نیشتەجێ کردن، خوێن وەک جۆگەلە دەڕۆیشت، چاوەکانم نووچقاند.

گوێم لێبوو بە ئاسپایی دەرگاکەمان لەسەر دەکرایەوە، بەترسەوە لەدەرگاکەم ڕوانی، کەسم لەپشت دەرگاکە نەبینی، موچڕکەیەک بەگیانمدا هات، نەمدەزانی لەڕاستیدا کەسێک هەبوو دەرگاکەی لەسەرم دەکردەوە، منیش بەدەم خەوەوە ئەمدیو و ئەودیوم دەکرد، هیچم پێ نەکرا، تەنانەت خەونەکەشم بۆ تەواو نەکرا، لەپڕ لەنێو خەونەکەمدا چاوم بەدەستی پیاوێک کەوت لەپشت دەرگاکەوە، ئەوەندی نەبرد بە جلوبەرگێکی زەردەوە لەبەرامبەرم دەرکەوت، کڵاوزرێەکەشی بەسەرەوە بوو، ئەوە پۆشاکی سەربازانی (تشینگ)ە، وامزانی هاتووە ڕزگارم بکات، وەلێ ڕوخساری وا

دەرنەکەوت فریادڕەسم بێت، بەتایبەت لەو کاتەدا، لەڕاستیدا کەسێک هاتە ژوورەکەم جیهانێکی ڕاستەقینە بوو نەک خەون، کەسێکی قێزەوەن.

❊ ❊ ❊

(( ئەگەر نامووس لاقە کرا، ناسنامە ون دەبێت)).

❊ ❊ ❊

سەربازە (تشینگ)کە چەکەکەی نەوی کرد، دەرگاکەی دوای خۆی داخست، هاوارم لێکرد:

-من لە تۆیکۆرەکانم.

دەبوو (تشینگ)ەکان تۆیکۆرەکانیان بپاراستایە، دوای ئەوەی لەمەملەکەتەکەی خۆیانیان گرت، وەلێ زۆریش لە (زنگار)ەکان خراپتربوون، شەڕانگێز و باجیان بەسەرمانا فەرز کرد، لاقەی ژنان و کچانیان دەکرد، کیژۆڵەکەم گرتە خۆم و بلەز گەڕامەوە، پێم لە گۆشەیەکی جێوبانەکە کەوت و کەوتم بەسەرجێوبانەکەدا، ئەو پێیخۆش بوو، هات و دەستی بۆ کچۆڵەکە درێژ کرد، بەیەک تەکان تووڕی دایە سەر زەوییەکە، ئەوجا چاوەکانی لێ کز کرد و لێم هاتە پێش.

هەستم بەدەستی کرد یاخەی کراسەکەمی گرت، دەیویست دوگمەکانی بترازێنێت، دەمزانی خەونە ڕووم بەملاو ئەولادا وەردەگێڕا، هاوارێکی خنکاوم بۆ کرد، دەستیم گرت تا پاڵی پێوە نێم، وەلێ ئەو بەهێزتر بوو، بەدەستەکانی ناقرگەی گرتم، ئا لەوێ بە ئاگاهاتمەوە، چاوم کردەوە، دەموچاوێکی ناشرینم

بینی لەژوورەکەمدا دەستم بۆ دەبات، ئەوە پیاوە نێردراوەکەی حکومەت بوو، بە پێ پاڵم پێوە نا، وەلێ ئەو قورسایی خۆی هاویشتە سەرم، وەختەبوو بخنکێم، ما جوێنی پیس پیسم پێبدات، باوەڕناکەم جوێنی واپیسم بیستبێت، ئەو دەستەکانی بەهێز بوون، هەر کە دەمویست لەخۆمی دوور بخەمەوە، لێیدەدام.

لەپڕ دەرگاکە کرایەوە ژنە نێردراوەکەی حکومەت هاتە ژوورەوە، هاواری بەسەریا کرد و بە بانمەوە پەلکێشی کرد، دوو چاوی گورگ ئاسای هەبوو، ئافرەتەکە بەلەقە دووری خستەوە، شتێک بەزەیی بەمنیشا هاتەوە، جلو بەرگەکەی وێدام، ئەودەم دایبابم هاتنە ژوورەوە، هیچ و پووچەکە ڕاستەوەبوو، یەک دوو جوێنی داو لەژوورەکە دەرچوو، گوێمان لەدەرگاکە بوو، بەتووندی لێدەدرا، ئافرەتەکە بەسەر جیوبانەکەمەوە دانیشت و گوتی:

-داوای لێبووردنت لێ دەکەم، ئێمە ناچارین ئەم کارە ناشرینە بکەین، باوەڕم پێبکە گەلی چین ئەمەیان پێ خۆش نییە، بۆ خۆم ساڵی پار لەمیسر بووم، زیارەتی مزگەوتی (حوسێن)یشم کرد، ڕاپۆرتێک لەسەر ئەم هیچ و پووچە بەرز دەکەمەوە، بەو هیوایەی بەخێر بڕوات.

*　　　*　　　*

(( ئەوەی ناچارکراوە لەسەر خراپەکاری، سەربەگێچەڵە))

*　　　*　　　*

نەهامەتی و دەردە سەری بەنێوچەوانمەوە نووسراوە، ما بیر لەخۆکوشتن بکەمەوە، لێ دیمەنی منداڵەکانم بەحەواوە پەل و پۆ هاویشتنیان و گەڕان بەدوومدا وایکرد لەو بیرۆکەیە پاشەگەز ببمەوە، دڵم گووشراوە، ڕوحم بەبەر نەماوە، دەروونم هەموو دەرگاکانی کڵۆم دراوە، بێئومێدی بەری هەموو شتێکی لێ گرتووم، تەنانەت خوداش بەتەنگ نووزانەوەکانمدا نایەت، هەرچەند پەنای بۆ دەبەم، بەڵایەکم تووش دەبێت، هەندێ بۆچوونی خەراپم تیا دەرِسکا، خۆمم لێ داتەکاند، ئەوەی ڕوویدا بۆچوونەکانیشم دەستیان بەسەرا گرتبووم و ئاوریان تێ بەردەدام.

ئەفسەرێک بە هاوارەوە هاتە ماڵمان و ناوی بانگ کردم، لەگۆشەیەکی ماڵەوە تەماشام کرد، وەلێ دڵم وەختەبوو لەجەستەم دەربچێت، هاتن و دەست و پێیان کۆت کردم و بردمیانە دەرەوە، یەک وشەی ناڕەزاییم دەرنەبڕی، هەرچی ناڕەزاییم بوو لەناخما قەتیسم کرد، خودا دادوەرمە، خودایە کوانێ هەقی من؟ کاتێکی سەخت و قورسم بەدەستیانەوە بردە سەر، دیاربوو ئەو پیاوە قێزەونە خەبەری لەدەست دابووم، بەر لەوەی هاورێکەی خەبەر لەدەست ئەو بدات.

بۆ شوێنێک بردمیان، هەموو چواردەوری بیناکە تەلبەند کرابوو، هیچ تابلۆیەک وەک ناونیشان بۆ بیناکە نەبوو، پاسەوانێکی زۆر بەچەکەوە وەستابوون، هەر بە پاڵ بردمیانە ژوورەوە، ما جلوبەرگەکەم داکەنن، ژنێک بەرامبەرم وەستابوو، پیاوێکیش بەرامبەر ئافرەتەکە وەستابوو، هەموو شتێکیان لێ

داماڵیم، ڕووت و قووت وەستام، ژنەکە جەستەمی سەح دەکردەوە، پیاوەکەش لەتەکیدا دەیڕوانی، دواتر هەر بەو شێوەیە نامیانە ئامێرێکەوە، دواتر سەریان تاشیم، یەک تەڵ بەسەرمەوە نەما، ئەوەی تیاما قیت دەبووەوە، لەناخمدا بوو، شتێکی زۆر گەورە، شتێک پەیوەندی بەخواوە هەیە.

*　　　　*　　　　*

( (ئەگەر بناغە لەرییەوە، هەر هەموو بیناکە دەڕوخێت))

*　　　　*　　　　*

بیرۆکەی وا بەخەیاڵما دەهات، تووشی شۆکی دەکردم، لەدۆخی خۆمم دەڕوانی بەچی گەیشتووم، ئەم بینایە زیندان نییە، ئەگەرچی تێیدا دەستبەسەرین، لەسەربازگەیەکی نمایشکاری دەچوو، سێ بینا لەسەر شێوەی (U) دووانی بۆ پیاوان و دانەیەکیشی بۆ ژنان دروستکراوە، درۆم نەکردبێت تێیدا زیاتر لە پێنجسەد تۆیگۆری دەستبەسەر کراون، شوراکان زۆر بەرز و لەهەموو لایەکەوە پاسەوان لیسیان بەدەستەوە، لەو سەربازگەی دەستبەسەرییە فێری زۆر شتیان دەکردین، فێری بیری شوعییەت کە حوکمی چینی دەکرد، ئەو پارچە سوورەی بەسەر سەرمانەوە داکوترابوو.

هەموو بەربەیانییەک وەک ئاژەڵ کۆیان دەکردینەوەو ناچاریان دەکردین سروودی شوعییەت بڵێینەوە، دواتر دەبوو تەماشای شاشەی گەورەی نمایشی چالاکییەکان و دەستکەوتەکانی سەرۆک (شی جین بین) بکەین، ئەوجا

دەیانخستینە پۆلەکان تا مێشکمان لە زانستی درۆ پڕ بکەن، لەو وانەیە باسیان لەبنەماڵەی تشینگ دەکرد، چون سەرەتایەک بۆ سەردەمێکی دادوەرانەو هەق، بیرم ڕۆیشت، دوای ئەوەی تۆیگۆریان خستە سەر مەملەکەتی خۆیان و دەردی دونیایان پێدان و لەبەرامبەرا کەوتنە لاقە کردنی کچ و ژنیان، هەر کاتێکیش تۆیگۆرەکان بەرامبەریان هەڵچوونایە، ئەو کوشتارەی پێیان دەکرا، دەنگیان لەئاسمانەوە دەبیستران، تا ملکەچیانیان دەکرد.

ئەوەی لەدڵا گرانبوو، (تشینگ)ەکان کۆمەڵێکی زۆر موسوڵمانیان تێدابوو، تەنانەت یەک تیپی سەربازی چەکداری موسوڵمانیان هەبوو، هەر ئەوان بوون شۆڕشەکانی تۆیگۆری موسوڵمانیان هەرەس پێ هێنا، (تشینگ)ەکان کچانی تۆیگۆریان ناچار کرد شوو بە چینییەکان بکەن، کە بەلای موسوڵمانانەوە حەرام بوو، هەرچی تۆیگۆرەکان بوون لەبەر هەژاری و نەهامەتی ئەو شووەیان قبووڵ بوو، حکومەتیش هەماهەنگی ئەو تۆیگۆرانەیان دەکرد کە بەو حوکمەی حکومەت ڕازی بوون.

لەنێو بیرکردنەوەدابووم دووان لەپاسەوانەکان هاتن و ڕوو بە ڕووم وێستان، ئەگەرچی گوێم بەهیچ نەدەدا، وەلێ دڵم ختوورەی کرد، بینیم لەمن تێپەڕین و پەلی ئافرەتێکیان گرد و پەلکێشیان کرد، لەناو وانەکە دەریانکرد و بردیان، گوێمان لەپاڕانەوەی دەبوو، ئەو ژنەم دەناسی، دیاربوو ئەو ڕاپۆرتەکەی خۆی بەرز نەکردبووەوە، کە دەبوو هەر یەک لە ئێمە بەیانیان ڕاپۆرتی خۆی

بخوێندایەتەوە، ڕەخنە لەناخی خۆی بگرێت، لەبیرکردنەوەکانی، بلێت چی تیا گۆڕاوە، هەر هەموومان درۆمان بۆ خۆمان هەڵدەبەست، هەرچی ئەو ئافرەتەبوو، ملی کەچ نەدەکرد، ڕاپۆرتی درۆی نەدەنووسییەوە.

❊ ❊ ❊

(( زۆر دووبارە کردنەوەی درۆ، لەپێچاو پێچی مێشک هەڵدەکۆڵێت))

❊ ❊ ❊

ئەو دیمەنەی دوێنێ ڕوویدا، کە دراوسێکەم بۆی گێڕامەوە، ئۆتۆمبیلێکی جیپی ڕەش لەبەردەم دەرگای ماڵمان وەستا، کۆمەڵێک پیاوی لێ هاتنە خوارەوەو قسەیان لەتەک دایبابم کرد، هەردوو منداڵەکەم لەپاڵ دیوارەکە دانیشتن، ژنێکی نامۆش قسەی لەتەکیانا کرد، دەیویست دەستیان بگرێت بیانبات، وەلێ منداڵەکان دەستیان بەدەموچاویانەوە گرتبوو، تا پیاوەکان هاتن و بەزۆر هەڵیانیان گرت، ژنەکە بۆی گێڕامەوە تەنانەت لەگریانیشیاندا زۆر هێمن بوون.

ئەوە هەمان لیژنە نەفرەتییە بەرپرسیارەکەیە بۆ بردنی ئەو ئۆیگۆرانەی پابەندی ڕێنماییەکان نابن، تا لەسەربازگەی دەستبەسەری دەستبەسەریان بکەن، هەر هەمان لیژنەن بەسەر منداڵانی کەسوکار دەستبەسەرەکان دەگەڕێن تا بیانخەنە قوتابخانەیەکی ناوخۆیی و مێشکیان لەهەموو شتێکی ئیسلامی دوور بخەنەوە، تا لەدایبابیشیان نەچن، هەر کاتێک بیری منداڵەکانم

دەکەمەوە دڵم دەبێتە پشکۆیەکی ئاگر، خودایە ئەگەر لەتەکما دادوەر نیت بمسووتێنە، وەلێ بۆ منداڵەکانم دادوەر بە.

چەندین ساڵە ناتوانم پەیوەندی بە باوکیانەوە بکەم، پەیوەندیکردنی دەرەوەم لەسەر قەدەغە کراوە، کەسیش ڕازی نییە لەڕێی ئەوەوە پەیوەندی بکەم، ئەنتەرنێتەکەشم لەژێر چاودێریدایە، لەناو زیندانەکە زۆریان لێکردم ناونیشانی میسریان پێ بڵێم، دوور نییە ئەویشیان دەستگیر کردبێت، ڕەنگە هەر لەم سەربازگە دەستبەسەرییەشدا بێت، تۆ بڵێی هاواری یەکێک لەوانە شەوان هاواریان لێ هەڵدەستا ئەو نەبێت؟ چاوم نووقاند، یوسف تۆ لەکوێی؟ هاوسەری ژیانم، بیرت دەکەم.

❊ ❊ ❊

((حەسرەتی نائومێدی بکوژە))

❊ ❊ ❊

مانگانە یەکجار دەیانهێشت پەیوەندی بەمنداڵەکانمانەوە بکەین، پەیوەندییەکەش بە ڤیدیۆ دەبێت و پاسەوانەکانیش وەک گورگ بەدیارمانەوە دەبن، جاری پێشوو لەکەسوکارمەوە زانیم حکومەت منداڵەکانمی بۆ قوتابخانەی ناوخۆیی بردووە، ئەمڕۆش ڕێیان دام قسە لەتەک منداڵەکانم بکەم، سۆسەی سەر شاشەکەم دەکرد، تا چاوم پێیان بکەوێت، ئەوەی دەرکەوت دەموچاوی پیاوێکی چینی بوو، بە بزەخەنەیەکی قورسەوە تەماشای شاشەکەی دەکرد، هاواری لەناوی منداڵەکانی پشتیەوە دەکرد، تا

ئامادەی سەر شاشەکە بن، لەپڕ منداڵەکەم هات، هەر کە دەموچاومی بینی، دەستی نایە سەر چاوەکانی و بەرەو گۆشەیەک ڕایکرد.

نەیدەویست ڕووی خۆیم پیشان بدات، ئەو دیمەنە زۆر ئازاری دام، کوڕی خۆم بەو تەمەنەت زەبوونیان کردی، کامێراکە بەنێو منداڵان کەوتە گەڕ تابراکەی بدۆزێتەوە، بینیم لەدوور ڕا وێستاوە، کامێرامانەکە لێی نزیکەوە بوو، پێیگوت:

-دایکت باشە، بڕوانە.

کوڕی دووەمم بەچاوی داماوانەوە لێی ڕوانیم، وەک ئەوەی خواردنێکم بەدەستەوە بێت و وێی نەدەم، هەستم بە دڵتەنگی کرد، هۆشم لەبەر بڕا، وەک لاشەیەکی بێ گیان بەسەر زەویەکەدا بەرەوەبووم.

ئەوە کرداری گۆڕینی ناسنامەو ئاینە، گۆڕانی ڕەگەزە، وەک ئەوەی ڕەگەزێکی ئەفریقی لە نەوەی کۆنگۆ بگریت و بەهێز ناچاری بکەیت باوەڕ بەوە بهێنێت کە لەحەوزی ناوەڕاستدایە، ئەگەر ئەوەی ڕەتکردەوە، دەستبەسەری بکەیت و بە بیروباوەڕی خۆت مێشکی ڕابهێنیت، ئەویش بەوای ئەشکەنجەدانیەوە، چین ئەوەمان لەتەکا دەکات، ئێمە لەڕەگەزی توورکین، گەلی ناوەندی ئاسیا، ئەوانیش ڕەگەزی چینن، بەدەر لەوەی وڵاتەکەمان بەرامبەر ئەوانە، بەزۆر و زۆرداری ئێمەیان خستە سەر خۆیان، لەو سەردەمەوە دەیانەوێ هەموو کولتوور و ئاین و ڕەگەزمان بگۆڕن، ئەگەرچی موسوڵمانیان زۆرە، وەلێ کەدێنە لامان تووشی شۆک دەبن، تۆ بڵێی لێمان بترسن؟

*　　　　*　　　　*

(( ترسی ستەمکاران لە ئاینی ئیسلام زۆر کۆنە لەگەڵ سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلامەوەیە))

*　　　　*　　　　*

پیاوێک بە پێی پاڵی پێوە نام چون ئەوەی شەق لە شتێک بدات ((بجووڵێ))، بەزمانێکی وقورس وایگوت، وەلێ من وەستام، نەک وەک ئەوەی سەرکێشی بکەم، بەڵکو جەستەم دەلەرزی، لەنیوەشەودا و بەتەنیا لەگۆشەیەکی زیندانەکە وەستابووم، کەسم بەدیارەوە نەبوو، سەرما ئێسکەکانی دەکرۆشتم، ((بجووڵێ)) بەدەنگێکی توند گوتی، لێ جەستەم چون ئەوەی برشتی لەدەست دابێت، هێزم تیا نەبوو، دەیانویست زەلیلم بکەن، بەو سەرمایە منیان هاویشتبووە دەرەوەی ژوورەکە، بەوای ئەوەی لەم دواییەدا گوێڕایەڵیان نەبووم، قامچییەک بەر پشتم کەوت ((بجووڵێ)) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتم، هەر هەنگاوێک ئازاری دەدام، خودایە تۆ لەکوێی؟ تۆ هەیت؟

جەستەم هەڵچوو، خۆم کوڕ کردەوە، بەسەر چۆکا کەوتم، ئاواتخوازبووم بمرم، قامچییەکی تر، بەسەر دەموچاوما بەرەوە بووم، بارانەکە وەک دەرزی ژەن پشتمی دەژەند، هەر دڵۆپەیەک دەرزییەک بوو بەپشتمەوە، لە شوێنێکی نزیکمەوە گوێم لەهەناسەیەک بوو، چاوم بۆ هەڵبڕی، لەنێو بارانەکە بینیم، ڕاوەستاوە هەموو شتێک تێیدا ئازایە، چاوە کراوەکانی، وێستانە بەشکۆکەی،

ئاڵایەکی شینی ئاسمانی بەدەستەوە، داسە مانگ و ئەستێرەیەکی بەسەرەوە، ئەو ئاڵایەی لەبیرم چووبووەوە، یا لەبیرمیان دەبردەوە، ڕەسنی خۆم، ناسنامەکەم، کیژۆڵەکەی تۆیگور بوو گەورەببوو، ئاڵاکەی بە بەرچاومەوە بەرزتر کرد، گوێم بەسەرماو بارانەکە نەدا، ئاڵای تورکستان.

دووبارە دیقەتم دایەوە، هەر بەخۆیە، ئازایەتییەکەی وەسپ ناکرێت، خێوێکم بینی بەدوو چاوی چینییەوە هاتە تەنیشتی و شەپازللەیەکی پیا کێشا و بەری دایەوە، ئاڵاکەی دەستیشی بەرەوەبوو، وەلێ دەستی بەزەوییەکەوە گیر کرد و هەستایەوەو ئاڵاکەشی بەرز کردەوە، خێوەکەی تەنیشتی بوو بەهەڵم، گوڕ وتینێکم هاتەوە، خوێنم هەڵچوو، دەستم بەزەویەکەوە گیر کرد، هەستامەوە، بیرت نەچێت ئاززوو، مەهێڵە سەیەلەکە ڕوحت بەرن، ناسنامەکەی خۆت ون نەکەیت، لەهەموو کۆڵان و گەڕەک و ناوشار کۆی کەنەوە، لەناو دڵتا بۆیان کوێر نابێەوە.

❊ ❊ ❊

(( خوێنمان وەک ڕووبارێک لەچەمی ڕزگاریدا دەڕژا، وەلێ ئەی خاک بۆ تۆ ژیانیشمان دەکەین بەقوربانی))

سروودی وڵاتی تورکستانی موسوڵمانی ونبوو.

❊ ❊ ❊

تورکستان، ئەو خەونەی وەک خەونەکەی فەلەستین ونبوو، لەهەمان ساڵی ونبوونی فەلەستین، کاتێک بنەماڵەی تشینگ حوکمی خۆیان ڕادەستی

کۆماری چینی میللی کرد، کە بەردەوام بوو لەگۆڕینی ناسنامە، ئۆیگۆرەکان یەک دەست لێیان ڕاپەڕین، ڕووسیا هاوکارییانی کردن تا شۆڕشەکەیان سەرکەوتوو بێت، بۆ ئەوەی وڵاتێکی سەربەخۆ بۆ خۆیان لە چین جیا بکەنەوە، کۆماری تورکستانی ڕۆژهەڵات، دواتر دەرکەوت ئەوە فێڵێکە ڕووسیا و چین پیلانیان بۆ داناوە، ئەوساڵە بەدبەختە کە هات، ساڵی 48 بوو، ڕووسیا تورکستانی بۆ چین بەجێهێشت، هەر بەهەمان شێوەی بریتانیا فەلەستینی دا بە ئیسرائیل، لەهەمان ساڵدا خەونەکەمان مرد، وەلێ لەدڵی ئۆیگۆرەکان هەر مایەوە.

دیمەنم لەپیاوێک دەچوو، کە بەسەر تاشراوی بە بن بارانەکەوە وەستابووم، ئەو ماوەیە ڕۆیشتم کە ناچاریان کردم بڕۆم بەڕێوە، لەپڕ شتێک ڕوویدا، هەموو پاسەوانەکانی هێنایە سەرسوڕمان، کاتێک دەرگای دەرەوە کرایەوەو ئۆتۆمبیلێکی ڕەشی گران بەها هاتە ژوورەوە، پیاوێکی تیا دابەزی، ناسیمەوە، چونکە هەموو ڕۆژێک بەسەر شاشەی هەواڵەکانەوە دەمبینی، بەرپرسێکی باڵای حکومەتی چین بوو، دەڕۆیشت بەڕێوەو دڵنیا دەبوو لە دەستبەسەرەکان، کاتێک بینیمی وەستا، دیاربوو تەماشای شێوەی نامۆی منی کرد، بەو وێستانەم و بەو سەرتاشراوییەم.

تەماشای ئەوانەی دەوروبەری خۆی کرد و گوتی:

-ئەم کوڕە گەنجە لێرە چی دەکات؟

لێم نزیکتر بووەوەو ما لێم ورد بێتەوە، بارانەکەش لێیکردبووەوە، بەو تاریکییە چاوەکانم دەبریقانەوە، منیش بە خۆڕاگری وێستام، گوتم:

-چین ئەو خۆڕاگرییەی نامێنێت، پیاوەکانیشیان دەگۆڕدرێن، ئەمەی بە ئێمەی دەکەن ڕۆژێک دێت بگاتە دونیا، تا ئەو ڕۆژەش دێت چین دەتکات بەقوربانی.

بەسەرسامییەوە لێی ڕوانیم، وای دەزانی کوڕم، پاسەوانەکان پەلاماریان دام و گوتیان:

-کچەتیو ئەوە چی دەڵێیت؟

چاوەکانم لێ زەق کردنەوە، پیاوەکان پەلیان گرتم و بەکێشیان کردم، تا دوورم بخەنەوە، پێمگوت:

-هەزار سەربازگەی دەستبەسەری تری وەک ئەمە، یەک ملیۆن ئۆیگۆری تێدایەو ئەشکەنجە دەدرێن و سووکایەتییان پێ دەکرێ، ڕۆژێک دێت بەسەر کارەساتەوە بەخەبەر بێیتەوە.

پیاوەکان دایان بەناو دەممدا تا بێدەنگ بم، بەسەر زەوییەکەوە پەلکێشیان کردم، چاوم لەچاوی ئەو بەرپرسە نەبڕی، زەق زەق دیقەتم دەدا.

* * *

( (گۆڕانی ناسنامە لەگۆڕانی ئاینەوە دەستپێدەکات))

* * *

هەندێک ئاسن و تەنەکە بەدیوارەکەوە جێگیر کراون، سەرەتا کە چاوت پێدەکەوێت وادەزانیت کورسی و مێزن، بەسەر کورسییەکەوە دایاننیشاندم، سینەمیان خوار کردەوە تا بەمێزەکە گەیشت، ئەوجا دەستیان بۆ پشتمەوە بەرز کردەوەو کۆتیان کردم، قاچەکانیشمیان بە قاچی کورسییەکەوە شەتەک دا، پێدەچوو هەرچی ورەیە تێامدا کوێری بکەنەوە، یەکێکیان گوتی:

-کورسی پڵنگت بیستووە، هەی قەحپە؟

بەرسڤم نەدایەوە، زیاتر لێی مۆڕ بوومەوە: هەی هیچ و پیچ بمکوژە، ئەو نوورەی تیامایە ناکوژێتەوە. کاتێک پیاوێکی تر هاتە ژوورەوە، ڕوخسارم گۆڕا، دارێکی ئاسنی بەدەستەوەبوو، سەری دارەکە تەلبەند و کارەبای تێدابوو.

دارەکەی نا پێما و کارەبا بەجەستەمدا هات و لێل زریکەی جەستەم هاوارم کرد، دووبارە کارەبای بە لاقمەوە نا و جوێنیشی پێدام، هاوارم کرد:

-ئای خودایە!

ددانە زەردباوەکانیم بینی، کاتێک وەک گورگ کەللەی بەملاو ئەولادا دەهێناو دەبرد:

-ئەگەر خودا گوێی لێتە، نابێ بێت و لەم حاڵەت ڕزگارت بکات، هەی قەحپە؟

بۆ سێیەمجار کارەبای پێوە نام، دواتر تفێکی لێکردم و ڕۆیشت، بەدەم ڕێوە گوتی:

-بۆ کورسی پڵنگەکە جێت دەهێڵم، چاک بزانە چەندین ڕۆژ بەو شێوە بەستراویەوە دەمێنیتەوە، تا لەچوارپەلی دەکەویت.

دوای چەند کاتژمێرێک لەکورسی پڵنگەکە حاڵی بووم، پێچراوەکانی تەنیشت ئازارت پێ دەگەیێنن، ئازارێک بەرگەی ناگریت، ئەو هیچ و پووچە دەڵێت چەندین ڕۆژ بەو حاڵەوە دەمێنمەوە، وەلێ شتێک لەناخمدا ما بیر بکاتەوە، دەرچوون لێرە مەحاڵە، دەبێت ملکەچیان بیت، دەزانم کفر بە بن ئەشکەنجەوە لای خودا گوناه نییە، ڕۆژێک تێپەڕی و کەس بەلاما نەهات، تەنانەت خواردنیشیان بۆ نەهێنام، هەستمکرد خوێن بە دەست و پێما دەهات، پێدەچێت قۆناغی دواتر بەوای پێچراوەکانەوە پێستم دەبێت بە پێستی خەت خەتی پڵنگ.

* * *

(( تەنهاکەسێک بە زۆرداری داوای لێکرا کوفر بکات، لەدڵەوە باوەڕی تەواوی هەبوو))

سورەتی ئەلنەحل.. ئایەتی 106

* * *

واخۆم پیشان دەدا کە گۆڕاوم، پەشیمانی بەڕوخسارمەوە دەردەخەم، وەلێ ئەوان دڵیان هەر کنەی دەکرد، لەسووکایەتی پێکرنم نەدەکەوتن، ئەشکەنجەیان دەدام، گوتم کفرم بەخودا کرد، ئەگەر بوونی هەبوایە لێرە وازی لێ نەدەهێنام، بۆ خۆم نوێژکەر نەبووم، ناشمەوێ نوێژ بۆ خودایەک

بکەم بوونی هەر نییە، منداڵەکانیشم لەو ئاینە دوور دەخەمەوە، دوای سێ ڕۆژ لەژووری کورسی پڵنگەکە دەریان کردم، گەڕامەوە زیندانەکە، ما پسپۆری دەروونیم بۆ بهێنن، بینییان هەموو سروودەکانم ئەزبەر کردووە، ئەوەی ئەوان لەوەڵام پێیان خۆشە ئەوەم دەگوتەوە، چاوەکانیشم بە پەشیمانی ڕاهێنابوون، ئەگەرچی پڕبوون لەئاور، وەلێ لێم شاردبوونەوە.

دوای چەند مانگێک دەریان کردم، دەڵێم دەریان کردم، بەڵام بۆ ماڵی خۆم نا، بۆ شوێنێکی تر، کە هۆکاری هەموو ئەو مەشقکردنەی نێو سەربازگەکەبوو، ناچاریان کردم لەکۆمپانیایەکی پلاستیکی چینی بەزۆرەملێ کاری تیا بکەم، ئەوەی بەلامەوە سەیربوو، سەدان ئۆیگۆری تر لەوێ کاریان دەکرد، ئەوان لەدواقۆناغدابوون، تێگەیشتم چارەنووسی ئەو ملیۆن ئۆیگورییەی ناو سەربازگەی دەستبەسەرییەکە هەر وەک من دەبن، وەک کۆیلە لەکۆمپانیاکان کاری زۆرەملێیان پێدەکەن، دوای چەند ساڵێکی تر دەیانگەڕێننەوە ماڵەکانی خۆیان، وەلێ لەبری ئەوان ملیۆنێکی تر دەستبەسەر دەکەنەوە، لەقۆناغی کۆمپانیاکان بەدواوە دەگەڕێنەوە ناو ماڵ و منداڵیان.

ملیۆنێک کرێکاری ئۆیگۆری لەسەدان کارگەو کۆمپانیای چین، پلاستیکی چینی، جلوبەرگی چینی، ئەلیکترۆناتی چینی دروست دەکەن، و ڕوانەی هەموو جیهان دەکرێن، هەموو شتێک بەسەر مێزەکەتەوە لەچین دروست کراون، هەموو شتێک لە ناندینەکەت، لەژووری نووستن، هەر هەموو شتەکان بەخوێنی ئۆیگۆرەکان دروست کراون، نازانی بۆچی هەرزانن؟ لەبەر ئەوەی

بێ کرێ کاریان پێکردووین، وەک کۆیلە کارمان کردووە، ئەگەر دونیا پێمان بزانن چۆن گوزەرانمان کردووە، کەس ئەو شتانەی نەدەکڕی، کە نووسراوە لەچین دروست کراوە.

*　　　*　　　*

((کاڵای پیسبووی کواڵتی نزم و خەراپ لەهەموو دەورووبەرتدایە))

*　　　*　　　*

ساڵانێکم بەسەر برد، گەڕامەوە ماڵەوە، لاواز و بێئومێد، وەلێ شتێک فێرببووم، بێدەنگی باشترین ڕێگایە بۆ دوور کەوتنەوە لەوەی بینیم، هەتا تاوانبارێک حوکمی وڵات بکات، باشتر وایە بێدەنگ بیت، کەسوکارەکەم پێیان ڕاگەیاندم مێردەکەم لەمیسر دەستگیرکراوە، چەند ساڵێکە لەسەربازگەکان دەستبەسەرە، بیرم کەوتەوە ئەودەم هەستم دەکرد ئەویش دەستبەسەرە، یوسف هەستم پێتدەکرد، هەستم بەهاوارەکانت دەکرد، خودا بتپارێزێت، گڕ لەچاوانمدا بەربووە، بیرم لەشتێک دەکردەوە، شتێک بەدوو باڵ بفڕم و ئازاد بم.

گەشتکردن، نەک بۆ دەوڵەتێکی ئیسلامی، تۆبەم کرد، بۆ وڵاتێک لەوپەڕی دونیا، وڵاتێک توورە لەچین، نەک بە شێوەیەکی ئاشکرا، ڕوو بەڕووی ئەستەنگێکی زۆر بووم لەتەک حکومەتدا بۆ ئەو سەفەرە، سێ جار گەشتەکەیان ڕەتکردمەوە، وەلێ فێڵ لەدوای فێڵم دەنایەوە، تا خۆم لەناو فڕۆکەیەک بینییەوە بەسەر ئاسمانی چینەوە بەبان هەورەکانەوە، ئای چەند

ئاواتخوازبووم ئەو هەورانە بەسەر سەریانەوە بچێتە خوارەوەو کوێریانی بکردایە.

ئەمریکا ئەو وڵاتە دوورە، ئازادی درۆینەی بریقەدار، دونیا بە بۆنەی چوونم بۆ ئەمریکا هەستا، دانەنیشتن تا بە پەیوەندی کۆنکرێس گەیشتم، دەزانم ئەمریکا ڕقی لەچینە، دەشزانم ئەمریکا قێزەونە، چاک و خراپ دەڵێت تا ڕەخنە لەچین بگرێت، با وابێت، من دەمەوێت دەنگی نەتەوەکەم بەجیهان بگات، میللەتی ئۆیگۆر، تەنها هەر ئەوەندەم دەوێت، دونیا باس لەچەوساوانەمان بکات، ئێمە دەردەسەری زۆرمان بەدەستیانەوە بینیوە، ئاخر کەم نییە میللەتێک لەمێژوو و کەلتوورو ڕۆشنبیری دابڕدرێت، تێگەیشتم خوداش ئەوەی قبووڵ نییە.

لەدانیشتنی کۆنگرس دەموچاوێکی زۆر دانیشتبوون، ڕاستەوخۆ بەجیهاندا بڵاوکرایەوە، لەنێو دەموچاوەکان ڕوخسارێکم بینی، ئەو کچۆڵە شابانۆیە بە گرنگییەوە تەماشای دەکردم، فیلمێک دانم بەخۆمدا گرت و گریام، ئا ئەوەیە ئۆیگۆر، ئەوەیە تورکستان، ئەوە ڕوحمانە لەهەمووماندا زیندووە، پێویستە جیهان بهەژێنێت، تا بگەڕێینەوە وڵاتێکی سەربەخۆمان هەبێت، ئێمەش وەک میللەتان ناسنامەو مێژوو و ڕۆشنبیریمان هەیە، ئەوەش کەمترین هەقە بۆ میللەتێک لەسەر گۆی زەوی دەژێت.

❊ ❊ ❊

خەمم پێدایت؟ خەم شتێکی لەناختا داگیرساند؟ موسوڵمانەکان ئەوەیان هەیە، ئەگەر خوێنەر بیت، دەزانیت چین هاوکاری حکومەتی کەمبۆدیای کۆمۆنیستی دەکرد، ئەوانیش هەمان شتیان بەسەر ڕەگەزی (تشام)دا هێنا، ئەوانیش کەمینەیەکی موسوڵمانن لەکەمبۆدیا دەژێن، هێزی کۆمۆنیست لەوێ دابەزینە سەریان و کۆمەڵکوژیانیان کردن، نزیکەی دوو ملیۆنیان لێ کوشتن، هەر لەبەر ئەوەی موسوڵمان بوون، بەلای حکومەتەوە خەتەر بوون.

(ژاپان)ت خۆش دەوێت؟ دەزانیت ژاپۆنی ئیمپراتور لەهەمان ساڵی 48دا و دوای ئەو ساڵەش ئەوەی کوشتنی و ئەوەی ئەشکەنجەیان دان و ئەوانەش کە لاقە کران و سەدان هەزارانیشیان لە ( ڕۆهینگا) موسوڵمانەکانیان بۆ دەرەوەی ژاپۆن نەفی کردن، دواتریش شالاوی سەربازی کردە سەر ڕۆما و شاری (بانلۆگ)ی بۆرمایان بەتەواوی سووتاند، لەبەر ئەوەی کەمینەیەکی موسوڵمان بوون، کاتێکیش لەتەک چین کەوتە جەنگ، هێزی ژاپۆن دایانە سەر شاری (نانکینگ)ی چینی، هەرچی موسوڵمان بوو، کوشتیان و ژن و کچەکانیشیان خەراپ کردن، بەوەشەوە نەوەستان لاشەکانیانیان شێواندن، هەرچی مزگەوت بوو، کە زیاتر لەدوو سەد مزگەوت دەبوو، تەختیان کرد و سووتاندیان.

ڕەشبگیرییەکەی ساڵی 48 بەگرفتی موسوڵمانانی (ڕۆهینگا) لەبۆرما دەستی پێکرد، کاتێک هێزی بۆرما هاتە ناو شارەکەو دەستی بەسەرا گرت و ئەوجا کەوتە کوشتن و بڕین و ئەتککردنی کچان و ژنان، تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە.

(فليپين)ييەكانيش كە بە (مۆرۆ)كانيان كرد، ئەوانيش كەمينەيەكى موسوڵمانن، ئەوەی لە رۆهینگا کرا لێرەش دەستی پێکرا، (تیپ-)ییەکانیش ئەوەی بە موسوڵمانەکان کردیان، (سرپی)یەکانیش ئەوەی نەشێت بە (بۆسنە)ییەکان کردیان، قۆرگم وشکبوو، وەلێ خراپترین کوشتار لەخاکی ئەورووپا دوای جەنگی جیهانی دووەم ڕوویدا.

بولگارياش گۆڕينی ناسنامەی بەسەر موسوڵمانەکان فەرز کرد، ژمارەيان چارەگە مليۆنێک دەبوو، تەنانەت ناچاريانيان کردن ناويشيان بگۆڕن، ناوی بولگاری لەخۆيان و منداڵەکانيان بنێن، لە ئتينی ئيسلام دوور بکەونەوە.

تۆ ئەگەر کەمێک هەست بکەيت و بيری لێ بکەيتەوە، فرمێسک لەچاوەکانت نابڕێت، نەک لەبەر ئەوەی ئەوان موسوڵمانن، بەڵکو ئەوانيش وەک تۆ بنيادەمن، هەمان ناسنامەی وەک ناسنامەکەی تۆيان هەيە، ئەو مزگەوتەی لەبەردەميدا نێيت و دەرۆيت، ڕەنگە نەچيە ژوورەوە، وەلێ بۆ ئەوان وەک خەونێکە، ئەو سەرپۆشەی بێ گرنگی لەسەری دەنێيت، يا لەمەرپەوە مشتو مڕ دەکەيت، هەيە ژيانی لەناوبرا هەر لەبەر ئەوەی سووربوو لەسەر دانەکەندنی.

ئەو فرمێسکانەی لەدڵەوە دەڕژێن، سەختترن لەو فرمێسکانەی چاو دەيڕێژن، کاتێک دڵت لەبێ دەسەڵاتيدا دەگری، ئەوە ناچارييە قەدەر دايدەهێنێت، کچێکی وەک ئەوە چ گوناهێکی کردووە، هەر لەبەر ئەوەی ناوی خودای هێناوە؟ چ بەڵايەک لە بەڵای ئاين سەختترە؟ سەرم نەوی کردبوو،

نەمدەتوانی تەماشای ئەو کچە بکەم، دەمویست پێی بڵێم پاڕێکە لەخۆم، لەبەر ئەوەی منیش موسوڵمانم.

تونێیە دەکرۆزایەوەو زیکری خودای دەکرد، ئەو پیاوە دڵ ناسکە پێدەچێت زوڵمم لێ کردبێت.

گوێم لەکردنەوەی دەرگای قەفەسەکەبوو، سەیرم پێهات، شارلۆتان لەبەر دەرگای قەفەسی ئافرەتە ڕووپۆشەکە وەستا، بەدەستی ئیشارەتی بۆ کرد ئازادە، بۆ خۆی بڕوات، ئەم بوونەوەرە لەچی درووست کراوە؟ شەیتانە یا بنیادەم، یانەخۆ عەقڵی لەدەستداوە، شەیتان حکوم بەمردنی درۆزن دەکات و ڕاستگۆش ئازاد دەکات؟ ئەم شوێنە کوێیە؟تۆ بڵێی مردبین و وا سزا دەدرێن؟

داوام لەخودا کرد بمبەخشێت، کەبینیم میهرگوڵ تۆرسۆن بەهەنگاوی ورد و لەسەرخۆ بێ ئەوەی لەدەوروبەری بڕوانێت، بەرەو ئەو دەرگایە دەڕۆیشت کە دەرگای ڕزگاربوونە، پرسیارێکی زۆر وەک تافکە بەناخما هات، گریمان شەیتانەو عەقڵی لەدەست داوە، چۆن ڕێگای پێدەدات بڕوات، چاک دەزانێت خەبەر لەدەستی دەدات؟ کێشەکە ئەوەیە یەک وشەی پێنەگوت، کە بەرامبەر دەرگای قەفەسەکەی وەستا، وەلێ شارلۆتان دەستی بەرزەوە کرد، تا فرمێسکی چاوەکانی بسڕێت، بەدەم تەماشاکردنییەوە کە بەرەو دەرگای ڕزگاربوون دەڕۆیشت، شارلۆتان ئاهێکی هەڵکێشا، ئەوجا تەماشای ئەو پیرەژنەی کرد، کە لەگۆشەیەکی قەفەسەکەی دانیشتبوو، خەمێکی زۆری

لێنیشتبوو، ئەویش بەوای گوێگرتنیەوە بۆ بەسەرهاتە خەمبارەکەی میهرگوڵ لەمەڕ ئەو بەسرهاتەی بەسەر تۆیگۆرەکاندا هاتبوو خەم دایگرتبوو.

شارلۆتان لەقەفەسی پیرەژنەکە نزیکەوە بوو، بەزمانێکی هێمن پێیگوت:

-لیزا، نۆرەی تۆ هاتووە، ئەو چیرۆکەی بەسەرتا تێپەڕیوە بیرت ماوە، یا زەمەن کوژاندوویەتەوە؟

پیرەژنەکە بەدەنگی پیرەژنی خۆی گوتی:

-ئەگەر بچمە هەزار ساڵیش، ئەو بەسەرهاتەم بیر ناچێتەوە، لەدوو ڕوانگەوە دەیگێڕمەوە، وەک چۆن پێویستە بگێڕدرێتەوە.

شارلۆتان سەری بەڵێی بۆ ڕاوەشاند، ڕێی پێدا دەست پێبکات، هەناسەیکی پڕ لەبیرەوەری هەڵکێشا کە زۆر دەمێکە لەناخیدا دەرنەهاتووە، بیرەوەرییەکی شۆککەر.

11

# چیرۆکی جیهانە لەیەکچووەکان

## لیزا تریفۆر دەیگێڕێتەوە

(( بیرۆکەی فرەیی جیهانەکان تا ڕادەیەک دڵنەوایی دەدات، چونکە ئەگەر هەڵەیەک هەبێت کە پەشیمان بیت لێی، پێویست بەدڵتەنگی ناکات، کەسێک لەجیهانێکی تردا هەیە و کۆپییەکی تری تۆیە کە ئەو هەڵەیەی نەکردووە، دەبێت هەنووکە دڵخۆش بێت))

لیزا دەڵێت:

تەنیایی و سەرما و شەو و بێدەنگی لەئوتێلێک بەتەنیشت دەریاوە دوو ئەستێرە بەبان دەرگاکەیەوەیە منیش بەتەنیا دانیشتبووم، لەم جیهانە هیچ کەسێکم نییە خۆم و خۆم نەبێت، گەنج بووم، هەموو شتێک لەناخمدا گوڕو تینی ژیانی تیا ڕسکاندبووم، تا لێرە بارخانەم داناو لەم ئوتێلە کار بکەم، ئەودەم بیرم نایەت بیرم لەچی دەکردەوە، هەڵبەتە ڕوحم هەڵوەدای چیرۆکێکی فانتازیابوو لەو تەنیاییە دایڕێژم، بۆ خۆم پاڵەوانی چیرۆکەکە بم، کە کەسێک دڵی تێچوویم، وەلێ ناز ڕەتیبکاتەوە، ئەو چیرۆکە خەیاڵ دایبهێنێت تا لەچڕنووکی تەنیایی ڕزگارم بێت، کات لەو چیرۆکە بەچەند خولەکێک تێپەڕ دەبێت، ئەوە نەبوایە گوریسێکم بەدەرگاکەوە هەڵدەواسی و ملی خۆمم پێوە دەکرد، لەڕقی ئەم ئوتێلە هیچ و پووچە کە کەسی بۆ نایەت، شتەکە سەیر نییە، ئوتێلەکە نزیک کارگەی دروستکردنی کەشتییە لە (فیلادیلیفا)یە، ئەوەی سەردانییان دەکردین زۆربەی هەرە زۆری

دەریاوانییەکانبوون، ئەوانیش خەڵکانێکی لووتبەرزبوون، کرێکارەکانیش بەجل و بەرگی سادەو نوکتەو نوکتەی دووبارەو سێ بارە گوتنەوەیان نارەحەتیان کردبووم، وەلێ لەم ڕۆوە ئێدی کەس نەدەهات، لەبەر ئەوەی وڵات لەحاڵەتی جەنگدا بوو، تەنانەت دونیا لەجەنگدابوون، ئەم هەڵدەکوتێتە سەر ئەو و ئەویش بەرگری لەخۆی دەکات، ئەو جەنگە جەنگی جیهانی دووەمبوو، جەنگێکی خوێناوی، ئێدی کارگەکانیش لەدروستکردنی کەشتی تازە وێستان، ئەو کەشتیانەش کە هەبوون دەڕۆیشتن تا بەدەریاوانەکانیشیانەوە خۆیان بتەقێننەوە.

ئەم تەنیا بوونەش خۆشە، وەلێ تەنیایی بەردەوامیش کارەساتە کە هۆگری بیت، هەر ئەو تەنیاییەیە دەتگۆڕێت بە کوندەپەپوو، تەماشای هەر کەسێک بکەیت بەڕێوە دەڕوات زۆر بەوردی سۆسەی دەکەیت چون ئەوەی مەیموونێکی ڕەنگاو ڕەنگ ببینیت، خوزگە کەسێکم لێرە دەبینی ئەگەر بەهەڵەش ڕەتبوایە، نازانم بۆچی ئەم ئوتێلەیان لەوێستگەو بازار دوور بینا کردووە، گرەو دەکەم ئەم ئوتێلە جێبهێڵم و دوای چەند ڕۆژێک بێمەوە، دەبینم هیچ ڕووی نەداوە و نەگۆڕاوە، بیرم کردەوە بۆ پیاسە بچمە دەرەوە، سەردانییەکی وێستگەی بەنزینخانە نزیکەکە بکەم، تا لەتەک کرێکارێکی بانزینخانەکە دەمێک دەمەتەقێ بکەم، جاری واش دەبێت کە بیر لەوە دەکەیتەوە دەربچیت و پیاسەیەک یا شتێک بکەیت بۆ ڕەوینەوەی تەنیاییەکەت، کەسێک لەو دەمەدا دێت، هەر بەڕاستی کەسێک هاتە ناو ئوتێلەکە، ئۆخەیێکم کرد، هاتنی دڵی خۆش کردم.

لەدەرگای ئوتێلەکەوە هاتە ژوورەوە، قەد و باڵا و ڕوخساری سەرنج ڕاکێش بوو، جل و بەرگەکەی پۆشتەو پەرداخ بوو، قژە سەری جوان داهێنابوو،

جانتایەکی ناوەندی بەدەستەوە، ئەو دەستەکەی تری... بێستە پەلەم لێ مەکەن! ئەوشتە چییە؟ دەفرێکی کانزایی گەورە و بریقەدار، چون دەفر فڕیوەکانی کە لەفیلمە خەیاڵەکانی سینەمادا دەمانبینی، جارێ لە دەفرکە ڕادەمام و جارێکی تر بەچاوی کوندەپەپووەکە لە پیاوەکە ڕادەمام، دەفرەکە لەسەر زەوی نیشتەوە و پیاوەکەش بەدەم سڵاوکردنەوە بزەیەکی بۆ کردم.

بەڕێزەوە گوتی:

-خاتوونەکەم، ژوورێکم لاتان دەست دەکەوێت، یا هەر هەموو ژوورەکان گیراون؟

بەدەم دوایین وشەیەوە بە تیلەی چاوی لەچۆڵ بوونی ئوتێلەکەی ڕوانی، منیش بەدەم تێڕوانینم بۆ دەفرەکە پێمگوت:

- بەڵی ژوورمان بۆت هەیە، بەڵام ئەوە چییە؟

ئەویش لای لە دەفرەکە کردەوەو بە دڵخۆشییەوە نازانم هۆکارەکەی چیبوو، گوتی:

- ئەوە گرافیتۆنە داهێنانی خۆمە، کار بە بای ئایۆنی دژ بە کێشکردن دەکات.

وەک گێلۆکەیەک خۆمم دەرخست کە مەبەستی لەو دەفرە کانزاییە چییە، گوتم:

- بەڕێز بەداوای لێبووردنەوە، وڵات لەدۆخی جەنگدایە، بۆیە بەکارهێنانی تەنی لەم شێوەیە قەدەغەیە بەتایبەت لەئوتێلەکاندا، هەر لەبەر ئەوەش کە ئێمە بەتەنیشت کارگەی دروستکردنی کەشتییەوەین.

پیاوەکە زۆر بەڕێزەوە گوتی:

- داوای لێبووردنت لێ دەکەم کە ناڕەحەتم کردی، لەشوێنێکی تر بۆ ژوور دەگەڕێم.

باوەڕم نەدەکرد بەو شێوە بەڕێزییەی خۆی بەدەستەوە بدات، بەو شێوە داچەمینەوەشی کە خەسڵەتی لۆردەکان بوو، ئامادەبوو بۆ ڕۆیشتن، بەو شێوەیە بۆ تەنیای دەمێنمەوە، هەر زوو بانگم لێکرد و تەماشایەکی جوانییەکەیم کرد و گوتم:

- بەڕێز، دڵنیایت ئەو شتە خەتەر نییە؟

لێوەکانی گەست و بزەیەکی تری بەئاستەم دەرخست و گوتی:

- بەڵێ خاتوونەکەم، بەڵێنت پێدەدەم.

بەخۆڕادەستکردنەوە دەفتەرەکەم دەرهێناو گوتم:

- ناوی بەڕێزتان چییە؟

زۆر بەخۆ باوەڕبوونەوە گوتی:

- ناوم (تۆماس)ە، تۆماس براون.

* * *

براون دەبێژێت:

فیلادیلفیا کەشێکی پیشەزای هەیە، تەنانە لەڕوخساری دانیشتوانیەکەشیەوە ئەوە بەدی دەکەیت، زۆر بزێون و جیددین چون ئەوەی قەدەر بەدوایانا ڕابکات، لە کالیفۆرنیا لای ئێمە ئەوە نییە، دەبینی کچێک لەو پەڕی خۆشحاڵیدایەو لەتەک سەگەکەی یاپشە یاپشە بەشەقامەکاندا پیاسە دەکات. لەنزیکترین ئوتێلی حەوزی کەشتییەکان گەڕام، ئەگەر لەبەر نهێنی چالاکییەکە نەبوایە کە هێزی دەریاوانی ئەمریکی پێیان ڕاسپاردم، لەئوتێلێکی

پێنج ئەستێرەیی دوور لە حەوزەکە دەمامەوە، تا ئێستاش باوەڕ ناکەم دەریاوانی ئەمریکی چۆن و بۆچی بیریان لەوە کردووەتەوە تا منی بۆ بنێرن، بابەتەکە سەیرە، بەتایبەت (ئینیشتاین)یان ناچار کرد، زمانی لەگۆ بخات بۆ ئەو زانستەی کە ناچاریان کرد لەو بیردۆزە تازەیەی بشارێتەوە، لەچاوان دووریان خستەوەو ئەمریکا بۆ خۆی قۆرخیان کرد.

سەیرم بە سەردەم دێت، چۆن گاڵتەیان بەدەریاوانیم دەکرد و ڕۆژ هات و ڕۆیشت ئەوەتا لەنێو هەموو زاناکان منیان هەڵبژارد، بەر لەچەند ساڵێک لەزانکۆدا بەسەر شانۆی زانستی وەستابووم، تاقیکردنەوەیەکم خستە ڕوو، هەر هەموو ئەوانەی گوێیان لێم بوو لەسەرسامیدا قژە سەریان قیتەوەبوو، کاتێک تۆپێکی کانزاییم بە بەندۆڵەوە بەست و پاڵێکم پێوە نا، تا بگەڕێت، لەگەڵ بەرزبوونەوەی بەندۆڵەکە بەرزەوە بوو، لە حەوا وەستا و نەگەڕایەوە، وەک ئەوەی کەلەڕەقی خۆی بنوێنێت، کاتێک بیرۆکەکەم شرۆڤە کرد، ژاوەژاوێکی نایەوە، گرنگ نییە لەکۆمەڵگای زانستی ئەو مشتومڕە، ئەوەش مانای ئەوەبوو تۆ ڕاستی، ئەوان بەزەییان بەکەسا نایەتەوە، بۆم دەرکەوت کێشکردن هێزی بەکێش نییە، کە وامان مەزەندە دەکرد، بەڵکو هێزێکی پاڵنەرە و دەتوانرێت زۆر بە ئاسانی دەستی بەسەرا بگیرێت، بێ هیچ بزوێنەرێکی ئاڵۆزیش.

ئەگەر ئەو بیرۆکەیەی دۆزیمەوە، گورە بکرایە و پارەی تیا خەرج بکرایە، دەیتوانی ئۆتۆمبێل بەحەواوە بفڕێنێت، نەک هەر بەحەواوە تەنانەت بەرەو مەودای ئاسمانیش وەک فڕۆکە بەرز بێتەوە، پێویستیمان بە دڵۆپێک سووتەمەنیش نابێت، بەڵکو پێویستیمان بە مەکینەیەکی ئاڵۆز دەبێت، تەنانەت ئەگەر سادەش بێت، ناوی تەکنەلۆژیای وشکم لێناوە، یانی پێویست

به هیچ پارچەیەکی جووڵاو ناکات، چوومە دەریاوانی ئەمریکی لەبەر ئەوەی کاتی خۆی بایەخیان بەو جۆرە داهێنانە دەدا، وەلێ ئەوان گوتیان حاڵی حازر گوێ بەو بیرۆکەیە نادەن، ڕاپۆرتی خۆمم وێدان ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان پێویستیان پێبوو، دەتوانن پەیوەندیم پێوە بکەن.

تاقیکردنەوەکانم بە پارەی خۆم تاقی دەکردەوە، یەکەم دەفری فڕینی بچووکم داهێناو ناویشم نا (گرافیتۆن) لەبەر ئەوەی بەهێزی دژە کێش کاری دەکرد، تەنها دوو جەمسەری کارەبای لە هەردوو لاوە پێویست بوو، زۆرێک لەزانایانی ئەمریکی و ئینگلیزیم بانگهێشت کرد، تا لەنزیکەوە داهێنانەکەم ببینن، دەفرەکەم ناوی لەچاویان هانی، بەڵام نازانم بۆچی ئاهەنگیان بەو بۆنەوە بۆ نەگێڕام، یا بۆچی بۆ ئەو داهێنە خەڵاتی نۆبڵیان نەکردم، ئاخر داهێنانی وا سووتەمەنیشیناوێت، ئەوە تەنانەت سەردەمەکەش دەگۆڕێت، هەڵبەت کۆمپانیا زەبەلاحەکان نایانەوێ ئەو داهێنە ببێتە هۆی کوێر کردنەوەی عەرشیان، ئەوەی ڕاستییە ئەوان گەورەترین تاوانی زانستی لەمێژوودا دەکەن، ئەوان نایانەوێ داهێنانی وا بکرێت، نەوەک کۆمپانیاکانیان لەکار بکەوێت.

ساڵانێک تێپەڕی، جەنگی جیهانی دووەم هەڵگیرسا، پەیوەندییەکم لەلایەن کەسێکی زۆر وریاوە پێگەیشت، پێیڕاگەیاندم دەریاوانی ئەمریکی پێویستیان پێمە، چوومە بارگاکەیان، دڵم ختوورەی کرد، ئاخر غایەلەی زۆرم کرد، وەلێ بەوە دڵم هێور بووەوە، ساڵانێک کارم لەسەر تاقیکردنەوەکانیان کردووە، هەر ئەو تاقیکردنەوانە بوون بەهۆی بانگهێشتکردنم، پێیانڕاگەیاندم شوێنی جێبەجیکردنی تاقیکردنەوەکە فیلادیلفیایە، کە پێنج هەزار کیلۆمەتر لە کالیفۆرنیاوە دوورە، جانتا ناوەندییەکەم ئامادەکرد و (گرافیتۆن)ەکەشم

لەتەک خۆما برد، گوتیشیان ئەگەر تاقیکردنەوەکە سەرکەوتوو بوو، ئەوا سەرکردەکان بە پەرۆشیەوە دەبن.

بەوای دوورییەوە گەشتەکەم زۆر سەختبوو، زۆریش ڕێم ونکرد، تا بەو ئوتێلە سادەیە گەیشتم کە کەس تیا دانەدەنیشت، ئافرەتی پێشوازییەکە لانێی بوو، وەلێ زۆر جوانبوو، پێدەچوو ژیانی شاری پیشەسازی زۆری فێر کردبێت، بە سەرسامییەوە لە گرافیتۆنەکەی دەڕوانی، سەرەتا ژووری پێ نەدام، دواتر خەسڵەتی لانێییەکەی ژوورەکەی وێدام و تەماشای کردم و بزەیەکیشی بۆ کرد.

*　　　　*　　　　*

لیزا دەڵێت:

کات درێژەی کێشا، دوای دەرچوونی ئەو قیتوقۆزە تەنیایی بەرۆکی گرتمەوە، کاتژمێرەکانم یەک بەدوای یەک دەژماردن، خەیاڵیشم لەو دیدارە کورتەی ئەو سڵاوکردنەی و تێڕوانینەکانی لێم جیا نەدەبووەوە، لەئاوێنەکە لەڕوخساری خۆمم ڕوانی، دەستێکم بە قژە سەرمدا هێنا، بۆ دەیەمجار لەکاتژمێرەکەم ڕوانی، شەوم بەسەر هات و هەر دەرنەکەوت، بیرم کردەوە بۆ کات بەسەر بردن بچمە ژوورەکەی و جێ و بانەکەی ڕێکبخەم، بۆ نهۆمی دووەم سەرکەوتم، دەرگای ژوورەکەیم کردەوەو چوومە ژوورەوە.

بە ئاسپایی دەرگاکەم کردەوە، چراکەم هەڵکرد، چاوێکم بەژوورەکەدا گێڕا، هەموو شتێک ڕێک و پێک بوو، تەنانەت جی و بانەکەشی، ئەم پیاوە (جێنتڵمان)ە وەک لەشار دەیانگوت، بینیم دەفرەکەی بە دیوارەکەوە هەڵواسراوە، بانی دەفرەکە بەوای چراکەوە دەبریقایەوە، لە دەفرەکە نزیک

بوومەوە و زۆریش بەوریاییەوە دەستێکم پیا هێنا، ئەو کوڕە قۆزە چی دەربارەی ئەو دەفرەی پێگوتم؟ ئا گوتی بە کێشکردن کار دەکات؟ هیچ کێشکردنێک پێ نازانم تەنها چاوەکانی نەبێت، کە کێشت دەکات تا لەقووڵایی نیگاکردنەکەی ڕۆ بچیت.

دەفرەکەم بەدەستەوە گرت، قەبارەی گەورە نەبوو، هەر بەقەد کێکێکی نیمچە گەورە دەبوو، دوو ستوون لەملاو ئەولایەوە دەرچووبوون، بە بانیشیەوە هیچ نووسینێک نەبوو، تەنانەت ڕەنگیشی پێوە نەبوو، ڕەنگی زیوینی هەبوو، دەتگوت تەنەکەیە، پێدەچوو درووستکەرەکەی زەوقی وای نەبووبێت لەدرووستکردنی شتەکان.

ما دیقەتی وردەکارییەکانی بدەم، چون ئەوەی بمەوێ بزانم چۆن کار دەکات، دواجار چاوم لەسەر شتێکی دەفرەکە وەستا، بە ترس و سەرسوڕمانەوە نیگام گواستەوە سەر زەوییەکە، کشامەوە، لەپشتمەوە بەسەر زەوییەکەوە سێبەری مرۆڤێکی درێژ دەرکەوت، لێل ئاوڕدانەوەم لێی هاوارم کرد، دڵم خۆی بۆ نەگیرا، ئەوەی پشتمەوە مرۆڤ نەبوو، هیچ بوونەوەرێکی تریش نەبوو، ئای خودایە ئەوە... !

ئەو سێبەرەی پشتمەوە بەسەر زەوییەکەوە بینیم، هەمان شت بوو کە ئاوڕم لێ دایەوە، تەنها سێبەر بوو، وەلێ ئەمجارە بەسەر دیوارەکەوە، سێبەرێکی درێژ و لەسەرخۆ دەجووڵایەوە، بەوای درێژییەکەیەوە نیوەی سێبەرەکە بەسەر زەوییەکەوەو ئەودوای بەسەر دیوارەکەوە بوو، سێبەرێک بێ هیچ شتێک سێبەری درووست کردبوو، دەتگوت لە گیانلەبەرەکە جیا بووەتەوە، کەوتە جووڵە وەک ئەوەی بێتە پێشەوە، سێبەرەکە بەدیوارەکە کورتی دەهێنا، وەک ئەوەی کەسێک لەدوور ڕا نزیک دەبێتەوە، ئەوەی تۆقاندمی

دەنگێکی چوون فیشکەی ماری هەبوو، نەمدەزانی لەکوێوە دێت، زانیم هاوارەکانم بە کەس ناگات، ئەم ئوتێلە نەگریسەمان لەهەموو شتێکەوە دوورە، بەدەر لەوەش دەفرەکەم بەدەستەوە گرت و هاواری شێتانەم کرد، چاویشم لەجووڵەی سێبەرە شەیتانییەکە نەبڕی، دواتر پێمهەڵکەوت و بەرەوە بووم، تا لەوێ دەفرەکە هەڵبوو.

بینیم دەفرەکە لەنێو دەستمدا هەڵدەبەزییەوە، وەک ئەوەی بیەوێ بەحەوادا بچێت، لەدەستم بەڕەڵا بوو، بەشێوەیەکی نارێک دەسووڕایەوە، سێبەرەکەش بەملا و ئەولادا دەهات و دەچوو، منیش لەهاواری خۆم نەکەوتم، ترس زۆری بۆ هێنام چوومە دەرەوەی ژوورەکە، نەفرەتم لە پیاوە قۆزەکە کرد، بۆم دەرکەوت ساحیرە، لەدەرەوە لە دوو توێی دەرگاکەوە چاوم بەوە کەوت کە لێی تۆقیبووم، ئەو سێبەرە لەدەرگاکە نزیک دەبووەوە، دواتر هاتە دەرەوە... جوێنێکم دا و بەترسەوە کشامەوە، بەدەم کشانەوەش لەسێبەرەکەم دەڕوانی کە لەدەرگاکە بۆ ناو ڕاڕەوەکە دەهاتە دەرەوە، جووڵەیەکی لەناکاوم کرد، بێ هیچ مەبەستێک، وەلێ زۆر بەسوود کەوتەوە، دەستم برد چرای ڕاڕەوەکە بکوژێنمەوە، سێبەرەکە نەما، هێدی هێدی بە پەیژەکە هاتمە خوارەوە، چاویشم لەڕاڕەوە تاریکەکە نەدەبڕی، هەر ترپەیەکی دڵم ترسە لەرزۆکەیەک بوو، ئەوەندەی پێنەچوو سێبەرەکە بەسەر پەیژەکەوە دوور لەتاریکی ڕاڕەوەکە دەرکەوتەوە، ئەویش بەرو خوار دەبووەوە، ئەوجارە لەشێوەی جەستەی بنیادەمێک دەرکەوت نەک سێبەر، بەرەو نهۆمی زەوییەکە ملمنا و چرای سەر پەیژەکەم کوژاندەوە، خۆم بە ژووری نووسینگەی پێشوازیدا کرد، دەستم بۆ دووگمەی سەرەکی هەموو چراکانی ئوتێلەکە برد و کوژاندمەوە،

دەرگاکەم لەسەر خۆم کلۆمدا، نازانم بۆچی ئەو کردە گەمژەییەم کرد، باشتر وانەبوو بۆ دەرەوەی ئوتێلەکە هەڵێم؟
چەند خوولەکێک تێپەڕی چاوم هەر لەبن دەرگاکە بوو، لەوێ لە بنی دەرگاکەوە شتێک وەک سێبەر لەتاریکی ژێر دەرگاکەوە دیاربوو، چون ئەوەی ڕشی سێبەرەکە لەڕەشی تاریکییەکە ڕەشتر بێت، بەملاو ئەولادا دەهات و دەچوو، فیشکاندنەکەشی خوێنی دەمەیاندم، نەفرەتم لەو ساتە کرد کە ڕێم بەو پیاوە قۆزە دا لەم ئوتێلە بمێنێتەوە.

* * *

براون دەڵێت:
شەیدا و هۆگری زانست ڕەنگە فیزیاو کیمیا بەلارێدا بەرێت و تاوانی ئاگری بەربوونەوە بگێڕێت، بۆیە لە هزری میللەتان چیرۆککەلێکم گوێ لێبووە، وەک چیرۆکی فرانکشتاین و ئەوانیتر، ئەو شەیدابوونەش دەگاتە تروپک کاتێک دەگاتە نیوەی ڕێگا، تا بەو ڕاستییە بگات کە جیهان بگۆڕێت، هەندێجاریش ئەو هۆگرییە سەرزەنشتییەکت لەتەکدا دەکات، دواتر بۆت دەردەکەوێت ئەوە لەقازانجی مرۆڤایەتیدایە، ئەو شەیدابییە دادێتەوە تا گڕ بگرێت، لەدەرەوەی ئوتێلەکە بیرم لەوە دەکردەوە، بەرەو دەرەوەی ئوتێلەکە دەڕۆیشتم، دوای ئەوەی بەیانی باشم لەو ئافرەتە شۆخ و نازدارەکرد، ڕاستەوخۆ بەرەو حەوزی کەشتییەکان ڕۆیشتم، ڕێک بەرەو کەشتییە سەربازییە زەبەلاحەکەی (ئیلدریگ) ڕێگام گرتەبەر.
ئەوەی تەواوی خەڵکی نایزانن، دەریاوانی ئەمریکی لەجەنگی جیهانی دووەمەوە کار لەسەر تاقیکردنەوەی نهێنی جەنگی دەکەن، کار لەسەر

بابەتگەلێک دەکەن، خەڵکی بەخەیاڵی دەزانن، وەلێ لەدەریاوانیدا پارەی باشی بۆ هەڵدەڕێژن، تاقیکردنەوەکان تایبەتن بە ئاشکرا کردنی جیهانە لەیەکچووەکان، یا مەودا لەیەکچووەکان، وەک هەندێک ئاماژەی پێدەکەن، گەشت بەنێو سەردەمەکان، لە (ئینیشتاین)یان قەدەغە کرد دوایین بەشی بیردۆزەکەی کە ناوی لێ نابوو کێڵگەی یەکگرتوو، کە هەردوو بیردۆزەی ڕێژەیی و کارۆموگناتیسی و هێزی کێشکردنی لەیەک هاوکێشەدا ئاوێتەکردبوو.

مانای سەرکەوتنی ئینیشتاین لە تێکەڵکردنی کارۆموگناتیسی و هێزی کێشکردن لە یەک کایەدا، ئەو توانیایەیە دەتوانێت تیشک بچەمێنێتەوە بەدەور تەنێکی دیاریکراودا، بەو ئاوایەش تەنەکە لەبەر چاوان ون دەبێت، هەر وەک کڵاوی کۆنی خۆشاردنەوە، وەلێ بەفیزیک نەک بە خورافات، بۆیە دەریاوانیش بۆی دەرکەوت ئەو شتە سەربازییە، ئینیشتاینیان بێدەنگ کرد و نهێنییەکەشیان قۆستەوە.

لەتەک زانایانی دەریاوانی ئەمریکی لەکالیفۆرنیا کارم لەسەر ئەو بیردۆزەیە کرد، لەگەڵ ئەو تاقیکردنەوانەی خۆم دامهێنابوون لەبواری کارەبابیدا، تا بەوە گەیشتین تەن لەبەرچاوان بشارینەوە، تەنانەت توانیمان بینای گەورەش بشارینەوە بەبێ ئەوەی کەسی تیا بێت، وامان شاردەوە چون ئەوەی هەر نەبووبێت، دوای چەند خولەکێک دەرمانخستەوە، گۆڕانکارییەکی زانستی بوو، ئەوەندەی تر زاناکانی پەرۆش کرد، تەنانەت وایانلێکردین دەست بۆ ون کردنی مرۆڤەکانیش بەرین، باشترین هەلیش بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە، ئێستایە، ئەمریکا بەرەو جەنگی جیهانی دووەم دەڕوات، ئەگەر توانیمان کەشتی و فڕۆکەکانمان

بشارینەوە، ئەوا شکست بە زەبەلاحترین دوژمن دێنین، وەک ئەوە وایە شەیتانیان بەسەرا هاتبێتە خوارەوە.

کەشتی (ئیلدریج)ی سەربازی بۆ ئەو تاقیکردنەوەیە هەڵبژێردرا، کە ئەمڕۆ گەشتی تاقیکردنەوەکەی لە فیلادیلیفیاوە دەردەچێت، پێویستە تاقیکردنەوەکە لەکاتی دەرچوونی لە حەوزی کەشتییەکانەوە دەست پێبکات، هەروەها بڕیار درا تیمی کەشتییەکەشی بەسەرەوە بێت، ناشبێت کەس بە پیتێکی ئەو تاقیکردنەوە بزانێت، لەبەر ئەوەی خودی تاقیکردنەوەکە نهێنییە، ئەگەر بزانن ئەو سەرکێشییە ڕەتدەکەنەوە، بۆیە لەسەرەتاوە گوتم پەرۆشی زانستی وا لەفیزیک دەکات تاوانی مرۆڤایەتی بنێتەوە، هەندێ جار لەپێناو زانستا دەبێت قوربانیشی بۆ بدرێت. تەماشای کەشتییە سەربازییەکەم کرد، لەنێو هەموو کەشتییەکانی حەوزەکەدا بەهەیبەتەوە وەستابوو، تیمی دەریاوانییەکە لەکارەکانیاندا زۆر گورج و گۆڵ بوون، چاوم تێبڕین، هەستمکرد شێوەیەک لەشێوەکان فرنکشتاینم، بە ئامادەگی ئەفسەری دەریاوانی سەرکەوتمە سەر کەشتییەکە، وامان پێگوتبوون کە ئامێری تەشویشی دەخەینە سەر، تا ڕادار کەشفی نەکات، لەڕاستیدا ئێمە درۆی زۆرمان نەکرد، تەکنیکی شاردنەوەی کە دامانهێنا تەنەکە لەبەرچاوان دەشارێتەوە، یانی لەڕاداریش، کەواتە درۆ نییە.

کاپتنی کەشتییەکە پیاوێکی کەتەبوو، پیاوێکی تووڕە و ڕوو گرژ بوو، جارەو بار بەڕوویەکی ڕق ئاسا لێی دەڕوانیم، بەخۆمم دەگوت، چی دەبێت ئەگەر ئەو پیاوە بە کارەکەمان بزانێت؟ لەبیرۆکەکە داچڵەکیم، دڵم زیاتر کەوتە لێدان، وەلێ هەمووم لێ شاردەوە، ما خۆم بەکارەکەمەوە سەرقاڵ بکەم، ئەویش لەپێناو نیشتمان و هەروەسا لەپێناو زانستیشە.

ئەوەی ڕاستی بیت تیمی دەریاوانییەکەمان زۆر دوا خست، تا کەوتە ڕێ، دوای ئەوەی شتەکانمان دابەست، بڕیار وابوو هەلیکۆپتەرێک بەبان کەشتییەکەوە هەڵفڕێت، ئەو ئامێرەی تێدا بێت کە مەودای کێڵگەی یەکگرتوو دەهاوێت و کەشتییەکە بەسەر دەریاکەوە ون دەبێت، بۆ خۆم لەناو کۆپتەرەکەدا بووم، تەماشای کەشتییەکەو تیمە دەریاوانییەکەم دەکرد، زیاتر لەدووسەد کەسی بەسەرەوە بوو، دەستم بەسەر دوگمەی ئیشپێکردنەکەوەبوو، بیرم لەپشت ڕوودانی ئەو تەکنەلۆژیایە دەکردەوە، کاتێک بوو بەکاتژمێر سێی لای ئێوارە و کەشتییەکەش لە بەندەرەکە دوور کەوتەوە، پەنجەم بەدوگمەکەدا هێنا، چەند چرکەیەکی نەبرد کەشتییەکە دیار نەما، چون ئەوەی وێنەیەک بێت بەسەر تەختە ڕەشەوەو کەسێک سڕیبێتەوە.

هەموو ئامێرەکانی چاودێریمان لێ خستە گەڕ، بەلەمەکانمان نارد، بینیمان بەلەمەکان بەو شوێنەدا ڕەت بوون کە کەشتییەکەی لێبوو، چون ئەوەی دیار نەمابێت، هەموو ئامێر و ڕادارەکان هیچیان نەدۆزییەوە، بەر لەوەی پەنجە بە دووگمەکەدا بنێم بۆ گەڕانەوەی کەشتییەکە، دڵم ختوورەی کرد.

چەند چرکەیەکم لێ بوو بەچەندین ساڵ، لەپڕ کەشتییە زەبەلاحەکە لەهەمان شوێن دەرکەوتەوە، هیچی بەسەر نەهاتبوو، دیقەتی دەریاوانەکانی سەر کەشتییەکەم دا، هەرهەموویان بەسەر پشتی کەشتییەکەوە بەربووبوونەوە.

بەلەمەکان بلەز چواردەوری کەشتییەکەیاندا، پیاوانی دەریاوان چوونە سەر کەشتییەکە بۆ ئەوەی بزانن چی ڕوویداوە، بینییان تیمەکە زیندوون، وەلێ هەر هەموویان تووشی سەرەگێژە ببوون و دەرشانەوە، هەندێکیشیان لەخۆیان چووبوون، وەلێ کەسیان لێ نەمردبوو.

شتێک لەوپەڕی سەرسوڕمان و ترسدا بوو، کاپتنی کەشتییەکە کە ڕقی لێم بوو، نە لەسەر کەشتییەکە بوو نەیش لەدەریاکە، ئەگەرچی بەلەمەکان تا بەریەیان بەدوویدا گەڕان، هیچ شوێنەوارێکی نەبوو.

* * *

لیزا دەبێژێت:

هەنگاو گەلێکی لەسەرخۆ لەتاریکی ناو ئوتێلەکە بەرەو ژووری کابرای قۆز دەڕۆیشت، هەر لەسەرخۆش دەرگای ژوورەکەی کرایەوە، زۆر بەوریاییەوە هەنگاوی بەرەو ناوەوە هاویشت، لەپڕ وێستا، دەنگی هێنانە سەرپێی دەماچەیەک بۆ سەر کەللەی هەنگاو نەرەکە هات، منیش زۆر بەوریاییەوە گوتم:

- یەک هەنگاوی تر کەللەت دەتەقێنمەوە، ئەی دەجاڵی قۆز.

هەستم بە لەرز لێهاتنی کوڕی قۆز کرد و دەستەکانی بۆ تەسلیم بوون بەرز کردەوە، هاوارم بەسەریا کرد:

- دەستەکانت بەرە پشتتەوە، بەدەم لەرزگرتنەوە و بەدڵەڕاوکێوە گوتی:

- خاتوو لیزا.. چییە...

بەهەڵچوونەوە ڕێم لێگرت:

- دەمت داخە، بەرلەوەی لەزمانیشت بخەم.

شەوێکی بەسام و تۆقێنەرم بەسەر برد، باوەڕ ناکەم هیچ ڕوحێکی بنیادەمی بەرگەی ئەو دۆخە بگرێت، بەدەر لەوەی لەو ژوورە تاریکە چرکەم لەخۆم بڕیبوو، ئەو سێبەرەش نەیدەتوانی ببوارێت، هەر بەتەنها بینینی دەیویست بگەڕێت و مشە مشی بێت، ئەو فیشکاندنەش کە دەهاتە گوێ، خوێنی

لەجەستەم بەستبوو، بەتایبەت کە خۆر بەرەبەرە دونیای ڕووناک دەکردەوە، لەپەنجەرەی ژوورەکانەوە ڕووناکی تاریکییەکەی ڕامالّی، کە من وەک مشک لەسووچێکی ژوورەکەدا خۆم شاردبووەوە.

ساتێکی زۆر ناخۆشبوو، دڵم بەرگەی ئەو دەرکەوتنەی نەدەگرت، کە سێبەری شەیتانەکە بێت و ناقڕگەم بگرێت، خودا کردی و ونبوو، تەنانەت لەژێر دەرگاکەشەوە نەبینرا، گوێم لەفیشکاندنیشی نەبوو، چون ئەوەی ڕۆژەکە ڕاوی نابێت، دانم بەخۆما گرت و پەردەکانم دادایەوەو بەسەر کورسی پێشوازی دانیشتم، هەستم بە ماندوویێتی و دڵتەنگییەکی زۆر کرد، لەپڕ گوێم لەکردنەوەی دەرگای سەرەکی ئوتێلەکەبوو کرایەوەو ئەو قیت و قۆزە دەرکەوت.

زۆرم لەسەر شەیتان خوێندبووەوە کە ناشرین نییە و شاخداریش نییە، بەڵکو قیتوقۆزەو پۆشتەو پەرداخە و زمانی تا بڵێی شیرین و لووسە، ژیانم بەوای ئەو ئەفسانانەوە هیچ کێشەیەکی بۆ نەنابوومەوە، تا ئەم شەیتانە قۆزەم لێ پەیدا بوو، بەو دەفرە نەفرەتییەشی کە بەدەستی جنۆکەوە دەفڕی، زۆر بەوریاییەوە هەستام و دەستم بۆ تفەنگەکەی ژێر مێزەکە برد کە بۆ خۆپاراستن دامنابوو، بەدوویەوە زۆر بەوریایی ڕۆیشتم تا لوولەی تفەنگەکەم لەسەری گیرکرد، ئەویش بەترسەوە وێستا.

دەستی بۆ پشتیەوە برد، وەک چۆن داوام لێکرد، بە پەتێک دەستەکانیم بەست، ئێدی هیچی پێناکری، بەوە دڵی خۆمم دایەوە، بەدەم ئازاری دەستیەوە گوتی:

- خاتوو لیزا ئەوە چی دەکەی؟ من کارم لە...

بەهەڵچوونەوە پێمگوت:

- تۆ شەیتانیت.

هەستمکرد ئەو وشەیە ئازاری پێگەیاند، هەر زوو بەڕوخساریەوە دەرکەوت، بەتووندی پێڵوی چاوەکانی دادایەوەو گوتی:

- خاتوون.. تکایە وا مەڵێ، من شەیتان نیم، من...

بەڕقەوە قسەکەم پێ قاچی:

- ئەو سیحرە نەفرەتییەی ناو ئەو دەفرە شەیتانە قێزەونەکانتی هێنا.

پیاوەکە قسەکەی پێبڕیم و بەتونێک دەنگی ڕاستگۆیانە گوتی:

- من زانای فیزیکم، ئەو دەفرەیەش گرافیتۆنە و بەکارەبا کار دەکات، پێشتر چوویتەتە قوتابخانە؟

لوولەی تفەنگەکەم زیاتر لەکەللەی توووند کرد و گوتم:

- بەڵێ چوومەتە قوتابخانەو زانکۆشم تەواو کردووە، هەی ئیبلیس دەزانم کارەبای نەفرەتی سێبەری نییە تا وەک شەیتان بجووڵێتەوە.

سەروسیمای گۆڕا و گوتی:

- ئەوە چ سێبەرێکە باسی دەکەیت؟ تکایە خاتوون هێمن بەرەوە و...

لەپڕ چراکەم پێکرد، دەستی نایە سەر چاوەکانی، پێمگوت:

- دەی لێل شەیتانەکانت ڕابوێرن، هەی جادووگەر.

بلەز چوومە دەرەوەو دەرگاکەشم لەسەری کڵۆمدا، بەهەڵەداوان چوومە خوارەوە بۆ ژووری پێشوازی و لەسەر زەویەکە دانیشتم، تفەنگەکەش بە باوشمەوە بوو، هەموو شتێک لەڕوحمدا دەلەرزی.

* * *

براون دەڵێت:

ئەو ئافرەتە لاتینیە توندڕەوە دەرگای لەسەر کڵۆم کردم، مەخابن بەشەیتانیش ناوزەدی کردم، ئەوەی نەشێت پێیکردم، بەڕاستی ئازاری ڕوحی دام، بەشێک لەناخمدا تاقیکردنەوەکانم ڕەت دەکاتەوە، چون ئەوەی پێمبڵێت ئەو کارەت دژ بە مرۆڤایەتییە، وەلێ بەشی هەرە گەورەی ناخم پێمرادەگەیێنێت کە کاری درووستم کردووە، کە مرۆڤایەتی لێی بەسوود دەبێت، بابەتەکە هەر ئەوە نییە شتێک بشاریتەوە، بابەتەکە زۆر لەوەش گەورەترە و...

لەلای دەرگاکەوە گوێم لەدەنگی هەڵدانەوەی لاپەڕە بوو، دیقەتمدا، بینیم کەسێک لەپشت دەرگاکە وەستاوە، سێبەری پێی بەڕوونی دیاربوو، بەدەنگێکی گڕ هاوارم کرد:

- خاتوو لیزا.. تکایە هێور بەرەوە، ئەو دەرگایەم لەسەر بکەرەوە.

(پێ)کان لەپشت دەرگاکەوە نەجووڵان، چون ئەوەی پشت دەرگاکە گوێی لێم نەبێت، لە دەرگاکە نزیکبووەمەوەو تەماشای بن دەرگاکەم کرد، سێبەرەکە لەپشت دەرگاکە دیار نەما، لەپڕ بەسەر ڕووی دەرگاکەوە وەک ئەوەی کۆپی سێبەری بنیادەم بێت دەرکەوت، هەستمکرد هەموو جەستەم کەوتە لەرزین، توانای قسەکردنیشم نەما، بەترسەوە کشامەوە، ئەو سێبەرە سەرچاوەی نەبوو، بەڵکو خۆی سەرچاوەی خۆیەتی، چاوم بە ژوورەکەدا گێڕا، عەقلی زانستیم هیچ شرۆڤەیەکی بۆ نەبوو، ئەو سێبەرەش دڵی پێ نەسووتام، کەوتە گەڕ تا سێبەرەکەی بەسەر دیوارەکەوە کورت بێتەوە، چون ئەوەی لێم بێتە پێشەوە، دواتر بەسەر زەوییەکەوە ڕاکشا، ئەوە بوونەوەرە و هۆشیشی هەیە، ئەوە چ بێهودەییەکی شەیتانییە؟!

*　　　　*　　　　*

یەکەمجارمبوو لەژیاندا ترس ئامبازم بێت، منێکی زانا بە پێی یاسای فیزیک و سرووشت کار دەکەم، وەلێ ئەوە چ فیزیکێکە سێبەر بە بێ جەستە دادێنێت؟ هەموو ئەو چیرۆکانەی بیستوومە بەوای دەرکەوتن و ونبوونەوە بووە، وەلێ سێبەرێک بێ تەن بێت و بڕوات، ئەوە عەقڵ هەڵی ناگرێت.

خەسڵەتی بنیادەمییەکەم لەوە زیاتر خۆی بۆ نەدەگیرا، تا هێزم تیا بوو هاوارم کرد، سێبەرەکە زیاتر لێم نزیکەوە دەبوو، هیچ دەربازبوونێکیشم بۆ نەبوو، کورسییەکم دا بەزەویدا، سێبەرەکە ئێستێکی بۆ کرد، ما بەملاو ئەولادا بگەڕێت، هاوارێکی ترم لێکرد، هەرچی لەناخمدا هەبوو دەرمبڕی.

*　　　　*　　　　*

لیزا دەڵێت:

لەقفەیەکم لەدەرگاکە دا، بینیم کوڕە قۆزەکە وەک مریشکێک بەر لەسەربڕین لەقفەفرتێیەتی، لەرزێکی لێهاتووە، نەبێتەوە، هەرزوو پەنجەم بەدوگمەی چراکە نا و ژوورەکە تاریک داهات، لێل تاریکبوون، فیشکەی سێبەرەکەش نەما، ئەوجا چوومە بن باڵی و ڕاستم کردەوە، دەستم بەسەریا هێناو داوای لێبووردنم لێکرد:

- ئەو ساتانەی ناخت تیا هەژا، من یەک شەوی ڕەبەق لەتەکیدا مامەوە، ها قومێ ئاو بخۆرەوە.

ئاوم وێدا و دەستم بەسەرو قژیدا هێنا تا هێمن بێتەوە، پێمگوت:

- بۆم دەرکەوت پەیوەندی بەتۆوە نییە، بۆ خۆم دەرچوومە دەرەوە بۆ وێستگەی بەنزینخانە نزیکەکە، لەوێش قسەو باسی ئەو نەفرەتییە بوو،

پێدەچێت هاتبێتە خوارەوە، نازانم بەدەر لەوەش هەست دەکەم پەیوەندی پێتەوە هەبێت.

کوڕە قۆزەکە بە (نا) سەری ڕاوەشاند، لێمپرسی:

- چی تۆی بۆ ئێرە هانیوە؟ بۆچی لەم ئوتێلە خۆت شاردووەتەوە، ئەم ئوتێلە هی خەڵکانێکی دەوڵەمەند نییە، تۆش پێدەچیت لەدەوڵەمەندەکان بیت.

قۆزە خۆی گردکردەوەو گوتی:

- خاتوون ناتوانم وردەکارییەکانت پێبڵێم، ئەوەی من دەیکەم لەوپەڕی نهێنی حکومەتدایە، هیچ پەیوەندییەکیشم بەو نەفرەتەوە نییە، دەبێت دەستەکانم بکەیتەوە، دەبێت هەر ئەمڕۆ لەسەر کارەکەم بم، ئەوەی دەیکەم زۆر گرنگە بۆ جیهان، تکات لێدەکەم دەبێت لەوێ بم.

تفەنگەکەم لێ بەرز کردەوەو لوولەکەم نایە نێوچەوانی، فیشەگم نایە بەر، ئەوجا هاوارم بەسەریا کرد:

- ئەگەر دەتەوێت گاڵتەم پێبکەیت و ئەوا تەختی نێوچەوانت لەژێر فەرمانی پەلەپیتکەمدایە، ئێدی سوودیشت بۆ جیهان دەنۆڕێنیت، ئاگاداری تووڕەیی کچانی تۆردیە بە.

کوڕە قۆزەکە داچڵەکی، دەستی بەقسەکردن کرد، شتێکی زۆر سەیری گێڕایەوە، پێدەچوو زۆریش خەتەرناک بێت، باسی لە شاردنەوەی کەشتی جەنگی کرد، کە بەهۆی چەند شتێکی فیزیکییەوە کە هەر خۆی سەری لێ

دەردەچوو، گوتی کە خودی حکومەت سەرپەرشتی ونکردنی ئەو کەشتییە زەبەلاحەی جەنگی کرد، پێمگوت:

- باشە کوڕی قۆز ئەی چۆن دەڵێیت حکومەت ئەو پرۆژەیەی ڕتکردووەتەوە، بۆ خۆتیش ئەوەتا دەڵێیت ئامادەبوونت بۆ پرۆژەکە گرنگە؟

قۆزە بەوریاییەوە گوتی:

- حکومەت ئەو پرۆژەیەی بەفەرمی هەڵوەشانەوە، وەلێ بەشێوەیەکی نافەرمی درێژەی پێدەدات، ئەویش بەوای گرنگی بەدەر لەخەتەرناکییەکەی، تکایە خاتوونەکەم لێگەڕێ بڕۆم.

دەستم بەسەریا هێنا، وەلێ لوولەی تفەنگەکەم لەگەردنی لانەبرد و گوتم:

- تا نەزانم ئەو شتانە چین حکومەت ئەوەندە گرنگی پێداوە، بۆشمی کورت مەکەرەوە من گێلۆکە نیم.

قۆزە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

- خاتوون.. تاقیکردنەوەکان تایبەت نەبوون بە شاردنەوەی کەلوپەلە سەربازییەکان، بەڵکو تاقیکردنەوەن بۆ ئاشکرا کردنی جیهانە لەیەکچووەکان و مەوداکانی تر، کە زۆربەی زاناکان باوەڕیان وایە ئەو جیهانانە هەن، کۆپی تری ئێمەی تێدایە.

کە ئەوەم بیست ناخم هەڵچوو، لێم پرسی:

- مەبەستت لەو جیهانە لەیەکچووانە، بۆنموونە لای ئێمەی تۆرنیە خەرمانە لە ئەفسانەکاندا پیاو چاکانی تێدا دەژین، یا دۆزەخ کە تاوانبارەکانی تێدا دەژین.

قۆزە بلەز گوتی:

- بەڵێ شتێک لەو جۆرە، وەلێ ڕێک وەک ئەوە نییە، جیهانەکانی تر کە مەبەستمانە کۆپییەکی تری تۆیە خاتوو لیزا، ڕەنگە لەشوێنێکی تر کار بکات، یا ئوتێلێکی تر.

هەموو سەرسوڕمانێکم تیا ڕسکا و گوتم:

- دەڵێیت حکومەت پارە لەوە خەرج دەکات؟ ئایا ئەو شتە زانستە؟ ئەوەی باوەڕ بە هەموو جۆرەکانی ئەفسانە دەکات، بەلایەوە هەر ئەفسانەیە.

کوڕە قۆزەکە برۆکانی بەرزەوە کرد و گوتی:

- ئێمە وەک زانایان باوەڕمان هەیە ئەوە خورافاتێکی گەمژانەیە، تا تاقیکردنەوەکەمان ئەنجامدا، هەموو زانایانی فیزیک لە (ئەنیشتاین)ەوە تا (نیلز) سەریان سوڕما، کاتێک ئەلیکترۆنمان ئاراستەی کونی دیوارێک کرد، دەبوو ئەلیکترۆنەکە لەکونەکەوە بڕوات و لەشاشەی بەرامبەر کونەکە بدات، بینیمان ئەلیکترۆنەکە لە دە شوێن لەهەمان کاتدا لەشاشەکەی دا، ئەوەش مانای ئەوەیە تەنێکی ماددە نییە وەک تۆپ، بریتییە لە شەپۆڵێک وەک شەپۆلی دەریا، کە لەکونێکەوە دەرچوو، پەرتەوازە دەبێت.

گوتم:

- ئەوە چ کێشەیەکە؟ ڕەنگە شەپۆڵێک بێت وەک شەپۆڵی دەنگ.

کوڕە قۆزەکە لێوی خۆی بەئاستەم گەزی و گوتی:

- کێشەکە کە سەرسامی کردبووین، کاتێک ئامێری چاودێریمان لەنزیک کونەکەوە دانا، بۆ سۆسە کردنی ئەلیکترۆنەکە تا بزانین لەگەڵ ڕەتبوونی

ئەلیکترۆنەکە بەکونەکەدا، دەبینین ئەلیکترۆنەکە گۆڕا بەتەنێکی ئاسایی و لەشاشەکەی بەرامبەری دەدا، خۆ ئەگەر ئامێرەکەمان کوژاندەوە، ئەوا ئەلیکترۆنەکە گۆڕا بە شەپۆلێکی تر، چون ئەوەی ئەلیکترۆنەکە هەست بەو چاودێرییە بکات، ئەگەر زانی کەسێک سۆسەی دەکات، وەک تەنێکی ئاسایی ڕفتار دەکات، خۆ ئەگەر ئەو سۆسەکردنە نەما ، چاودێرییەکە بۆ شەپۆڵ دەگۆڕدرێت، بابەتەکە وەک ئەوە وایە تەماشای کەسێک بکەیت، دەبینیت قسەت بۆ دەکات، کاتێک ڕووی لێ وەردەگێڕی و لەبەر چاوانت نامێنێت، بۆ (با) دەگۆڕدرێت، ئەوجا کە دووبارە لێی دەڕوانیتەوە، دەگۆڕدرێت بۆ مرۆڤ و قسەت لەتەکا دەکات، هەر بەو شێوازە .

بۆ چەند چرکەیەک بێدەنگیم هەڵبژارد، کوڕە قۆزەکە هەڵیداو گوتی:

- تەنها شرۆڤەیەک بۆ ئەوە، وەک زانا فیزیکییەکان لەسەری کۆکن، جیهانگەلێکی لەیەکچووی زۆر هەن و پەیوەندیشیان پێمانەوەیە، جیهانێک ئەلیکترۆن تێیدا دەبێت بە تەن، جیهانێک تێیدا دەبێت بە شەپۆڵ، ئێمەش یەک سرووشتی ئەلیکترۆن دەبینین، لەبەر ئەوەی سرووشتەکەی تری لەجیهانێکی لەیەکچووی ترماندایە، ئێمەش تەنها بەهەستەکانمان و بە ئامێرەکانمان تەنها ئەوەی لەجیهانی ئێمەدایە تێیدا دەژێین.

بە ناڕەزاییەوە گوتم:

- چاوبێری چ پەیوەندییەکی بەوەوەیە؟ تۆ دەڵێی کاتێک چاوبێری دەکەین وەک تەن دەردەکەوێت، کاتێکیش کامێراکە دەکوژێنینەوە وەک تەن خۆی دەردەخات، چی...

قسەکەی پێ قاچیم و گوتی:

- ئەوە بابەتێکی فرە ئاڵۆزەو کات بۆ شرۆڤە کردنی نییە، تەنها هەر ئەوە کێشەی ئەلیکترۆنەکەش نییە، بینیمان لەیەک کاتدا دەتوانرێت لەدوو شوێنی جیاوازدا ببینرێت، دەشتوانێت دیوارەکان ببڕێت و...

زانا قۆزەکە دەنگی لەخۆی بڕی، ما ڕایوەشێنم، شتێک لەچاوەکانیەوە دەرکەوت، حەزم نەکرد قسەکەی پێ ببڕم، چمکی کراسەکەی گرتم و گوتی:

- دەزانیت؟ توانیمان ئەو لێکچوونەی ئەلیکترۆنەکە دەیکرد بۆ تەنە زەبەلاحەکانی وەک کەشتییە جەنگییەکە کوێر بکەینەوە، خاتوو لیزا پێم بڵێ، ئەو سێبەرەی بینیت لەسەر شێوەی سێ ڕەهەندی بینین بوو، وەک ئەوەی جەستە بێت، یا تەنها بەسەر دیوار و زەوییەکەدا چاپکراو بوو؟

بەوای قسەکانییەوە ترسام، ولێ وەڵامم دایەوە:

- جارێک بە سێ ڕەهەندی مەودایی بەسەر قادرمەکەوە وەک بنیادەمێک ڕوخساری نەبوو دەمبینی، تەنها سێبەربوو.

بەدەم قسەکردنی لەتەک خۆیدا گوتی:

- تەنە سێ ڕەهەندە دوورییەکان بەسەر دیوارەکانەوە سێبەریان دەردەخست، وەلێ چوار ڕەهەندە دوورییەکان سێ ڕەهەندی دووری فڕێ دەدایە سەرمان.

بریقەیەک لەچاوەکانی دەرکەوت، بریقەی حاڵیبوون بوو...

* * *

براون دەڵێت:

بە دوو چاوی ئاوساوەوە، بەوای کەمخەوییەوە و ترسی دوێنێ شەو لەئوتێلەکەی لیزا کە دواتر ئیزنی ویدام بگەڕێمەوە سەر کارەکەم، لەناو کۆپتەرەکەوە دەمڕوانییە ئیلدریج کەشتییە زەبەلاحەکەو تیمەکەی کە بۆ جاری دووەم بۆ چالاکییەکی سەربازی دەرچووبوون، کەسیش پێیانی نەگوتبوو دەکەونە ژێر تاقیکردنەوە، هەر ئێمەبووین تاقیکردنەوەمان لەسەریان دەکرد، بەئاستەم لێوی خۆمم گەست کە بەدواداچوونم بۆ ئامادەکردنی ئامێرەکان دەکرد، ئەوجارە زۆرێک لەژمارەکانمان گۆڕی، شتگەلی هەستیارترمان لە (فیرجینیا)وە بەدووری 300 کیلۆمەتر دابەست، تاقیکردنەوەکەی ئەوڕۆژە تەنها شاردنەوە نەبوو، بەڵکو گواستنەوەی ئۆتۆماتیکیشە.

بەوای دڵەڕاوکێوە ئارەقەی سەردی نێو چەوانم سڕی، ئەگەر ئەو تاقیکردنەوەیە سەرکەوتوو بوو، ئەوا مەزنترین زانستمان دۆزیوەتەوە، ئێدی پێویستیمان بە کەشتی زەبەلاحیش نابێت بۆ گواستنەوەی باری گەورە، یا فڕۆکە بۆ گواستنەوەی خەڵکی، هەموو شتەکان بە چرکەسات دەگوێزرێنەوە، لەهەمووشی گرنگتر پێویست بە سووتەمەنی ناکات.

کاتژمێر دەی بەیانی پەیوەندییەکمان بۆ هات، ئەوە نیشانەی ئەوەبوو دەستبەکاربین، بێ ئەوەی تەماشای کەشتییە جەنگییەکە بکەم ئامێرەکەم پێکرد، کەشتی ئیلدریج بەتەواوی ون بوو، وەلێ ئەمجارە لەدوای خۆیەوە تەمێکی دروستکرد، بەلەمەکان لەناو تەمەکە کەوتنە سۆسە کردنی، گوتیان شتێکیان بینیوە وەک تەم وایە وەلێ ڕەنگی هەیە، پەیوەندییەکم لە فیجیناوە بۆ هات، زۆر بەجوانی گوێم لێگرتن، هەستم وروژابوو، ئیدی نازانم ترس بوو یا شتێکی تر لەخۆشخەبەری، گوتیان کەشتییەکە بە هەموو تیمەکەیەوە لەفیرجینا دەرکەوتەوە. ڕوخسارم شێوا کە گوتیان هەندێک لەتیمەکە ونبوونە و ئەوانی تریش تووشی شێتی هاتوون، چاوم نووقاند، گوێم لەسەرکردایەتی بوو، کە تاقیکردنەوەکە تەواو بکەم و کەشتییەکە بگەڕێنمەوە شوێنی خۆی لە (فیلادلفیا)، دە خوولەکی نەبرد، لەنێو تەمتوومانەکەوە کەشتییەکە دەرکەوتەوە، کۆپتەرکە بەسەریەوە نیشتەوە، بلەز دابەزیم، تا بزانم چی ڕوویداوە، بەتایبەت تیمەکە چییان بەسەرهاتووە.

دەردەسەرییەکی گەورە بوو، تیمەکە عەقڵیان لەدەست دابوو، یەکێکیانم بینی بەتاو غاری دەدا و لەدیوارەکەی بەرامبەری بەهێز سەری بەدیوارەکەدا دەکێشا، خوێن بەبالایا هاتە خوارەوەو کەوتە سەر زەوییەکە، مێشکی لەکەللەی هاتە دەرەوەو دەستبەجێ گیانی دەرچوو، ئەوانی دی هاواریان دەکرد و دەگریان و خۆیان بەیەکترا دەکێشا، یەک لەپیاوانی پشکنین هاتە لام و بەزمانێکی ترسەوە گوتی:

- گەورەم یەک لەدەریاوانەکانمان بینییەوە، پێدەچێت بەدیوارەکەوە نووسابێت.

دڵم بەتووندی کەوتە لێدان، چون ئەوەی بیەوێت لێم جیابێتەوەو دوورە پەرێزم بێت، بەهەنگاوی لەرزۆکەوە بەرەو ئەو دەریاوانە بەڕێکەوتم، دەمێک دیقەتم دا، دواتر چاوم داخست، ئاخر کۆمەڵێک گۆشت بوو، کە هەندێک لەپەلەکانی لەجووڵە نەکەوتبوون، زیاتر لێی نزیکەوەبووم، تا دەستەکانی ببینم، پێدەچوو ئەو دیوارە لەدرووستکردندا بوو، دەستی ئەمی تیا جێمابوو، دەرکردنی دەستی مەحاڵبوو.

بەترس و لەرزەوە بەسەر بانی کەشتییەکەدا ڕۆیشتم، بەنێو ئەو کارەساتە مرۆیانەی کە من هۆکاری بووم، بڕیارمدا کەشتییەکە جێ بهێڵم، تەنانەت جیهێشتنی تەواوی تاقیکردنەوەکە، کۆپتەرەکە گەڕاندمیەوە، بەپەلە چوومە ئوتێلەکە تا شت و مەکەکانم کۆ بکەمەوەو بڕۆم، دەرگای ئوتێلەکەم بەپەلە کردەوە، دواتر...

لیزا بەسەر زەویەکەوە کەوتبوو، تفەنگەکەش لەتەنیشتیەوە، هەرزوو پشکنینم بۆ دڵی کرد، هێشتا زیندوو بوو، لەڕوخساریەوە دیاربوو شتێکی بینیبوو، وا زەرد هەڵگەڕابوو، بەنەفرەت بێت! تۆ بڵێی ئەو سێبەرە هاتبێتەوە گیانی؟ دەنگێک چون وششەی گەڵادار و فیشکەی مار هات بەگوێمدا، دەنگی سێبەرەکە...

ئاوڕم لەدووی خۆم دایەوە، چاوم پێکەوت، تەنها سێبەرێکیش نەبوو، حەوت سێبەربوون بۆ حەوت کەس، ما بەدەم دیقەتدانیانەوە زۆریش بەوریاییەوە بکشێمەوە، ئەوانیش لەسەرخۆ لێم دەهاتنە پێش، چون ئەوەی بزانن نیچەرەکەیان نەتوانێت هەڵبێت، دواتر ترس ئامبازم بوو، یەکێکیان کەللەی دوو لەت ببوو، یەکێکی تریان باڵێکی نەبوو، ئەویتریان جەستەی تەواو شێوا بوو، وەک ئەوەی کۆمەڵە گۆشتێک بێت، ئای خودایە، ئەوانە...

حاڵیبوونێکی زانستی هەیە واتلێدەکات دڵتخۆش بیت، جۆرێکی تر لێی دادەچڵەکێی، ئەمجارە من داچڵەکیم، ئەو سێبەرانەی بەتەنها دەڕۆن بەڕێوە، هۆشێکی تایبەتیان هەیە، نە جنۆکەن نەیش ئەهریمەن، بەڵکو سێبەری کەسانێکن بۆ شوێنێکی تر گوێزاویانەتەوە، جیهانێک هاوشێوەی جیهانی ئێمە، ئەوە سێبەری ئەو تیمەن کە لە ئێلدریج ونبوون، بەڵام بێستە، ئەوەی دەستی بڕاوەو ئەوەی کەللەی پێوە نەماوە ون نەبوونە، وان لەوێ، بەسەر (ئێلدریج)ەوە.

بەنەفرەت بێت، ئەوانە لەدوو دووریدا و لەهەمان کاتدا هەن، هەروەک چۆن ئەلیکترۆن لەدوو شوێن و لەهەمان کاتدا هەیە، جوێنێکم داو لەهەموو شتەکان هەڵاتم، تەنانەت ناسنامەو دەفرەکەشم ناوێت، ئەگەر بۆشم بکرێت دەستبەرداری پلەی زانستییەکەشم دەبم، کەواتە من زانا نەبووم، پیاوکوژێکم وەک ئەو حکومەتە شێتەی ئەمریکا، بەپەلە ئوتێلەکەم جێهێشت، وام مەزەندە کرد سێبەرەکە دووم بکەوێت، وەلێ واینەکرد، ئەوەم بۆ ڕوون بووەوە کە ونبوونیان بەدەستی ئێمە بووە، نەک خودی خۆیان.

نازانم هەنووکە چۆن دەژین، ئاخۆ لەشوێنێکی تر جیهانێکی تر دەبینن، کە تێیدا دەجووڵێنەوە؟ نازانم و کەسیش نازانێت، حکومەت ئەو تاقیکردنەوانەی ڕاگرت، دوای ئەو کارەساتە، دوور نییە زۆرت لەو کتێبانە خوێندبێتەوە یا لەفیلمەکان بینیبێتت دەربارەی تاقیکردنەوەی فیلادلیفیا، وەلێ کەس پێیڕانەگایاندووی کە بەتەواوی چی تێا ڕوویداوە، لەبەر ئەوەی تاوانێکی زانستییە و بەسەرپەرشتی دەریاوانی ئەمریکی نەفرەت کراوەوەیە.

❊ ❊ ❊

شارلۆتان دەستی بەقەفەسی (لیزا)وە گرتبوو، دەموچاوی لێ نزیک کردەوەو گوتی:

- دوای بیستنی چیرۆکەکەت شتێک بەهزرمدا هات.. چۆن دادگاییت بکەم؟ داواکاری زانستی لای ئێوەوە نەبووە، بەڵکو لای ئەو زانایە (براون)ەوە بووە، کە سەردانی ئوتێلەکەتی کردووە.

شارلۆتان سوڕایەوەو پشتی لەقەفەسەکە کرد و گوتی:

- ئەگەر تەماشای بنەمای زانستی بکەین کە بۆتی شرۆڤە کردووە، هەقی دەدەینێ، ئەلیکترۆن هەموو ئەو شتانە دەکات و زیاتریش کە ئەو باسی کردووە، لەهەمان کاتدا بەلای ڕاست و چەدا دەسووڕێتەوە، بۆ نمونە ئەگەر ئەوە نەبووایە لەدرووستکردنی تیشکی ئێکس سەرکەوتوو نەدەبووین، زۆر ڕاستە ئەلیکترۆن دیوارو بەربەستەکان دەبڕێت، ئەگەر ئەو بڕینە نەبوایە ئەوا خۆر دەکوژایەوە، بەڵام لەمەڕ چاودێری تاقیکردنەوەی ئەلیکترۆن بەوردی بۆی شرۆڤە نەکردووی، ڕەنگە بەوای ئەو دڵەڕاوکێوە بێت کە خستبووتە ئەو دۆخەوە.

شارلۆتان بەدەم گواستنەوەی دارەکەی دەستی لەڕاستەوە بۆ چەپ گوتی:

- کە بۆتی شرۆڤە نەکردووە، ئەوە نهێنییەکی گەردوونە، نهێنییەکە زاناکان دەگەیێنێتە میتافیزیکی ڕاستەقینە، زۆر بەسادەیی نهێنییەکە هەر تەنێک لەم گەردوونە گەورە بێت یا بچووک مامەڵەی تەن دەکات نەک شەپۆڵ، بۆ نموونە ئەم دارە فۆتۆناتی تیشک کە دەکەوێتە سەری دەگەڕێتەوە، ئەوە چاودێرییە، دارەکەش وەک هەر تەنێک، گەرمایەکی کزۆڵەی لێ

دەردەچێت، دەرچوونی ئەو گەرمایە مانای ئەوەیە چاودێری کراوە، هەرچی ئەلیکترۆنە قەوارەیەکی زۆر بچووکە و زۆریش تیژڕەوە، بۆیە نابینرێت، وەک شەپۆلێک مامەڵە دەکات، چونکە نەبینراوە، هەر کە ئامێرێکی بۆ دادەنێین چاودێری بکات، وەک تەنۆچکەیەکی زۆر ورد دەردەکەوێت.

شارلۆتان لەسەر کورسییەک دانیشت و دارەکەی لەزەویەکە گیر کرد و گوتی:

- هەموو بوونەوەری دەرەوەی سرووشت وەک جنۆکە چاودێری نەکراون، بۆیە شەپۆلی نەبینراون، لەبەر ئەوەی زاناکان توانییان چاودێری ئەلیکترۆن بکەن، هەر بەهەمان شێوە دەتوانن چاودێری جنۆکەش بکەن.

دواتر تەماشای (لیزا)ی کرد و دارەکەی پیشاندا و گوتی:

- ئەم زانیارییە بەکەڵکی چیرۆکەکەت دێت، چونکە ئەم زانیارییە ناگات بەهزرت لەبەر ئەوەی خوێندنیشت تەواو نەکردووە، وەک لەژیاننامەکەتدا هاتووە، زانیارییەکی تریش لەبەسەرهاتەکەتدا هەیە یارمەتی باوەڕکردن دەدات، ئەویش بابەتی فرە جیهانەکانە، ئەویش زانیارییەکی زۆر تایبەت و پسپۆڕییە لەبواری فیزیک، ئەویش بیردۆزەی پشیلەی شرۆنگەرە.

شارلۆتا بەرەو قەفەسەکەی لیزا ڕۆیشت و گوتی:

- شرۆنگەر جووڵەی بڕکۆکەیی بەهەموو نامۆییەکانیەوە دەتوانین بە نموونەیەک نزیکی بکەینەوە، ئەگەر پشیلەیەکمان لە سندووقێک بەستەوەو بوتڵێک غازی ژەهراویمان بەکراوەیی تیا دانا، ئەو جووڵەی بڕکۆکەیی دەڵێت مادامێکی سندووقەکە داخراوە، پشیلەکە لەهەمان کاتدا مردووەو زیندووە، هەموو جارێکیش سندووقەکە دەکەینەوە بۆ چاودێری کردنی،

دەبینین لەیەک دۆخدایە، یا مردووە یانەخۆ زیندووە، بەپێی پێوەری فیزیک دوو جیهانی جیاواز هەن، ئێمەش لەیەک جیهانداین، کاتێک سندووقەکە دەکەینەوە، دەبینین پشیلەکە مردووە، کەچی لەجیهانێکی تر کۆپییەکی تری ئێمە هەیە، سندووقەکە دەکاتەوە دەبینێت پشیلەکە زیندووە، ئێمەش ناچارکراوین تەنها ئەم جیهانە ببینین، نەک جیهانەکەی تر، ئەویش بەوای ئەگەری سنووردارەوە.

شارلۆتان بەدارەکەی دەستی کێشای بەقەفەسەکەو گوتی:

- یانی لەوێ جیهانێکی تر هەیە، بۆ نموونە لەم ژوورەی ئێمە (لیزا)یەک هەیە و لەناو قەفەسێک دەستبەسەرە، وەلێ لەجیهانەکەی تر درۆ ناکات، بۆیە شارلۆتان لێی دەگەڕێ بڕوات، هەرچی ئەمەی لەجیهانەکەی ئێمەدایە درۆ بۆ شارلۆتان دەکات، ئەوەش وا لەشارلۆتان دەکات توورە بێت.

دارەکەی دەستی شێتانە دەیکێشا بەقەفەسەکەو دەیگوت:

- تاقیکردنەوەی فیلادلیفیا کە لە بەسەرهاتەکە گێڕاتەوە، دەریاوانی ئەمریکی بەتەواوی ڕەتیکردەوە، گوتیشیان قسەی پڕوپووچەو کابرایەکی دەریاوان بەناوی کارل ئالن ڕیگەیاندبوو کە چاوی بەتاقیکردنەوەکە کەوتووە، کە خودی ئەو دەریاوانە بەسەر کەشتییە جەنگییەکەوە بووە، کەسی تر نەیبینیوە، ئەوەشی گوتبوو ئەوەی لەتاقیکردنەوەکە ڕزگاری بووبوو، دەریاوانی ئەمریکی مێشکیانی شێواندبوو، تا هیچیان بیر نەیەتەوە، گوتووبووشی زانا براون لەو تاقیکردنەوەیە بەشداری کردووە، هیچ

سەرچاوەیەک نییە یا نووسراوێکی براون نییە، هیچ ڕاگەیاندنێکیشی نەداوە کە بەشداری ئەو تاقیکردنەوەیەی کردبێت، بەدەر لەچیرۆکی دەفری فڕیو ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە، کۆمەڵگەی زانستی زۆر سوودیان لێ بینی.

شارلۆتان دەرگای قەفەسەکەی کردەوەو گوتی:

- بوونی تۆماس براون لەچیرۆکەکەت و تاقیکردنەوەی فیلاسیلفیا ئاماژەدەرە کە چیرۆکەکەت درۆیە، لیزا.. لەبەر ئەوەی ئەو تاقیکردنەوەیە وەهمە، هەر تێنەگەیشتی چارەنووسی درۆکردن لێرە کووشتنە؟

لیزا بەهێمنییەوە گوتی:

- دەمزانی بەدرۆم دەخەیتەوە، وەلێ دوایین ئومێدێکم هەیە، ئومێدێک بەر لەکوشتنم.

شارلۆتان بەنیگاکردنی پرسیارەوە، لیزا بەشارلۆتانی گوت:

- دەمەوێ خۆم بکوژم، هەر وەک چۆن جیم جۆنز لە چیرۆکی دووەم گوتی، ناهێڵم کەس ژیانم ببات، بۆ خۆم کۆتایی بەژیانی خۆم دێنم.

شارلۆتان چاوەکانی لێ کز کرد و بێ هیچ پێشەکییەک دەمانچەکەی بۆ فڕێدا، کەوتە بەر پێی لیزا، شارلۆتان پشتی تێکرد، لیزاش داچەمییەوەو بەدەستێکی لەرزۆکەوە دەمانچەکەی هەڵگرت، نەمزانی چ بێ عەقڵێکە شارلۆتان کردی، چۆن دەمانچەکەی بۆ جێهێشت، کە دەزانێت ئەگەر تەقەی لێ بکات دەیکوژێت؟ وەلێ لیزا دەمانچەکەی گرتە دەست و ئاراستەی کەللەی خۆی کرد و پەنجەکانیشی دەلەرزین، گوتی:

- هۆ شارلۆتان، بێ هیچ قسەوباسێک گەمژەیەک پێیگوتبووم، جیهانە هاوشێوەکان هەقن؟ فالهالا.. ئەوەی ئۆدین پەیمانی وێدابووین هەقە؟ ئەگەر ژیانی خۆم ببڕمەوە دەچمە لای؟

شارلۆتان بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

- ئافرەت.. تا ئێستا هەر نازانیت؟

پیرەمێردەکە دیقەتی دام و تکای لێکردم:

- یاشێخ.پێم بڵێ، تۆ درۆ ناکەیت، ئەگەر مردم دەگەمە (فالهالا)و ئەو هەموو شۆخ و نازدارەی تێدایە؟

هەستم بەنامورادی کرد، قسەوباسەکەی لەتەک توێبە کردم بیرم هاتەوە، لەمەڕ چارەنووسی ئەو خەڵکە، چاوم نووقاند، گوێم لێبوو دەکڕووزایەوەو تکای لێدەکردم، پێمگوت:

- لیزا خاتوون.. تۆ بەهەشت بەو پانتاییەی ئەرزو ئاسمان دەبینیت، وەلێ نەک لای (ئۆدین)ی تاکچاو، بەڵکو لای خودای مەزن، باوەڕی پێبێنەو نەفرەت لە ئۆدین بکە، خودای تۆ تاکچاو نییە.

پیرەمێردەکە بزەیەکی هات، لێی حاڵی نەبووم، گوتی:

- یاشێخ.. خۆزگە پێشتر بەخزمەتت بگەیشتمایە.

پەنجەی نایە سەر پەلەپیتکەی دەمانچەکەو فیشەگی نا بەکەللەی خۆی، من و توێبەش کە دەستی بەسەریەوە گرت و چووە کڕنووشەوە و بەدڵ بۆ ئەو خاتوونە گریا، بینیم شارلۆتان لەسەرخۆ لە قەفەسەکەی توێبە نزیکەوە بوو، بەدارەکەی دەستی دەیکێشا بەقەفەسەکە و بە توێبەی گوت:

- ئەی یەمەنی نۆرەی تۆش هات، تۆ بەر لەوەی لە کۆنفراسەکە ئامادەبیت، پیتراگەیاندبووین، شاشەیەکت بۆ ئامادە بکەین، هەندێ وێنەو ڤیدیۆت بۆ ناردبووین، کە سەربردەکەت پەیوەستە بەوەوە، ئەوەتا بۆتمان ئامادە کردووە .

لەپڕ شارلۆتان چەقەنەیەکی لێدا، کابرای ڕووسی پاڵی بەشاشەیەکی گەورەوە نا، وێنەیەکی سرووشتی بەسەرەوەبوو، لێی نووسرابوو (توێبە ئەلحەموم)، کابرای ڕووسی ئامێرێکی کۆنترۆڵێکی دایە دەست توێبە، کە لەناو قەفەسەکەدابوو، توێبە چون ئەوەی هزری ڕۆیشتبێت، نەیدەزانی چ جیهانێکە بەدەست ئەو شێتەوە کە تێیکەوتووین، وەلێ دیقەتی شاشەکەیداو دواتر بەترسەوە ڕووی لەهەمووومان کرد، دەستی بەگێڕانەوەکرد، چیرۆکی دوانزەهەمین...

❊ ❊ ❊

## 12

# چیرۆکی ئێرەیی

### تویبه ئەلحەموم دەیگێڕێتەوە

چاو هەققە، تەنانەت ئەگەر پێش قەدەری پێشوەختە بوبێت، چاو پێشی کەوتووە، ئەگەر داواتان لێکرا خۆتان بشۆن، ئەوا خۆتان بشۆن.

سەحیح موسلم

بێ هیچ پێشەکییەک، لەدۆخێکداین پێویست بە پێشەکی ناکات، فیلمێکم بۆ ئامادە کردوون، نەمدەویست لەم هەلومەرجە نەفرەتییە نمایش بکرێت، وەلێ چارم نییە، بەڵکو ئەمە خودایە شتێک لەبابەتەکە ڕوودانی هەبێت.

ئەوەی لەسەر شاشەکە دەیبینن (حەزرەمۆت)ە شارێکی عارەبییە، هەزاران ساڵە ئەو ناوەی لێنراوەو نەگۆڕاوە، ئەو دەشتە بەهەشتەش شیوی (ئەلمەسیلە)یە کە ڕووبارێکی مەزنی پیا ڕەت دەبوو، بەمبەرو ئەوبەریشیەوە کۆنترین شارستانی لەخۆ دەگرت، بۆ خۆشم لەخێڵێکی مەزنی دەوروبەری ئەو شیوەم، بەناوی هۆزی (حەمووم)ەوە.

داوای لێبووردنتان لێدەکەم کە خۆمم پێ نەناساندن، من (تویبە ئەلحەمووم)م، من بەڵێندەرێکی زۆر بە ئەزموون و کۆنم لەکارەکەمدا و خەڵکی حەزرەمۆتم، کە لێرەش ئامادەم بۆ ئەوە نا خۆمتان پێ بناسێنم، یا باسی هۆزەکەم بکەم، لێرەم تا بەسەرهاتی ئەو پیاوەتان بۆ بگێڕمەوە کە بەسەر شاشەکەوەیە، لێل چاوپێکەوتنت بۆ ئەو پیاوە دڵت پێ دەسووتێ؟ پیاوێکی

کەم ئەندامی نابینا و لەرو لاواز بە گۆچانێکەوە بێ هودە دەگەڕێت، باوەڕم پێدەکەن هەر هەموو خەڵکی یەمەن زاتی ئەوە ناکەن بەرامبەری بوەستن؟ ئەو پیاوە لاوازە (ئەرحەب)بە، ئەرحەبی ئەلحەمووم، برامە.

وێنەکانتان لەسەرەتاوە پیشان دەدەم، تا لەهەموو شتێک حاڵی بن، ئەو منداڵە دەبینن، کە لەپۆلەکەدا بەتەنها دانیشتووە؟ بەڵێ، ئەوەی کامێراکە ڕووی تێکردوە، ئەوە (ئەرحەب)ی برامە لەتەمەنی هەشتساڵیدا، بەو منداڵییەی خۆیەوە نیگاکردنێکی جوامێرانەی هەبوو، شاشەکە نووکە شەش وێنەی تری منداڵانتان پیشان دەدات، هەر وێنەیەکی ئەو منداڵانەش ناوەکەی لەخواری شاشەکەوە نووسراوە، تەنانەت مێژووی ئەو ماوەیەی تیا ژیاون، تا مردن، بەڵێ هەموویان هەر بەتەمەنی منداڵی مردن، ڕەنگە قسەکەمتان بەلاوە سەیر بێت، وەلێ ئەو منداڵانە لەماوەی خوێندنی بنەڕەتی نزیکترین هاوڕێی کاکم بوون.

ئێستا دیمەنی کامێراکە دەتانگوێزێتەوە دیمەنێکی تر، ئەو منداڵەی دەیبینن بەسەر جێوبانەکەوە ڕاکشاوە؟ ئەوە ئەرحەبی برامە لەقۆناغی هەرزەکاریدایە، ئەو زیپکانەی دەموچاوی دەبینن، ئەوە هی هەرزەکارییە، نووکە چەند چرکەیەک لەتەکما بە، ئەو گەنجە قۆزە دەبینن لەوێ وەستاوە؟ ئێوە لەلای ڕاستەوە دەیبینن، کەمێکی تر ڕووی وەردەگێڕێت ئەودەم بە ڕوونی دەیبینن، ئا ئەوەتا دەجووڵێتەوە، بینیتان؟ مەترسن، ئەو دیوی دەموچاوی سووتاوە، چرچ و لۆچی تێکەوتووە، ئەو گەنجە ناوی فاتیحە، گەنجێکی قۆز وەلێ بەدبەخت، تووشی کارەساتی ئۆتۆمبیل هات، لایەک لە دەموچاوی سووتا، سووتانێک چارەسەری بۆ نەبوو، ئەو فاتیحە کچێک بەدڵ و بەگیان کەوتبووە

عیشقیەوە، بەناوی سووندس، سووندسیش کچە پووری ئەرحەبە، دڵیان چووبووە یەک.

لێگەڕێن چیرۆکەکە تەواو بکەین، ئێستا دیمەنی ناو ئۆتۆمبیلێک دەردەکەوێ، گەنجێک ئۆتۆمبیل لێدەخوڕێت، ئەویش ئەرحەبە، لە ڕێگایەکی تیژڕەودا لێدەخوڕێ، لەپڕ ئۆتۆمبیلێکی بەهادار پێشی دەکەوێت، ئەرحەب دیقەتی ئۆتۆمبیلەکەی دەدات، لێ دواتر چاوی لە شەقامەکە بڕییەوە، دوای دە میل لەڕێگاکە ئەرحەب چاوی بە ئۆتۆمبێلەکە دەکەوێتەوە، وەلێ بەوەرگەڕاوی، لای نەداو درێژەی بەلێخوڕینەکەی دا، شانی ڕاوەشاند، چون ئەوەی هەندێ شۆفێر بێباکانە ئۆتۆمبێل لێدەخوڕن.
ئێستا کامێرا دەمانباتە دیمەنێکی هەراو هۆریاوە، سەما و تەپڵ لێدان، ئەوە ئاهەنگێکی گەورەیە، هەر هەموو ئەوانەی ئامادەن کەسوکارو خزمانمن، دەتوانن زاواکەش لەنێو ئەو خەڵکە ببینن، ئا ئەوەتا لەوێیە، بەڵێ ئەوە خۆمم، منم زاواکە، زەماوەندی منە، زۆر دڵخۆشبووم کە ئەو ئافرەتەم هێنا، ئەوەی لەولاترەوە دانیشتووە ئەرحەبی برامە، ئەو شەوە شەوێکبوو لەخۆشترین شەوانی ژیانمدا، ڕۆژی دواتر بەئاگا هاتمەوە، بینیم هاوسەرەکەم بەتەنیشتمەوە مردووە، جەڵتەی دڵ لێدابوو، وەلێ نەمزانی هۆکاری جەڵتەکە چییە، مردنی لەپڕم بیستبوو، پەنام لێ دەگرت، وەلێ پێدەچێت نزیکترین کەسمی بردبێتەوە، کە هاوسەرەکەم بوو.
دەتانەوێت دیمەنی تر ببینن تا لەهەقیقەتی تاڵ تێبگەن، یانەخۆ ئێدی بەسە؟
بەڵێ من دانی پێدادەنێم، من برای چاونەفەسترین برام لە یەمەن، تەنانەت لەهەموو جیهان وەک مەزەندەی دەکەم، ئەرحەب ئەلەحمووم لە یەمەن

ناسراوه، کەس نییە زاتی ڕوو بەڕووبوونەوەی بێت، چەندینجار بینیومە خەڵکی کە بەرەو پیریان ڕۆیشتووە خۆیان لێ دوور خستوەتەوە، ئەگەر ئێرەیی پیاوێک بوایە ئەوا ئەرحەب دەبوو.

ناوبانگی بڵاوببووەوە، تەنانەت گۆڤارێکی عەرەبی بەناوبانگ دیداری لەتەکا بەست، زۆربەی هەرەزۆری خەڵک خوێندیەوە، وەلێ باوەڕیان پێ نەکرد، گوتبووی هەموو ئەو حاڵەتانە لەخۆوەیە، کاتێک لەشتێکی جوان دەڕوانێت، ناتوانێت لە یەک چرکە زیاتر لێی بڕوانێت، وەلێ ئەو چرکەیە بەسە، بەوەش کۆتایی بەدیدارەکەی هێنا، کە هەموو خەڵکی خۆیان لێ بەدوور دەگرت، خۆشیان ناوێت، تەنانەت خزم و ناسیارەکانیش حەزیان پێ نەبوو، هەقی خۆتە ڕقت لەکەسێک بێت ڕقی لێتە، ئەگەر هەموو خەڵکی ڕقیان لێت بووەوە، هەقی خۆتە ڕقت لەهەموو خەڵک ببێت، گوناهی تۆ نییە کە ڕقەکەت ئەو هەموو ئازارانەیان بدات.

کەس وەک ئێمەی هۆزی ئەلحەمووم نەهامەتی نەچەشت، ئەرحەب ناوبانگی لەوتاندین، زیاتر نەهامەتی بۆ ئێمە بوو، لەبەر ئەوەی ئێمە زۆرترین بەرکەوتەمان لەتەکیدا هەبوو، کاتێک مامەڵە لەتەک ئەرحەب دا دەکەیت، ئەوا مامەڵە لەتەک کەسێکی ئاساییدا دەکەیت، هەست بەهیچ شتێکی تۆقێنەر ناکەیت، وەلێ دوای ئەوەی جێیدەهێڵیت، خۆت لەکێشەیەکدا دەبینیتەوە، هەندێجار ئەوە ڕوودەدات، کاتێک بە بەردەمیدا دەڕۆیت و سڵاوی لێ دەکەیت، ئەرحەب هەر بۆ خودا دەڵێم شەیتان بوو.

بۆت هەیە مەزەندە باروددۆخی ئەرحەب بکەیت، هەموو ئەوانەی ڕقیان لێ بوو، ئەوەی خۆیشی ڕقی لێیان بوو، لێی دەسڵەمینەوە، بۆیە دەسەڵاتی گرتە دەست، کەس نەبوو داواکارییەکانی ڕەت بکاتەوە، توندترین دەسەڵاتی

پەیدا کرد، تا بڵێی شەڕانگێز بوو، پارەی لەخەڵک دەستەند، لەخەڵکی دەدا، لاقەی ژنانی دەکرد، تا حاڵ بەوە گەیشت لەنێو خەڵکی دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە خودی مەسیحی دەجاڵە، بڕێک باوەڕیان بەو دەنگۆیە کرد، دەبوو سنوورێک بۆ ئەو کارەساتە دابنێین، بەر لەوەی نێوبانگمان بەقوڕا بچێت.

لەسەرەتا ئەوەم پیشاندان کە نابینایە و گۆچانێکی بەدەستەوەیە، بەڵام چۆن نابینا بوو؟ ئەوەش چیرۆکێکی بەدواوەیە.

ئێمەو خەڵکانێکی تریش هەوڵی زۆرماندا ئەرحەب بکوژین، ئەوەش سەیر نەبوو، هەر هەموو خەڵکی یەمەن ئاواتەخوازبوون بکوژرێت، وەلێ هەموو هەوڵەکان شکستیان هێنا، ئەگەرچی هەندێک لەو هەوڵانەش بە چەک بووە، ئاخر ئەگەر خودا نەیەوێت بکوژرێیت ناکوژرێیت، ئەگەر هەموو دونیاش دژی بوەستنەوە.

ئەو رۆژەم لەبیرە کە هۆزەکەمان کۆبوونەوە، هەرچی پیاوی گەورەو ریش سپی هۆزەکە بوون ئامادەی ئەو کۆبوونەوەبوون، باسەکەیان تەنها یەک باس بوو، ئەرحەب ئەلحەمووم، ئەوەی ئەو بە بنەماڵەکەمانی کردبوو، ڕا و بۆچوونەکان جیاواز بوون، مشتومڕەکە گەیشتبووە ئەوەی دەس بدەنە یەخەی یەکتر، دواجار لەسەر ڕایەک ڕێککەوتن، پێویستە تا هەتایە چەک بکرێت، بەڵێ، بڕیارماندا نابینای ئەرحەبی کوڕمان بکەین.

بەدەر لەوەی بیرۆکەکەمان ناشرین بوو وەلێ باشترین تەگبیر بوو لەوەی کە بکوژرێت، ناو و ناوبانگی ئەلحەمووم بەقوڕا چووبوو، تەنانەت مامەڵەی خەڵکیش بۆ ئەلحەموومییەکان وەک جاران نەبوو، نەدەبوو بیکوژین، خۆ ئێمە پیاوکوژ نین، تەنها نابینای دەکەین، دەشبوو بەدەستی خۆمان ئەوەمان

بکردایە، ئەویش بە ڕەزامەندی هەموو هۆزەکە، ئەوسا هەیبەتی هۆزەکەمان بۆ دەگەڕایەوە.

لێمگەڕێ ڕووداوەکە بە تەواوی بگێڕمەوە کە ڕوویدا، ئەرحەب خۆی لەداوەتی ئاهەنگی خێزانێکی سادە بینییەوە، خێزانێک لەهۆزەکەمان بەوای هۆکارێکی خانەوادەیی کە گرنگ نەبوو ئاهەنگیان گێڕا، زۆر سەیر بوو ئەگەر کەسێک داوەتی کردبا، وەلێ داوەتەکەی قبووڵ دەکرد و ئامادەی ئاهەنگەکە دەبوو، لای نیوەشەو ئەرحەب تووشی سەرەگێژە بوو، ناچاربوو سەر بخاتە سەر خوانەکەو لەهۆش خۆی چوو.

ئێستا دەتوانیت لەدیمەنەکەدا بمبینن، هاتم و بڕێک لەپیاوانی خزم و کەسوکار لەتەکما هاتن، تا ئەرحەب هەڵگرین و لە هۆڵەکە دووری بخەینەوەو لە ژوورێکمان نا، دەمبینن باڵم هەڵمالی و بلەز دەرزییەکم بەماددەیەک لەباڵی دا، دەمبینن دەرگاکەمان لەسەری کڵۆمدا، بە ئاسپایی گەڕاینەوە ناو خەڵکەکە تا ئاهەنگەکە تەواو بکەین.

ڕۆژی دواتر گردبوونەوەیەکی گەورە لە شەقامی شێوی (ئەلمەسلیە) ڕوویدا، زۆربەی گەورەپیاوان هاتن بەدەم بانگهێشتنامەکەمانەوە بۆ بینینی ڕووداوێک، ئێستا کۆمەڵێک پیاو دەبینن کەسێکی چاو بەستراویان هەڵگرتووە، بەرەو گۆڕەپانی ئاواییەکە، بەڵێ، ئەوە منم و ئەوانەش کەسوکارو خزمانمن، (ئەرحەب)مان بەسەر شانەوەیە.

لەسەر زەویەکە دامان نا، دەست و قاچیمان وەها کۆت کردبوو، جووڵە نەکات، لەناوەڕاستی گۆڕەپانە گەرمەکە خۆر سەری کەچەڵی دەسووتاند، دەتەوێت پرسیاری ئەوە بکەن چی لێ دەکەین؟ ئێمە ئەوە جێ بەجێ دەکەین کە گەورەپیاوانی ئەلحەمووم بڕیاریان لەسەر داوە، ئەوە دەکەین کە دەبوو

زۆر زووتر بکرایە، دەتوانن گوێتان لە دەنگی ئەرحەب بێت، لەپشت دەمبەستەکەیەوە کە نابوومانە سەر دەمی، نازانم تێبینیتان کرد یا نا، ئێمە گەرنێشیمان وا بەستبووەوە نەتوانێت گەردنی بسووڕێنێت، هێشتا گوێم لەپرسیارەکەتانە کە بەنیازی چین، بەردەوام بن تێدەگەن نیازی چیمانبوو.
خەڵکەکە لەیەکیان دەڕوانی چون ئەوەی لەهیچ حاڵی نەبووبن، لەپڕ چاوبەستەکەی سەر چاویمان لابرد، هەموو شتێک ئاشکرا بوو، دوو پارچە ئاسنی بازنەیی هەر پارچەو بەسەر چاویەکیەوە، جارێ کاری ئەو ئاسنە نازانن؟ ئەوە شتێکە لەکلینکی پزیشکێکی چاو بەخواستن هێنابوومان، پێڵووەکان دەگرێت تا چاو بەکراوەیی بمێنێتەوە، ئێدی چەند بکات چاوەکانی بۆ دانادرێتەوە، لە نەشتەرگەری چاو بەکاری دەهێنن، گوێمان لەهاوارێکی خنکاوی ئەرحەب بوو، وەلێ گوێمانی کاس کرد، هاواری بە ئازاراوە، ڕوومان کردە خۆرەکە تا بەزۆرەملێ لە خۆرەتاوەکە بڕوانێت.
هەوڵیدا بەدزییەوە جەستەی بجووڵێنێت، تا بچێتە سەر سک، وەلێ ئێمە بەهێزترین پیاوانمان هەڵبژارد بۆ کۆت کردنی بەزنجیر، وابێت جووڵەی بۆ نەکرێت، یەک لەو دیمەنانەی حەزرەمووت کە خەڵکی یەمەن قەد لەبیریان ناچێتەوە، ئەو دەمەی چاوەکانیمان تیرۆر کرد، خەڵکەکە سامیان لێ نیشت، دەبینیت پیاوانی پۆلیس وەک تەماشاکەر وەستاون و بۆیان نییە بچنە پێشەوە، ئێمە کارێک دەکەین ئاسایشی گشتی بپارێزین، نەک بە پێچەوانەوە.
ئەو پیلانەمان زۆر بەسادەیی داهێنا بۆ نابینا کردنی، نەک بەو شێوەیە سامناکەی چاوەکانی دەربهێنین، یا ئاوی کوڵاتووی پیا بکەین، یا سەگی تێبەربدەین.

ئەرحەب لەهاواری خۆی نەدەکەوت، گلێنەی چاوەکانی بەملاو ئەولادا دەهێناو دەبرد، ئازاری زۆری هەبوو، ئێمە ئازار بەخش نەبووین، ئێوە نازانن ئەو شەڕانگێزییەی ناخی ئەو پیاوە چییە، دیمەنەکە شتێکم بیردەخاتەوە لەشارستانیەتە کۆنەکاندا دووبارە دەبووەوە، دیمەنی سووتاندنی جادووگەران، دەیانهێنان و لەخاچیان دەدان و دەیانسووتاندن، ئەوەش بە بەرچاوی خەڵکییەوە دەکرا، ئەویش بۆ کوێر کردنەوەی شەڕانگێزییەکەبوو، جیاوازی لێرەدا ئەوەبوو شەڕانگێزییەکەی ئەرحەب لەچاوەکانیدا بوو.

چوار کاتژمێر بەو بارەوە ماینەوە، تا دڵنیابووین چاوەکانی سووتاون، زۆرمان دەربەسەری کێشا، وەلێ دواجار ناو و ناوبانگی هۆزەکەمان بەرز ڕاگرتەوە، ئەوە چالاکییەکی تیرۆریستانە بوو، تیرۆرکردنی چاو.

چاوبەستەکەمان نایەوە سەر چاوەکانی، بەسەر شانەوە بەرەو ماڵەگەورەکە بردمانەوە، زۆر وێران بوو، خستمانە گەرماوەکە تا خۆی بشوات، دواتر لەسەر جێوبانێک پاڵمان خست، پارچە قوماشێکمان نایە سەر چاوەکانی و هەندێ کڵۆ بەفرمان خستە سەر قوماشەکە تا ئازاری سووتانەکەی کەمبکاتەوە، یەک وشەی لەزار دەرنەچوو، ئەگەرچی قسەکانی گەورەی خانوادەکە زۆر بە ئێشیش بوو، کە گوایە پاک بووەتەوە، ڕێگاشی پێ دەدرێت لەنێو کام خانووی بنەماڵەکە بیەوێت تیا ئاکانجی بێت، پێشی گوت.ئەگەر مەیلی لێبێت ناوی کام کچ ببات لێی مارەدەکەن، ئەو ڕۆژگارە جەرگبڕە لەبیر ناچێتەوە.

دوای مانگێک و سێ ڕۆژ بێ هیچ هۆکارێک ئەرحەب کۆچی دوایی کرد، لەماڵی بنەماڵەکە بە مردوویی بینیبویان، هەر هەموو ئەلحەمومییەکان دوای ڕوفاتەکەی کەوتن، بۆ خۆم یەکێکبووم لەوانەی دارەمەیتەکەیان هەڵگرتبوو،

بەهێمنی تا گەیشتینە گۆڕستانی ئەلحەموویەکان، گۆڕێکی تایبەتمان بۆ هەڵکەند دوور لە گۆڕەکان، وامان زانیی ئەوە باشترین ئارامگای ئارامی ئەو دەبێت، هەر کە گەیشتینە سەر گۆڕە ئامادەکراوەکەی، سەرمان سوڕما، بۆچی گۆڕەکەیان بەجوانی هەڵنەکەندووە؟

بینیم گۆڕهەڵکەنەکە لەتەک گەورەی هۆزەکەمان لەمشتو مڕدابوو، گۆڕ هەڵکەندەکە سوێندی دەخوارد کە بەجوانتریی شێوەو بە باڵی مردووەکە گۆڕەکەی هەڵکەندووە، ئەزموونی ئەو گۆڕهەڵکەنە بۆ زیاتر لە بیست ساڵ دەچێت، ماقووڵ نییە هەڵە بکات، بۆ ئەوەی مردوو زوو بنێژرێت داوامان لێکرد دەستبەجێ گۆڕەکە بە باڵای هەڵکەنێت، گۆڕەهەڵکەن دەستی دایە قووڵنگەکەی و کەوتە هەڵکەندنی گۆڕەکە.

هیچم دەربارەی هەڵکەندنی گۆڕ نەدەزانی، یا ئەوەتا ئەو گۆڕهەڵکەنە هیچی بیر نەماوە، یا ئەوەتا ئەو خۆڵی ئەو خاکە تاوێرە شاخەو هەڵناکەندرێت، خوا هەڵناگرێ ئەو پیاوە هەوڵی تەواوی خۆی دا، وەلێ ئەو خاکە لێی نابێتەوە، بەقووڵنگ کەوتە گیان خاکەکە، سوودی نەبوو، گەنجەکان چوونە خوارەوەو دەستیان بەهەڵکەندنی لادیوارەکان کرد تا فراوانتری بکەن، نیوکاتژمێر زیاتر هەر هەوڵماندا، تا بێتاقەتی کردین.

گۆڕهەڵکەنەکە پێشنیاری هەڵکەندنی گۆڕێکی تازەی کردین، وەلێ شتێکی سەیر لەو گۆڕستانە ڕوویدا، ئاخۆ قووڵنگەکەش لەهەق خاکەکە نەدەهات، خەڵکەکە سام دایگرتن، کەوتنی ئایەت خوێندن، ناچار چووینەوە لای گۆڕە کۆنەکە، مردووەکەمان هەڵگرت و نامانە ناو ئەو گۆڕە تەنگە، ئەوە تەنها چارەسەر بوو، هیچیترمان نەدەوویست تەنها مردووەکە لەگۆڕ بنێین و ئەو مەینەتییە بشارینەوە.

ئێدی خۆڵمان بەسەریا کرد، ما خۆمان لەخۆڵەپەتانەکە بتەکێنین، چەند خولەکێکی نەبرد گوێمان لەدەنگێکی خنکێنراو بوو، هەر وەک دەنگی زەمینلەرزە، دەنگی تێکشکاندنی ئێسک وپرووسک، ئای خودایە! ئەوە منم وڕێنە دەکەم؟

گەڕاینەوە ناو ماڵی خۆمان، لەوێ دوای ئەوەی ڕیش چەرمۆیەکی هۆزەکەمان قسەی بۆ کردین، لەهەموو شتێک حاڵی بووم، باسی لەگۆڕتەنگی زۆڵم و ئێرەیی بردنی بۆ کردین، لەژیانی ئەوانەی ئێرەیی بەخەڵکی دەبەن، بەردەوام دەروونیان ناساغەو هەست بە تەنگی ناوسینەیان دەکەن، ئەو تەنگییەش لێلیان دەمێنێتەوە تا لەناو گۆڕەکەشیاندا، وەلێ تێک و پێک شکاندنی ئێسک و پرووسکیان ئەوە ڕەنگە سزای خودا بێت بۆ ئێرەیی بردەکان، کۆتایی (ئەرحەب)ی برام بەو ئاوایە بوو، ئەرحەب ئەلحەمووم.

کەچەڵەی نەفرەتی بەرەو قەفەسەکەی توێبە ڕۆیشت، منیش توند قەفەسەکەی خۆمم بەتووڕەییەوە ڕاوەشاند:

- ئەی ئەهریمەن نەکەی دەستی بۆ بەریت، قسەکانی هەر هەمووی هەق بوون، تەنانەت زانستیش ئەوەی سەڵماندووە، پێغەمبەرمان فەرموویەتی.. چاو ڕەنگە مرۆڤ بخاتە ناو گۆڕەوە، یانی دەکرێت بکوژرێت.

شارلۆتان بە دووچاوی بازەوە دیقەتی دام و لای بەجەستەی خۆی بۆ کردمەوەو گوتی:

- کەوایە بابەتەکە ئاسانە، بەچاوەکانت لێمبڕوانەو بمکوژە تا ڕزگار بیت.

هێزم وەبەر خۆ داو گوتم:

- خۆزگە چاو بە ڕق کاری بکردایە، هەی شەیتان هەر لەجێی خۆت دەمسووتاندی، وەلێ لەدەروونی خەڵکانێکی پیس کار دەکات، کە لای من نییە، باوەڕ ناکەم تۆش بەو هەموو توانایەتەوە بەو هەموو زانستەتەوە نازانیت سەدان لەخەڵکی دەتوانن لە دوورییەوە کاریگەرییان هەبێت، قەت ئەو کەسانەت نەبینیوە هەر بەچاو کەوچکیان چەماندووەتەوە؟ ئەوە باشترین بەڵگەیە کە مرۆڤ هێزێک لە چاوەکانیدا هەیە.

شارلۆتان بە لالێوەوە بزە ناشرینەکەی دەرخستەوەو گوتی:

- یاشێخ کەست بەچاوی خۆت بینیوە کەوچک بە چاوەکانی بچەمێنیتەوە؟

بەتوورەییەوە گوتم:

- نا نەخێر بەچاوی خۆم نەمبینیوە، وەلێ لەڤیدیۆی ئەنتەرنێتەوە ئەوەم بینیوە، خەڵکیش بەسەر شانۆوە بینیویانە.

شارلۆتان بەدەم چاو کزکردنەوەیەکی تۆقێنەرانە گوتی:

- سیحریازەکانی سەر شانۆ ئەوەی دەیگێڕن بەوای فێڵە دەستییەوەیە، کەوچکە ڕاستەقینەکە بەجووڵەیەکی زۆر بەپەلەی دەست دەیگۆڕنەوە بە کەوچکێکی چەماوە، یا شتگەلێک دەجووڵیننەوە یا بەرزی دەکەنەوە بەوای دەزوویەکی نەبینراوەوە ئەوە دەکەن، یاشێخ تۆ ئەوەندە گێلی ئەوە نەزانیت؟ ئەوەت لەدەمی جێمس هایدریکەوە نەبیستووە دانی بەوەدا هێناوە ئەوەی لەسەر شانۆکان گێڕاویەتی، بەوای گەمژەیی خەڵکی ئەمریکییەوە بووە، ئەوان ئامادەگیان تێدابووە بۆ باوەڕکردن، ئەویش ئەو هەلەی قۆستووەتەوە.

شارلۆتان دارەکەی دەستی گرداو گوتی:

- یاشیخ لەگێلییەکەت دەبوورم، تیمێکی زانایانی فەرەنسی سەریان بە سیحری (بێر جیرارد) سوڕما، بانگیان کرد بۆ کارگەیەک بۆ تاقیکردنەوە، سەرکەوتوو نەبوو، هەر لەوێ دانی بە فێڵەکەی نا، تا خەڵکی چێژ لەسیحرەکەی ببینن، ئەوەش بەلایەوە دڵخۆشکردنی خەڵکی بوو، بەو واتایەی خزمەت بە خەڵکی بکات، ئەوەی من باوەڕم پێ نییە، یاشێخ بەڕێزتان چەند ساوێلکەن باوەڕ بەشتی وا دەکەن، ئاخر لەکوێ بووە چاو کەوچکێک بچەمێنێتەوە، یا شتێک بجوولێنێتەوە، پێدەچێت زۆر تەماشای فیلمی لەو جۆرەت کردبێت.

دواتر تۆنی دەنگێکی تووڕە لەدەنگی شارلۆتان بەرزەوە بوو، گوتی:

- ملیاردێرێکی ئەمریکی خەڵاتی یەک ملیۆن دۆلاری بۆ ساحیری ئیسرائیلی یۆری گیللەر خستە ڕوو، کە ناوبانگی بە چەمانەوەی کەوچک دەرکردبوو، بەمەرجێک بەرامبەری ئەو کارە بکات، بەم بۆنەیەوە یۆری سیخوڕێکی ئیسرائیلی بوو، دەیویست لەڕێی ئەو کارەوە ناوبانگ دەربکات تا بە کەسایەتییەکان بگات، بەو ئاوایە توانی بە مایکڵ جاکسۆن بگات، بووە هۆی کێشەیەک لەمەڕ لاقەکردن، کە دواتریش پیلانی بۆ دانراو بەفەرمانی جوولەکاکان لەناوبرا.

شارلۆتان پشتی تێکردم و بەرەو قەفەسەکەی تویێە بەڕێکەوت و گوتی:

- تویێە.. من ناتکوژم، دەزانی بۆچی؟ لەبەر ئەوەی ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگری زانستی هەیە، کە بیرۆکەی چاوی پیس بنەمایەکی زانستی

دانی پیا ناوه تەنها ئەفسانە نییە، جەستەی بنیادەم لەمێشک و دڵەوە مەودایەکی کارەبایی لێ دەردەچێت، دەتوانین ئەو کایە بە ـﺠـەمسەرەکانی مێشکەوە بگەیێنینە سینە، ئەوەی ڕێکەوتە دەتوانین لەدووریشەوە بێ ئەوەی دەستی بەر بکەوێت بپێورێت، بیرۆکەی بوونی ئەو کایە کارەباییەو دەرچوونی لەجەستەوە، وادەکات کارێگەری لەدوورەوەش هەبێت، کەواتە بیرۆکەی چاو پیسی بیرۆکەیەکی مەحاڵ نییە، بەتایبەت ئەو کایە کارەباییە دەتوانێت چەندین کیلۆمەتر بڕوات، بێ ئەوەی بێ هێزیش بێت.

شارلۆتان بەرامبەر قەفەسی توێبە وەستاو گوتی:

- هەندێجار بەرامبەر کەسێک دەوەستین، هەست بە ئازاری گەدە دەکەین، ڕەنگە بە بیستنی دەنگی ئەو هەستەمان لا بڕسکێت، ئایا ئەوەش جۆرێک نییە لەکارێگەری لەدوورەوە؟ ڕەنگە کارێگەری چاو کارێگەرییەکی دەروونی بێت، کەوادەکات کەسی قوربانی نەخۆش بێت یا ترسابێت، لەهەموو حاڵەتەکاندا ئەوەی باوەڕی پێدەکەین، بوونی بنەمایەکی زانستی و دەروونی لەپشت کارێگەری چاوی پیسەوەیە.

شارلۆتان دەرگای قەفەسەکەی توێبەی لەسەرخۆ کردەوە، توێبە دەموچاوی نابووە سەر زەویەکە، شارلۆتان گوتی:

- ئێوە وەک هۆزی ئەلحەمووم کۆبوونەوەو تیرۆرکردنی چاوەکانیتان ئەنجامدا، ئەوەش دەبەنگییە، چاو هیچ ئیشارەتێکی کارەبایی لێوە دەرناچێت، تەنانەت ئەگەر نابیناش بێت، دەتوانێ ئێرەیی بەخەڵک بەرێت،

کایە کارەباییەکە لەدڵ و مێشکەوە دەردەچێت، نەک لەچاوەوە، ئەوەی

کردنتان تاوانبوو.

شارلۆتان چەقەنەی لێدا، پیاوە ڕووسییەکە هات، شارلۆتان چرپاندیە گوێی، ڕووسییەکە بلەز بەرەو تۆلابێک ڕۆیشت و دەرزییەکی فرە گەورەی دەرهێنا، هەر کە بینیم دڵم بەرەوە بوو، دەستم بەقەفەسەکەوە گرت و هاوارم لێکرد:

- نەکەی هەی بەنەفرەت بیت، هەی هیچ و پووچ ئەو کارە گەمژەییە نەکەی.

شارلۆتان بزەی سەر لێوی پانتر کردەوەو گوتی:

- چاو بەچاو و ددانیش بە ددان، ئەوە قسەی ئاینەکەت نییە؟ ئێمە هەقی (ئەرحەب)مان دەوێت، لەو کەسەی چاوی لێ سەندووە.

قەفەسەکەم بەتووندی ڕاوەشاندو هاوارم کرد:

- هەی قێزەون، واد...

بازنگەکە پێکەمی توونـد گوشی، بەسەر زەویدا کەوتم، هەوڵمدا دان بەخۆما بگرم، وەلێ ئازارەکەی لەوەدا نەبوو، هەر بەسەر گازەرەی پشتا کەوتبووم، بەتیلەی چاو تەماشای ڕووسییەکەم دەکرد، باڵی توێیەی گرت و لەقەفەسەکەی دەرهێنا، دەرزییەکەی لەگەردنی توێبە چەقاند، توێبە تا توانی هاواری کرد، نەیدەزانی چی لێ دەکەن، دواتر بەسەر چۆکا کەوت، دەستی بەدەموچاویەوە گرت، تەماشای چواردەوری خۆی دەکرد، هاواری لێکردم:

- یاشێخ .. یاشێخ هیچ نابینم.

ویستم برشتێ بەخۆم بدەم، وەلێ ئازاری بازنگەکە لەوەدا نەبوو، هەوڵمدا بەرەو دەرگای قەفەسەکە بڕۆم، وەلێ لەسێیەم هەنگاومدا بەرەوە بووم، گوێم

لەگریان و کڕووزانەوەی توێیە بوو، توێیە دانی بەخۆیدا نەگرت، بەسەر زەوییەکەوە بەرەوە بوو، دواتر شارلۆتان بە ڕقەوە لێی ڕوانی و گوتی:

- توێیە بە زیندوویی لێرە دەچێتە دەرەوە، وەلێ بەچاو کراوەیی نا، وەک چۆن چاوی براکەی تیرۆر کرد، ئێمەش تۆڵەی براکەیمان لێکردەوەو چاویمان تیرۆر کرد.

شارلۆتان دیقەتی دام و گوتی:

- خالد موسی نۆرەی تۆ نەهاتووە، تۆ دوایین کەس دەبیت، کەسێک پێش تۆ ماوە.

تەماشای قەفەسەکانم کرد، بێجگە لەخۆم کەس نەمابوو، ئەی...

شارلۆتان گوتی:

- ئیڤان سوکۆلۆڤ نۆرەی تۆیە، ئەوەی هەتە بیگێڕەوە.

کابرای ڕووسی لاواز یەکێک لەدەرگای قەفەسەکانی کردەوەو چووە ناویەوەو دەرگاکەی لەسەر خۆی کڵۆمدا، منیش هەر دیقەتم دەدا و بەوای (توێیە)شەوە فرمێسک لەچاوەکانم نەدەبڕا، ئەوەی ڕاستی بێت لەم شوێنە هیچ شتێک سەری پێ سوڕ نەکردم، وەلێ ڕووسییەکە چیرۆکەکەی خۆی گێڕایەوە، لەهەموو ئەو چیرۆکانەیدا کە پێشتر گێڕدرانەوەو لەهەموو ئەو ژیربێژییەیدا کە لەمێشکمدا مابوون، دایانییە بەر کوتەکێکی ئاسنین.

13

# چیرۆکی گاڵتەجاڕ

## ئیڤان سکۆلۆڤ دەیگێڕێتەوە

(بەگیانی خۆم هەرچی گاڵتەجاڕی سێرکن قێزەونن، لەپیاوێکەوە بیبیستە
که لەتەک ئەو بوونەوەرانە لەژوورێکدا نووستووە)

ژیانێکی کورت و بێ بایەخم بردەسەر، بیست و حەوت ساڵی تەمەنم بەڕێخست و هیچ شتێکی گرنگم تیا نەبینی، هەموو شتەکان دووبارەبوونەوەبوون، قوتابخانە، ماڵەوە، کچە نازدارەکەی دراوسێ، خەونی کارکردن لەمۆسکۆ، جگەرەی (کازبک)ی ڕووسی کە کادووەکەی بەیەک شێواز لە دەممەوە دەرم دەهێنا، هەر وەک یەکشێوازیی ژیانم.

من لەشارێکی کەناردەریام، گرنگ نییە هەنووکە ناوی شارەکە بزانیت، ئێمە مردووین، دوایین مانگ لەژیانمدا ئەفسانە بوو، تێگەیشتم دونیا لەسەر خێر نییە، بنیادەمەکانیش گەورەترین نەژادی هزرمەندی لووتبەرزی و خۆبەزلزانینن.

کە بەئامادەیی گەیشتم لەقوتابخانە هەڵهاتم، ما بەدوای کارێک بگەڕێم، دەچوومە هەر کۆمپانیایەک و هەر شوێنێک وەریان نەدەگرتم، دواجار وەک خزمەتکار لای خانوادەیەکی خوا پێداو کارم کرد، ساڵێک زیاتر لەلایان کارم کرد، تا لەتەکما ڕاهاتن و منیش لێلیاندا ڕاهاتم، بەلاتەوە گرنگە ناوم بزانیت؟

من گوێی پێ نادەم، ئەو جیهانەی منی تێدام گوێ بەناو نادەن، وەلێ لێگەڕێ لەجیهانی ئێوە ناوم (ئیڤان)ە، ئیڤان سۆکۆلۆف. ڕەنگە تەنها شتێک لەکەسایەتی مندا هەبێت، ئەوەیە هۆگری زۆری (سێرک)م، لەمنداڵییەوە ئەو حەزەم تیا ڕسکاوە، هیچ سێرکیکم لە شارەکانی ڕووسیادا نەبواردووە، پلیتی سێرک لای ئێمە زۆر هەرزانە، لە ئەڵمانیا چوومەتە سێرکی باروم، لەپاریس سێرکی دۆ هێڤەر، سێرکی بیلاڕووسیا، هەرگیز بێزاریش نەدەبووم لە سێرکەکان، ئەگەرچی دووبارەش بوونەوەبوون.

کۆن ئەو سێرکانە دڕندەیی بوون، کوشتن و خوێنڕشتن و هەزاران تەماشاکەر ئارەزووی کوشتنیان هەبوو، ناوی کۆلوسیۆم بوو، ئەمڕۆ سێرکەکان شارستانیترن، وەلێ باوەڕم پێبکە ئەو خۆشییەی نییە.

دوایین ماناکی ژیانم نادیارو دڵگووشەر بوو، لەتەک ئەو خانوادەیەی خزمەتیانم دەکرد، مۆڵەتێکی کورتی ساڵانەمان بردە سەر، مۆڵەتی ئەو خێزانە خواپێداوە گەشت و کات بەسەربردن بوو لەمۆسکۆ، ئەو شارەی خۆشمویست و دوایین مەنزڵگامبوو.

ئەستەمە کەسێکی کەناری دەریایی وەک من ببەی بۆ مۆسکۆو گریمانەی ئەوەی بدەیتێ کە بەرپرسی خێزانێک لەدایک و سێ منداڵ بێت. گەیشتینە فرۆکەخانەی دۆمۆدیدفۆی گەورە، ڕێکارەکانی پرسگەی فرۆکەخانەکەمان نزیکەی دوو کاتژمێری خایاند، لەبەر ئەوەی هەموو جانتاکانیان پشکنین، ئەگەر وا نەبوایە دە خولەکمان پێنەدەچوو، دیاربوو منیان بەدڵ نەبوو، ئاخر

کێ خێزانێکی داماو بەو شێوەیە دەپشکنێ ئەگەر گێژێکی وەک منیان لەتەکا نەبێت.

شەومان لەو ئوتێلە بەسەر برد، کە ناویم بیر نایەتەوە، گەشتەکەمان بۆ مۆسکۆ بۆ دوو هەفتە بوو، هەفتەیەکم لەتەک خێزانەکە بەسەر برد، هەفتەی دووەم خێزانەکەو پۆلیس بەدوومدا دەگەڕان، چەند داماو بوون ئەو خێزانە، دەزانم ئەو گەشتەم لێیان تێکدا، کە لەساڵێکدا تەنها جارێک ئەو بەختەیان بۆ گەشتکردن هەبوو.

مۆسکۆ تا بڵێی ناوازەیە، هەست دەکەیت گەلەرییەکە بۆ بیناکان، کە وەک نمایشکارانی جل و بەرگ لەبەرامبەرتدا وێستاون، کۆشکی سانکت، کۆشکی شاژن ئیکاترینا، کاتدراییلەکان، مۆزەخانەکان، کاتێکی خۆشمان بەسەر برد، تا شەوی هەینیمان بەسەرا هات، وەلێ بەلای منەوە دوایین شەوم بوو.

جوانترین جل و بەرگمان لەبەر کرد، تا سەردانی سێرکە گەورەکەی مۆسکۆ بکەین، مەزەندەی خۆشبەختی من بکە، زۆر بە پەرۆشەوەی بینینی سێرکەکە بووم، تەنانەت دەتوانی گوێ لە ترپەی دڵم بگریت.

هەموو ئەو نمایشانەی بینیبووم تەنها یاری منداڵانەی گەمژە بوو بەرامبەر ئەو ئاهەنگە خەیاڵئامێزەی لەدوایین شەومدا بینیم، پێنیشتنەکانی چون شانۆی ڕۆمانی بوون، هۆڵی نمایشکردنەکە بەجووڵە بوو، بۆ پێنج شێوە دەگۆڕدرا، سەهۆڵبەندان، ئاو، لم، جیمناستێک، زەمینەی فیلمی ماتریکسی ڕەش. تەواو لەدیمەنەکە ڕۆ چووبووم، نمایشگەلێکی زۆر ناوازەمان بینی،

ماتۆڕی تێدابوو لەناو خڕۆکەیەکی گەورە دەگەڕان، جمناستیکەکان بەحەواوە دەهاتن و دەچوون، کەچی لای پشتەوەیان دیمەنی پەیکەری بوونەوەری ئاسمانی بوو، بە ئەستێرەکانیشەوە دیمەنێکی سەیریان هەبوو، هەموو شتێک سیحری خۆی هەبوو، تا نمایشی گاڵتەجاڕییەکە هات، ئەو بەرنامەیە بەلای خەڵکییەوە جوانترین نمایش بوو، ، وەلێ من لەوان نەبووم.

بەڕاستی ئەوانە گاڵتەجاڕی ئاسایی نەبوون، وەک ئەوانەی لەتەلەفیزۆن دەیانبینیت، ئەوانە شەیتانبوون،گەورەکەیانم بینی عابایەکی سووری بەسەر شانەوەبوو، دوو شاخیشی لەسەر خۆی نابوو، تەنانەت نمایشەکانیشیان دەبوو کۆمیدی بێت، وەلێ تۆقێنەربوو، دانیشتوانیان تووشی شۆک کردبوو، بیرم کەوتەوە بچمە سەرئاو، لەشوێنی خۆم ڕاستەوەبووم و بەدووی سەرئاو دەگەڕام،

دوای خۆ خاڵیکردنەوەم، بەپەلە دەرچووم، کێشەکە ئەوەبوو نەمدەزانی لەکوێ دانیشتبووم، ئاخر لەنێو بیست هەزار تەماشاکەر چۆن شوێنەکەی خۆم بدۆزمەوە.

بەڵام ئەو گەڕەلاوژێیە چییە؟

ئەگەرچی هەموو شتێک وەک خۆی بوو، وەلێ گوێم لەدەنگێکی بێزارکەر بوو، خەڵکەکەش واقیان وڕمابوو، دیاربوو شتێکی سەرنج ڕاکیش لەنمایشەکەدا بەڕێوەبوو، زەمینەکە گۆڕدرا بەزەمینەی فیلمی ماترێکسی ڕەش.

بۆم دەرکەوت گەڕەلاوژێ نەبوو، ئەوەی دەمبیست لەمێشکی خۆمدا هەڵاکە بوو، هەستم بەسەرەگێژەیەکی سەیر کرد، دەنگێکی نامۆ لەکەللەی دام و بەرەوەبووم.

ئەوەی دواجار بیرم بێتەوە، من لەسەر چۆک کەوتبووم و تەماشای شانۆکەم دەکرد، کە گاڵتەجارەکان بەو سیما ناشرینەیانەوە تەختەکەیان داگیر کردبوو. تووشی لەخۆچوونی پچڕ پچڕ بووم، هەرچەند چاوم دەکردەوە پەردەیەکی سەوزم دەبینی، کۆمەڵە وتووێژێک بە زمانی ڕووسی، جارێکیتر لەخۆ دەچوومەوە.

- تی منی ڤیریش؟ (بڕوات بەمن هەیە؟)
- گنیشنا (بەڵێ)
- پردەلچیتی سڤەیۆ رابووتو پچالستا (کەواتە بەردەوامی کارەکەت بەو چێژە ببینە)

لەسەرخۆ چاوم کردەوە، برێک لە گاڵتجارەکان بەرامبەر ئاوێنەیەکی گەور وێستاون، دەستەسڕێک بە شللەیەکی ناو پەرداخێک تەڕ دەکەن و دواتر ڕوخسارە ڕەنگاڵەکەی خۆیانی پێ دەسڕنەوە، گەورەکەیان ئەوی عابا سوورەکەی بەسەر شانەوەیە، لێل یەکێکیان کەمێک قسان دەکات و دواتر دەموچاوی خۆی بە پەڕۆکە دەسڕێتەوە، ئەوجا شاخەکانی بەسەریەوە دادەکەنیت، شتێک هەیە لێی تێنەگەیشتبووم، لەوانەشە کارێگەری

لەخۆچوونەکەم بێت، ئەو مرۆڤە گاڵتەجاڕانە بنیادەم نین، پێدەچێت ئەوان... دووبارە لەهۆش خۆم چوومەوە.

لەپڕ چاوم کردەوە، تاریکییەکی ئەموستەچاو، دەنگی گەرمکەرەوە و مرخە مرخێکی ناخۆش، من بەسەر زەویەکەوە ڕاکشاوم، چوار کەسی تر بەسەر قەرەوێلەکانەوە ڕاکشاون، پێدەچوو خەون ببینم، بیرمە کۆمەڵێ پیاوی پێست سوورم بینی، ددانیان زەردی دەکردەوەو لەجلوبەرگی گاڵتەجاڕانەیاندا قسانیان دەکرد، ئەوەتا بۆ جاری سێیەم لەخۆم چوومەوە.

بەوای دەنگی زۆر بەرزەوە بەئاگا هاتمەوە، گوێکانم کاس بوون، وام هەست دەکرد سەد ساڵە نووستووم، لەنێو تاریکییەکەدا ڕووناکی ڕەنگاو ڕەنگ لەدەموچاوی دەدام، هەست دەکەم بەئاسمانەوەم، هیچ شتێک بەدەورو بەرمەوە نابینم، وەلێ گوێم لەمۆسیقایەکە لەو ئاوازانەی بۆ فیلم دادەنرێن.

چاوەکانم چون ئەوەی بەو دەوروبەرەم ڕاهاتبن، دەنگی کەسێک لەمایکرۆفۆنەوە قسەی دەکرد، هەرایەکی زۆر بە چەپڵە لێدانەوە لەخەڵکانێک بەدوای قسەکانیەوە بەرزەوە بوو، لەپڕ شوێنەکە بوو بەچراخان، هەموو شتێکم بینی.

بە بەرزییەکی مامناوەند و بە حەبلێکی ئەستوور لەناوەندی شانۆکەدا بەحەواوە هەڵواسراوم، بیست هەزار کەسیش تەماشام دەکەن و فیکەو چەپلەم بۆ لێدەدەن، ئەوان چاوەڕوانی شتێکن، تەماشای خوارەوەی خۆم کرد، چوار لەگاڵتەجاڕەکان لای خوارەوە بە شێوەیەکی بازنەیی

دەخوولێنەوەو داوا لەتەماشاکەران دەکەن هاوار بکەن، گەورەی گاڵتەجاڕەکان مایکەکەی بەدەستەوە گرت و بەتەڵفیسییەوە شتێکی گوت و دەستی بۆ درێژ کردم، ئەوەی لێی حاڵی بووم، خۆمم بەجل و بەرگی گاڵتەجاڕییەوە بینی و بە حەواشەوە ئاوێزان بووم، هەستم بە لووتێکی سووری گەورە کرد بە بان لووتمەوە چەسپ کرابوو، سەرەتا نەمزانی چی بکەم، ئاخر لەپڕا بووم بەگاڵتەجاڕی سێرک و لەناوەندی سێرکی مۆسکۆی گەورە بۆ نمایشکردن.

شتێک بەدەم و چاومەوە وەک ئەوەی گرژی کردبێت، هەروەک ئەوەی بەزۆرەملێ پێکەناوی کرابم، چەندم کرد ماسوولکەکانی ڕوخسارم بجووڵێنم، ئەو شێوە ڕوخسارەم هەر پێکەناوی دەهاتە بەرچاوم، عەقڵم زۆر لەوە بچووکتر بوو ئەو شتە ڕاڤە بکات، گوێم لەقاقای پێکەنینی جەماوەرەکەبوو، بۆ ئەو قسەیەی یەک لەگاڵتەجاڕەکان کردی، دواتر موسیقا کەوتە گەڕ، ئەو مۆسیقایەی بۆ شتێک ئامادەت دەکات، کە جەموورەکە چاوەڕوانین، لای خوارەوەم گاڵتەجاڕەکان بەشێوەی بازنەیی وەستان، بەو ئاوایەی ڕوویان لە جەماوەر بێت، ئەوە چییە؟ هەست دەکەم باش نیم، دواتر شتێکی سەیر ڕوویدا.

لەپڕ جلەکانم ئاگریان تێبەربوو، جەماوەر هاواریان لێ بەرزەوەبوو، بیست هەزار هاواری سەیرم بەگوێدا هات، گەرماییەکی لەناکاو پەلەکانی گرتمەوە، من دەسووتام، ئاور بەربووە لاقەکانم، لەهیچ حاڵی نەبووم، ڕوخسارم هێشتا پێکەناوی بوو، گرماییەکە تا دەهات زیاتر دەبوو، ئاور گەیشتە جلەکانم، ئەو

شوێنانەی ئاوریان پێنەگەیشتبوو، لای سمت و سینەم بوو، دیاربوو ئەوەش به هۆکار بووبێت، جەماوەر لەهاواری سەرسوڕمانیانەوە کەوتنە چەپڵە لێدان، جلەکانم دەتوانەوە، چزی ئاگرەکە پەلەکانی گەستم، جەماوەر لەچەپڵە لێدانی خۆیان نەدەکەوتن، تا تینم تیابوو هاوارم کرد، مۆسیقاکە گوێی کاس دەکرد، ئەوجا چەپڵەلێدانی جەماوەر بە گەرم و گوڕی، منیش دەسووتام.

له جەماوەرەکە دەڕوانم، دڵیان خۆشەو لەپێکەنینی خۆیان ناکەون، منداڵەکان واقیان وڕماوە، گاڵتجارەکان نمایشی سەر شانۆ دەکەن، منیش هەر دەسووتێم، ئەی هیچ و پووچەکان نابینن دەسووتێم، بێ سوودە کێ گوێی لێمە، سیمام پێکەناوییە، فرمێسکم ڕشت، ڕوومەتەکانم سوور هەڵگەڕان، چوار پەلم دەسووتا. نیگایەکم چووە سەر ئەو خانوادەیەی خزمەتکاریان بووم، بەدەم گەنمەشام خواردنەوە پێدەکەنین، چەپڵەیان بۆ دەکووتیم، بەڵام ئەوە کێیە لەتەنیشتیانەوە دانیشتووە؟ ئای خوایە، خۆ ئەوە خۆمم لێلیاندا دانیشتووم و قاقای پێکەنینمە.

من دەمرم، بەوای سووتانەوە دەمرم، دەست و پێم بە ئاگرەکە دەتوێتەوە، ئازارێک وەسپ ناکرێت، جەماوەر لەچەپڵەلێدانی خۆیان ناکەون، خۆم لەنێویاندا دەبینم، چەپڵە لێدەدەم، خێزانەکەش بەتەنیشتمەوە چەپڵە دەکووتن، لەپڕ گوریسەکە هێنامیە خوارەوە، ڕێک بۆ ناو حەوزێک ئاو، نووقمی ئاوە سەردەکە بووم، ئەوجا هەر حەبلەکە بەرزەوە بوو، منیشی لە

ئاوەکە دەرهێنا، گوێم لەقاقای پێکەنینی جەماوەرە، هەستم بەهیچ نەدەکرد، ئاخر ڕوحم لەجەستەم جیا ببووەوە.

ئەی بنیادەمەکان ئەوەی دەربارەی پیاوە گاڵتەجاڕەکان پێتان نەگوتراوە، کەسێک یا هاوڕێیەکتان هەیە لەسێرک کاری کردبێت؟ یا گوێتان لەکەسێک بووە باسی هاوڕێیەکی گاڵتەجاڕی کردبێت؟ دەزانم گوێتان لێ نەبووە، ئێوە تەماشای گاڵتەجاڕەکانی سێرک دەکەن، پێتان وایە ئەوان خەڵکانێکی ئاساییں، خێزاندارن و لەدەرەوەی سێرکەکە ژیانی ئاسایی خۆیان بەسەر دەبەن، لێگەڕێن نهێنییەکتان بۆ بخەمە ڕوو.

ئەو بوونەوەرانە لەهیچ شتێک لەبنیادەم نین، ئەوانە شەیتانن، شەیتانەکان لەئاور خەڵقەندەبوونە، ئەو جۆرە شەیتانانە لەتەک شەیتانەکانی تر ئەوەیە ئەمانە دەبینرێن، بەو کارانەیان لەسێرکدا گوایە دڵی خەڵکی خۆش دەکەن، قسەکانیان زۆر بێ مانایە، ڕوحی منیان سووتاند، هەر بۆ ئەوەی دڵی ئەو خەڵکە خۆش بکەن، خۆیشم بینی لەنێویاندا دەخەنیمەوە، ئەی مرۆڤەکان ئەوەیە کارە قێزەونەکانیان، خۆت بەشتێک دەخەنیتەوە بەئاگر ئەشکەنجە دەدرێیت.

بەڵی ئەوان لەهەموو شوێنێکن، تیایاندایە وەک خوێن تیاتانایە و هەستی پێ ناکەن، قسەتان لەتەکا دەکەن و خۆشتان قسەیان لەگەڵ دەکەن، مشتومڕتان دەبێت و ئەوانیش قسەوباسیان لێلتانا دەبێت، ئەوان گاڵتجاڕی پلەیەکن، کردەوەکانیان وا دادەهێنن ئەوپەڕی خۆشبەختیتان بێت، وەلێ لەوپەڕی

مەترسیدا دەبێت، بەڵێ ئەوان شەیتانن، هەموو شەوانێک دادەبەزنە سێرکەکان، ڕۆڵی خۆیانی تیا دەبینن.

- تی منی ڤیرێش؟ (باوەرت پێم هەیە؟)

- گنیشنا (بەڵێ).

- پەردلچێتی سڤیۆ ڕابۆتۆ پچالستا ( کەواتە بەردەوامی کارەکەت بە).

بێ هیچ پێشەکییەک ئاگر لەجەستەی ڕووسییەکە بەربوو، بەوای ئازارەوە سەری بەرزەوەکرد چون کەمتیارێک لمۆزی بەرزەوەکردبێت و هاواری لێ هەستا، برشتم تیا نەمابوو، پێکانم هەڵیان نەدەگرتم، هەرچۆنێک بوو لەحەییەتا خۆم بە شیشی قەفەسەکە گەیاند و تەماشای دەوروبەرەکەم کرد، گومانم نەما کە ئێرە ئەو دونیایە نییە کە دەیزانم، ئاخر نەبووەو نابێت ئەو ڕووسیە مردبێت و بەسەرهاتی خۆی بگێڕێتەوە، پێکانی شارلۆتانی قێزەونم بینی بەرامبەرم وەستا، بە نائۆمێدییەوە سەرم بەرز کردەوە، دارەکەی نایە سەر کەللەم و گوتی:

- یاشێخ بیر بکەرەوە، شێخ بەمانای بەساڵاچوو دێت، یا پیربوون، ئەوەش مانای ئەوەیە عەقڵیشت پەکی کەوتووە و پیر بووە هیچی بیر نایەتەوە، وایە؟

ئەم نەفرەتییە ئەگەر ئەو بازنگانەی نەدەبوو، وام دەکرد کەللەی وەک ئاسنی ئەم قەفەسە ژەنگ بگرێت، وەلێ چارم ناچارییە، بەدارەکەی دەستی کێشای بەقەفەسەکەو بەهەڵچوونەوە گوتی:

- بیر بکەرەوە، ئەو عەقڵەت بەکار بهێنە، بەلاشە، تا زووە بیر بکەرەوە، تۆ های لەکوێ؟ بڵێ لەکوێی؟

تەماشای دەوروبەری خۆم کرد، ئەو هەموو کارەساتەم بینی، دواتر دیقەتی چاوەکانیم دا، کە ئارەزووی ژیانی بەسەرەوە نەمابوو، گوتی:

- تۆیەک دۆستەکانت لەبیرت دەکەن، نەیارەکانت پێیانخۆشە، تەنها یەک خولقێنەرت بەدەستەوەیە ئەویش عەقڵتە؟

بەترسەوە لێمڕوانی، فەرموودەیەکی پێغەمبەرم بیر هاتەوە، کاری بۆگەن و پیس یاوەری ئەو مرۆڤەیە لەگۆڕەکەیشیدا بەدوویەوەیە، هەستم کرد لەشم گەرم داهات و نێوچەوانم ئارەقەی گرت، تەماشای دەوروبەری خۆمم کرد، مەحاڵە نابێت ئەو بێت کە...

نەفرەتییەکە بیرکردنەوەکەی قاچیم، پەنجەی بۆ ئەو ڕووسییە درێژ کرد کە ئاوری تێبەربیبوو.

- هەر چێژێک کە بەسەر شەهوتدا بردووتەتە سەر لێرەدا مانای هاوارکردنی ئازارە، هەر پێکەنینێکیشت بە خراپە بردبێتە سەر ئەوا بەخۆت پێکەنیویت کە وا لێرەدا دەسووتێیت، ئەو ڕووسییە تێگەیشت، کەس نییە تێنەگات، زەمەنێکی تا هەتای بەبەرەوەیە چۆنی بوێت وای بەرەنگاری دەکات، کەسێ نییە گوێی لێ بێت، وەک چۆن کەسیشی نییە ئازادی بکات.

هەموو ناخم کەوتە لەرزە لەرز، بەدەم تێڕامانمەوە بۆی گوتم:

- تۆ.. تۆ کێی؟

لە لالێوەوە بزەیەکی بۆ کردم و گوتی:

- من شارلۆتانم، تۆش لەژیانتا هەموو شتێکت بیردەچێتەوە تەنها ناوی من نەبێت.

توێبە بەدەم دەنگی ڕووسییەکەوە کە هاواری دەکرد بەئاگا هاتەوە، ما دەست بەملاو ئەولای خۆی گڕ بدات، بەترسەوە گوتی:

- یاشێخ چی دەگوزەرێت؟ یاشێخ تۆ باشیت؟

شارلۆتان گوتی:

- ئەم نیشینگەیەی تیا دابەزین، گوێتان پێ نەدا، ئەوە دوا مەنزڵگاتان دەبێت، هەموو ژوورەکان ڕازاونەتەوە، هەر وەک ڕازاندنەوەی سەر گۆڕەکان، وەلێ ئەوەی ناو گۆڕەکەیە جەستەیەکی بۆگەنەو کرم تێیداوە.

توێبە هاوارێکی لێ بەرزەوە بوو، شارلۆتان دارێکی بە کەللەیدا کێشا، گوتی:

- بێدەنگ بە، بەرلەوەی لەزمانیشت بخەم.

توێبە سەری نایەوە سەر زەویەکە، شارلۆتان گوتی:

- هەموو ئەوانەی لێرە بینیتان خەڵکانێکی ڕاستەقینەن، بڕێکیان زیندوون، ئەوانی تر مردوون.

هەستم کرد خۆێنم هەڵدەچوو، ئەم نەفرەتییە دەڵێت مردوو؟ تووشی سەرەگێژەی کردم، ئەشکەنجەی دەروونی سەختترە لە ئەشکەنجەی جەستە.

شارلۆتان بەرەو قەفەسی ئافرەتە هیندییەکە بەڕێکەوت، کە هێشتا شەمشەمەکوێرەکان لێی نەبووبوونەوە، شارلۆتان پێی خستە ناو قەفەسەکەو پێی نایە سەر کەللەی ئافرەتەکە، پێیگوت:

- لەدونیادا خۆتان بەکلکی شەیتانەوە بەستووە، لەدوا ڕۆژییشدا دەکەونە سەر پێڵاوی شەیتانەوە، خۆتان خستە گومراییيەوە، شەیتان لێتان بەرییە، ئەو دەڵە شرە لەتەک هاوڕەگەزە دەروونییەکانی خۆی لەگەڵ نەخۆشەکانی لەنەخۆشخانەی خانوادەی پیرۆز لە بۆمبای چی نەکردووە، لەسێدارە درا لەبەر ئەوەی هۆکار بوو لەکوشتنی یەک لەنەخۆشەکانی، ئەوا بەسزای خۆی گەیشت.

دەستی لەقەفەسەکە بەردا، کە بەحەواوە هەڵواسرابوو، لێڵ بەربوونەوەی دەنگێکی لەناکاوی چون تەقینەوە لێ بەرزەوە بوو، توێبە هەستاو سەرەڕۆیانە ڕایکرد، ئەویتریش ببوو بەخەڵوز، تەنها کەللەی و شانێک و تەنها چاوێکی پێوە مابوو، بە ئازارەوە لەدەوروبەری خۆی دەڕوانی، شارلۆتان گوتی:

- درۆ گوناه، بڵاوکردنەوەشی گونایەَکی مەزنە، نووسینەوەی درۆش لە پەرتووکێکدا و کارێگەری بەسەر نەوەکانەوە هەبێت تاوانە، ئەشکەنجەدانی درۆزن پێویستە بە پێی درۆکەی بێت کە لەدونیادا کردوویەتی، ئەم هەتیوەش دوای ئەوەی هەموو ژیانی بەفیڕۆدا، لەئەدەبی تاواندا کتێبێکی نووسیوەتەوەو ناوی لێ ناوە (ئاورێک لە ئاسمانەوە)

کتێبێکە لەسەر سووتانی خودە، ئەویش کارێگەری زۆری بەسەر نەوەکانەوە هەبووە.

دواتر بەرەو لاشەی جۆزێف لیستەر بەڕێکەوت و بەسەریا ڕابوورد و گوتی:

- بەڕاستی دەڵێم، بنیادەم مایەی سەرسوڕمانە، بەسەر هەموو ڕەگەزەکانمانا لە گوناە سەرکەوتوو بوو، ڕەنگە بەوای ئەوەوە بێت کە لەقوڕێکی هیچوپووچ خوڵقێندرابێت، وەلێ بنیادەم گۆشتی جەستەی برای ببرژێنێت و کاری و بەهاراتی پێوە بکات بیبرژێنێت و کۆمەڵێک چێشتخانەی گەورەی پێ بباتە ڕێوە، ئەوە لەتوانای بیرکردنەوەی ئێمەشدا نەبووە، تەنانەت خەیاڵیشمان بۆ نەچووە، ئێمە لەزاری لیستەرەوە ئەفسانەی مافیامان زانی، کەس باوەڕی بەڕاست و درۆی ئەو نەبوو، بێ هیچ بەڵگەیەک دەستبەسەر کرا، بەهەرحاڵێک بێت چارەنووسی هەر کوشتنە، درۆزن چارەنووسی لەناوچوونە، ئەوەشی گۆشتی جەستەی مرۆڤ دەکوڵێنێت یا دەیبرژێنێت چارەنووسی هەر کوشتن دەبێت.

دواتر شارلۆتان بەرامبەر قەفەسەکەم وەستاو گوتی:

- گشت ئەوانەی ئا لێرەدا لەم (بۆرگاتۆریۆم)ە مردن، ئەوانە مردووی سەردەمێکی دوورن، بۆ نەموونە (لیزا) کارمەندی نووسینگەی پێشوازی سەربردەی خۆی لەڕۆژانی جەنگی جیهانی دووەمدا دەگێڕایەوە، کەستان تێبینی ئەوەتان نەکردووە؟ ئەو جوولەکەیەش کە باسی بوونەوەری ناو

بۆشایی زەوی گێڕایەوە، ئەوە پیاوێکی شێتبوو لە حەفتاکاندا مرد، خاوەن کتێبی (بۆشایی زەوی)یە، کە یاری بە ملیۆنان مێشکی خەڵک کرد، بەر لەوەی ئەو جوولەکەیە بمرێت، بە پارەی قازانجی کتێبەکەی ئەرزەیەکی لەبەرازیل کڕی، ما پرۆژەیەک بۆ ڕەگەزی بنیادەم دابهێنێت، ئەویش بە هاوسەرگیری کردن لەتەک ڕەگەزی ناو بۆشایی ژێر زەوی، واشی ڕاگەیاندبوو، ئەو زەوییەی کڕیبووی کونی تێدایە بۆ ناو بۆشایی زەوی.

شارلۆتان سەری بە مەخابنی بۆ ڕاوەشاندم، لێم نزیکەوە بوو، لەترسا لێی کشامەوە، تا کۆتایی قەفەسەکە وورکەوتمەوە، ئەو نەفرەتییە بەدەور قەفەسەکەم دەسووڕایەوەو دەیگوت:

- خالید موسا.. تۆ زیندوویت یا مردوویت؟

من هەر لێی دوور دەکەوتمەوەو دەمگوت:

- من زیندووم، بیرم نییە مردووبوویم، لێم دوورکەوە.

ددانە زەردباوە ناشرینەکەی دەرکەوت و گوتی:

- بەڕاست؟ ڕۆژی لەدایکبوونی خۆتت لەبیرە؟

لەترسا زمانم لەگۆ کەوت، ئاخر بیرۆکەی مردنم لەزمانی ئەوەوە دڵی خستمە لەرز، پێیگوتم"

- لەهەندێ خەون دیمەنی بانەڕۆژ دەبینین، ئەوە مانای ئەوەش نییە کە ڕووداوەکانی دوارۆژ نووکە ڕوویدات، ئێمە تەنها بەسەر ڕووباری زەمەنەوە

دەیبینین کە نووستووین؟ دووریش نییە ئێستا کۆپییەکی خۆت لە
بانەڕۆژدا هەمان ئەو کارانەی تۆ دەکات.
لەدەست و پێ کەوتم، چی بەم شەیتانە بڵێم، کە گوتی:
- ڕەنگە تۆ کۆپییەکەی بانەڕۆژ بیت، وەلێ ئەو دوارۆژە فرە دوورە،
لەبەرزەخدایە.
شەیتانەکە دەرگای قەفەسەکەی لێ کردمەوەو هاتە ژوورەوە، بەخشکە خشک
لێی دوور دەکەتمەوە، گوتی:
- بەچاوی خۆت بینیت ئەوەی ڕاستی گوت بەسلامەتی لێرە دەرچوو، ئێدی
تۆ بۆ دەترسێی؟ باوەڕی تەواوت لەناختا نییە؟ یا تۆ...
بەزمانێکی تووند بەوای زۆر لەخۆ کردنەوە گوتم:
- هەرگیز من درۆ ناکەم.
سەر ڕووتاوە بە لازەردەخەنەیەکەوە گوتی:
- دە قسە بکە، ئەمڕۆ زمانت یانی چارەنووستە بۆ ڕزگاربوون.
پاڵم بەقەفەسەکەوە دا و لەخودا پاڕامەوەو بیرەوەرییەکانم بیر خۆم
دەخستەوە کە هۆکاری هەموو شتێک بوون، ڕووداوگەلێکی شەیتانی.

14

# چیرۆکی جنۆکه پۆشین

خالید موسا دەیگێڕێتەوە

( ئەم کچە هیچ کەم و کوڕییەکی تەندروستی لەمێشکیدا نییە، منم تێدا نیشتەجێم)

جنۆکە

دڵانی کەمتیار و چاوانی بنیادەم، مێینەیەک کە بەڕێگاوە دەڕۆیشت، چاوانی پیاوان نەدەما لەخوارییەوە تا سەر سەرییەوە سۆسەی نەکەن، ئەگەر پۆشاکێکی ماقووڵی لەبەردا بوو، ئاسایی لێی دەڕوانن، ئەگەریش بەمەزەندەی خەڵکی وەسپی لەسەر هەبوو، نیگایەکی بلەزی تێدەبڕن، نەک شکۆی پیاوانەی خۆیان بدۆڕێنن، ئەوجا نەفسی کەمتیارییان ئاوری دەگرت و بەر لەوەی بەبەر چاوانەوە ونبێت نیگایەکی قووڵتری بۆ دادەهێننەوە، ئەگەر وردتر بۆیان بڕوانیت، دەبینیت لەخەسڵەت و پێگەی کۆمەڵایەتی و تەنانەت تەمەنیش هەر هەموویان هەمان خەسڵەتی کەمتیاریان تێدایە، بەردەوامیش لەخوارەوە بۆ لای سەرەوە نیگایان هەڵدەکشێت، تەنها لەدۆخی (فاتن)دا نەبێت.

ئەو تەنها و تاک بوو هەر کە تێپەڕ دەبوو، لەسەرەوەیان دەڕوانی و نەدەهاتنە خوارەوە، تا ئەو چرکە ساتە لەدەستیان نەچێت لەدیقەتدانی ئەو جوانییە،

سەرپۆش بەسەرەوە، قژ ئاڵتوونی سەپۆشەکە وای لەخۆ گرتووە چون ئەوەی تامی تامی بەچاوانەوە بکات، جل و بەرگی تەسک هەموو ئەو وەسپەی لەشی تێدا دەرخستبوو، وەلێ کەس بایەخی پێ نەدەدا، تەنها دیقەتدانی دەم و چاوانی کەمیارەکەی ناخیان هێور دەکردەوە.

بەوای ئەو جوانییەوە داخوازیکەران لەبەر دەرگای ماڵی باوکی ڕیزیان بەستبوو، وەلێ ئەو هەمووانی ڕەت دەکردەوە، دڵی بە کەسێکەوە بوو، بێجگە لەو کەسی تری بەدڵ نەبوو، ئەگەر بێتە داوای خودی خۆی پێشکەش دەکات، بەو ئاواتەوە بەرامبەر ئاوێنە گەورەکە دەوەستاو پرچی لێ واڵا دەکرد و دەیڕازاندەوە، بەدەم ئاوێنەکەوە ئاهێکی هەڵدەکێشا، لەتەک کچی ناو ئاوێنەکە دەکەوتە ستران گوتن و قسەکردن، ئەی جەردەی دڵ زۆرت پێچوو، دێیت و دڵم دەدزیت و دواتر ون دەبیت...

ئەگەر دەرگای ژوورەکەی لەسەر خۆی کڵۆم بدایە، کورتترین جلێکی کە هەیبوو لەبەری دەکرد و دواتر ماکیاژی بەدەموچاویا دەهێناو بۆنی بەخۆیدا دەکرد و ئەوجا بەرامبەر ئاوێنەکە دەوەستا و نازی بەکچی ناو ئاوێنەکەوە دەکرد و لێلیدا دەکەوتە قسان چون ئەوەی ئەو بێت لەبەرامبەریدا وێستا بێت، ئەوجا ناوی دەبرد، ڕەنگە ئەوە ئاسایی بێت لای کچان کە خۆ بەخۆ بن، وەلێ لەنیوەشەودا خۆی بڕازێنێتەوەو سوورو سپیاو بکات، کە تەنها لەبۆنەی هاوسەرگیرییەکان ئەوەیان دەکرد، ئەوجا کەوشەکانی لەپێبکات و بۆنێکی زۆریش بپرژێنێتە سەر خۆی، لەسەرخۆ بەرەو سیسەمەکەی دەکەوێتە

ڕێ و ڕادەکشێت، دواتر پەتووەکە بەسەر خۆیدا بدات و چراکەش خامۆش بکات و بنووێت، ئەوە بابەتێکە چیرۆکێکی بەدواوەیە.

※ ※ ※

پرچێکی ڕەشی قەترانی، دوو چاو سۆزیان لەبری فرمێسک لێ دەبارێ، بزەخەنەیەک لێو دێنێتە سیحر، لەتەکیدا دەچووە جیهانێک لەسەر گۆی زەوی نەبوو، تاوێک سەمای لەتەکا دەکرد و تاوێکی تر دەیبردە ئاسمان، دواتر لەخەوەکەی بێدار دەبێت و هەست بەجۆش و خرۆشی ئەو لەززەتە دەکات، ئەوجا جوانترین جلێک کە هەیتی لەبەری دەکات و بەرەو زانکۆ بەڕێدەکەوێت، نەیدەبینی تەنها لەخەونەکانیدا نەبێت، هەر کە دەیبینی ڕووی ڕووناک دەبووەوە، چون چرایەک نەدەکوژایەوە تەنها ئەو ساتەی لێی دوور دەکەوتەوە، بڕوای وابوو دووبارە بینینەوەی خەون بۆ کەسێک یانی ڕاستییە، ڕۆژێک هەر دێت و بەدیداری دەگات، باوکی زۆر خەونی بەدایکییەوە بینیبوو، چەندین ساڵ بەر لەوەی مارەشی بکات، دواتر کە لەسەر زەوی پێیگەیشت ناسییەوە، دایکیشی هەروا، ڕۆژێک هەر دەیبینێت، لەبەر ئەو دیدارە ئەم دەژێت، ئەگەر تا دوایین تەمەنیشی بێت.

بەر لەساڵێک هاتە خەونی و پەرۆشی بوو، دواتر جارێک دووجارو سێجاری تریش هاتەوە خەونی، مانگێک لەخەونا نەیبینی، دواتر هاتەوە، بەوای نەهاتن و و ئامادەبوونی کەمی زانی ئەو بارودۆخەی وایلێدەکات بێتە خەونی، ئەگەر چەند ڕۆژێک بەسەر یەکەوە نوێژەکانی بەڕێک و پێکی کرد، ئەوا لێی دوور

دەکەوێتەوە، خۆ ئەگەر نوێژەکەی جێهێشت و نەیکرد بە بزەخەنەوە ئامادەی خەونەکەی دەبێت، ئەوەش بۆ خۆی کێشە نەبوو، زۆربەی ڕۆژەکان نوێژی نەدەکرد، تا (ڕیم)ی هاوڕێی وریای دەکردەوە، ئەوجا یەک دوو ڕۆژ نوێژەکەی دەکرد و دواتر لێی دادەبڕایەوە.

تێبینی ئەوەی کرد، هەرکاتێک دایکی قورئانی لەماڵەوە لێبدایە، لێی دوور دەکەوتەوە، مەبەست لەخەونەکەیە، بۆیە بەدلوای لێبووردنەوە قورئانەکەی دەکوژاندەوە، بەو ئاوایەی لەسەعی کردنی دەکات، زۆرجاریش کە خۆی ئارایشت دەکرد و دەکەوتە سەما کردن دەهاتە خەونی و جاروباریش نەدەهاتە خەونی، لەوە حاڵی بوو ئەو کراسانەی لەبەری دەکرد دەیهێنایە خەونی، ئەوانەش کە نەیاندەهێنایە خەونی گشتی کۆکردەوەو تووڕی دان، ئەگەرچی گرانبەهاش بوون.

هەر کاتێک فاتن بچووبایەتە دەرەوە، خۆی لەسەر تەڵێک دەڕازاندەوە، بەو ئومێدەی ڕێکەوت بەرەو ڕووی یەکیان بکاتەوە، ئەگەر ترسی ماڵەوەی نەبوایە، سەرپۆشەکەشی فڕێ دەدا، هەر بۆخۆی حەزی بەسەرپۆش نەبوو. شەوێک لەشەوانی مانگەشەو بەسەر جێوبانەکەیەوە ئەمدیو و ئەو دیوی دەکرد، لەخەونەکەیدا تەماشای دیمەنێکی زۆر سەیری لا ڕسکا، خۆی بینی بەو ژێر کراسە کورتەیەوە بەنێو شەقام و لەناو خەڵکی دەڕۆیشت و خەڵکیش تەماشایان دەکرد، وەلێ لەو خەونەیدا دیقەتدانی کەمتیارەیی خەڵکەکە بۆیان نەدەشارایەوە، بەوە ڕانەهاتبوو، لەخەونەکەدا بەرەو کۆشکێکی سپی

بەڕێکەوت، بەبان پەیژەی بیناکەوە ئەو کورە قۆزەی بینی، قاتێکی ڕەشی لەبەردایەو کۆمەڵێک ئافرەتی ڕاهیبە بە جل و بەرگی ڕەشەوە دەوریان داوە، دیقەتیدا وەلێ پێی ڕانەهاتبوو، دواتر زەنگێکی نامۆ لێدرا، سەری بۆ بان بیناکە بەرزەوە کرد، دەستی بەدەمییەوە گرت، ئەوە بینایەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو بەناوبانگترین کۆشکی پارێزگای بەڵقاس بوو، کڵێسەی پیرۆزی دەمیانە بوو.

❊ ❊ ❊

فرمێسک ڕژان و حەسرەتبوون لەچاوە جوانەکانیەوە هەراسانی کردبوو، (ڕیم)یش لەئامێز دەگرێت و هێوری دەکاتەوە، ڕیم نەیدەزانی چۆن ئەوەی پێ بڵێت کە پەرۆشی کردووە، کەمێک قیتەوەبوو، گوتی:

- ئازیزەکەم، ئەوەی کە دەتبینی کەسێک نەبووە تا بەدیداری بگەیت، باوەڕم پێبکە ئەوە هیچ کەسێک نییە، من دەزانم ئەوە چییە، بەڵام بەڵێنم پێبدە دانەچڵەکێیت.

فاتن وڕەی بەخۆی دا، ئەوجا ڕیم پێیگوت:

- هاوڕێیەکمان هەبوو هەمان شتی تووش بوو، ئەوە جنۆکەیە، هەموو جنۆکەیەکیش نا، جنۆکەیەکی مەسیحی عاشقە، ئەوەش توندڕەوترین جنۆکەیە.

فاتن مووچڕکەیەک بە سەرتاپای جەستەیدا هات، چون ئەوەی کارەبا گرتبێتی، ئاخر ئەو ترسنۆکترین مرۆڤ بوو لەجنۆکە دەترسا، فاتن هەستی

بەترسێک کرد، خەمێکیش دایگرت، ئاخر ئەو خەونە خۆشەی تیا ژیا لەڕاستیدا خەون بینین بوو بە جنۆکەوە، جنۆکەیەکی شەیتانیش، بڕشتی تیا نەما، ئەو خۆش باوەڕیش بوو، فرمێسک بەچاوەکانییەوە گۆل گۆل دەهاتە خوارەوەو گوتی:

- بەڵام ئەو خۆشی دەوێم، تۆ نەتبینیوە، چەند قۆز و جوانەو...

ڕیم باوەشی لێداو تووند توند بەخۆیەوەی گووشی و گوتی:

- فاتن من لەخۆمەوە ئەوە ناڵێم، ئەزموونم لەو بابەتە هەیە، لەماڵەوە تەنها قورئان لێ بدە، نوێژەکانت بەردەوام بکە، ئەوسا دەزانیت ئەوە شەیتانەو لێت دوور دەکەوێتەوە.

چاوەکانی فاتن ترسیان تێکەوت، کاتێک نوێژی نەدەکرد و قورئانی دەکوژاندەوە ئەوە ئەو ڕێگایە بوو کە بەهۆیەوە خۆشەویستەکەی پێ ئامادە دەبوو، دواتر هەندێک جل و بەرگ سەرنجی ڕاکێشابوو، گوتی:

- بەڵێ، مەحاڵبوو ئامادە بێت تا قورئانەکەم نەکوژاندایەتەوە.

ڕوخساری ڕیم دڵەڕاوکێی تێکەوت، دەستی نایە سەر دەموچاوی فاتن و دڵنیای کردەوەو گوتی:

- نابێت بەهیچ شێوەیەک قورئان بکوژێنیتەوە، تەنانەت لەدرەنگانی شەویشدا، ئەو جل و بەرگە تەسکانە لەبەر نەکەیت، لای ئێوارە دێم بۆ لات و شتێکت بۆ دێنم لەبەری بکە، ئیدی نزیکت ناکەوێتەوە، ترسیشت نەبێت، جارێکی تر نایبینیتەوە.

فاتن ترس ئامبازی دڵی بوو، بەترسەوە چووە ماڵەوە، بەدەم لەرزەوە سڵاوی لەخێزانەکەی کرد، هەر بەترسیشەوە چووە ژوورەکەی، ترسا جلەکانی بگۆڕێت، عاباکەی دایکی بەسەر جلەکانەوە لەبەر کرد، ما نوێژ بکات، تا خۆرئاوابوون لەنوێژ نەکەوت، ڕیم هات و لەناو کیسەیەک جۆرە جلوبەرگێکی دەرهێنا، کراسێکە لەسەرییەوە تا پاژنەی پێی دادەپۆشێت، بەو ڕەنگانەش کە فاتن حەزی پێبوو هێنای، فاتن زۆری پێخۆش بوو، تەنانەت جوانییەکەشی نەشاردەوە .

ڕیم بۆ ماوەیەک لەتەکیدا مایەوە، قورئانی بەسەرا خوێند و ژوورەکەی بخوور کرد و شتگەلێکی تری کرد بۆ دەرپەڕاندنی جنۆکەکە، دواتر دڵنیای کرد و جێیهێشت، ما فاتن بەتەنها لەژوورەکەی خۆی، دونیا بەرەو کپبوون دەچوو، دەنگ لەکۆڵانەکە نەما، چراکانی ماڵەوە کوژانەوە، هەر بەتەنها لەژوورەکەی خۆی بۆ ئەوەی ترسی نەبێت چراکانی نەکوژاندەوە، تەنانەت دەرگاکەشی بەکراوەیی جێهێشت، وەلێ دڵی تا دەهات ترپەکانی بەرزتر و بەپەلەتر دەبوون، دەمێکی زۆری بەڕێخست، هەستی بە خەواڵوو بوون کرد، خۆی ڕادەستی خەو کرد، لەوێوە بینی...

لەدۆخێکدا بوو شتی وای نەبینیبوو، بینی بەسەر سنگیەوە وەک پشیلەیەکی گەورە بە دووچاوی شەهوەتەوە لێی دەڕوانێت، فاتن هاواری دەکرد و خۆی ڕادەپسکاند تا لێی دوور بکەوێتەوە، وەلێ ئەو زیاتر فشاری دەخستە سەر

سینەی، هەستی بەتەنگبوونی هەناسەی کرد، هەناسەبڕکێکەی ناو ژوورەکەی تەنییەوە.

لە ژوورەکەی تەنیشت فاتنەوە دایکی بۆ نوێژ بەخەبەر بوو، بلەز خۆی بەژووری (فاتن)دا کرد، دڵی ختوورەی کرد، بینی کچەکەی بەسەر سکا چەماوەتەوەو ئازارێکی زۆریشی پێوە دیارە، هەوڵیدا بە ئاگای بێنێتەوە، نەیتوانی، ما بەتووندی ڕایوەشێنێت و ئاو بەدەم و چاویا بکات، لەپڕ فاتن ڕاستەوەبوو، هاواری لێبەرزەوەبوو، ترسی خستە دڵی دایکیشیەوە، دایکی باوەشی لێدا و بیسمیلای بەسەرا کرد، دواتر هەستاو قورئانی لێدا، ئەوجا دەستی بەسەر کچەکەیدا هێنا تا هێوری بکاتەوە.

دایکە کچەکەی بینی هەر کە گوێی لە قورئانەکە بوو بەتووندی دەستی خستە سەر گوێکانی، سەری بەملاو ئەولادا دەهێناو دەبرد، دایکە دەستی برد تا گوێکانی بپشکنێت، وەلێ فاتن زیاتر و توندتر دەستی بە گوێکانیەوە گرت، هەموو گیانی دەلەرزی، دایکە وەک ئەوەی شتێک حاڵی بووبێت، دەستی بۆ قورئانەکە برد و کوژاندیەوە، ئیدی فاتن ئارام بووەوەو خەوی لێکەوت.

❊ ❊ ❊

ئیدی فاتن ئەو فاتنە نەبوو کە دەیانناسی، ڕەنگ زەرد، چاوەکانی خەواڵوو، ناوقەد باریک و خاو و خلیچک، زۆر بەقورسی دەڕۆیشت بەڕێوە، لەنەخۆش دەچوو، بەدەر لە هاواری دایکی بەردەوام ئەو شەیتانە بەسەریەوە بوو، باوکە

سووربوو لەسەر ئەوەی کچەکەی بۆ نەخۆشخانە بەرێت، گوێکانی خراپ ببوون، بەدەر لەهەموو پشکنینەکانی کە بۆی کرا، هیچ دەرئێکی نەبوو.

لەنەخۆشخانە پزیشکی دەروونی قسەی لەتەکا دەکرد، وەلێ فاتن شتگەلێکی بۆ دەگوتەوە، بەلای پزیشکی دەروونییەکەوە هیچ شرۆڤەیەکی بۆ نەبوو، گوتی کاتێک سەر دەباتە کرتۆش کردن، هەست دەکات کەسێک بەپێ دەچێتە بان سەری، هەر کاتێکیش گوێی لە قورئان دەبێت، گوێکانی ئازاریان دەبێت، کاتێکیش قورئانەکە دەکوژێتەوە ئازارەکەی نامێنێت، لێ دکتۆرەکە دڵنیای کرد و گوتی پەیوەندی بەجنۆکەوە نییە، حاڵەتی لەو شێوەیەی هاتووەتە بەر دەست و بێ کێشە چارەسەری کردووە.

باوکە تکای لە دکتۆر کرد بێتە ماڵیان، لەبەر ئەوەی هاتن بۆ لای دکتۆر کێشەیان بۆ دەنێتەوە، بەو ئاوایەی خەڵکی کچەکەیان بەشێت ناوزەد بکەن.

دکتۆر هات و هەموو شتێکیان بۆ گێڕایەوە، شتگەلێکی جیاوازی بینی، بەوەش هەر ڕاهاتبوو، هەموو نەخۆشێکی دەروونی کە باوەڕیان بە ئەفسانەکانە، هەموو شتەکان بەشێوەی ئەفسانەیی دەگێڕنەوە، سەرەتا وایلێکرد بە بەرچاویانەوە نوێژ بکات، تا لەو چیرۆکە بڕوانێت کە پێ دەنێتە بان کەللەی، نوێژی کرد، هیچ ڕووی نەدا، وەلێ لەکاتی نوێژەکەی بۆ گێڕایەوە کە سەری چەند جارێک قورس بووە، یا هەستی بەو قورسییەی سەری کردووە، بەوەش بۆی وەسپ کرد چون ئەوەی کەسێک پێبنێتە بان سەری، ئەو وێنا کردنە شێوەی ئەفسانەیی هەبوو.

تێبینی ئەوەی کرد کاتێک دایکە قورئان لێدەدات کچە ئازاری پێدەگات، بەدەر لە سەیرو سەمەری بابەتەکە، دابەزی شریتێکی قورئانی بە دەنگی قورئانخوێنێکی تری کڕی کە هەمان دەنگی قورئانخوێنەکە نەبێت، هاتە ماڵەوەو شریتە تازەکەی لێدا، کچە تووشی هیچ نەبوو، تێگەیشت بابەتەکە پەیوەندی بە قورئانخوێنەکەوەیە، دوور نییە پەیوەندی بەدەنگی ئەو قورئانخوێنەوە هەبێت لەڕووداوێک ڕەنگە لەمنداڵیشدا بووبێت، ئەوە بووتە گرێیەک و دواتر لێی دەرکەوتووە.

ما خێزانەکە دڵنیا بن، دکتۆرەکەیش بەیناو بەین سەردانی دەکردن وەک بەدواداچوون بۆ حاڵەتەکە، تا ئەو شەوە هات، ئێدی لەهزری ئەو دکتۆرە نەدەسڕایەوە...

فاتن لەنێو جێوبانەکەی گرژ دەبووەوەو پشتی دەچەمایەوە، چاوەکانیشی زەق زەق تەماشای بنمیچەکەیان دەکرد، دکتۆرەکە هیچی پێ نەدەکرا، ناچار دەرزییەکی سڕکردنی لەجانتاکەی دەرهێناو دەرزییەکی لێدا، فاتن لەگرژکردنەوەی خۆی کەوت، هاواری بوو بەنووزانەوە، تەماشایەکی دڕندانەی دکتۆری کرد، دەرزییەکەی لەباڵی خۆی دەرهێناو لەگەردنی دکتۆری چەقاند، دکتۆر بەدەم لەهۆش خۆ چوونەوە، بەسەر زەوییەکەدا بەرەوە بوو.

فاتن گرژییەکەی نەما، وەک ئەوەی کە بردی جێیهێشت، بەنیگایەکی سارد لە دکتۆری ڕوانی، بەتانییەکەی ڕاکێشاو دای بەسەر خۆیا.

❊ ❊ ❊

پیاوێکی ریش درێژ چووە ماڵەوە، هەر کە پێی ڕاستی نایە ژوورەوە دەستی بە ئایەت خوێندن کرد و پەنای بۆ خودا دەبرد، قسەگەلێکی گوتەوە، هەندێکی بیستراوەو هەندێکی تری نەبیستراوبوو، شێخ بە ڕوحانییەت بەناوبانگ بوو، جنۆکەی دەردەکرد، خۆشەویستانی لەیەک نزیک دەکردەوەو ئێرەیی کوێر دەکردەوە، ئەو جۆرە پیاوە چاویان سیحراوییە، کە قسەت لەتەکا دەکات چاو نابڕێتە چاوەتەوە، قسەکانی ژیرییانەیە، یا وا هەست دەکەیت حەکیمانە بێت.

باوکی فاتن ڕێنمایی ژووری کچەکەی کرد، دکتۆر لەهاموشۆ کردن کەوتبوو، (فاتن)یش لەنێو حاڵەتی هەڵچوون و بێبڕشتی ئەوەندەی تر هەراسان بوو، تەنانەت دۆخی خێزانەکەشی شێواندبوو.

شێخ چووە ژوورەوەو چاوی بەو جوانییە کەوت بەسەر جێوبانەوە هێزی تیا نەمابوو، ئاخر فاتن لەسەختترین حاڵەتی نالەباریشیدا هەر لەجوانی خۆی نەکەوتبوو، شێخ داوای لە دایبابی فاتن کرد لەژوورەکە بچنە دەرەوە، تەنها یارمەتیدەرکەی لەتەکا بمێنێت، ئەگەرچی باوکە ڕقی لەوەبوو، وەلێ مانەوەی یاریدەدەرەکەی متمانەی پێدا، هەردووکیان چوونە دەرەوەو ما شێخ کارەکەی خۆی بکات.

شێخ لە لێوە سوور هەڵگەڕاوەکانی (فاتن)ی دەڕوانی، ئەوجا تەماشای چاوەکانی کرد، دواتر هەردوو باڵی، دەستی برد و خستییە سەر نێوچەوانی، بە چپەوە هەندێ شتی خوێندەوە، (فاتن)یش تا دەهات بێ هێزتر دەبوو،

ئەوجا دەستی بۆ گەردنی برد، پێستێکی نەرمی هەبوو، پێناچێت لەو شێوەی بینیبێت، ما دەست گڕدات تا دەستی بۆ سەر سینەی بردو...

- هەی قەحپە ئەوەی دەیبینی بەدڵتە؟ حەز دەکەی زیاتریش ببینیت؟

شێخ بە بینینی جەستەی کچەکە چاوەکانی ئەبڵەق بوون، ئەوە دەنگی یاریدەدەرەکەی نەبوو، دەنگی هیچ مێینەیەکیش نەبوو، دەنگێکی پیاوانەبوو، لەلای (فاتن)ەوە هات، دەجاڵەکە بەترسەوە تەماشای کرد، ئەوەی بینی کە پاشەکشەی پێکرد تا بەسەر گازەرەی پشتیدا بەرەوە بوو، ئەو نازدارەی بێدەنگ و بە ئازارەوە بە جێوبانەکەوە لکاوە، سەری بەرز کردەوە، وەلێ بەڕوخسار لەشەیتان دەچوو، لەچاوەکانیەوە خاڵێکی سپی وەدەرکەوت، چون چاوەکانی مار نیگای تێبڕی، دەجاڵ و یاریدەدەرەکەی قەڵەمبازیانداو هاواریان لێ بەرزەوە بوو، باوکە بە لەققە دەرگاکەی کردەوە، کچەکەی بەلاوازی و ملکەچی بینی، دەجاڵو یاریدەدەرەکەی بەرەو دەرگاکە هەڵپەیانبوو، دەجاڵ هاواری کرد:

- سوێند بەخوا ئەوە نە بنیادەمە نەیش جنۆکە، ئەوە نەفرەتییە.

باوکەو دایکە بێ ئومێدانە لەیەکیان ڕوانی، یاشێخ پولێکی وەرنەگرت و بڵاوەی لێکرد، ئەوەی بەسەر زەویەکەوە کەوتبوو خەمی ئەو دایک و باوکە بوو، کە هیچ چارەیەکیان بەدەستەوە نەمابوو، دایکە فرمێسکی بۆ دەڕشت و باوکە نۆش دامابوو، ئاخر ئەو شێخە وەک باسیان لێوە دەکرد تاکی نەبوو بەتایبەت لەجنۆکە دەرکردندا.

ڕۆژی دواتر فاتن لەسەر جێ و بانەکەی ڕاستەوە بوو، ما خۆی برازێنێتەوە و پرچی دابێنێت بەو شێوەیەی خۆی حەزی پێبوو، کورتترین کراسی لەکانتۆرەکەی دەرهێناو بەرامبەر ئاوێنەکە وەستا، لەپڕ دایکە کچەکەی بەو شێوەیە بینی، دڵی زۆر پێخۆش بوو، گوتی:

- ئەی پارچەیەک لەدڵی دایە، ئەڵێی مانگی، شێوەت وا پێدەچێت چاک بوویبێتەوە.

فاتن نیگایەکی ساردی تێبڕی و ئاڵکایەوە ئاوێنەکە و ما دەست بەخۆیا بێنێت، دایکەش بلەز بەرەو لای باوکە غاری دا تا ئەو مژدەیەی وێبدات، باوکە لەکچەکەی ڕوانی دەتگوت بووکەو ڕازاوەتەوە، دایکە گوتی:

- خۆشەویستەکەی من بۆکێ خۆی ڕازاندووەتەوە؟ ئەو بەختەوەرە کێیە کە سەردانیمان دەکات؟

فاتن بەشێوەیەکی ناشرین لێیانی ڕوانی و گوتی:

- من دەڕۆمە دەرەوە.

دایکە بەدەم نیگاکردنی بۆ هاوسەرەکەی ئاهێکی هەڵکێشا و فرمێسک بەچاوەکانییەوە هاتە خوارەوە، باوکە گوتی:

- ئا بەم شێوەیە دەچیتە دەرەوە؟ تۆ تەواوی، یا دەتەوێ بمانلەوتێنیت؟

فاتن تەماشای کراسە تەسکەکەی بەری خۆی کرد، کە نەخشی جەستەی دەرخستبوو، گوتی:

- چی تێدایە؟ جوانیەکەمی دەرخستووە، هەقی خۆمە جوانی ڕاستەقینەی خۆم دەربخەم.

دایکە گوتی:

- فاتن گیان، تۆ ڕووپۆش بووی، دەڵێی شێت بوویتە، ئەو کراسە تەسکە داکەنە تا باوکت کێشەیەکی نەناوەتەوە.

فاتن شووشەی بۆنەکەی لەدەست گرت و بۆنی بەخۆیا کرد وەک ئامادەییەک بۆ چوونە دەرەوە، دیقەتی باوکی داو گوتی:

- ئەگەر ئەو پیاوە با ڕێم لێبگرێت.

باوکە کە گوێی لەو قسەیە بوو وەختەبوو لەپێستی خۆی دەربچێت، ئاخر ئەوە فاتن نییە بەرامبەر باوکی بگرێت، هەرگیز چاوی بەرامبەر باوکی هەڵنەبڕیوە. فاتن بەرەو دەرگاکە بەڕێکەوت، باوکە باوەڕی نەکرد، ناچار لەبەردەم دەرگاکە وەستا و ڕێی پێگرت، ئەوەی ڕوویدا لەعەقڵی نە باوکەو نەیش خودی فاتندا بوو.

شەپازللەیەکی بە ڕوومەتی فاتندا کێشا، ڕق و تووڕەبوون بەڕۆخساری (فاتن)ەوە دەرکەوت، ئەوجا فاتن لەیاخەی کراسەکەی باوکی گرت و پاڵی پێوە نا، پشتی کێشا بەدیوارەکەوە، ئەوجا دەستی بەرزەوە کرد پیایا بماڵێ، باوکە هەناسەی سووار بوو، دیاربوو ئەو لێدانە بۆری هەناسەی تەنگ کرد، دواتر باوکە بەسەر زەویەکەدا بەرەوە بوو، بەدەم دابەزینی دوو دڵۆپ فرمێسک لەچاوەکانی باوکەوە نیگایەکی لەفاتن بڕی، ئەگەر لە بەردی

بڕوانیایە شەقی دەکرد، دایکە نۆش دامابوو، بەهانای کامیانەوە بچێت، بلەز فریای هاوسەرەکەی کەوت و دڵی دەدایەوە، کچەش بەدەم ڕوانینی لەباوکی لەرز دایگرت، فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە، هێدی هێدی شل و مل بووەوە، تا لەدەست و پێ کەوت و بەسەر زەویەکەوە بەرەوە بوو.

بابەتەکە هی ئەوە نەبوو گوێی پێ نەدرێت، تا خراپتر نەبێت، ریم هاتە ناو کێشەکەو بڕیاری دا شێخێکی بەهێزی بۆ دابین بکات، باوکە هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر کچەکەیدا نەمابوو، گەڕان بەدوای پیاوێکی ڕاستگۆ لەنێو دەجاڵەکاندا وەک گەڕان وابوو بەدوای دەرزییەک لەنێو کۆمەڵێک پووش و پەڵاشدا.

هەوەڵین هەنگاوێک ریم پشتی پێ بەست دوور کەوتنەوە بوو لەئامۆژگاری کردن، کە گوایە فلانە شێخ و فلانە شێخ باشن، یا فلانە شێخ ئەزموونی زۆرترە، ریم گەیشت بە شێخ خالید موسا، دەیزانی هەموو قورئانی ئەزبەر کردووە، لەدەرەوە چاوەڕێی کرد.

خالید موسا گەنجێکی بەخۆ بوو، وەک مەزەندەی بۆ دەکەیت بەساڵا چوو نەبوو، باوەڕی نەدەکرد پشتی پێ ببەستێت یا دڵەڕواکێ بێ، وەلێ بەوای قسەی خەڵکییەوە کە گەنجێکی بە ئاکار بوو، بۆی دەرکەوت ئامادەگی تەواوی هەیە بۆ چارەسەر کردنی ئەو کێشەیە، بۆیە دەستبەجێ بڕیاریدا لەتەکیا هەر ئەو کاتە بڕوات.

ریم پێی ڕاگەیاندبوو فاتن هاوڕێیەتی و جنۆکەیەکی مەسیحی چووەتە لەشیەوە، خالید بەهێمنی پێیگوت:

- شتێک نییە بەناوی جنۆکەی مەسیحی، جنۆکە مەسیحی هەر تیا نییە، ئەو ئایەتەت نەخوێندووەتەوە لە سوورەتی (ئەلئەحقاف) کاتێک گوتیان قورئان دوای موسا هاتووە چون ئەوەی دان بە عیسا نەهێنن، ( ئەی قەوم ئێمە بیستوومانە کتێبێک دوای موسا هاتووەتە خوارەوە)شرۆڤەی.. ئایەتی 30

ڕیم پێیگوت:

- یاشێخ.. مەسیحی بێ یا مەسیحی نەبێت، فاتن بەدوو دۆخدا تێدەپەڕێت، جارێک لاواز و لەرز دەیگرێت و بەشێوەیەکی زۆر ناشرین ڕفتار دەکات، تەنانەت بەسەر جێوبانەکەیەوە دەست و پێی دەبەستنەوە، تا نەچێتە دەرەوەو ئابروویان ببات.

ڕیم درێژەو وردەکاری زیاتری بۆ شێخ باس نەکرد، شێخیش هیچ پرسیارێکی لێ نەکرد، دیاربوو لە کێشەکە حاڵی بووبوو.

فاتن بەسەر جێ و بانەکەیەوە دانیشتبوو، وەک ئامادەگییەک بۆ چوونە ژوورەوەی شێخ خالید کە بەنیگایەکی دڵخۆشکەر نەبوو لەلایەن دایبابی (فاتن)ەوە، وەک نائومێدییەک بۆ دۆخی کچەکەیان، وەلێ شێخ سڵاوێکی گەرمی لێکردن، لەتەک ڕیم چوونە ژوورەکەی فاتن و ما بێدەنگ گوێ لە ڕیم بگرێت، ڕیم گوتی:

- ئازیزەکەم بە شێخ بڵێ هەست بەچی دەکەی، چیت لەخەونەکانت دەبینی؟

فاتن هەر بەشێوەی دانیشتنەکەی خۆی و بێ ئەوەی چاو ببڕێتە چاوی شێخ گوتی:

- هیچم نییە، ئێوەش لەو قسە پڕوپووچانەی خۆتان بکەون، ئەو دەجاڵانەی دەیانهێنن هیچ سوودێکیان نییە.

ڕیم بەخۆشی پێیگوت:

- ئازیزەکەم، ئەم پیاوە هەموو قورئانی لەبەرە، پیاوێکی خوا ناس و ساڵحە.

فاتن بەڕقەوە دیقەتی داو گوتی:

- هەر هەموویان درۆزنن، فێڵباز و پیسن.

ڕیم مەزەندەی ئەوەی کرد شێخ بەرسڤی توندی بداتەوە، لێ هەستاو بە ئاسپایی لێی نزیکەوە بوو، تەنها وشەیەکی گوت کە زۆر سەیر بوو:

- جوولەکەی یا کافر؟

فاتن دەمێک بێدەنگی نواند، زۆر بەوردیش دیقەتی شێخی دەدا و چاوی لێ نەدەپرووکاند، گۆناکانی کەوتنە لەرزین، دواتر زۆر بوێرانە گوتی:

- نەمزانیوە مزگەوتەکان شێخی لەم شێوەیەی دامەزراندووە، کە چاو ڕەنگاو ڕەنگ و قۆزن.

ڕیم ناچار بوو بەدەنگێکی بەرز هاوار لەکەسوکاری فاتن بکات، کە لەدەرەوە دانیشتبوون.

- محەمەد.. ئیبراهیم گوریسەکان...

فاتن هەستاو بەرەو لای خالید ڕۆیشت، بەهەمان دەنگ دەیگوت:

- یاشێخ بۆچی هەنگاوەکانت ڕاگرت، ئەی شێخی قیت و قۆز؟ منت دەوێ؟

ما خالید بەشەرمەوە بکشێتەوە، ئەوجا دەرگاکە کرایەوەو دوو گەنج لە خزمانی فاتن هاتنە ژوورەوە، زۆر بەتووندی باڵبەستیان کرد، فاتن کەوتە ڕاپسکاندن، وەلێ هەر زوو باڵبەستیان کرد، خالید ئاوڕی لەجانتاکەی دایەوەو بوتڵە ئاوێکی دەرهێناو کەمێک ئاوی بەدەستی خۆیدا کردو لەفاتن نزیکەوە بوو، هەرچەندی کرد و خۆی ڕاپسکاند سوودی نەبوو، خالید بەدەنگێکی تیژ گوتی:

- لەمەولا موحاسەبەتان دەکەین ئەی گرۆی ئادەمی، جا بەکام لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ ئەی کۆمەڵی جنۆکە و ئادەمی ئەگەر توانیتان دەرچن لەبەشەکانی ئاسمانەکان و زەوی ئەوە بڕۆن دەرچن، ناشتوانن مەگەر بە دەسەڵاتێک نەبێت، جا بەکام لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

شرۆڤەی.. سورەتەکانی 31و32و 33و 34 ی سورەتی ئەلرەحمن

ئەوجا ئاوەکەی لەدەستی دەناو دەیپرژاندە دەموچاوی فاتن و دەیگوت:

- (ئاگر و مسی تواوەتان بۆ دەنێرێت، ئەوسا یارمەتی یەکتریشتان بۆ نادرێت، جا بەکام لەنیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن)

شرۆڤەی سورەتی ئەلرەحمان.. ئایەتی 35 و 36

فاتن دەنگی گڕ بوو، ئازاری پێگەیشت، بەهەموو توانایەوە هاواری دەکرد:

- ڕیم ئەو گڵاوە دەربکە...

خالید قسەکەی پێ بڕی و دەستی نایە نێوچەوانی و ما ئایەت بخوێنێت:

- (یان دەڵێن ئێمە کۆمەڵێکی سەرکەوتووین و نابەزین، بێگومان کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێت و هەڵدێن، بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دواییە وە سزای ئەو ڕۆژە زۆر سەختر و تاڵترە).

شرۆڤەی.. ئایەتەکانی سورەتی ئەلقەمەر 44 و 45 و 46

فاتن پشتی کوڕ بووەوە، هەموو جەستەی ڕەق بوو، دەنگێکی چون غەرغەرەی لێوە دەهاتە دەرەوە، لەسەرخۆ دەنگەکە کزتر دەبوو، چاوەکانی لەدرندەیی دەکەوتن، فرمێسک لەچاوەکانی دەهاتە خوارەوە، ڕیم بلەز خۆی پێگەیاند و بیسمیلای بەسەریا دەکرد و توووند تووند لەباوەشی گرت، خالید بوتڵە ئاوەکەی لەسەر مێزەکە داناو جانتاکەی کۆکردەوە، وەک ئەوەی ئامادەبێت بۆ ڕۆیشتن، گوتی:

- ئەوە ئاوی زەمزەمە، هەموو ڕۆژێک سێ قومی بەدەما بکە، خودا شیفای دەدات، ئەگەر ئاوەکەش تەواو بوو، پەیوەندیم پێوە بکە، بۆ دانیشتنی دووەم دێمەوە.

کارتێکی دایە دەست ڕیم، ناوی و ژمارەکەی تێدابوو، ئەوجا ئیجازەی لێ وەرگرت و ڕۆیشت.

* * *

ئاگرێکی سووتێنەر هەموو خەڵکی لەکارەساتێک بەئاگا هێنایەوە، تەماشای پەنجەرەی ژووری ئاگرەکەیان دەکرد، ژووری فاتن بوو، کچێک بەدڵنیاییەوە دەهات و دەچوو، دواتر کچەکە پەنجەرەکەی شکاند، شتگەلی ئاگراوی لەپەنجەرەکەوە تووڕ دەدرایە دەرەوە، هاموشۆکەران سەریانسوڕما، ترس کەوتە دڵیانەوە، زانیان ئەوشتانە کتێبی ئیسلامین وەک بۆمب بەئاوەرەوە یەک لەدوای یەک فڕێ دەدرلو ئەویش لەهاواری خۆی نەدەکەوت، دایکە بەپشتی کچەکەیەوە دەرکەوت، دەیویست بیگرێ، فاتن پاڵی بەدایکیەوە دەنا، خەڵکەکە بەرەو بیناکە ملیان نا، وەک ئەوەی بیانەوێ ئاگرەکە بکوژێننەوە.

فاتن لەدەرگای سەرەکی بیناکە بەجلی خەوەوە دەرکەوت، بۆڕییەکی بەدەستەوە، کێشای بە جامی پەنجەرەکە وردو خاشی کرد، گەنجێک لێی نزیکەوە بوو، باڵی (فاتن)ی گرت، هەوڵی دەدا بۆڕییەکەی لەدەست بسێنێت، فاتن بەدەستەکەی تری ماڵی بە گەنجەکە، پشتاو پشت تووڕی دا، وەک ئەوەی بەمنداڵێکی کێشابێت، ئەو کچە سەلارەی هەموو ڕۆژێک بەڕێی خۆیدا دەهات و دەڕۆیشت، جنۆکە چووەتە لەشیەوە، چاوەکانی ڕقیان لێ دەباری، دەنگیشی چون دەنگی کەمتیار دەیلووراند.

بە بۆڕییەکەی دەستی بگەیشتایەتە هەر ئۆتۆمبیلێک جامەکەی دەشکاند، دایکەو باوکە بە زەلیلی هاتنە دەرەوە، خەڵکێکی زۆر چوونە ناو بیناکە بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە، ئۆتۆمبیلی فریاکەوتنی ئاگر کوژێنەوە گەیشتنە جێی

ئاگرەکە، توانیان ئاگرەکە کۆنترۆڵ بکەن، ئەوجا ڕیم دەرکەوت و شێخ خالید بەدوویەوە، لەفاتن نزیکەوە بوو، ما قورئان بەسەریا بخوێنێت:

- سزاو لەناوچوون بۆ هەموو درۆزنێکی گوناهبار، کە بەڵگەکانی خودا دەبیستێت و بۆی دەخوێنرێتەوە لەپاشان لەسەر کافری بەردەوامە چونکە خۆبەزلزانە ئەڵێی هەر نەیبیستووە، دەی مژدەی پێبدە بەسزایەکی سەخت، وەهەرکاتێک شتێک لەبەڵگەکانمان ئاگاداربێت بەگاڵتەی دەگرێت، ئەوانە سزای ڕیسواکەریان بۆ هەیە.

شرۆڤەی.. سورەتی ئەلجاسیە ئایەتەکانی 7 و 8 و 9

فاتن ئاوڕی لێ دایەوەو بە ڕقێکی شەیتانییەوە تەماشای کرد، خەڵکەکە سەرسام بوون، وەلێ شێخ دەنگی لێ هەڵبڕی و کەوتە قورئان خوێندن:

- بێگومان بەندەکانی من دەسەڵاتت بەسەریاندا نییە و ناتوانیت گومڕایان بکەیت وە پەروەردگارت بەسە پارێز و چاودێرت بێت. شرۆڤەی.. سورەتی ئەلئەسرا ئایەتی65

ما فاتن بکشێتەوە، لەرز دایگرت، ئەویش ڕوو بەڕووی دەڕۆیشت و قورئانی دەخوێند:

- ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندەیە بۆ سەر کێوێک و تێبگەیشتایە لەوەی کە تێیدا هاتووە دەتبینی بەملکەچی و لەت لەتبووی لەترسی خودا ئەم جۆرە نموونانە دەیانهێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە.

شرۆڤەی.سورەتی ئەلحەشر ئایەتی 21

فاتن بۆرپییەکەی لەدەست بەرەوە بوو، بەسەر زەویەکەوە ڕاکشا، شێخ خالید بەپەلە پەڕۆکەی دا بەسەریا، تا پۆشتەی بکات، فاتن دەلەرزی و دەگریا، خەڵکیش بەخەمبارییەوە لێیان دەڕوانی، ئاگرەکە کوژایەوە، ئەوەی لەدڵی دایبابدا مایەوە، هەستکردن بوو بەوەی کچەکەیان ڕۆیشت و لەدەستیان دەرچوو.

*　　　　*　　　　*

پزیشکی دەروونییەکە دیقەتی (فاتن)ی دا بەسەر جێوبانەکەوە بەسترابووەوە، بە باوکەی گوت:

- بەڕێزم، کچەکەت جنۆکەی تێدا نییە، ئەوە نەخۆشییەکی دەروونی هەیە، لەلای ئێمە بە فرە کەسایەتی بەناوبانگە.

باوکە بەچاوی ناڕەزاییەوە لێی ڕوانی و گوتی:

- شتگەلێکمان لێ بینیوە مەحاڵە، تەنانەت بەگوریس بەستمانەوە گوریسەکەی کردەوە، بۆیە ناچاربووین بە زنجیر بیبەستینەوە، وەک دەبینیت.

دکتۆر دیقەتی زنجیرەکەی دا و بەداخەوە گوتی:

- بڕوام پێبکەن نۆخەکە ئاڵۆزتر دەکەن نەک چارەسەرکردنی.

بە سێمای باوکەوە هێمایەکی سەیر وەک ناحاڵیبوونێک درووست بوو، پرسی:

- دکتۆر ئێمە هیچ نازانین.

دکتۆر ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- وەک گوێت لە دەجاڵەکان گرت، گوێ لەڕای زانستی تەندرووستیش بگرە، نەخۆشی فرەکەسێتی ئەوە عەقڵی نائاگایی دایدەهێنێت، کەسێتییەک ناکۆک بە کەسێتی نەخۆشەکە، واتە دوو کەسایەتی لەناخی نەخۆشەکەدا دەژێت، بۆ هەر یەکەیان خەسڵەتی خۆی هەیەو لەدەنگ و بیرکردنەوەو ئامانجەکانی و خەونەکانی، دوور نییە نەخۆشەکە پیاوێک دابهێنێت، کەسایەتی مێینەیەک دەبینێت جل و بەرگی ژنانە لەبەر دەکات، ماکیاژ دەکات، یا کەسایەتی منداڵێک دائێنێت، لەتەک بووکەشووشەکان یاری دەکات، هەر بەو شێوەیە عەقڵی نائاگایی شەیتانێک جنۆکەیەک دائێنێت.

باوکە بۆ یەکەمجاری بوو گوێی لەو جۆرە قسەیە بێت، بە دکتۆرەکەی گوت:

- تکایە بەردەوام بە.

دکتۆر گوتی:

- عەقڵی نائاگایی بەپێی ئەو زانیارییانەی پێشتر لەعەقڵی نەخۆشەکەدا هەبووە، کەسایەتییەکانی دادەهێنێت، ئەگەر نەخۆشەکە هەر لەمنداڵییەوە لەسەر ئەوە پەروەردە بوو، کە جنۆکە دەقیژێنێت و دەنگێک وەک دەنگی ئاژەڵی درندە دەردەکات و ڕقی لەقورئان دەبێت و دەسووتێت، کاتێک عەقڵی نائاگایی ئەو جنۆکەیە دائێنێت، هەموو ئەو خەسڵەتانە لەخۆ دەگرێت و لەعەقڵیدا دەمێنێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر نەخۆشەکە مەسیحی بوو، لە ئەمریکا دەژیا، ئەوا عەقڵی نائاگایی جنۆکەیەک دادەهێنێت جیاواز لەو جنۆکەیەی لەوڵاتی موسوڵمانەکاندا

هەیە، لەوێ بەوە عەقڵی نائاگاییەکەی گۆش کراوە کە جنۆکەکە بە خاچ دەسووتێنرێت، دەبینیت کە چاوی بەخاچ دەکەوێت ئازاری دەبێت، بەڕێزم باوەڕ بکە هەمووی نەخۆشی دەروونییە و هیچی تر.

باوکە بەدەم دیقەتدانی کچەکەی کە بەسەر جیوبانەکەوە نووستبوو، هەستی بەونبوونی کچەکەی دەکرد، گوتی:

- ئەوە چی لەعەقڵی نائاگایی دەکات ئەو کەسایەتیانە دابهێنێت؟ دواتر چ پێویست بەوە دەکات؟

دکتۆر لە (فاتن)ی ڕوانی و گوتی:

- کاتێک مرۆڤ لەژیانیدا تووشی شۆک دەبێت، یا کۆمەڵێک ڕووداو بەسەر کەسێکدا ڕەت دەبێت، ڕفتاری باش ناکات و تێیدا لاوازە، ئەوا عەقڵی نائاگایی کەسێتییەکی تری بەهێز و جیاواز دادەهێنێت، ئەوەش خەسڵەتێکی بەرگری کردنە لەلایەن عەقڵی نائاگاوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی کێشەکان.

باوکە لێی پرسی:

- چارەسەری ئەو نەخۆشییە چییە؟

دکتۆر بەرسڤی دایەوە:

- بەدواداچوونی بۆ بکرێت لە لایەن دکتۆرێکی دەروونییەوەو پسپۆرێکی دەروونییەوە، دوو کەسن جیاواز لەیەکتر، یەکەمیان دەرمانەکەی بۆ دیاری دەکات، ئەوی دووەمیش چارەسەری دەروونی و کۆمەڵایەتییەکەی.

دایکە هاتە بەینەوەو گوتی:

- مەحاڵە، ئەوەی لەناو کچەکەم دایە هیچێک لەوانە نییە، کاتێ ئاگر لەماڵەکەمان بەربوو، من گوێم لێبووە بەزمانی بیانی قسەی دەکرد، بەچاوی خۆم بینیم دەستی بۆ بنمیچەکە بەرزەوە کرد، بەزمانێکی بیانی شتگەلێکی دەگوتەوە من لێی تێنەدەگەیشتم.

دکتۆر ژیرانە گوتی:

- خانم، ئەوە باوە لەنەخۆشی فرە کەسایەتیدا، عەقڵی نائاگایی وەک کۆمپیوتەر وایە، مرۆڤ هەرچی بیستووە لەژیانیدا و بەهەر زمانێک بێت لەو عەقڵە نائاگاییەی کۆی کردووەتەوە، تەنانەت ئەوەی لەفیلمەکانیش بیستوویەتی، کاتێکیش عەقڵی نائاگایی کەسایەتییەکی جنۆکەیی دادەهێنێت، ئەوا ئەو دۆسێیە هەڵدەداتەوە کە کۆن بیستوویەتی و بەهەمان شێوازێک کە گوێی لێ بووە، هەر حاڵەتێکیش لەو کەسایەتییانەمان تاقیکردووەتەوە بە پسپۆڕی زمان، بینیومانە تەواو شکستی هێناوە، ئەگەر وا خۆی پیشان بدات کە جنۆکەی عێراقی چووەتە لەشیەوەو بە شێوەزاری عێراقی قسەی کردووە، کەسێکمان هێنا عێراقی بوو، بە شێوەزاری عێراقی قسەی لەتەکا کرد، زۆر بە ڕوونی وەڵامی نەداتەوە، تەنها چەند ڕستەیەک دەڵێتەوە لە درامایەکی عێراقیدا بیستوویەتی.

لەو ئان و ساتەدا لەدەرگا درا، ڕیم هاتە ژوورەوە، دوا بەدوای شێخ خالید موسا ڕێزی بۆ هەمووان نواند، دایکەو باوکەش وەک ڕێزێک بۆی داچەمینەوە، هەرچی دکتۆر بوو بە چاو کزییەکەوە چاوی لەچاو شێخ خالید بڕی، شێخ سیقەتی بەروانکە سپییەکەی دکتۆری دا و هیچی نەگوت، باوکە هاتە دەنگ و گوتی:

- یاشێخ، بەداوای لێبووردنەوە ئەوە دکتۆر (بەدەوی)یە، پزیشکی دەروونیە.

خالید بەساردییەکەوە سڵاوی لێکرد، دواتر لای لەدایکە کردەوەو بوتڵێکی بچووکی بۆنی دایە دەست و گوتی:

- ئەوە (مسک)ە، نێوچەوانی پێ چەور بکە، مسک بۆنێکی خۆشە، جنۆکە ڕقی لەبۆنی خۆشە، جوانیش بیبەستنەوە، ئەمڕۆ کەشی دەرپەڕاندنی جنۆکەی بۆ دەکەین.

ئا لێرەوە دکتۆر چون ئەوەی حەوسەڵەی نەبێت بێدەنگ نەبوو، گوتی:

- مسک؟ دەرپەڕاندنی جنۆکە؟ سوێندت بەخودا دەدەم، پێغەمبەر یا یەک لە سەحابەکانی ئەوەیان کردبێ؟ یا بۆ خۆت بەناوی ئاینەوە ئەوەت داهێناوە، ئەوانەش کە وەک خۆت وان.

شێخ بەنیازبوو وەڵامی بداتەوە، وەلێ دکتۆر پێشی کەوت و گوتی:

- پێغەمبەر جنۆکەی دەرنەپەڕاندووە، لەخوا بترسە، ئەوە جادووە درۆیە بەناوی ئاینەوە دەیگێڕن.

شێخ خالید بەتوورەییەوە گوتی:

- بڕوات بە لەشدا چوونی جنۆکە نییە؟ گوێت لە قورئان نەبووە خودا دەفەرمێ (ئەوانەی کە سوود یانی ڕیبا دەخۆن کاتی زیندووبوونەوە ڕاست نابنەوە، لەگۆڕەکانیاندا مەگەر چۆن کەسێ ڕاست دەبێتەوە کە جنۆکە دەستی لێ وەشاندبێت)

سورەتی بەقەرە/ ئایەتی 275

دکتۆر جانتاکەی گرتە دەست وەک ئامادەبوون بۆ ڕۆیشتن، لای لەشێخ کردەوەو گوتی:

- یاشێخ من قورئانم خوێندووەتەوە، ئەوەی تۆ باسی لێوە دەکەیت ئەوە (وەسوەسەی) شەیتانە، گوێت لەو ئایەتە بووە خودا دەفەرمێ (وەئەگەر خەتەرە و خەیاڵ و وەسوەسەیەکت بۆ هات لەلایەنی شەیتانەوە یەکسەر پەنا بگرە بەخودا بەڕاستی هەر ئەو بیسەری زانایە، بەڕاستی ئەوانەی خواناس و پارێزگاربوون کاتێک خەتەر و وەسوەسەیەکیان لەشەیتانەوە پێ بگات یادی خودا دەکەن و خوایان بیر دەکەوێتەوە جاک توپڕ بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە)

شرۆڤەی سورەتی ئەعراف/ ئایەتی 200 و 201 ،

ئەوانە ئایەتی تەواوی (وەسوەسەن)، یا چۆنت بوێ توا قورئان تەوزیف دەکەیت؟

یاشێخ لەخوا بترسە، لەوە زیاترت پێ ناڵێم.

دواتر بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و تەماشایەکی باوکەکەی کرد و گوتی:

- ئەو کەسێتییەی جنۆکەکەی عەقڵی نائاگاییەکەی دایهێناوە، چەند بەدوایدا بڕۆیت زیاتر لای دەمێنێتەوە، گەشەو نشونمای زیاتر دەبێت تا ئەم جۆرە پیاوانە بێننە سەری، بەو جۆرە تۆ ئاوت بە ماسی داوە، خۆراکت بەو کەسێتییە داوە بمێنێتەوە، ئەگەر بتەوێت ئەو کەسێتییە لەلای کچەکەت بکوژێت، ئەو جۆرە دەجاڵانەی لێ دوور بکەرەوەو کچەکەت بەرە بۆ نەخۆشخانەی دەروونی بە داو دەرمان چارەسەری بکەن، کە خودا دایگرتووە، نەک بە مسک و نازانم چی.

دکتۆر ڕۆیشت، دایکە ڕاستەوەبوو، وەک ئەوەی گوێی لەهیچ نەبووبێت، (مسک)ەکەی ساویە نێوچەوانی کچەکەی، شێخ دەستی برد و لەناو جانتاکەی شتێکی دەرکرد، دایکەو باوکە سام دایانیگرت، کە دارێکی دەرهێنا.

❊ ❊ ❊

شێخ خالید لە فاتن نزیکەوە بوو، فاتن لەخەودا بوو، شێخ بوتڵە ئاوی (زەمزەم)ەکەی دەرهێناو پرژاندیە سەر دەموچاوی فاتن و ئایەتی بەسەرا خوێند:

- ئەی موحەمەد بڵێ پەنا دەگرم بەدرووستکەری بوونەوەر، بەپەروەردگاری بەربەیان، لەزیانی ئەوەی درووستی کردووە، وەلەزیانی تاریکی کاتێک کە

دادێت، وەلەزیان و خراپەی جادوگەران کە پەت و دەزوو گرێ دەدەن و فووی پیا دەکەن، وەلەزیانی بەخیل و حەسوود کاتێک کە حەسوودی دەبات.

شرۆڤەی سورەتی ئەلفەلەق ئایەتەکانی 1 و 2 و 3 و 4 و5

ما دووبارەو سێ بارە ئایەتەکە بخوێنێت و ئاوەکەی بەسەرا بپرژێنێت، فاتن لەرز دایگرت، دواتر ئایەتی تری بەسەرا خوێند، گوتی:

- هەی پیسی ناپاک، هەی ئاژەڵ ناوی خۆت بدرکێنە.

شێخ تەنها لەرزی فاتنی دەبینی، ئەوجا دایکە لێی نزیکەوە بوو، وەلێ شێخ دارەکەی بەرزەوە کرد و کێشای بە لاقی فاتن، ئێشی پێ گەیاند، گوتی:

- کێ فەرمانی پێداوی بوێر بیت بەسەر ئاغاکانت؟

لێرەوە لە لەرز کەوت، ئەوجا سووک چاوەکانی کردەوە، ئەو تێڕوانینە شەیتانییەی تێدابوو، جنۆکەکە بەدەنگێکی ناشرین قسەی کرد:

- من سەردارم بەسەر تۆو هەموو بنیادەمییەوە، ئەم قەحپەیەش تیاید دەرناچم تا نەیکوژم و واتان لێنەکەم بۆی بگرین.

دایکە بەسەر سینگی مێردەکەیەوە دەستی بەگریان کرد، و گوتی:

- پیاوەکە ئەوە کچەکەی ئێمە نییە، ئەوە دەنگی ئەو نییە، ئەو دکتۆرە وڕینەی ئەکرد.

فاتن لەسەرخۆ سەری بۆ لای ڕاست وەرچەرخاند و بە بزەخەنەیەکی شەیتانییەوە تەماشای دایکی کرد، جنۆکەکە گوتی:

- بەڵێ، لەمن زیاتر باوەڕت بەکەس نەبێت، لەسەر پەیمانی خۆم سوورم، کۆتایی ئەم قەحپەیە بەچاوی خۆت دەبینیت.

شێخ دارەکەی بەرزەوە کرد و ما ئایەت بەسەر (فاتن)دا بخوێنێت، شەیتان بەسەر جێوبانەکەوە هەوڵیدەدا لەکۆتەکان ڕزگاری بێت، جەستەی (فاتن)ی چەمانەوە وەک کەوانەی تیروکەوان، ما دەستی فاتن بەهێز ڕابکێشێت، تا کۆتەکەی بکاتەوە، چاوەکانی فاتن سپی هەڵگەڕان، دەنگێکی دڕندانەی لێ بەرزەوە بوو، کۆتی زنجیرەکە ئازاری بە مەچکەکانی دەگەیاند، تا خوێن لە دەستەکانییەوە دەرچوو، دایکە باوەشی لەکچەکەی دا ، شێخ ویستی ئاگاداری بکاتەوە، وەلێ کات بەسەر چووبوو، فاتن ددانەکانی لەگەردنی دایکی گیر کرد، وەک تەوارێک کەڵبەکانی لەنیچەر گیر بکات، باوکە باوەشی لە ژنەکەی داو دووری خستەوە، خالید هاواری لەڕیم کرد، ئەودەم کیسەیەکی ڕەشی لەجانتاکەی دەرهێنا:

- بانیۆی گەرماوەکە لە ئاو پڕ بکە و ئەم کافوورەی تیا بەتاڵ بکە.

ڕیم کیسەکەی لێ وەرگرت تا کارەکە ئەنجام بدات، لەنێو هەڵچوونی شەیتان و هاواری دایکەو فرمێسک ڕژانی باوکە و لێدانی دڵی شێخ، ڕیم لەدوورەوە هاواری کرد، گەرماوەکە ئامادەیە، ئەوجا شێخ بانگی لە بەهێزترین گەنجانی کەسوکاری کچەکە کرد، بەهێز بیگرن و کۆتەکانی لەدەست بکەنەوە، شەیتان هەوڵی زۆری دا خۆی لەدەستیان ڕاپسکێنێت، وەلێ گەنجەکان بەهێز (فاتن)یان گرت و هاویشتیانە ناو ئاوی بانیۆکەوە، لەبن ئاوەکەوە دوکەڵێک

دەرچوو، جەستەی فاتن شل بووەوە، وەک ئەوەی هێزی تیا نەمابێت، ڕیم داچەمیەوە باوەش بەسەر هاوڕێکەیەوە بکات و ماچی کرد، لێرەوە شێخ گوتی:

- پێویستە بیبەینە بەر خوێندنەوە، ئەم دۆخەیان لەمن گەورەترە، ئەو شێخە بەساڵاچووانە بێتوانا نین لەو دۆخە.

ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، چاوەکانی سەیریان دەهات، گوێی لەبەریانگی بەیانی بوو، سەری نایە باوەش (ڕیم)ی هاوڕێی، ڕیم بۆ ئارام کردنەوەی دەستی بەسەرو قژیدا دەهێنا، فاتن پێیگوت:

- ڕیم.. خەونێکم بینی، سێ قەلەڕەش جەستەمیان هەڵدەکۆڵی، چون ئەوەی لاشەیەکی بێ گیان بم و ئەوانیش بمخۆن.

ڕیم باوشی لێداو ماچی گۆنای کرد و گوتی:

- دوودڵ بەمبە ئازیزەکەم، کەمێکی تر دەچیت بۆ شوێنێک هەندێک ئایەتت بەسەرا دەخوێنن تا خەونی وا نەبینیتەوە.

دوای کاتژمێرێک ڕۆژ بووەوەو ڕیم بە (فاتن)ەوە هاتە خوارەوە، فاتن چون ئەوەی لەنجەو لار بکات، تەواو نەهاتبووە سەر خۆی، بەرەو خوێندنەوەی بان سەری بەرێکەوتن.

لەوێ شێخ خالید چاوەڕوانیان بوو، هەموو شتێکی بۆ شێخی بەساڵاچوو گێڕابووەوە، شێخی بەتەمەن هەر کە چاوی بە فاتن کەوت، زانی جنۆکەکە چەندی توانای بەسەرەوە بووە.

دوای ئەوەی گوێی لە بەسەرهاتەکەی بوو، کچەیان کردە ژوورێکی پاشکۆی ژووری خوێندنەوەی قورئان، ئەوجا دەست و پێیان کۆت کرد، تا کاردانەوەیەکی خراپی بەدواوە نەبێت، ما قورئان خوێنەکان قورئان بخوێنن، شەیتان کەڵبەکانی خۆی دەرخست و تفی لەقورئان خوێنەکان کرد، ئەوەی جوێن بوو پێیانی دا، دواتر دانی بەوەدا نا کەسێک نووشتەی ڕەشی بۆ کچەکە کردووەو مەحاڵە لەجەستەی دەربچێت، ئەو سیحرەش لە (دێر دەمیانە) شاردراوەتەوە، ئەو جۆرە سیحرەش لەشوێنێکی پیرۆز شاردراوەتەوە، قەدەغەیە کەس دەستی پێبگات، لەوەش خەتەرناکتر ئەوەیە کەسێک بڵێت لە فلانە جێیە، ئەوەش دەبێتە هۆی دووزمانی تایەفەیی .

سێ لە قورئان خوێنەکان هەوڵیاندا جنۆکەکەی لە لەشی دەرپەڕێنن، کەشی لیس وەشاندن دەستی پێکرد، ڕیم هاواری لێکردن لەلێدانی بکەون، وەلێ ئەوان دڵنیاییان پێدا دوودڵ نەبێت، لیسەکە بەر کچە ناکەوێت، بەڵکو بەر جنۆکەکە دەکەوێت، کچە هەستی پێ ناکات، ئەوە جنۆکەیەکی ئاسایی نەبوو، خۆی لەکۆتەکە ڕزگار دەکرد و لێیانی دەدا و دەگەڕایەوە لەشی فاتن، تەنانەت کەللەی یەکێکیان بە دیوارەکە کێشا، مەحاڵە ئەو هێزە هی کچێک بێت.

ئەو دانیشتنە سەرکەوتوو نەبوو، ڕیم چووە بن باڵی هاوڕێکەی لەکۆڕەکە کشانەوە، شێخەکان ئامۆژگاری (ڕیم)یان کرد جنۆکەکەیان پێ دەرناپەڕێت، ئامۆژگارییان کرد، شێخ خالید ببەنە سەری و قورئانی بەسەرا بخوێنێت، ئەمە خوایە ئەو جنۆکەیەی لە لەشی دەرپەڕێت.

چەندین ڕۆژی بەسەرا چوو، فاتن لەسەر جیوبانەکەی خۆی ڕاکشابوو، بەیناو بەین ڕیم سەردانی دەکرد، فاتن هەر ئەو فاتنە نەبوو، کێشی زیادی کردبوو، دەموچاوی گۆڕا ئەو جوانییەی جارانی نەمابوو، شێخ خالید هەموو هەفتەیەک قورئانی لەسەر دەخوێند، سوودی نەبوو، تەنانەت پزیشکی دەروونییەکەیش هەوڵیدەدا دایک و باوکی بیبە نبۆ نەخۆشخانەی دەروونی، وەلێ گوێیان لێ نەگرت، لەبەر ئەوەی خەڵکی قسەیان بۆ هەڵدەبەستێت.

بەرەبەیانییەکی ڕۆژی شەممە، ڕوحی فاتن بۆ لای خودا بەرزەوە بوو، چاوە جوانەکانی کوژانەوە، جەستەی ڕادەستی خاک کرا، خەڵکێکی زۆر دوای جەنازەکەی کەوتن، شێخ خالید یەکێک بوو لەوانەی جەنازەکەیان بەرەو گۆڕستان دەبرد، بەڕێکەوت دکتۆر هاوشانی شێخ خالید دەڕۆیشت بەڕێوە، ڕاستەو ڕاست بە شێخ خالیدی گوت:

- ئەو کچە نامەیەکی خودا بوو بۆ ئێوە، کە بەنەفامی خۆتان کوشتتان.

شێخ خالید بەزمانێکی زبر گوتی:

- لەخودا داوای لێخۆشبوون بکە، هەموو سەرەمەگێک پەیامێکی بۆ دابەزیوە.

دەستنوێژی هەڵگرت ئامادەی نوێژ کردن بێت.

دەنگی ئەشکەنجەدارەکان کپبووەوە، تەنها هەر من مامەوە، پیاوێکی ناشرینی سەر ڕووتاوەش دیقەتی چاوەکانی دەدام. هەردوو شایەتمانم لەدڵەوە خوێند و بەدەوروبەری خۆمم ڕوانی، توێبە بەسەرزەویەکەوە لەهۆش خۆی چووبوو،

ئافرەتە هیندییەکە شوێنەواریشی نەمابوو، ئەو پیاوە سووتاوەکەیش دیار نەبوو، تەنانەت لاشەی (لیستەر و لیزا)ش لەوێ نەمابوون، بەلامەوە سەیر نەبوو، دەمزانی ئەوان مردوون، بەهەرحاڵ، نەمزانی ئەو سەر رووتاوە شەیتانە چۆن ڕوحی ئەوانەی بۆ ئێرە بانگهێشت کردووە، یا ئەوە منم چوومەتە (بەرزەخ)ەوە؟ نازانم، شارلۆتان مستێکی بەنیوچەوانم کێشا و شریتی بیرکردنەوەی بچڕیم، سەرم بۆ لای پشتمەوە برد، کەللەمی بەقەسەکەدا کێشا، بەوای ئازارەوە هاوارم کرد، بازنگەکەی پێم بەتووندی فشاری خستە سەر پێم و ئەوەندەی تر ئازارم پێگەیشت، شارلۆتان بەدەنگە ناخۆشەکەی گوتی:

- مێشکی ملیونان خەڵکی داماو و سادەتان بەم درۆو دەلەسانەتان گۆش کرد، ئەوانیش بە ئومێدەوە وەک نابینا دووتان کەوتوون، ملیۆنان خەڵکی قوربەسەر نەخۆشخانەکانیان جێهێشت کە دەواو دەرمانی بەشەفایان بۆ نۆخەکە هەبوو، کەوتنە دوای دەجاڵەکانی وەک ئێوە، تا مێشکیان بەقسەی پڕوپووچ پڕ بکەن، وادەزانیت فاتن بەهۆی جنۆکەو شەیتانەوە مرد؟ بێ مێشکی ئێوە کوشتی، پشتی لە زانستی نەخۆشخانەو باری دەروونی کرد و خۆی خستە بەر دەستتان، کەسوکارەکەشی پێتان ڕەزامەند بوون، ئاخر چۆن باوەڕتان پێ نەکەن کە ئێوە بەناوی ئاینەوە قسەتان بۆ دەکرن؟ ئێوە تەنها هەر (فاتن)تان نەکوشت، ملیۆنانی ترتان کوشت، نەخۆشی دەروونیتان ڕاونا واتانکرد خۆیان بکوژن، یا ببنە هۆکاری مردنی خۆیان، دوور نەبوو چەند سەردانییەکی تری دکتۆری

دەروونی ڕزگاری بکردایە، ئاخر ئەوە چۆن دەڕسکێت، کە قسەی پڕوپووچی ئێوە متمانەی لەدڵی ئەوان بۆ زانست کوژاندەوە.

بەرپەرچم دایەوەو گوتم:

- تۆ نازا...

کوتەکێکی تری وەشاندو دەم و ددانی شکاندم، داچڵەکیم و دەمی پڕ کردم لەخوێن، گوتی:

- هەی هیچ پووچ.. پێغەمبەرەکەت و سەحابەکانی ئەوەیان دەکرد کە ئێوە دەیکەن؟

ویستم قسەیەکی بۆ دابهێنم، لەپڕ کێشای بەسەر گوێمدا و ئازاری زۆری پێگەیاندم و گوتی:

- هەی نارەسەنینە ئەوەی پێغەمبەرکەتان و سەحابەکانی دەیانکرد ئێوە ئەوەتان نەکرد؟ ئەوەی دەیکەن بیدعە نییە؟

هەوڵمدا وەڵامێکم بۆی هەبێت، وەلێ سوودی نەبوو، ئەو گوێم لێ ناگرێت، بینیم لای کردەوەو بەرەو دەرگای قەفەسەکە بەڕێکەوت و گوتی:

- هەموو ئەوانەی بەر لەتۆ قسەی خۆیان کرد، بەرامبەر بەقسەکانی تۆ داماوتر بوون، ئەوەی ئەوان کردبوویان بەقەد ئەو تاوانەی تۆ هیچ نەبوون، ئێوە ملیۆنانی خەڵکی هەمووساڵێک دەخەنە ئەشکەنجەوە، لەدلو دەرمان دووریان دەخەنەوە، تا دووی بیدعەی ئێوە بکەون.

بەبێ هێزییەوە پێمگوت:

- تۆ ک.. تۆ کێی؟

بەرقەوە پێیگوتم:

- خالید موسا.. ئەو کارانەی لەژیانتا کردووتن، ئەو بیدعانەی لەدڵی خەڵکیدا شینت داون و ئازارت بەڕوحیان گەیاندووە، هەموو بیدعەیەک چەواشەکارییە، هەموو چەواشەکارییەکیش بۆ ناو ئاگرە.

هەنگاوەکانی پەلەتر کرد و لەقەفەسەکە چووە دەرەوەو قەفەسەکەی لەسەر کڵۆم کردم، ئەوجا دیقەتی دام، چون ئەوەی دوا ڕوانینی بێت:

- هاوشێوەکانت ئەشکەنجەی ئێرەیان بەس نییە، لەوێ دەتبیننەوە، لەبەرزەخی ڕاستەقینە.

ڕۆیشت تا گەیشتە دەرگای گەنجینەکە، لەدەرگاکە چووە دەرەوەو بەتووندی دەرگاکەی داخست، چەند چرکەیەک لەسەرمای بەستەڵەک مامەوە، باوەڕم نەکرد ئەو نەفرەتییە ڕۆیشت، مەزەندەی ئەوەم کرد لەهەچ کاتێکدا بێت لەقە لەدەرگاکە دەدات و بە ئامێرێکی ئەشکەنجەوە بێتەوە گیانم، لێ چەند خولەکێکی تریش تێپەڕی و بەدەر نەکەوت، ڕاستەوەبووم بۆ لای دەرگای قەفەسەکە ملمنا، هەوڵی کردنەوەی دەرگاکەم دەدا، وەلێ تەواو کڵۆم درابوو، تۆیە نزیک بەقەفەسەکە کەوتبوو، لەسەرخۆ بانگم لێوە کرد، دواتر دەنگم زیاترلێ بەرزەوە کرد، بەناوی خۆی بانگم لێوە کرد، تا بەئاگا هاتەوە، پێمگوت:

- تویێبە .. ئەو شەیتانە ڕۆیشت و جێیهێشتین، وەرە دەرگاکەم لێ بکەرەوەو با هەڵبێین.

بینیم فرمێسک لەچاوەکانی تویێبە هاتە خوارەوەو گوتی:

- یاشێخ.. هەر بەڕاست ئەو شەیتانە نەفرەتییە ڕۆیشت؟

پێمگوت:

- بەڵێ، بەر لەچەند خولەکێک ملی شکاند، ناشزانم نیازی چییە، تویێبە بۆ لای من لا مەکەرەوە، بڕۆ بۆ لای ڕاستت لاشەی کابرای ڕووسییەکەی لێیە، کلیلی قەفەسەکان لەوێ کەوتووە.

تویێبە هەنگاو بە هەنگاو زۆریش بە زەحمەت بۆی جوڵا، تا دەستی بەکلیلەکان گەیشت، ئەوجا بەرەو قەفەسەکە هات و تا گەیشتە بەر دەرگاکە، ما بەدەستی لەرزۆکیەوە کلیلەکان یەک یەک تاقی بکاتەوە، تا گوێمان لەچرکەی کرانەوەی قفڵەکە بوو، ڕوحمان ئارام بوو، شوکرانەی خودامان کرد، دەرگاکەی کردەوەو باوەشمان لەیەکدا و گوتم:

- تویێبە .. لەخودا بەزیاد بێت کە خەمی لێ بردینەوە.

لێ تویێبە ڕوخساری گۆڕا و گوتی:

- یاشیخ گوێت لەوەیە؟

گوێم بۆ دەنگەکە ڕاگرت، ئەی خودایە ئەوە دەنگی ئۆتۆمبیلی پۆلیسە، پێکەنیم و گوتم:

- تویێبە ئەوان هان لێرە، ڕزگارمان دەکەن.

تویێبە گوتی:

- وەلێ ئەو بازنگانە پێمان دەگووشن کە لەم ناوچەیە دوور کەوتینەوە.

دڵنیام کرد و گوتم:

- هەڵبەتە بۆ ئەوەش چارەسەریان هەس.

لەپڕ دەرگاکە شکاو برێک پۆلیس بەجل و بەرگی پۆلیسی ڕۆمانییەوە هاتنە ژوورەوەو دیقەتیان دەداین، تەماشایەکی ئەو ناوەیان کرد، دواتر سەرکردەکەیان لێم نزیکەوە بوو، گوتی:

- ئێوە باشن، ئەوتاوانبارە کوانێ کە ئێوەی دەستبەسەر کردووە؟

بەپەلە پێمگوت:

- بەر لەچەند خولەکێک لەو دەرگایەوە هەڵات.

پیاوەکە ئاوڕی لە پۆلیسەکان دایەوە، تا فەرمانیان وێبدات، تیمێکیان چوونە دەرەوە بەدووی شەیتانە سەر ڕووتاوەکە بگەڕێن، تیمێکی تریان مانەوە، گوتم:

- گەورەم، کێ ئاگاداری کردنەوە؟ وامانزانی تیاچووینە.

پیاوەکە ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- ئەو کچە.

ئیشارەتی بۆ دەرگای گەنجینەکە کرد، بینیم لەوێ وەستاوە، لەخۆشیا فرمێسکم ڕشت، کە بە سەرپۆشەکەیەوە بینیم، ئەو کچە تۆیگۆریە ڕزگاری کردین.

توێبە گوتی:

- یاشیخ ئەو کچە کێیە کە باسی لێوە دەکات.

بەدەم تێڕوانینم بۆ کچەکە بەسوپاسگزارییەوەی گوتم:

- میهرگوڵ تۆرسۆن.

توبیە لەحەیبەتا دەمی کردەوە، لەخۆشیشدا فرمێسکی داهات، سوپاسی خودای کرد و ڕوو بەڕووی ڕۆیشت و لەباوەشی گرت، لەتەکیا بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و چوونە دەرەوە، تەماشای دونیام کرد، چون ئەوەی بۆ یەکەمجارم بێت لەدونیا بڕوانم، بەهەشتی سەوز و دارستان و شەماڵێکی خۆش دڵی دەکردەوە.

لێکۆڵینەوەی زۆر کرا، پەنجەمۆری زۆریشیان پشکنی، کەس شوێنەواری (شارلۆتان)یان نەدۆزیەوە، تەنانەت ئەو ئوتێلەش خەڵکی گوتیان چەندین مانگە چۆڵکراوە، کەسیش بەکاری نەهێناوە، لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی بۆ فرۆشتنی داناوەو کڕیارێکیشی بۆ نەهاتووە.

یەک وشە چییە بیرم نەچووە لەوەی ئەو شەیتانە گوتوویەتی، خۆمم بۆ تەرخان کردووە، بەدووی هەر زانیارییەک بمگەیێنێتە لای، تا بەڕێکەوت لەگەڕانەکانمدا تابلۆیەکم بینی، چاوەکانم لەترسا ئەبڵەق بوون...

کەڤاڵێک لەسەردەمی ڕێنێسانس یان کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست پێدەچوو، وێنەی پیاوێکی کورتەباڵای قەڵەو بەسەر مێزێکەوە شتێکی بەدەستەوەیەو

بەرزی کردووەتەوە، لەخوار مێزەکەوە سێ ئافرەتی لادێی لەپێشیشیانەوە ئافرەتێکی زۆر دەوڵەمەند بە کراسێکی درێژەوە دانیشتووە...

تابلۆیەک هەونەرمەندی ئیتاڵی لەشاری (بوندوقییە) ئەویش (پیترۆ لۆنگی)یە کێشاویەتی، تابلۆیەکی زۆر بەناوبانگە، ناونیشانی تابلۆکە (شارلۆتان)ە the charlatan

وشەی شارلۆتان بە ئینگلیزی بەمانای دەجاڵ یا ساختەچی دێت، ئەو کەسەی لەناو خەڵکیدا بەوە بەناوبانگە کە توانای یا چارەسەری هەیە، وەلێ فێلبازێکی درۆزنە، ما دیقەتی ورد لەتابلۆکە بدەمەوەو ئەو دەموچاوەش کە وێنەی کراوە، دڵم پەشیمانی و ترس دایگرتبوو، خۆ ئەگەر من تەنها مانای ئەو وشەیەم بزانیبایە، شوێنەکەم بەتەواوی بەجێدەهێشت، ئەو تابلۆیەم لەسەرەتای چوونم بۆ ناو ئوتێلەکە بینی، با ماناکەیشیم زانیبا، هیچی نەدەگۆڕی، کۆنفرانسەکەم تا کۆتایی دەبردە سەر، مرۆڤ هەرچی ئامازەیەکیشی بخەیتە بەردەم، لەکۆتاییدا کیسەیەکی گەورەی ساوێلکەییە.

کۆتایی

# شەیتان دەگێڕێتەوە

گرنگ نییە خێرهاتنت بکەم، پێویستیش ناکات پێشوازیم لێ بکەن، لێگەڕێن لەسەر ئەوە ڕێکبکەوین کە ڕوودەدات.. من لێرەم تا بنووسم و ئێوەش لێرەن تا بخوێننەوە، پێویستیش ناکات ئەوەی دەیڵێم بەدڵتان بێت، سەری خۆم بەگێژ بێنم بەوای دان بەخۆگرتنتان، بۆیە با لەپیاهەڵدان دوور کەوینەوە، من شێخێکی کەللەڕەقم لەو جۆرەی کەس حەزیان پێ نییە، ئێوەش کۆمەلە گەنجێکی فزوولین لەو جۆرەی کە بەدڵ من نین، کە بنیادەمەکان سوورن لەسەر بەکارهێنانیان لەنێو خۆیاندا.

هەلێکی زۆرترتان بۆ دادێنم، وەلێ لە لای منەوە نییە، لەبەر ئەوەی من تووشی دەردی بێزاری بوومە، هەموو شتێك لەزمانی خۆیانەوە دەبیستن، ئەوان بۆ خۆیان هەموو شتێك دەزانن، لەبەر ئەوەی بەچاوی خۆیان بینیویانە، لێشم مەپرسن من کێم، بیری خۆتانی بخەنەوە ئێوە لێرەن بۆ گوێگرتن نەك پرسیار کردن، ئەگەر ئەوەی بیستتان بەدڵتان نەبوو، بڕۆن سەری خۆتان لەبەرد بدەن، بەلای منەوە هیچ جیاوازییەکی نییە، ڕێك وەك ئەوەی ڕۆحیان دەرهێنابم، بەلای ئێوەشەوە هیچ جیاوازییەکی نییە، بەو ئاوایە سازاین.



نەخشەسازی: علی وەزانی